# الفرقان

## بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان

به کوردی

نووسینی

ابن تيمية

وەرگێرانی

نوری هەمەوەند

بەرگی دووەم

نارين

بسم الله الرحمن الرحيم



تأليف

# الفرقان

## بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان

مافی له چاپدانی پارێزراوه بۆ
نارین

نـــاوی کتێـــــــب: الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان به کوردی.

نووسیـــنــــــی: ابن تيمية.

وەرگێڕانـــــــی: نوری هەمەوەند.

نـەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین(کامران رفیق).

نورەو ســـالی چـــاپ: چاپی یەکەم، سالی ٢٠١٦ .

نـــــــــــرخ: ٢٥٠٠٠ د.ع .

ژمـــــارەی سپـــاردن: (٧٦١) ی سالی (٢٠١٥) ی پێدراوه.

---

نارینگای چاپ و پەخشی
نارین

هەولێر/ بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
Website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
تەلەفۆن:٦٦٢٥١١٩٨٢(٠٠٩٦٤)

مۆبایل:٠٠٩٦٤٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# الفرقان

# بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان

## به كوردى

بەرگی دووەم

نووسینی

ابن تيمية

وەرگێڕانی

نوری هەمەوەند

ناريـن

## بەشێك

## سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەران( علیهم الصلاة والسلام ) لەو ئەولیاو دۆستان چاکترن کە پێغەمبەر نین

پێشینان و پێشەوایانی ئوممەت و سەراپای دۆستانی خوای گەورە لەسەر ئەوە رێکەوتوون کە پێغەمبەران لەو ئەولیاو دۆستان چاکترن کە پێغەمبەر نین(١)

-----------------------------------------------

(١)_ موسوڵمانان لە پێشینانی چاك و پێشەوایان و سەراپای ئەهلی سووننەت لەسەر ئەوە رێككەوتون کە چاکترین ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە پێغەمبەرانن، وە پێغەمبەرایش لەو ئەولیایانە چاکترن کە پێغەمبەر نین، بۆیە هیچ کەسێك هەر پێگەیەکی هەبێ لەگەڵ پێغەمبەراندا بەراورد ناکرێ ، بە پلەی پێغەمبەران ناگات لە لای خوای گەورە، چونکە هیچ فەزیلەت و چاکەکاریەك لەگەڵ پێغەمبەرایەتیدا یەکسان نابێت، پاش پێغەمبەرانیش (الصِّدِّيقون)ن: کە بریتین لەو کەسانەی کە زۆر ڕاستگۆن و هیچ درۆیەکیان لێوە نابیسترێت _ لەو بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا يَزَالُ الْعَبْدُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى صِدِّيقًا )) واتە: ((بەردەوام بەندە ڕاستگۆ دەبێت و بەدوای ڕاستێتیدا دەگەڕێت، تا بەلای خواوە بەڕاستگۆ دەنوسرێت))، کەوا بوو (الصِّدِّيق) کەسێکی زۆر ڕاستگۆیەو، قسەی ڕاست دەڵێت و بەدوای ڕاستێتیدا دەگەڕێت، لە هەموو بوارێکدا لەوە دا کە دەیلێت، لەوە دا کە دەیبیستێت، بە گشتی بە دوایدا دەگەڕێت، هەواڵی هیچ شتێکیش نادا بە کەس نادات مەگەر ئەو شتانەی کە بە ڕاستی بینیویەتی، ئەو حەزی بەوەیە بەردەوام لەگەڵ خوای گەورەداو پاشانیش لە گەڵ خەڵکیشدا ڕاستگۆ بێت، پاش ئەوانیش شەهیدانن، پاش ئەوانیش باقی ئیماندارانن، وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا﴾[النساء: ٦٩] واتە: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا و

---

پێغەمبەر بكات جا ئەوانە لە گەڵ كەسانێكن كە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاكان وە ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێكی چاكن. ئا ئەمەیە پلەكانی ئەهلی فەزڵ و چاكە كارانی ئەم ئوممەتە: پێغەمبەران، ڕاسگۆیان، شەهیدان، پیاو چاكان. بەڵام بەلای صۆفیەكانەوە دۆستان دابەش دەبێت بۆ كۆتاهەمینی دۆستان و ...هتد، بە لای ئەوانەوە چاكترینی دۆستان كۆتاهەمینیانە كە لە باقی دۆستان چاكترە، هەندێكیشیان زێدەڕۆیی دەكەن و دەڵێن: ئەولیاو دۆستان لە پێغەمبەران چاكترن، كۆتاهەمینی ئەولیاو دۆستان لە كۆتاهەمینی پێغەمبەران چاكترە، ئا ئەمەیە ڕێبازی صۆفیەكان كە زێدەڕۆیی لە ئەولیاو دۆستاندا دەكەن و پێشی پێغەمبەرانیان دەخەن و، شاعیرێكیان گوتویەتی:

مَقَامُ النُّبُوَّةِ فِي بَرْزَخٍ فُوَيْقَ الرَّسُولِ وَدُونَ الْوَلِي

واتە: جێگەو پلەی نوبوەت لە شوێنێكدایە كەمێك لە ڕەسول بەرزترەو لە خوارەوەی وەلی كەوا بوو بە لای ئەوانەوە جێگە و پلەی وەلی و دۆست لە جێگە و پلەی پێغەمبەر(الرسول) گەورەترە، ئەمەش گەورەترین گومڕاییە، ئەوان دەیڵێن: وەلی شتەكان لەو سەرچاوە بنەڕەتیەوە وەردەگرێت كە پێغەمبەر لێوەی وەردەگرێ، بۆیە وەلی پەسەندتر دەكەن، دەڵێن: پێغەمبەر لەڕێگەی فریشتەكەوە شت وەردەگرێت، بەڵام وەلی ڕاستەوخۆ و بە بێ هیچ واسیتەو نێوەندكارێك شت لە خوای گەورەوە وەردەگرێت، بۆیە بانگەشەی ئەوە بۆ وەلیەكانیان دەكەن كە لەگەڵ خوای گەورەدا دادەنیشن و، خوای گەورە ڕاستەوخۆ زانستیان پێ دەبەخشێت، هۆكاری هەر هەموو ئەمانەش بۆ گومڕایی و شوێنكەوتنی شەیتان و پشت هەڵكردن لە قورئان و سوننەت دەگەڕێتەوە.

خوای گەورە بەندەکانی خۆی ئەوانەی بەهرەی خۆی بەسەردا ڕشتوون بۆ چوار پلە ڕیز بەند دەکات و، لەو بارەوە دەفەرمویّ: ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُوْلَئِكَ رَفِيقًا﴾[1] [النساء: ٦٩] واتە: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان وە ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێکی چاکن .

فەرمایشتی پێغەمبەر خواش ﷺ هاتووە دەفەرمویّ: ((مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَلا غَرَبَتْ عَلَى أَحَدٍ بَعْدَ النَّبِيينَ والمرْسَلينَ أَفْضَل مِنْ أَبِي بَكْرٍ))[2] واتە: ((پاش پێغەمبەران تیشکی خۆر بەسەر یەکێکدا دەرنەکەوتوەو ئاوا نەبووە لە ئەبی بەکر چاکتر بێت)).

---

(١)_ ئەوانەی خوای گەورە بەهرەو نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتوون، چوارن: پێغەمبەران، ڕاستگۆیان، شەهیدان، پیاو چاکان، ئا ئەمانەن پێگەی ئیماندان بە لای خوای گەورەوە.

(٢)_ لم أقف عليه بهذا اللفظ.

والذي في الترمذي (٣٦٨٤)، من حديث أبي بكر مرفوعاً: ((ما طلعتِ الشمسُ على رجلٍ خيرٌ منْ عُمَرَ)) وإسناده ضعيف جداً. وضعفه الترمذي: وحكم عليه الشيخ ناصر بالوضع في (ضعيف الجامع ٥٠٩٩)، وانظر: ((الأحاديث الضعيفة)) (١٣٥٧).

بەڵێ، فەرموودەکە ئاماژە بۆ فەزیلەت و چاکێتی ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه دەکات و، پاش پێغەمبەران لە هەموو خەڵك بە چاکتری دادەنێت، بەڵام فەرموودەکە (ضَعف)ی تێدایە، بەڵام پێگە و فەزلی ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه لەچەندەها دەقی (صحیح)ی دیکەدا جێگیر بووە لەوانەش، یەکەم: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لا تَحْزَنْ﴾[التوبة: ٤٠] واتە: ئەگەر ئێوە یارمەتی ئەو

-------------------------------------------------------------------

-------------------------------------------------------------------

-------------------------------------------------------------------

(پێغەمبەرەﷺ) ئەدەن ئەوە بێگومان خوا یارمەتی داوە کاتێک بێ بڕوایان دەریان کرد لە مەککە پێغەمبەر یەکێک بوو لەو دوو کەسە کاتێک ئەو دووانە (پێغەمبەرو ئەبوبەکر) لە ئەشکەوتی (ثور)دا بوون ئەو کاتە بە هاوەڵەکەی دەگوت خەم مەخۆ. هاوەڵەکەشی ئەبوبەکر ﷺ بوو، دوو کەس بوون: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ بوو، کە لە کۆچ کردندا ڕەفیقی بوو، پاش بوون بە پێغەمبەر لە مەککەوە ڕەفیقی بوو تاوەکو ئەو ڕۆژەی مرد، دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی پێشەوا ئەبوبەکرەوە فەرموویەتی: ((لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلًا لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلًا )) واتە: ((ئەگەر شیاو بوایە خلیلیکم _ دۆست و برادەری ڕاستگۆی، بە ئەمەکی، گیانی بە گیانی _ هەڵبژاردیە بە دڵنیایی ئەبوبەکرم بە خەلیلی خۆم هەڵدەبژارد))، ئەمە ئاماژە بۆ فەزڵ و چاکێتی ئەو پیاوە دەکات، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت ئیمامی ئەبوبەکری ڕاسپارد بۆ ئەوەی نوێژ بە موسوڵمانان بکات، تەنانەت دایکان عائیشە _خوای لێ ڕازی بێت_ بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ ئەوەی فەرمان بەئیمامی عومەر ﷺ بکات، بەڵام تووڕە بوو، فەرمووی: فەرمان بە ئەبوبەکر بکەن بۆ ئەوەی نوێژ بە موسوڵمانان بکات، ئەمە ئاماژەیەکی بە هێزە بۆ فەزڵ و چاکێتی ئەبوبەکر، چونکە چاکێتیەکانی ئیمامی ئەبوبەکر زۆرن سێ یەم: ئەو چاکترینی خەڵکی خوایە پاش پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)، ئەمەش وەکو کەی لەو ئایەتە موبارەکە هاتووە کە دەفەرموێ: ﴿فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ﴾[النساء: ٦٩] جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوای گەورە بەهرەی خۆی بەسەریاندا ڕشتووە لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان، ئیمامی ئەبوبەکریش یەکێکە لە ڕاستگۆیان _ خوای لێ ڕازی بێت _ چوارەم: خوای گەورە ئەبوبەکری ﷺ بە(أولو الفضل) ناوبردووەو،

---

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾[النور: ٢٢] واتە: با سوێند نەخۆن ئەوانەتان کە خاوەن چاکەو سەروەت و سامانن کە یارمەتی نەدەن بەخزمان و هەژاران و کۆچەران لە پێناوی خوادا، شاهید قسەکانمان لە ئایەتەکە ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ﴾ با سوێند نەخۆن ئەوانەتان کە خاوەن چاکەن، مەبەستی ئیمامی ئەبوبەکرە ﷺ وە بە(أولو الفضل) ناوزەندی کردووە، ئەمەش وەسفێکە کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا بۆ ئەو پیاوە بەڕێزەی دەکات، پێنجەم: ئەوەت بەس کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردو، زۆرێك لە عەرەب هەڵگەڕانەوە، چ کەسایەتیەك بەرامبەر بە هەڵگەڕاوەکان وەستایەوە؟ ئەبوبەکر بوو ﷺ، ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ مرد، هەوەڵان تووشی کارەساتێك بوون کە هاوسەنگی خۆیانیان لە دەستدا، جگە لە ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ کە بەهۆی بەهێزی ئیمانەکەیەوە وەکو شاخ و کێوەکان جێگیر بوو، هەواڵی مردنی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدان، فەرمووی: ((ئەوەی موحەممەدی دەپەرست ئەوا موحەممەد وەفاتی کرد، هەر کەسیش خوای گەورە دەپەرستێت زیندوەو نامرێ))، لەو کارەساتەدا وەکو شاخ و کێوەکان جێگیر بوو، ئەمانە چەندین هەڵویستی ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ بوون، خۆی بۆ خۆی بۆ فەزڵ و چاکێتی ئەو پیاوە گەورەیە دەگەڕێتەوە ، بۆیە هاوەڵانی دیکە ﷺ دانیان بەو فەزڵ و چاکێتیەدا دەنا، پێشیان دەخست.

## فەزڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەکەی

چاکترینی ئوممەتان ئوممەتی موحەممەدە ﷺ [1] لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾[آل عمران: ١١٠] واتە: ئێوە (موسڵمانان) باشترین گەلێك بوون بۆ خەڵكی هێنرابێتە دی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾[2] [فاطر: ٣٢] واتە: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ﴾ لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بەکەسانێ ﴿اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمانبژاردن .

---

(١)_ چاکترینی ئومەتان ئوممەتی موحەممەد ﷺ، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ [آل عمران:١١٠.] واتە: ئێوە (موسڵمانان) باشترین ئوممەتێك بوون بۆ خەڵکی هێنرا بێتە دی فەرماندەدەن بەچاکە وە جڵەوگیری دەکەن لە خراپە. لەم ئایەتەدا خوای گەورە بە چاکترینی ئوممەتان وەسفی کردوون کە بۆ خەڵك و مرۆڤایەتی هێنرابێتە دی لە نێو پێشینان و پاشیناندا، چاکترینی خەڵکانی ئەم ئوممەتەش هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوابوون ﷺ، چاکترینی هەر هەموو هاوەڵانیش ئیمامی ئەبوبەکرە رضي الله عنه، پاشان باقی جێنشینانی تری پێغەمبەری خوا ﷺ و، پاشانیش ئەو هاوەڵەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە.

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ﴾ واتە قورئان ﴿الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ ئەم ئایەتە فەزڵی ئەو ئوممەتەی تێدایە بەوەی کە خوا هەڵیبژاردوو، ئەم قورئانەی پێبەخشین، کەوا بوو ئەم ئوممەتە ئوممەتێکی هەڵبژێردراوە لە لایەن خوای گەورەوە، ئەمەش ئاماژەیەکی گەورەیە بۆ فەزڵ و چاکێتی ئەم ئوممەتە.

وقال النبي ﷺ في الحديث الذي في المسند: ((أَنْتُمْ تُوَفُّونَ سَبْعِينَ أُمَّةً أَنْتُمْ خَيْرُهَا وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللَّهِ))[1] حسن: أخرجه الترمذي (٣٠٠١)، وابن ماجة (٤٢٨٧)، (٤٢٨٨)، وأحمد (٣/٥، ٥). **واته پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێوە حەفتا ئوممەت تەواو دەکەن ئێوە لە هەر هەموویان خێردار تر و بەرێزترن بە لای خوای گەورەوە)).**

**چاکترینی ئوممەتی موحەممەدیش ﷺ بریتین لە: سەدەی یەکەم**[2] وقد ثبت عن النبي ﷺ من غير وجه أنه قال: ((خَيْرُ القُرُون القَرْنُ الَّذِي بُعِثْتُ فِيهِمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)) متفق عليه . **واتە: ((چاکترین سەدەکان ئەو سەدەیە کە منیان لە نێواندا نێردرا، پاشان ئەوانەی بە دوایاند دێن و، پاشانیش ئەوانەی بە دوایاندا دێن)).**

---

**(١)_ فەرموودەکە ئاماژە بۆ فەزڵ و چاکێتی ئەو ئوممەتە دەکات، ئەوەش لە ڕۆژی قیامەتدا بەدەر دەکەوێت کاتێک هەموو ئوممەتان کۆدەبنەوە، حەفتا ئوممەت، ئەو ئوممەتە لە هەموو ئوممەتانی تر خێردارترو بەرێز تر دەبن بە لای خوای گەورەوە.**

**(٢)_ چاکترینی ئوممەتی موحەممەد ﷺ بریتیە لە سەدەی یەکەم کە هاوەڵانی بەرێزی تێدا ژیاون ﷿ کە پێغەمبەری خوایان ﷺ لە نێودا نێردراوە، هاوەڵێتیان کردوەو، لێوەی فێر بوونەو، جیهادیان لە پاڵدا کردووە، پاشی ئەوانیش سەدەی دووەمە کە تابعینی تێدا ژیاون و لەسەر دەستی هاوەڵانی بەرێزەوە فێر بوون، پاشانیش شوێنکەوتوانی تابعینە کە لەسەر دەستی تابعینەکانەوە فێر بوون، ئەمانە چاکترین ئەو سەدانەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیانەوە فەرموویەتی:** ((خَيْرُ القُرُون القَرْنُ الَّذِي بُعِثْتُ فِيهِمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)) **واتە: ((چاکترین سەدەکان ئەو سەدەیە کە منیان لەنێواندا نێردرا، پاشان ئەوانەی کە بە دوایاند دێن و پاشانیش ئەوانەی کە بە دوایاندا دێن)). شاهێدی دانی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ سەدە چاکەکانی ئەم ئوممەتە.**

هەر لە بارەی فەزڵ و گەورەیی و ئوممەتە پێغەمبەری خواﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: ((لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٣٦٧٣)، ومسلم (٢٥٤١). واتە: ((جەنێو بە هاوەڵانم مەدەن، سوێندم بەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە، گەر یەکێ لەئێوە بەئەندازەی کێوی ئوحد زێڕ ببەخشێت، بەمشتی یەکێك لەوان و، بەنیوەی مشتی ئەوانیش ناگات)).

پێشکەوتووانی یەکەمی کۆچکردوان و پشتیوانان: لە تێکڕای هاوەڵان چاکترن[2].

---

(١)_ فەرموودەکە فەزڵ و چاکێتی هاوەڵانی بەڕێزی تێدایە، کە لە سووکایەتی پێکردن و گاڵتە پێکردن و جوێن پێدانیان ڕێگریی دەکات، دەفەرموێ: ((لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي)) جوێن بە هاوەڵانم مەدەن، ئەمە بۆ ئەوان ڕێز لێنانە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی خۆی ناوی بردوون، لە جوێنپێدانیان ڕێگری کردووە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەزڵ و چاکێتی ئەوانی ڕوون کردۆتەو، فەرموویەتی: ((گەر یەکێك لەئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت)) لە پێناوی خودا ((بە مشتی یەکێك لەوان و، بە نیوەی مشتی ئەوانیش ناگات)).

(٢)_ بەڵێ، پێشکەوتووانی یەکەم لە تێکڕای هاوەڵانی تر چاکترن، پێشکەوتوانی یەکەم بریتین لەوانەی پێش (فتحی مەککە) ڕزگار کردن موسڵمان بوون، ئەمانە پێشکەوتوانی یەکەمن، ئەمان لەوانە چاکترن کە پاش (فتح مكة) ڕزگار کردنی مەککە موسڵمان بوون، مەبەست بە(فتحی مککە) ڕزگار کردنی مەککە ڕێککەوتنامەی حودەیبیەیە بۆ؟ چونکە ڕێککەوتنامەی حودەیبیە پێشەکی (فتحی مککە)ڕزگارکردنی مەککە بوو، خوای گەورە بە(فتحی مککە) ناوی بردووە، لەو بارەشەوە سوڕەتێکی دابەزاندووە ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا﴾[الفتح: ١] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێدایت (کە ڕێککەوتنی حودەیبیەیە). بەڵام بۆ خودی (فتحی مککە) ڕزگار کردنی مەککە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾[النصر: ١] واتە: کاتێك کە یارمەتی و کۆمەکی خوا هات لەگەڵ سەرکەوتن (مەککە ئازاد کرا).

لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُوْلَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى﴾(1) [الحديد: ١٠]

واتە: یەکسان نین ئەوانەتان کە لە پێش گرتنی (مەککە)دا ماڵیان بەخشیوو جەنگاون (لەگەڵ ئەوانەی لەدوای فەتح ئەو کارانە بکەن) ئەوانە پلە و پایەیان زۆر گەورەترە لەوانەی کە لە دوای (گرتنی مەککە) ماڵیان بەخشیوە و جەنگاون ﴿وَكُلا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى﴾ وە خوا بەڵێنی بەهەشتی داوە بە هەر دوو لا.

لە ئایەتێکی دیکە دا هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ﴾(2) [التوبة: ١٠٠]

واتە: وە پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکردووان و یاریدەدەران ئەوانەش زۆر بەچاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردوەو شوێنیان کەوتوون ﴿خوا لێیان ڕازییە ئەوانیش لە خوا ڕازین.

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكُلا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى﴾ خوای گەورە بەڵێنی بە بەهەشتی دا بە هەر دوولا، ئەوانەی پێش ڕزگارکردنی مەککە موسڵمان بوون و، ئەوانەش کە پاش ڕزگارکردن موسڵمان بوون، بەڵام ئەوانەی کە پێش ڕزگارکردن موسڵمان بوون چاکترن، کەوا بوو ئیسلام ئایینی دادەپەروەریەو هەر کەسێك لە پلەو مەنزیلەتی خۆیدا دادەنێت.

(٢)_ ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ﴾ پێشکەوتووە یەکەمینەکانی کۆچکردوان و پشتیوانان ئەوانەن کە پێش ڕزگارکردنی مەککە موسڵمان بوون، ﴿وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ﴾ هەروەها ئەوانەش کە زۆر بەچاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردوەو، شوێنیان کەوتوون، بەڵام ئەوانەی خۆیان دەدەنە پاڵ ئەوان، لەکاتێکدا بە چاکی شوێنیان نەکەوتوون، ئەو فەزڵ و چاکەیەیان دەستگیر نابێت. کەسانێکی زۆر

---------------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------------

هەن خۆیان دەدەنە پاڵ پێشینی چاك لە كاتێكدا ڕێڕە و ڕێبازی پێشینی چاك نازانێت، تەنانەت شتانێكیش بەپێشینی چاكەوە دەلكێنێت كە لە دوور و نزیكەوە پەیوەندی بەڕێڕەو ڕێبازی پێشینی چاكەوە نییە، وەكو: زێدەڕۆیی و، دەرچوون لە فەرمانی كارە بەدەستان و ...هتد، ئەو جۆرە كەسانە بە چاكی شوێنی ڕێبازو ڕێباوەڕی پێشینی چاك نەكەوتوون، بەڵكو ئەو كەسانە بە چاكی شوێنكەوتووی ڕێبازو ڕێباوەڕی پێشینی چاكن كە بەباشی ناسیویانە، بەبێ هیچ زێدەڕۆیی و بەبێ نەرمی نواندنێك، ئائەمانە چاكەكارانن، كە بەبێ زێدەڕۆیی، بەبێ نەرمونیانی نواندن، بەبێ فەوتاندن پەیڕەوی پێشینی چاك دەكەن، مەرج نییە هەر كەسێك بڵێت: من شوێنكەوتووی ڕێبازی پێشینی چاكم ئیتر ڕاست و دروست بێت تاوەكو یەكەم جار بەباشی تێیدەگات، دووەمیش لەسەر ئەو ڕێبازە بەڕێو چێت، سێیەمیش زێدەڕۆیی و نەرمی تێدا نەنوێنێت، ئائەمەیە ئەو كەسەی كە بە چاكی شوێنی ڕێبازی پێشینی چاك كەوتووە.

پێشکەوتووە یەکەمینەکان: ئەوانەن کە پێش (فَتحْ) ماڵیان بەخشیوەو جەنگاون، مەبەست بەو (فَتحْ)ەش: ڕێککەوتنی حودەیبییەیە، چونکە سەرەتای ڕزگار کردنی مەککە بوو[١] لەو بارەیەوە خوای گەورە سورەتێکی دابەزاند ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا (١) لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾[الفتح: ١_٢]، فقالوا: يا فقالوا رسول الله، أَو فتح هو ؟ قال: ((نعم))[٢] صحيح: وقد تقدم، والقائل عُمر، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێدایت (کە ڕێککەوتنی حودەیبییەیە) تا خوا خۆش ببێت لە گوناهەکانی ڕابردوو داهاتووت. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا ئەوە (فَتحْ)ە ڕزگارکردنە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)).

---

(١)_ بەڵێ، ڕێککەوتنی حودەیبییە سەرەتایەك بوو بۆ ڕزگارکردنی مەککە، ڕێککەوتنی حودەیبیە پێشەکیەك بوو بۆ ڕزگارکردنی مەککە، لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بەسترا، پاش ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ غەزا خەیبەری کرد کە خوای گەورە سەرکەوتنی پێبەخشی و پاشان ساڵی هەشتەم خوای گەورە مەککەی بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ ڕزگار کرد، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ (١) وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجاً (٢) فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً(٣)﴾[النصر: ١_٣] واتە: کاتێك کە یارمەتی و کۆمەکی خوا هات لەگەڵ سەرکەوتن (مەککە ئازادکرا) وە خەڵکت دیی کە پۆل پۆل دێنە ناو ئاینی خواوە ئەوسا ئیتر پەروەردگارت بە پاك ڕا بگرە بەهۆی ستایشی یەوە وە داوای لێ بوردنی لێ بکە چونکە بێگومان ئەو زۆر گیراکەریی پەشیمانی یە. لەو ساڵەدا چەندەها شاند لەهۆزەکانەوە دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیسلام بوونی خۆیان ڕا دەگەیاند، پاش ڕزگار کردنی مەککە.

(٢)_ ئەگەر چی ڕێککەوتنی حودەیبیە بە لای هەندێك لە هاوەڵانەوە یان بە لای زۆربەی هاوەڵانەوە لەبەرژەوەندی موسڵمانان نەبوو، بەڵکو کەسانێکی زۆر لێی بێزار

---

بوون وەکو پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب ﷛ و هاوەڵانی تریش، لێی بێزار بوون و وایان بە دیدەکرد کە ڕێکەوتنی حودەیبیە بۆ موسڵمانان جۆرە ستەمیکی تێدایەو، بۆ کافرانیش هێزو توانایی تێدایە، بەڵام واقیع پێچەوانەی ئەوەبوو، ڕێککەوتنەکە بوو بە (فَتْحْ)ێك بۆ موسڵمانان، بە لای زۆرێك لە هاوەڵانەوە ڕێککەوتنەکە بۆ کافران سەرکەوتنێك بوو بەڵام حەقیقەت بە پێچەوانەوە بوو، سەر شۆڕیی بوو بۆ کافران و سەرکەوتن بوو بۆ موسڵمانان، چونکە جەنگ هێور بویەوە، زاڵبونی کافران بەسەر هۆزەکانەوە نەما، ئیتر هەر کەسێك ویستی موسڵمانبوونی بوایە موسڵمان دەبوو و، نە دەترسا، ئەوەی ویستی کۆچکردنی بوایە کۆچی دەکرد، لە مەککەوە زۆر بە بێ ئەزیەت بۆ مەدینە کۆچیان دەکرد، بەڵام پێشتر بە نهێنی بوو، بە مەترسیەوە ئەوانەیان دەکرد، لە هەمان کاتیشدا بوبە سەرەتایەك بۆ ڕزگار کردنی مەککە.

وە چاکترین پێشینە یەکەمینەکانیش بریتین لە: چوار جێنشینەکە[1]، چاکترینی ئەوانیش ئەبوبکرە، پاشان عومەرە[2] لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان بە چاکەو، پێشەوایانی ئوممەت و، جەماوەریشەوە زانراو ئەمەیە[3]

---

(١)_ چاکترین پێشینە یەکەمینەکانیش بریتین لە چوار جێنشینەکە، پاشان باقی ئەوانەی مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، پاشان کۆچکردووان، پاشانیش پشتیوانان، هاوەڵانی بەشدار بووی جەنگی بەدرو ئەهلی (بيعة الرضوان) هەموویان خاوەن فەزڵ و چاکەن، ئەی ئەو هاوەڵانەی کە هەر هەموو ئەو فەزڵ و چاکانەیان تێدا کۆبۆتەوە، وەکو پێشکەوتن لە موسڵمان بووندا، بەشداریکردنی جەنگی بەدر، کۆچکردن لە پێناوی خوادا، بەشداربوون لە ڕزگارکردنی مەککەدا بەشدار بوون لە هەر هەموو غەزاکاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەبێ خاوەن چ فەزڵ و چاکەیەك بن؟!.

(٢)_ لە نێوان ئەهلی سوننەتدا جیاوازی نییە کە چاکترینی هاوەڵان بەڵکو چاکترینی ئوممەت ئەبوبەکرە، پاشان عومەرە ﵄، لەم بارەوە هیچ کەسێك لە ئەهلی سوننەت ناکۆکیی دروست ناکات، بەڵام لە بارەی سێیەم کەسەوە جیاواز بوون ئایا عوسمانە یان عەلیە ﵄، بیروڕای بەهێزتر و پەسەند تریش ئیمامی عوسمانە ﵁، چونکە هاوەڵان عوسمانیان هەڵبژارد تەنانەت ئیمامی عەلیش ئیمامی عوسمانی هەڵبژارد، تەنانەت ئەهلی شوراش ئەویان پەسەند کرد، هەڵیان بژارد چونکە چاکترین کەسە پاش ئەبوبەکرو عومەر ﵄.

(٣)_ لەم بارەوە هیچ کەسێك ڕایەکی جیاوازتری نییە مەگەر ئەهلی گومڕایی و کەسانی تری جگە لەوان.

چەندین بەڵگەش هەن ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن و، لەكتێبی ((منهاج السنة النبوية في نقض كلام أهل الشيعة و القدرية))[1] بە درێژی باسمان كردووە .

بە گشتی هەر هەموو تایەفەكانی سوونننە و شیعە یەكهەڵوێستن: لەسەر ئەوەی چاكترینی ئەم ئوممەتە پاش پێغەمبەرەكەی ﷺ یەكێكە لەجێنشینەكان[2]، بەڵام هیچ كەسێكیش لەپاش هاوەڵان لە هەر هەموو هاوەڵان چاكتر نابێت[3].

---

(١)_ لە كتێبی (المنهاج)دا شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێبێ _ وەڵامی كتێبی (منهاج الكرامة في الإمامة)ی (الحلي) شیعی دەداتەوە، هەروەها كتێبەكەی شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێبێ _ بەناوی (منهاج الإعتدال في الرد على أهل الرفض و الأعتزال)یشەوە دەناسرێت، چونكە وەڵامدانەوەیە بۆ هەردوو كۆمەڵی شیعەو موعتەزیلە.

(٢)_ بەڵام شیعەكان دەڵێن: پاش پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی عەلی رضي الله عنه چاكترە، ئەهلی سووننەش دەڵێن: ئیمامی ئەبوبەكرە رضي الله عنه، هەردوكیشیان عەلی و ئەبوبەكریش رضي الله عنهما دوو جێنشینن لە چوار جێنشینەكە.

(٣)_ ئەمە یاسایە، هەرگیز پاش هاوەڵان هیچ كەسێكی تر لە هاوەڵان چاكتر نابێت، ئەگەر بە بەرزترین پلەكانی زانست و فەزڵیش بگات، هێشتا بە پلە و پایەی هاوەڵانی بەڕێز ناگات، چونكە هاوەڵان بە خەسڵەتی هاوەڵێتی پێغەمبەری خوا ﷺ جیادەكرێنەوە، ئەمەش پلەو پایەیەكە كەسانی دیكە ناتوانن بە دەستی بێنن، چونكە كەسانی تر ئەگەر چی فەزڵ و، زانست و، كار و كردەوەشیان هەبێت، بەڵام هاوەڵێتی پێغەمبەری خوایان ﷺ نییە، سەدەی هاوەڵانی بەڕێز لە هەموو سەدەكانی تر چاكترە.

چاكترین ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە: بریتین لەو کەسانەی گەورەترین زانستی یان هەیە دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی، وە گەورەترین کەسی شوێنکەوتووی پێغەمبەری خوان ﷺ(١) وەکو هاوەڵانی بەڕێز ئەوانەی تەواوترین و کاملترین کەسانی ئوممەتن سەبارەت بە زانین و شوێنکەوتنی ئایینەکەی، وە ئەبوبەکری صیددیقیش رضي الله عنه تەواوترین و کاملترین کەسی زانیارو کردارکارە بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی(٢)،

---

(١)_ چاکترین ئەولیاو دۆستان بریتیە لەو کەسای گەورەترین زانستی یان هەیە دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی، وە گەورەترین کەسانی شوێنکەوتووی پێغەمبەری خواشە ﷺ، ئامەنن چاکترینی دۆستان، نەك ئەوەی صۆفیەکان دەیڵێن: گوایە چاکترین ئەولیاو دۆستان کۆتاهەمین ئەولیاو دۆستانە، هەندێکیشیان دەڵێن: کۆتاهەمین ئەولیا لە پێغەمبەران چاکترە.

(٢)_ تەنانەت لە حودەیبیەش کاتێ شتەکە بە لای هاوەڵانی بەڕێزەوە ئاڵۆز بوو، بە تایبەت ئیمامی عومەر رضي الله عنه چووە لای ئیمامی ئەبوبەکرو رضي الله عنه پێی فەرموو: بۆ لە ئایینەکەماندا زەلیلی بنوێنین. ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه فەرمووی: ئەی ئەو پێغەمبەری خوا ﷺ نییە ؟، ئیمامی عومەر رضي الله عنه فەرمووی: ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه پێی فەرموو: کەوا بوو ملکەچی بەو، سەرپێچی مەکە، ئەمە بوو هەڵوێستەکانی ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه لە ڕێککەوتنی حودەیبیە دا، هیچ گومان و ڕاڕایی و دودڵیەکی بۆ دروستنە بوو، هیچ ئاڵۆزبونێکی بۆ دروستنەبوو، ئەوەش بۆ بەهێزبوونی ئەو ئیمانەی دەگەڕێتەوە کە بڕوای وایە ئەمە پێغەمبەری خوایە ﷺو شیاونییە شتێك بکات فەرمانی خوای گەورەی لەسەر نەبێت، کەوا بوو هیچ ڕەخنەگرتن و ئاڵۆز بوونێك بوونی نابێت.

بۆیە ئەبوبەکر ﵁ چاکترین وەلی و دۆستی خوای گەورەیە[(١)]، چونکە ئوممەتی موحومەد ﷺ چاکترینی ئوممەتانن و، چاکترینی هەمووشیان هاوەڵە بەڕێزەکانی موحەممەدن ﷺ و، چاکترین هاوەڵانیش ئەبوبەکرە ﵁ .

---

(١)_ پێشەوا ئەبوبەکر ﵁ لە پێغەمبەری خوا ﷺ جیانە بووە، لەو کاتەوەی بۆبە پێغەمبەر تاوەکو مردنی، ماڵ و سامانی خۆی لە پێناوی خوادا بەخشی، هیچ شتێکی بۆ نەفسی خۆی پاشکەوت نەدەکرد، بەڵکو ماڵ و سامانەکەی خۆی و ئەوەشی لە شوێن و لایەنی ترەوە پێدەگەیشت هەر هەمووی لە پێناوی خوادا دەبەخشی، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ پێکەوە لە ئەشکەوتەکە دا بوون، پێکەوە کۆچیان کرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد کارەساتێك تووشی موسڵمانان بوو کە هەموویانی تووشی شۆك کرد، بەڵام ئیمامی ئەبوبەکر ﵁ جێگیر بوو و موسڵمانانیشی جێگیر کرد، وایلێکردن تەنها بەتەمای پاداشتی خوای گەورەبن و، خەمبار نەبن، جێگیری کردن، وتارێکی بۆ خوێندنەوە تا ئەو ئاستەی ئیمامی عومەریش ﵁ لەو هەڵوێستە سامناکەدا بە گوفتارەکانی قایل بوو، پاشان کاتێ عەرەب هەڵگەڕانەوە ئیمامی ئەبوبەکر جێگیر بوو تاوەکو خوای گەورە ئیسلامی بە تەواوی پێ جێگیر کرد، هاوەڵانی بەڕێز دەیان فەرموو: چۆن لەگەڵیاندا بجەنگێین لە کاتێکدا ئەوان شایەتومان دێنن، ئیمامی ئەبوبەکر ﵁ فەرمووی: سوێندم بەخوا دژی ئەو کەسانە دەجەنگم کە لە نێوان نوێژو زەکاتدا جیاوازی دەکەن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شایەتومان بێنن خوێن و ماڵیان لە من حەرام دەبێت مەگەر بە هەقی خۆی، زەکاتیش لەو هەقەیە، سوێندم بەخوا ئەگەر کاریلەیەکم نەدەنێ کە بە پێغەمبەری خوایان دابێت، لەسەر ئەوە لەگەڵیاندا دەجەنگم. پێشەوا

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------------

ئەبوبــەکر ﷺ پــاش وەفــاتی پێغەمبــەری خــوا ﷺ ئیســلامی ســەقامگیر کــرد، هەڵگەڕاوەکان و دوو ڕووەکانی تێکشکاند، خوای گەورە ئیمامی ئەبوبەکری کرد بە هۆکاری جێگیرکردنی ئیسلام، ئەمە چەندین هەڵوێستی گەورەبوون بە هاوشێوەی گەورەیی شاخە وەستاوەکان کە لەو ساتە سەخت و دژوارانەدا بەدەر لە ئەبوبەکر ﷺ کەسی تری تێدا جێگیر نەبوو، ئەمەش بۆ بەهێزیی ئیمان و، ڕاستگۆیی دڵنیا بوونی و ئارام گرتنی لەسەر مەینەت و کارەساتەکان دەگەڕێتەوە.

تایەفەیـەکی بەهەڵەداچـوو وایـان دەزانـی: کـە کۆتاهـەمینی ئـەولیا دەبێـت بـە چاکترینی ئەولیا[١]، چونکە شتەکەیان لەسەر کۆتاهەمینی پێغەمبـەران قیـاس کـرد[٢] هیچ شێخێکیش لە پێشکەوتوان دەربارەی کۆتاهـەمینی ئـەولیا قسـەی نـەکردووە[٣]، مەگەر موحەممەدی کوڕی عەلی ئەلحەکیم ولترمـذی[٤]

---

(١)_ کەسانێکیان دەڵێن: کۆتاهـەمینی ئـەولیا کـە لـەدوای هەموویانـەوە هـاتووە لەهەر هەموو ئەولیاکانی تر چاکترە، با لە پێشی ئەویشەوە هاتبن، ئەمەش گومڕاییـە، لەوەش سەختر ئەوەیە دەڵێن: کۆتاهەمینی ئەولیا لە پێغەمبـەران چـاکترە، بێگومـان قسەکەیان کوفرێکی ئاشکرایە _ پەنا بەخوا _.

(٢)_ دەڵێن: وەکو چۆن کۆتاهەمینی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ لە هەر هـەموو پێغەمبەرانی تر کە لە پێش خۆیەوە هاتوون چاکترە، ئاوەها کۆتاهەمینی ئەولیاش لە هەر هەموو ئەولیاکانی پێش خۆی چاکترە.

(٣)_ کۆتاهەمینی ئەولیا تازە داهێنراوە، خواپەرستان و، صۆفیەکان و، زاهیـدان لەو بارەوە قسەیان نەکردووە، بەڵکو تـەنها پاشـینانی ئـەهلی تەصـەوف لـەو بـارەوە قسەیان کردووەو، کێشەی کۆتاهەمینی ئەولیایان داهێناوە.

(٤)_ ئەلحەکیم ولترمـذی زانایەکە لە زاناکـان بـەڵام بیروڕایـەکی تەصـەوفی هەیـە، هەروەها فەلسەفەشی هەیەو، لە قسـە و مەسـتی ڕاسـتیش دور دەکەوێتـەوە، دانـەری کتێبی (نوادر الأصول في الحديث)ە، ئەو صۆفی و زاناشە بەڵام هەندێك لە فەلسەفە و لـە تەصەوفیشی تێکەڵ بووە، تا ئەو ئاستەی تانە لە فەزڵ و لە پلەو پایەشی دراوە، ئەو بووە کە مەسەلەی کۆتاهەمینی ئەولیای داهێنـاوە، بـۆ ئـەولیا کۆتاهـەمینێکی دانـاوە وەکو چۆن بۆ پێغەمبەران کۆتاهـەمینێك هەیـە کـە موحەممـەدە ﷺ و لـە هـەموویان چاکترە.

کە ئەو بەرهەمە کتێبێکی نەتەوەیە نە چەند شوێنێک هەڵەی تێدا کردووە، بۆیە ئایەتەیەت
بە پێشینانی هەر یەکێکیان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە خۆی کۆتاهەمینی ئەولیایە[٢]،
کەسێکیش ئەوتە بانگەشەی وا دەکات کە کۆتاهەمینی ئەولیا لە کۆتاهەمینی
پێغەمبەران چاکترە، لە پێش هەمووتی زانستی بە خوای گەورە (العیاذ بالله)

---

(٢)_ کاتێ ئەو پلەیە نوێنرایەوە (واتە: پلەی کۆتاهەمینی ئەولیا) ئیتر هەر یەکێک
لەوانەت و بانگەشەی وای دەکرد کە کۆتاهەمینی ئەولیایە، بنەڕەتی شتەکە پووچە،
بنەڕەتەکەی بەتاڵە، کەچی هەموو کەسێک هەڵدەستێت و، بانگەشەی ئەوە دەکات کە
کۆتاهەمینی ئەولیایە، بۆ ئەوەی ئەو فەزڵ و چاکە پووچە بەدەست بێنێت.

(٣)_ ئەولیا، چاکترینیان بریتییە لەو کەسەی کە لە هەمووان پارکارترو لە
خواترس ترە، لە هەمووانیش ئیمانی بە هێزتر بێت، وەک خوای گەورە دەفەرمووێ:
﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا
يَتَّقُونَ (٦٣)﴾ [يونس: ٦٢ _ ٦٣]، واتە: ئاگادار بن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لە
سەر نییە خەفەتیش ناخۆن، ئەوانەی باوەڕیان هێنا و هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە
خوا دەترسن. ئەو شتە نە بە پێشکەوتووانەوە تایبەت کراوە و نە بە پاشینانەوەشەوە
تایبەت کراوە، بەڵکو ئەوە فەزڵ و نیعمەتێکی خوای گەورەیە دەیبەخشێ بە هەر
کەسێک خۆی بیەوێت. ئەوەی ئەوان دەیڵێن گومڕاییەکی گەورەیە؛ بەڵکو کوفر کردنە
بە خوای گەورە _ داواکارین خوای گەورە بمان پارێزێت_ وە ئەو کەسەی ئەم
دەروازەیەی کردەوە تەنها ئەلحەکیم ولترمذی بوو.

(٣)_ چونکە دەڵێن: وەلی ڕاستەوخۆ لە خوای گەورەوە وەردەگرێت، بە
پێچەوانەی پێغەمبەرانەوە کە بە واسیتەو نێوەندکارێتی فریشتەوە وەردەگرن، بەڵام
ئەولیا لەگەڵ خوای گەورەدا دادەنیشن و، فێریان دەکات؛ ڕاستەوخۆ لە خواوە فێر
دەبن، تەماشاکەن گومڕا بوون مرۆڤی بە چ ئاستێک گەیاندووە.

وە پێغەمبەران لە ڕێگەی ئەولیاوە خواناسی و (العلم بالله) وەردەگرن[١] وەکو ئەوەی (إبن عربی) لە کتێبی (الفتوحات المکیة) و (الفصوص)دا[٢] بانگەشەی بۆ دەکات، ئەوە بوو پێچەوانەی شەرع و عەقڵ بویەوە لەگەڵ موخالەفەکردنی هەر هەموو پێغەمبەران و ئەولیاکانی خوای گەورەدا[٣]

---

(١)_ تا ئەو ئاستەی دەڵێن پێغەمبەران زانیاری بە خوا لە ڕێگەی کۆتاهەمینی ئەولیاوە وەردەگرن، بۆچی؟ چونکە کۆتاهەمینی ئەولیا ڕاستەوخۆ لەخوای گەورەوە وەردەگرێت و، پێغەمبەرانیش لەوانەوە سوود وەردەگرن.

(٢)_ إبن عربی کە گومڕایی و کوفر بیرو باوەڕی (وحدة الوجود)ی بۆ دروستکرد، بیروباوەڕی (وحدة الوجود)ی بڵاودەکردەوە _ پەنا بەخوا _و دەیگوت: مەخلوق و خالق نییە، بەڵکو هەموو بوون و ووجود بریتیە لەخوا، دەیگوت: ئەو کەسەی بڵێت: خالق و مەخلوق هەیە موشریك و هاوەڵپەرستە، گومڕایی بەو ئاستەی گەیاند، دەیگوت: ووجود بە تێکڕایی بریتیە لەخوا، هیچ دابەشبونێك لە نێوان خالق و مەخلوقدا نییە.

(٣)_ قسەیەکی کرد کە هیچ کەسێك لە کاتی خۆی و ئێستاش نایڵێت: دەیگوت: ئەولیا شێخی پێغەمبەرانن و، پێغەمبەران لەئەوانەوە وەردەگرن.

ئەو کەسەی ئایەتەکەی خوای گەورەی بەو جۆرە خوێندەوە: (فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن تَحْتِهِمْ) پێی گوترا: (لا عقل ولا قرآن) واتە (نە عەقڵ و نە قورئان) ئاوەها ناڵێن[1].

چونکە لە ڕووی زەمەنەوە پێغەمبەران لە ئەولیای ئەم ئوممەتە پێشکەوتوترن، وە پێغەمبەرانیش _ عليهم أفضل الصلاة والسلام _ لەئەولیا چاکترن، ئیتر چۆن هەموو پێغەمبەران لە کۆتاهەمینی ئەولیاوە کاروباری خوا پەرستیان وەردەگرن؟

ئەوان لەو باوەڕەدان کە ئەولیاو دۆستان ناسینی خوا (معرفة الله) تەنها لەوەی کە لە پاش خۆیانەوە دێت وەرەگرە، وا ڕادەگەیەنێت خوا ناسینی لە کۆتاهەمینی ئەولیاو دۆستان بە دەست دێنن[2]

---

(١)_ دەگوترێت کەسێك ئەو ئایەتەی خوای گەورەی ﴿فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ﴾[النحل: ٢٦] واتە: ئەوسا سەبانەکانیان لەسەریانەوە ڕوخا بەسەریاندا. بەم جۆرە خوێندەوە: (فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن تَحْتِهِمْ) واتە: سەربانەکانیان لە ژێریانەوە ڕوخا بەسەریاندا، ژنێکی دەشتەکیش گوێبیستی خوێندنەوەکەی بوو، پێی گوت: باش تەماشای قورئان بکە، سەربان لەسەرەوەیە نەك لە ژێرەوە، هەرگیز سەربان لە ژێرەوە نەبووە، بۆیە پێی گوت: (لا عقل ولا قرآن) واتە (نەقورئان نە و عەقڵیش ئاوەها ناڵێن)، چونکە قورئان بەو جۆرە نییەو، پیاوەکەش ئەو عەقڵەی نەبوو بیر بکاتەوە کە سەربان لە سەرەوەیە نەك لە ژێرەوە، ئیبن و عەرەبیش وەکو ئەو پیاوە قسەی کردووە، کاتێ دەڵێت: پێغەمبەران لە ئەولیاوە شت وەردەگرن، واتە: کەسی لە کەسێکی پلە نزمتر لە خۆی دین وەر دەگەنێت.

(٢)_ چۆن ئەولیاکان ناسی خوا لەو کەسانەوە وەردەگرن کە لە پاش خۆیانەوە دێن، ئایا دەگونجێ پێشینەکان ناسینی خوا پاش خۆیانەوە بە چەند بە سەدەو زەمەنێکەوە وەرگرێن، کەسی عاقڵ ئەمە ناڵێت؟

بەڵام کۆتاهەمینی ئەولیا لە هەموویان چاکتر نییە[1] وەك کۆتاهەمینی پێغەمبەران کە لە هەموویان چاکترە[2]، چونکە فەزڵ و چاکێتی موحەممەد ﷺ بەسەر تێکڕای پێغەمبەراندا بە چەندین دەق جێگیر بووە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن بەڵام هەسەری کۆتاهەمینی ئەولیا هیچ شتێکی بەسەر نەهاتووە، لەم بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ وَلا فَخْرَ))[3] صحيح: أخرجه مسلم (٢٢٧٨) واتە: ((من گەورەی هەموو نەوەی ئادەمم بەبێ شانازیی)) .

---

(١)_ ئەم مەسەلە جێگەی تێڕوانینە، چونکە کۆتاهەمینی ئەولیاو دۆستان _ گریمانی ئەگەر هەبێ _ ئەگەر چی تەنها بۆچونەو حەقیقیش نییە، لەوانەی پێش خۆی چاکتر نییە، بەڵکو پێشکەوتوان لە ئەو چاکترن.

(٢)_ ئەمە قیاسێکی پووچە، چونکە دەڵێن: کۆتاهەمینی ئەولیاو دۆستان لە هەموویان چاکترە وەکو چۆن کۆتاهەمینی پێغەمبەران کە موحەممەدە ﷺ لە هەموویان چاکترە، ئەمە قیاسێکی باتڵ و پووچە، لە نێوان وەلی و پێغەمبەردا جیاوازی هەیە، جیاوازیەکی زۆر لە نێوان وەلی و پێغەمبەردا بەدیدەکرێت.

(٣)_ پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ((أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ)) مەبەستی هەرهەموو نەوەکانی ئادەمە تەنانەت پێغەمبەرانیش _ عليهم الصلاة والسلام _، پاشان فەرموویەتی: ((وَلا فَخْرَ)) واتە کاتێ باسی ئەوەی بۆ کردوین بۆ شانازیکردن نەبووە، بەڵکو تەنها مەبەستی ئەوەبوو باسی ئەو بەهرەو نیعمەتانەمان بۆ بکات کە خوای گەورە پێی بەخشیووە.

**هـەروەها فـەرموویـەتی:** ((آتِي بابَ الجَنَّةِ، فَأَسْتَفْتِحُ، فَيَقُولُ الخازِنُ: مَنْ أَنْتَ ؟ فَأَقُولُ: محمد، فَيَقُولُ: بَكَ أُمِرْتُ أَنْ لا أَفْتَحَ لِأَحَدٍ قَبْلَكَ))[1] صحيح: أخرجه مسلم (١٩٧)، من حديث أنس ﷺ عن النبي ﷺ. **واتە: ((دێمـە دەرگـای بەهەشـت و داوای کردنـەوەی دەکـەم، خـازنی بەهەشـت دەڵێـت: تـۆ کێـی؟ دەڵـێم: موحەممـەد، دەڵێـت: فـەرمانم پێکراوە بۆ تۆی بکەمەوەو بۆ هیچ کەسێکی پێش تۆی نەکەمەوە)).**

**لە شەوی میعراجدا خوای گەورە پلەی پێغەمبەری خوای ﷺ بەسەر هەر هـەموو پێغەمبەراندا بەرزکردەوە[2]،**

---

(١)_ فەرموودەکە ئاماژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ چاکترینی هـەموو خەڵکـە، چـونکە یەکـەم کەسـە داوای کردنـەوەی دەرگـای بەهەشـت دەکـات، تەنانەت ڕێگە بە خازنی بەهەشت نەدراوە بۆ هیچ کەسێکی تری پێش موحەممەد ﷺ دەرگای بەهەشت بکاتەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و چاکێتی پێغەمبەری خوا ﷺ کـە بەبەڵگـەکانی قورئـان و سـوونەت سـەلمێنراوە، بـەڵام بانگەشـەی صـۆفیەکان سەبارەت بە فەزڵ و چاکێتی کۆتاهەمینی ئەولیا هیچ بەڵگەیەکی لەسەرنییە.

(٢)_ بـەڵێ، تـاوەکو لـە میعراجەکـەدا حـەوت چـینی ئاسمـانی تێپەڕانـد، ئەمـە پلەیەکـە پێغەمبـەرانی پێشـتر پێـی نەگەشـتوون، بـە واتایـەکی تـر پێغەمبـەران لـە ئاسمانەکاندا بوون، کە بە هەر ئاسمانێك دەگەیشت بە لای ئـەو پێغەمبەرانـەدا تێپـەڕ دەبوو کە تیایدا بوون، تاوەکو هەر حەوت ئاسمانەکەی تێپەڕاند، ئیتر کەوتە سەرووی هەموو پێغەمبەرانی ترەوە.

بۆیە بوبە شایستەترین کەس بەو فەرمایشتەی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ ﴾[1] [البقرة: ٢٥٣] واتە: ئەو پێغەمبەرانەی (کە باسکران) ڕێزمان داوە بە هەندێکیان بەسەر هێندێکیاندا لەو پێغەمبەرانە هی وایان بووە کە خوا قسەی لە گەڵ کردووە (بەبێ پەردە) وە هەندێکیانی بەرزکردۆتەوە چەند پلەیەك.

وە چەندەها بەڵگەی تریش لەو بارەوە هەن.

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ ئەو پێغەمبەرانەی کە باس کران ڕێزمانداوە بە هەندێکیان بەسەر هێندێکیاندا، چونکە خوای گەورە ڕێزی هەندێ لە مەخلوقاتی خۆی بەسەر هەندێکی تریاندا دەدات، پێغەمبەران و غەیری ئەوانیش،﴿ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ ﴾ لەو پێغەمبەرانە هی وایان بووە خوای گەورە بەبێ پەردە قسەی لەگەڵ کردووە، کە بریتیە لە موسا پێغەمبەر _ عليه السلام _، ﴿ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ ﴾ وە هەندێکیانی بەرزکردۆتەوە چەند پلەیەك، موحەممەدی ﷺ بە چەندین پلە بەرزکردەوە. بەڵام وەکو پێشتریش ئاماژەی پێدرا لە ڕاستیدا کە باسی ئەمە دەکرێت تەنها بۆ ڕوونکردنەوەو سوپاس گوزاریی خوای گەورەیە، بۆ شانازی کردن و کەم کردنەوەی ڕێزی کەسانی تر باس ناکرێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا تُفاضِلوا بَيْنَ الأنبياءِ)) واتە: (( لە نێوان پێغەمبەراندا چاکە بەراورد مەکەن)) واتە چاکە بەراورد کردنێك کە بۆ شانازی کردن بێت، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا تُفَضِلونِي على يونس بنِ مَتَّى)) واتە: ((ڕێزی من بەسەر یونسی کوڕی مەتتای پێغەمبەردا مەدەن)) مەبەستی ڕێزدانی شانازی کردن بوو.

وه هەر یەکێك لـه پێغەمبـەران سروش و وەحیـان لـه لایـەن خـوای گـەورەوە بـۆ دێت[(١)] به تایبەت موحەممەد ﷺ کـه لـه پێغەمبەرایەتیەکەیـدا پێویستی بـه غـەیری خۆی نەبوو[(٢)] شەریعەتەکەی نه پێویستی به شەرعی پێشی خۆی و وه نـه بـه پاشـتر نییه[(٣)]، به پێچەوانەی غەیری خۆی،

---

(١)_ جیاوازی پێغەمبەران لەگەڵ کەسانی تردا بریتیه لەوەی کـه پێغەمبـەران لـه لایەن خوای گەورەوە سرووشیان بۆ دێـت، بـەڵام غـەیری پێغەمبـەران سرووشـیان بـۆ دانابەزێت، جگه لەپێغەمبەران بۆ هیچ کەسێکی دیکه سرووش دانابەزێت، پێغەمبەران چاکترین خەڵکی خوای گەورەن و، بـه وەرگرتنـی سرووشـی خـوای گـەورەوە تایبـەت کراون.

(٢)_ پێغەمبەران له بواری پێغەمبەرایەتیەکەیاندا پێویسـتیان بـه غـەیری خۆیـان نییه وەکو ئەوەی صۆفیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن و، دەڵێن: پێغەمبەران پێویستیان به کۆتاهـەمینی ئەولیایـەو، سـوودو کـەڵکی لـێ وەردەگـرن، لـه ڕاسـتیدا پێغەمبـەران پێویسـتیان بـه کەسـانی دیکـەی خـەڵك نییـە، چـونکه خـوای گـەوره بـه سروشـی دابـەزێنراوی سـەریان دەوڵەمەنـدی کـردوون، بـه تایبـەت موحەممـەد ﷺ کـه شەریعەتەکەی شەریعەتەکانی پێشتر نەسخ دەکاتەوەو لا دەبات، بـه هـەموو خـەڵکی سەر زەمین ئادەمیزادو جنۆکه فەرمانیداو تەنها شوێنی ئەو بکەون.

(٣)_ بـەڵێ، شـەریعەتی موحەممـەد ﷺ شـەریعەتەکانی پـێش خـۆی نەسـخ کـردووەو لا بـردووە، بۆیـه پێویسـتی بـه شـەریعەتی پێغەمبـەرانی پێشـتر نییـە، وه نەپێویستی بەپاشتریش دەبێت له لایەن کۆتاهەمینی ئەولیاوە، وەکو ئەوەی دەڵێن.

وەك ئەوەی مەسیح (علیه السلام) شوێن کەوتووانی خۆی لە زۆربەی شەریعەتدا بۆ تەوراتی دەگەڕاندنەوە(١)، وە سەبارەت بە شەریعەتی تەورات مەسیح هات و تەواوی کرد(٢)، بۆیە گاورەکان پێویستیان بە پێغەمبەرەکانی تری پێش لە مەسیح(علیه السلام) هەبوو: وەکو تەورات و، زەبورو، تەواوی بیست و چوار پێغەمبەرەکانی(٣)،

---

(١)_ مەسیح _ علیه السلام _ پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەران بەلاَم کتێبێکی شەریعەتی سەربەخۆی بۆ دانەزیوە، بەڵکو بەو تەوراتە حوکمی دەکرد کە خوای گەورە بۆ موسای دابەزاند بوو، بەلاَم تەنها هەندێ شتی لە تەورات نەسخ کردو لا برد، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾[آل عمران: ٥٠] واتە: وە هاتووم بۆ ئەوەی هێندێ لەو شتانەی کە قەدەغەکراوە لێتان حەلاَڵ بکەم. بەلاَم بە گشتی ئەو شوێنکەوتووی تەورات بوو کە خوای گەورە بۆ موسای دابەزاند بوو، وە هەر هەموو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بە تەورات حوکمیان دەکرد، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ﴾[المائدة: ٤٤] واتە: بێگومان ئێمە تەوراتمان نارده خوارەوە کە ڕێنموونیی و ڕووناکی تێدا بوو پێغەمبەران حوکمی پێدەکەن.

(٢)_ لە ڕاستیدا تەنها هەندێ شتی تەواوکاریی بۆ هێنا، بەلاَم بنەڕەتەکە هەر تەورات بوو.

(٣)_ بەڵێ، بەنی ئیسرائیل پێویستیان بە تەورات بوو کە بۆ موسا _ علیه السلام _ دابەزی، پێویستیان بەپێغەمبەرانی پێشتر هەبوو، بە پێچەوانەی موحەممەدەوە ﷺ کە خوای گەورە شەریعەتێکی سەرتاپاگیری پێبەخشی، چیتر پێویستی بەوانەی پێش خۆی نەبوو، وە پێویستی بەشەریعەتێکی دیکەش نییە کە لە پاش خۆی دابەزێت و، تەواوی بکات.

وه ئوممەتانی پێشمان پێویستیان بە(مُحَدَّث)گەلێك هەبوو، بە پێچەوانەی ئوممەتی موحەممەدەوە ﷺ كە تەنها ئەویان بەس بوو، بۆیە لەگەڵ ئەودا نەپێویستیان بە پێغەمبەرێكی ترو نەبە(مُحَدَّث)یش بوو[1]،

---

(١)_ بەڵی، ئوممەتی موحەممەد ﷺ خوای گەورە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە شەریعەتەكەی دەوڵەمەندی كردن، بۆیە نە پێویستیان بە پێغەمبەرانی پێشترەو نە پێویستیشیان بە(مُحَدَّث) هەبوو، چونكە شەریعەتەكەی لە هەموو ڕوویەكەوە تەواوە. بەواتایەكی تر تاوەكو ڕۆژی قیامەت پێویستیان بە هیچ پێغەمبەرێكی دیكە نییە، چونكە شەریعەتەكەی تەواوە گشتیەو سەرتاپای مرۆڤایەتی ئەو شەریعەتەیان بەسەو، چی تر پێویستیان بە پێغەمبەرێكی تر نابێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي)) واتە: ((مـن كۆتاهـەمینی پێغەمبـەرانم و هـیچ پێغەمبەرێكی ترم بە دوادا نایەت))، كەوا بوو پاش پێغەمبەری خوا ﷺ هەر كەسێك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بكات درۆزنەو كافرە بە دەقی قورئـان و سوننەت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾[الأحزاب: ٤٠] واتە: موحەممەد ﷺ باوكی هیچ یەك لە پیاوەكانتان نییە بەڵكو ئەو نێردراوی خواو كۆتاهەمینی پێغەمبەرانە. بەڵام ئەولیاو دۆستان كۆتاهەمینیان نییە، بەڵكو هەر كەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بوو، لە خوای گەورە ترساو تەقواكار بوو، ئەوە بێگومان وەلی و دۆستی خوای گەورەیە.

بەڵکو ئەوەندە فەزیڵەت و چاکەو، زانیاریی و، کردەوەی چاکەی بۆ کۆکردۆتەوە کە لە نێوان پێغەمبەرانی دیکەدا بڵاوی کرد بووە[(١)] ئیتر ئەو فەزڵەی خوای گەورە پێی بەخشی، بە تەنها لە خواوە بوو _ئەوەی کە بۆی دابەزاندو، بۆی نارد _ نەك لە ڕێگەی واسیتەو نێوەندکاریی مرۆڤەوە[(٢)].

---

(١)_ خوای گەورە ئەوەندە فەزیڵەت و چاکەو زانیاری و زانستی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کۆکردەوە کە لە نێوان پێغەمبەرانی پێشتردا بڵاوی کرد بوونەوە، شەریعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە مرۆڤایەتی لە هەر زەمەن و شوێنێکدا پێویستی پێی بێت، چونکە خوای گەورە شایەتی کامڵ بوون و تەواوی بۆ ئەم شەرعەداوەو، دەفەرموێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلامَ دِينًا﴾[المائدة: ٣] واتە: ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردوە بۆتان و چاکەو بەهرەی خۆم بە تەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئایینتان بێت. ئەوەش زانراوە کە شتی (کامڵ و تەواو) پێویستی بە غەیری خۆی نابێت، نە لە پێشتر و نە لە پاشتریشەوە.

(٢)_ ئەوەی خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی خۆی بەخشی، تەنها لە خواوە بوو، لە ڕێگەی واسیتەو نێوەندکاریی هیچ مرۆڤێکەوە نەبوو، لە ڕاستیدا ئەمە بەرپەرچدانەوەیەکە بۆ ئەوانەی دەڵێن: گوایە پێغەمبەران لە کۆتاهەمینی ئەولیاوە زانست و ناسینی خوا (العلم بالله) وەردەگرن، دەڵێن: پێویستیان بە کۆتاهەمینی ئەولیایە، چونکە کۆتاهەمینی ئەولیا ڕاستەوخۆ لە خوای گەورەوە وەردەگرێت.

ئەمە بە پێچەوانەی ئەولیاو دۆستانەوەیە، چونکە هەر یەکێك پەیامی موحەممەدی ﷺ پێگەیشت، نابێت بە وەلی و دۆستی خوای گەورە مەگەر بە شوێنکەوتن و پەیرەکردنی تەواوی موحەممەد ﷺ(١) وە پیاو چاکان هەموو ئەو ڕێنموونیی و، زانستی بەسوودو، ئایینی ڕاست و، کردەوە چاکانەی بە دەستی دێنێت تەنها بەهۆی واسیتەو نێوەندکاری موحەممەدەوەیە ﷺ(٢)

---

(١)_ پاش ناردنی موحەممەد ﷺ هیچ کەسێك بە وەلی و دۆستی خوای گەورە نابێت، مەگەر کەسێك بە تەواویی شوێنی بکەوێت و پەیرەوی بکات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[آل عمران: ٣١] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت کەواتە دوای من بکەون تا خواش ئێوەی خۆش بوێت وە لە گوناهەکانتان خۆش ببێت وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾[النور: ٥٤] واتە ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ بڵێ فەرمانبەرداری خواو فەرمانبەرداری پێغەمبەر ﷺ بن. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[آل عمران: ١٣٢] واتە: وە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بن بێگومان میهرەبانیتان لەگەڵ ئەکرێت.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾[الحشر: ٧] واتە: وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی دان وەریبگرن وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێبێنن.

(٢)_ هەموو ئەوەی ئیماندار بە دەستی دێنێت، دۆستی خوا بە دەستی دێنێت، لە ڕاستیدا بە هۆی واسیتەو نێوەندکاریی شوێنکەوتن موحەممەدەوەیە ﷺ، ئەوەش بە شوێنکەوتن و پەیرەوکردنی تەواوی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت، نەك وەکو ئەوەی ئەوان دەڵێن: موحەممەد ﷺ ناسینی خوا لە کۆتاهەمینی ئەولیاوە وەردەگرێت.

هەروەها ئەو کەسەی پەیامی پێغەمبەرێکی پێگەیشت، نابێت بە ولی و دۆستێکی خوا مەگەر بە تەواویی شوێنی ئەو پێغەمبەرە بکەوێت کە بۆی نێردراوە[1].

وە هەر کەسیش بانگەشەیەکی وا بکات کە لەو ئەولیاو دۆستانەی پەیامەکەی موحەممەدیان ﷺ پێگەیشتووە، کەسانێکیان تێدایە ڕێگەیەکی دیکەی هەیە بۆ گەیشتن بە خوا، پێویستی بە ڕێگەکەی موحەممەد ﷺ نابێت ئەوە کافرێکی مولحیدە[2]،

---

(١)_ هەروەها ئەولیاو دۆستانی پێش ناردنی موحەممەدیش ﷺ، لە ڕاستیدا بوونەتە ئەولیاو دۆست بە هۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەران(علیهم السلام) لە زەمەنی خۆیاندا، ئەوەی سەرپێچی پێغەمبەران بکات وەلی و دۆستی خوای گەورە نییە بەڵکو دۆستی شەیتانە، هیچ ڕێگەیەکیش نییە بە خوای گەورە بگات جگە لە ڕێگەی پێغەمبەران و شوێنکەوتنی پێغەمبەران، کەوا بوو هەر کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات لە ڕێگەیەکی ترەوە بە خوای گەورە دەگات، کافرو گومڕایە.

(٢)_ ئەوە شتێکە گومانی تێدا نییە، بە ڕاستی کافرو مولحیدە، کەوا بوو ئەو صۆفیانەی دەڵێن: بە ڕاستی خەڵکی پێویستیان بە کۆتاهەمینی ئەولیایە، تەنانەت پێغەمبەرانیش پێویستیان بە کۆتاهەمینی ئەولیایە گەورەترین بێبڕوان _ پەنا بەخوا _ گەورەترین بێبڕوا بوون و خوانە ناسینە، چونکە وەلی نابێ بە وەلی تەنها بە هۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە ﷺ نەبێت، ئەو کەسەی شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەوێت وەلی و دۆستی خوانییە بەڵکو دۆستی شەیتانە.

وە ئەگەر گوتی: من پێویستم بە مەحەممەدە لە زانستی ڕووڵەت (علم الظاهر) نەك لە زانستی ناوەکیدا (علم الباطن)[(١)] بە واتایەکی تر لە زانستی شەریعەتدا(علم الشريعة) پێویستمان بە موحەممەدە نەك لە زانستی حەقیقەتدا (علم الحقيقة)، با دڵنیا بێت لە جوولەکەو گاوران خراپترە، ئەوانەی گوتیان: موحەممەد پێغەمبەرە بۆ نەخوێندەوارەکان نەك ئەهلی کیتاب[(٢)]،

---

(١)_ کەسانێکیان دەڵێن: من پێویستم بە موحەممەدە ﷺ تەنها بۆ فێر بوونی زانستە ڕو (علم الظاهر)، بەڵام زانستە پەنهانەکان (علم الباطن) زانستی دڵانە لە مەدا پێویستم بە موحەممەد ﷺ نییە، من ڕاستەوخۆ ئەم زانستە لەخوای گەورەوە وەردەگرم، ئەمەش دیسان گەورەترین کوفرە، بەڵکو ئێمە لە هەردوو زانستەکەدا ڕواڵەت و پەنهان پێویستمان بە موحەممەدە ﷺ، بۆیە دڵەکان چاك نابن و ئیمان ناهێنن مەگەر بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ.

(٢)_ ئەوانەی دەڵێن: ئێمە لەزانستی پەنهان دا (علم الباطن) پێویستمان بە پێغەمبەر نییە، بەڵکو تەنها لە زانستی ڕواڵەتدا (علم الظاهر) پێویستمان پێیەتی، ئەم جۆرە کەسانە ئیمانیان بە هەندێ قورئان هێناوەو، بەهەندێکی تری کوفر دەکەن، ئەمانە لەو جوولەکانە خراپترن کە دەڵێن: موحەممەد پێغەمبەرە، واتە: هەندێك لە جوولەکە، چونکە هەندێك لە جوولەکەو گاورەکان هەن دانبەوەدا دەنێن کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ بەڵام دەڵێن: تەنها بۆ نەخوێندەوارەکان پێغەمبەر بووە واتە: عەرەبەکان، بۆ جوولەکە و گاورەکان پێغەمبەر نەبووە، ئەمە گەورەترین کوفرە، چونکە پەیامەکەی موحەممەد ﷺ گشتیە بۆ ئادەمیزاد و جنۆکە، بەڵام گەورەترین کوفر بەشی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن: ئێمە ئیمان بە زاستە ڕواڵەتیەکان (علم الظاهر) دێنین، بەڵام بۆ زانستی پەنهانەکان (علم الباطن) ئێمە بەبێ پێغەمبەران بە دەستی دێنین.

چونکە ئەوان بڕوایان بە هەندێك لە تەورات هێناو بە هەندێکی تری بێبڕوا بوون، بۆیە بەوە کافر بوون، هەروەها ئەوەی دەڵێت: موحەممەد بە زانستی ڕووکاریەوە(علم الظاهر) نێردرا نەك بە زانستی ناوەکی(علم الباطن)، با دڵنیا بێت بە هەندێك لەوەی کە هێناویەتی باوەڕی هێناوەو، بە هەندێکی دیکەش کە هێناویەتی کوفری کردووە، ئەم کەسە کافرەو[1]

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەر دوو زانستەکەوە زانستی ڕواڵەتە و پەنهان نێردراوە، بەڵام ئەو کەسەی دەڵێت: تەنها بە زانستی ڕواڵەت نێردراوە نەك زانستی پەنهان، ئەو کەسە ئیمانی بە هەندێك لە قورئان هێناوە کە زانستی ڕواڵەتە ( علم الظاهر) وە بە هەندێکی تری کوفری کردووە کە زانستی ناوەکییە (علم الباطن)، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا (١٥٠) أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا(١٥١)﴾[النساء: ١٥٠_١٥١] واتە: وە دەڵێن باوەڕ بە هەندێك (لە پێغەمبەران) دەهێنین وە باوەڕ ناهێنین بە هەندێکی تریان و دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بدەنە بەر ئا ئەوانە بەڕاستی بێ باوەڕی تەواون. پێویستە ئێوە ئەم شتانە بزانن، چونکە لەم کاتەدا کاروباریان ئاڵۆز و مەترسیدار بووە، بە لای زۆریك لە خەڵك و، بە لای وڵاتانێکی زۆرەوە ئەمانە بوونە بە نوێنەری ئیسلام و موسڵمانان، بۆیە بەناچاری هەر دەبێ حەقیقەتیان ئەو کەسانە بزانرێ.

زۆر لەوانە کافر ترە، چونکە زانستی ناوەکی(علم الباطن) _ کە بریتیە لە: زانستی ئیمانی دڵان و زانیاریەکانی و باروحاڵەکانی(علم إيمان القلوب ومعارفها وأحوالها) _ بریتیە لە پەیداکردنی زانست سەبارەت بە حەقیقەت و شتە جێگیرە ڕاستەکانی ئیمانی ناوەوە(هو علم بحقائق الإيمان الباطنة)، وە ئەمە زۆر بەڕێز ترە لە زانینی تەنها کاروکردەوە ڕواڵەتیەکان ئیسلام[1].

کەوا بوو ئەگەر کەسێك بانگەشەیەکی وای کرد کە گوایە موحەممەد ﷺ تەنها ئەم کاروبارو شتە ئاشکراو ڕواڵەتیانەی زانیوە نەك حەقیقەت و شتە جێگیرە ڕاستەکانی ئیمان، وە ئەو حەقیقەتانەی ئیمانی پەنهان لە قورئان و سوونەتەوە وەرناگیرێن، با دڵنیا بێت باوەڕی بە بەشێك لەوە هەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هیناویەتی و کوفریش کردووە بە بەشەکەی تری[2].

---

(١)_ ئیمانی نێو دڵەکان زۆر لە ئیمانی ئاشکرای ڕواڵەت و ئیسلامی ئاشکرای ڕواڵەتی بەڕێز ترە، کردەوەی دڵ وەك ترس و ئومێد و خاکێتی و ملکەچی و... هتد دەگرێتەوە کە شوێنەکانیان دڵە، ئەو کردەوانەی دڵ بنچینەیە بۆ ئیمانە ڕواڵەتیەکە ئیمانە ڕواڵەتیەکەی لەسەر دادەمەزرێ، چونکە ئەگەر ئیمان لە دڵدا نەبێت، با مرۆڤ نوێژ بکات و، ڕۆژوو بگرێت سوودی بۆ نابێت، تاوەکو لە ڕواڵەت و پەنهایشەوە ئیماندار نەبێت.

(٢)_ ئەمە بەر پەرچدانەوەی زێدەڕۆی کەرانی ئەهلی، وەکو زانراوە لەسەرەتای دروستبوونیدا مەبەستیان تەنها کۆششکردن لەپەرستن و، تەقەشوف و، بەدەرخستنی زوهد بوو، ئەمەش خۆی بۆ خۆی ستایش کراو نییە، چونکە قورسکردنی ئایینەکەی خوای گەورەیە، نارەحەتی دەخاتە سەر نەفسی مرۆڤ، چونکە کاتێ چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ویستیان پەرستنەکانی نوێژو، ڕۆژوو، ژن نەخواستن لەسەر خۆیان قورسکەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامیدانەوەو، پێی فەرموون:

-----------------------------------------------
-----------------------------------------------
-----------------------------------------------

((بەڵام من نوێژ دەکەم و دەشنووم، ڕۆژوو دەگرم و دەشیشکێنم، هاوسەرگیریش دەکەم، بۆیە هەر کەسێك لە سوونەتەکانم لا بدات، لە من نییە)) ئایینی ئیسلام ئایینی مامناوەندێتی و میانڕەوییە، چونکە دڵی مرۆڤ بەمامناوەندێتی و میانڕەوی ئاسوودە دەبێت، بەڵام قورسکردنەوەی پەرستن سەختی بۆ مرۆڤ دروست دەکات، لە ئەنجامیشدا ناتوانێت لەسەر ئەنجامدانی پەرستنەکان بەردەوام بێت، چونکە مرۆڤەو ناتوانێت بەرگەی نارەحەتیە درێژخایەنەکان بگرێت، لە مرۆڤ داواکراوە لەسەر ئەنجامدانی پەرستنەکان بەردەوام بێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أَحَبُّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَلَّ)) رواه البخاري، واتە: ((خۆشەویستترین پەرستنەکان بە لای خواوە بەردەوامترینیانە(واتە: ئینسان لەسەر ئەنجام دانی بەردەوام بێت) با کەمیش بێت))، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئەو کەسانەوە کە پەرستنەکان لەسەر خۆیان قورس دەکەنەوە فەرموویەتی: ((فَإِنَّ الْمُنْبَتَّ لاَ أَرْضاً قَطَعَ وَلاَ ظَهْراً أَبْقَى)) واتە: وەکو ئەو کەسە مەبە کە لەڕێکردندا حەوانەوە بەخۆی و چوارپێکەشی نادات و، پاشان چوارپێکەی ماندوو دەبێت و خراپ دەبێت و، پەکی دەکەوێت و، لەوانەیە لە چۆڵەوانیەکدا بمێنێتەوە، ئیتر نەمەسافەکەی بڕی و، نەچوارپێکەشی بۆ خۆی هێشتەوە. ئائەمەیە سیفەتی ئەو کەسانەی کە دین قورس دەکەن ئەمە لە لایەکەوە، کە خۆی بۆ خۆی مەترسیدارەو ڕێگریی لێکراوە، لە لایەکی دیکەشەوە مەترسیەکی خراپتری هەیە، ئەویش ئەوەیە کە چەند کردەوەیەکی ئەنجام داوە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرمان لەسەر نەبووە، ئەویش پەلکێشی دەکات بۆ ئیلحاد بوون لە ئایینی خوادا، وەکو ئەوەی لەسەر دەستی پاشینانی ڕوویدا، تا ئەو ئاستەی گوتیان: وەلی و دۆست لە پێغەمبەر چاکترە، بەڵام ئایا لە پێغەمبەران _ علیهم الصلاة والسلام _ چاکتر هەن، ئەوان دەڵێن: نەخێر، ئەولیا چاکترن،

---------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------

مەبەستیان بەئەولیا صۆفیەکانە، مەبەستیان ئەوەیە کە صۆفیەکان لە پێغەمبەران چاکترن، چونکە ڕاستەوخۆ شت لە خواوە وەردەگرن، ئایا ڕەگەزی مرۆڤ دەتوانێت ڕاستەوخۆ لەخواوە وەرگرێت ؟، نەخێر، ئەو شتە لە توانای مرۆڤدا نییە، مەگەر لە ڕێگەی وەحی و سروشەوە یان لە ڕێگەی قسەکردنی بیستراوی پشت پەردەوە بێت وەکو موسا پێغەمبەر _ علیه السلام _، بەڵام ئەو کەسانەی بانگەشەی وا دەکەن کە ڕاستەوخۆ لە خواوە وەردەگرن، یان لەگەڵ خوادا دادەنیشن و دەڵێن: پێغەمبەران ناسینی خوا لە ئەولیاوە وەردەگرن، چونکە ئەولیا ڕاستەوخۆ ئەو زانستە لە خواوە وەردەگرن و، پێغەمبەرانیش لە ئەولیاوە وەردەگرن، ئەوانە لە گومڕاییەکی گەورەدان، ئەوانە تەماشاکەن دەرچوون یان لە ئایینی خوای گەورە بە چ ئاستێکی خراپێکی گەیاندوون، بنچینەی هەموو ئەمانە بۆ بیدعە دەگەڕێتەوە، بیدعە مرۆڤ بۆ شەڕو خراپە ڕادەکێشێت، جا ئەو شەڕو خراپەیە لەوانەیە زۆر بێت و، لەوانەیە پێدەچێ کەمیش بێت، بیدعە خەیری تێدا نییە، لەبەر ئەمەیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداریی و ووشیاری لە بارەوە داوە، خەڵکی بە شێوەیەکی ترسناك لێ ترساندووە، ئەوان دەڵێن: ئەولیا لە پێغەمبەران چاکترن، کۆتا ئەولیا لە کۆتا پێغەمبەر چاکتر، چونکە ئەولیا ڕاستەوخۆ شتەکان لە خواوە وەردەگرن، مەبەستیشیان بە ئەولیا صۆفیەکانە کە بە ئەولیایان، بێ ئابڕووی و جورئەت کردنیان بەرامبەر بە خوا بەو ئاستەی گەیاندن، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لێدانی دەروازەی بیدعەو، دەرچوون لەشەرعەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوان دەڵێن: پێغەمبەر زانستی ئاشکرای ڕواڵەتی وەردەگرێت، بەڵام ئەوان زانستی پەنهان (علم الباطن) وەردەگرن، گوایە ئەوان شتانێك دەزانن پێغەمبەران نایزانن، چونکە پێغەمبەران شتە ڕواڵەکان وەردەگرن و، ئەوەش کە بۆ خەڵکی باسی دەکەن تەنها زانستە ڕواڵەتیەکانە، بەڵام

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------

ئەولیا حەقیقەت و شتە پەنهانیش دەزانن. ئەوان تەنها لەشتانێکدا شوێنی پێغەمبەران دەکەون، ئیتر وەکو ئەوانەیان لێدێت کە بڕوا بە بەشێك لە کتیابی خوا دەکەن و کوفر بە بەشەکەی تر دەکەن، چۆن لە شتانێکدا شوێنی پێغەمبەر دەکەون و، لە شتانێکی تریشدا موخالەفەی دەکەن؟ چۆن جیا دەبێتەوە لە پێغەمبەر خوا و بانگەشەی ئەوەش دەکەی تۆ لەئەو چاکتری؟ ئەمە بڕوا بوونە بە هێندێك لە شەریعەتەکەی و بێبڕوا بوونە بە هێندێکی دیکەی، دڵنیابە ئەمە لە کوفری ئەو جوولەکانە توند ترە کە خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰ أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ [البقرة: ٨٥] واتە: جا ئایا بڕوا دەهێنن بە هەندێك لە تەورات، و بێ بڕوا دەبن بە هەندێکی تری جا تۆڵەی ئەو کەسانە کەوا بکەن لە ئێوە هەر ڕیسوایی و بەد ناوی یە لە ژیانی دونیادا وە لە ڕۆژی دواییشدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سەختترین سزا وە خوا بێ ئاگا نییە لەوەی کە دەیکەن. تەماشای ئەو هەڕەشانە بکەن لە لایەن خوا بۆ ئەوانەی ئیمان بە هەندێ لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنن و، بێ بڕوا دەبن بە هەندێکی دیکەی، چونکە ئەوان دەڵێن: لەشتە ڕواڵەتیەکان (الظاهر) گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ دەبین و، لەشتە پەنهان و شاراوەکاندا (الباطن) گوێڕایەڵی نابین، نەخێر پێغەمبەری خوا ﷺ زانستی ڕواڵەت و پەنهانی هێناوە، بەڵام ئەوان دەڵێن: ئێمە لە شتە پەنهان کان دا گوێڕایەڵی نابین و، لە شتە ئاشکرا ڕواڵەتیەکان دا (الظاهر) گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ دەبین، ئەمەش بڕوا بوونە بە هەندێ لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی و، بێ بڕوابوونە بە هەندێکی دیکەی.

وە ئەمە لەو کەسە شەڕ تر و خراپترە کە دەڵێت: ئیمان بە هەندێکی دێنم و کوفر بە هەندێکی دەکەم و، بانگەشەی ئەوە ناکات کە ئەو هێندەی ئیمانی پێ هێناوە ئاست نزمترین هەر دوو بەشەکەیە[1].

---

(١)_ جوولەکە بڕوا بەهێندێکی دێنن و، بڕوا بەهێندێکی ناهێنن، واتە بڕوایان بەوەیە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە بەڵام بڕوایان بەوەنییە کە بۆ ئەوان نێردرابێت، بەڵام بانگەشەی ئەوەشیان نەکردووە کە ئەوەی بڕوای پێدەکەن ئاست نزمترینی هەر دوو بەشەکەیە، بەڵام صۆفیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئاست نزمترینی هەر دوو بەشەکەیە، ئەمەش لە ڕووە ڕواڵەتیەکەیە ڕووکاریەکەیە، کە لە ناوەکیەکە ئاست نزمترە. واتە ئەوەی کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی ئاست نزمترینەو، بە بانگەشەی ئەوان ئەوەی نەیهێناوە ئاست بەرزترە.

## گومڕایی ئەوانەی وەلایەت و دۆستایەتی لە پێغەمبەرایەتی بەچاکتر دادەنێن

وە ئـەو مولحیدانـە: بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کـە وەلایـەت و دۆسـتایەتی لـە پێغەمبەرایـەتی چـاکترە[1] وە سـەر لـە خـەڵکی دەشـێوێنن و، دەڵـێن: وەلایـەت و دۆستایەتیەکەی موحەممەد لە پێغەمبەرایەتیەکەی چاکترەو، ئەم شیعرەش دەڵێن:

مَقَامُ النُّبُوَّةِ فِي بَرْزَخٍ فُوَيْقَ الرَّسُولِ وَدُونَ الْوَلِيِّ ![2]

واتە: پلەو پایەی نبوەت کەمێك لە پایەی ڕەسول بەرزترەو لە بەو پایە وەلیش بە نزمترەوە دەڵێن: ئێمە لە وەلایەت و دۆستایەتیەکەیدا بەشداریتیمان کردووە کە زۆر لە پەیامەکەی بەرزترە، ئەمەش گەورەترین گومڕاییەکانیانە[3]،

---

(١)_ بەڵێ، گوایە وەلی و دۆست لە پێغەمبەر چاکترە، وەلایـەت و دۆسـتایەتیش لە پێغەمبەرایەتی چاکترە، چونکە دۆست ڕاستەوخۆ لە خواوە شتەکانی وەردەگرێت.

(٢)_ بە لای ئەوانەوە نەبی لە ڕەسوڵ بەرزترە، بەڵام لەگەڵ هەموو چاکەکەیدا لە وەلی ودۆسـت نـزمترە، کـەوا بـوو بـە لای ئەوانـەوە وەلـی لـە نـەبی و لـە ڕەسـولیش بەرزترە، ئایا دوای ئەو گومڕابونەیان گومڕایەکیی تر هەیە؟، دێڕەکەش شیعری ئیبن و عەرەبیە.

(٣)_ ئەوان دەڵێن: پێغەمبەر وەلایەت و پەیامی هەیـە، وەلایـەت و دۆسـتایەتیش لـە پـەیام چـاکترە، بۆیـە ئێمـە لـە وەلایـەت و دۆسـتایەتیەکەیدا بەشـداریمان کـرد، ئەگەرچی ئەو بەپەیامەوە تایبەتکراوە، وەلایەت لە پەیام چاکترە.

چـونكه هـيچ كەسـێك هاوشـێوازێكی موحەممـەدی نـەكردووە لـە وەلايـەت و دۆسـتايەتيەكەيدا، نـەئيبراهيم و، نەموسـا، ئـيتر ئـەو مولحيدانـە چـۆن بتـوانن هاوشێوازێكی پێغەمبەری خوا بكەن ئەو بكەن[1].

وە هەموو ڕەسولێك نەبی ييە، وە هەموو نەبی يەكيش وەلی و دۆستە خوايە[2]،

---

(١)_ پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ كۆتاميىنی پێغەمبەرانە، خوای گەورە بۆ هەر هەموو مرۆڤايەتی ناردويەتی، خوای گەورە بەچەند خاسيەتێكەوە تايبـەتی كـردووە، كە لەهيچ كەسێكی ديكەدا نييە، بۆيـە لـە پێغەمبـەرانی ديكـە چـاكترە، هـەر كەسێك گومانی لەمەدا هەبێت كافرە، هـەر يـەكێك كەسـێكی تـر لـە موحەممـەدﷺ بەچاكتر دابنێت كافرە ئەگەرچی ئەوەی بەچاكی داناوە پێغەمبەرێكيش بێت لـە پێغەمبـەران، كەوا بوو دەبێ بارودۆخی ئـەو كەسانە چـۆن بێـت كـە صـۆفيەك لـە موحەممـەد ﷺ بەچاكتر دادەنێن، بێگومان گەورەترين كوفرو گەورەترين گومڕابوونە.

(٢)_ پـاش نـەبووەت پـەيای خـوا گـەورەترين شـتە، لـە دوای ئەوانـەوە وەلـی و دۆست دێـت، ڕەسـوڵ: بريتيـە لـەو كەسـەی شـەرعێكی بـۆ وەحـی كـراوەو، فـەرمانی پێكراوە بە خەڵكی ڕابگەيـەنی، بـەڵام نـەبيی: بريتيـە لـەو كەسـەی نێـردراوەو حـوكم بەشەريعەتی پێغەمبەرانی پێش خۆی دەكـات، وەكـو نەبيـەكانی بـەنی ئيسـرائيل كـە حوكميان بە تەورات دەكرد كە بـۆ مووسـا دابـەزێنرا بـوو، لـەم بـارەوە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ﴾[المائدة: ٤٤] واتــە: بێگومان ئێمە تەوراتمان ناردە خوارەوە كە ڕێنموونيی و ڕووناكی تێدا بوو پێغەمبەران حوكمی پێدەكەن. ئەو پێغەمبەرانە حوكميان پێدەكرد كە لـە پـاش ئـەو هـات بـوون، ئەوان دەڵێن: ئێمـە لـە نەبيـەكان چـاكترين، خۆيـان خسـتۆتە پلـەی بـەرزەوە، بـەڵام بەلايانەوە ڕەسوڵ نزمترين شتە، بـەلای ئەوانـەوە ڕيزبەنديەكـە بـەم جۆرەيـە: وەلـی، نەبی، ڕەسوڵ. بەڵام ياساكە ئەوەيە كە پەيای خوا لە نـەبووەت گشـتی تـرە، چونكە هەر ڕەسولێك نەبی يە نەك بە پێچەوانەوە.

کەوا بوو ڕەسول هەم نەبی و دۆستیشە، وە پەیامەکەی نبوەتەکە لە خۆگرتوە، نبوەتەکەشی وەلایەت و دۆستایەتیەکەی لە خۆگرتووە[1]، کەوا بوو چۆن ئەو وەلایەت و دۆستایەتیەی کە بەهۆی نبوەتەکەیەوە بۆی بەدیهاتووە لە نبوەتەکەی چاکتر بێت کە وەلایەت و دۆستایەتیەکەشی بۆ بەدیهێناوە، وە ئەگەر وا دابنێین کە خوای گەورە تەنها کردویەتی بە پێغەمبەر بە بێ ئەوەی وەلایەت و دۆستایەتی خوای هەبێت، ئەمە گریمانێکی هەڵەو نەگونجاوە[2] چونکە لەو حاڵەتەدا کە وەحی بۆ ناردووە ناگونجێت وەلی و دۆست ی خوا نەبێت[3] وە هیچ نبوەتێکیش نییە لە وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە بەدەربێت[4]،

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ پەیام و نەبووەت و وەلایەت و دۆستایەتی هەمووی تێدا کۆ بۆتەوە، ئیتر چۆن صۆفیەك لەو چاکتر بێت.

(٢)_ هەرگیز شیاو نییە خوای گەورە پێغەمبەرێك بنێرێت کە وەلی و دۆستی خۆی نەبێت، ئایا کەسی عاقڵ و ژیر شتی لەو جۆرە دەڵێت ؟ صۆفیەکان خۆیان بەم جۆرە قسانەوە پابەند کردووە، بۆچی ؟ گوایە خوای گەورە کەسێکی ناردووە وەلی نییە، یەکێك نییە لە ئەولیاکان نییە، چونکە بە لای ئەوانەوە تەنها ئەولیای صۆفیەکان ئەولیای خوان کە صۆفین.

(٣)_ بەڵێ، خوای گەورە هیچ کەسێکی نەناردووە مەگەر یەکێك بووە لە دۆستانی خۆی، هەرگیز دوژمنی خۆی نانێرێت.

(٤)_ وە هیچ نبوەتێکیش نییە بەدەر بێت لە وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە، چونکە پەیام نەبووەت لە خۆ دەگرێت، نبوەتیش وەلایەت و دۆستایەتی لە خۆ دەگرێت، هەموو ڕەسولێك نەبی یە، نەبوەتیش وەلایەت و دۆستایەتی لە خۆ دەگرێت، هەموو نەبییەك وەلی و دۆستە، نەك بە پێچەوانەوە، بەڵام مەرج نییە هەموو وەلی و دۆستێك نەبی و ڕەسول نییە، بەڵکو ئەوە فەزڵ و شەرافەتە کە وەلی و دۆست شوێنکەوتووی ڕەسول بێت، ئەگەر شوێنکەوتووی ڕەسوڵ نەبوو بێگومان دوژمنە نەك دۆست.

لەکاتێدا ئەگەر واش دانرا نبوەتێکی بێ وەلایەت و دۆستایەتی هەبێت، ئەوە دڵنیا بن هیچ کەسێك ناتوانێت هاوشێوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورەدا بکات[١].

وە ئەوانە دەڵێن: وەکو ئەوەی خاوەنی کتێبی (الفصوص) ئیبن وعەرەبی[٢] دەڵێت: گوایە ئەوان ئەو شتانەی بیانەوێت لەو سەرچاوەوە وەری دەگرن کە فریشتەکە لێوەی وەردەگرێت، بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ سرووش دەکات[٣]،

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ تەواوترین و کامڵترینی دۆستانی خوای گەورەیە، ئەو چاکترین خەڵکی خوایە، کۆتاهەمینی پێغەمبەرانە، چاکترین دۆستەکانێتی، چاکترین پێغەمبەرەکانێتی، فەزڵ و چاکەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا لە کاتی شەفاعەتی گەورەو، (المقام المحمود)دا ئاشکرا دەبێت، کاتێ پێغەمبەرانی (أولو العزم) لە شەفاعەت و تکاکاری پاشەکشە دەکەن و، پێغەمبەری خوا ﷺ پێش دەخەن.

(٢)_ ئیبن وعەرەبی چەندین کتێبی هەیە پڕن لە ئیلحاد، وەکو (فصوص الحِكَم)، بە داخەوە ئەم کتێبە تەحقیق کراوەو چاپکراوەو، ڕەنگە لە کتێبخانەکانەو پیشانگاکانیشماندا بفرۆشرێت، لە کاتێکدا ئیلحادی تێدایە، هەروەها کتێبی (الفتوحات المكية)شی هەیە، بە فتوحات ناوێناوە گوایە خوای گەورە لە مەککە ئەو شتانەی فەتح کردوەو ئاشکرا کردووە.

(٣)_ پێغەمبەری خوا لە ڕێگەی فریشتەکەوە وەردەگرێت، ڕەسوڵ و نەبی هەر دوکیان لە ڕێگەی فریشتەوە وەردەگرن، کەچی ئەوان بەتەنها ڕاستەوخۆ لەسەرچاوە سەرکیەکەوە واتە: لە خوای گەورەوە وەردەگرن، بەم شێوە بێت ئەوان لەڕەسول و نەبی چاکترن، تەماشاکەن شەیتان بەچ ئاستێکی گەیاندوون. پاشان قسەیان لە عەقلیشدا، بەو جۆرە بیروباوەڕی فەلسەفیانەشیان بۆ دروست بوو، وەك و فەیلەسوفە مولحیدەکانی یۆنان، کۆمەڵێکیشیان چوونە سەر ڕێبازی بەرهەمی صۆفی هیندیەکان.

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو شتەیان لە بیروباوەڕی فەیلەسوفە مولحیدەکانەوە پەیدا کرد، پاشان لە قالّبی موکاشەفەوە دەریاندەهێنا[1]، چونکە فەیلەسوفەکان دەیانگووت: ئەفلاك قەدیمەو ئەزەلیەو سەرەتای نییە[2]، وەکو ئەوەی ئەرستۆ و شوێنکەوتوانی دەیڵێن، سەرەتاکەی (موجَبُ بذاته)یە[3]

---

(١)_ فەلسەفەیان وەرگرت بەلاّ بە فەلسەفەیان ناونەنا، بەڵکو بە موکاشەفەیان ناونا _ گوایە راستەوخۆ شتەکانیان لەخوای گەورەوە بۆ ئاشکرا دەبێت _ لە کاتێکدا لە فەیلەسوفەکانیان دزیووەو، داویانەتە پاڵی خۆیان و، بەموکاشەفاتیان ناوناوە، دەڵێن: ئەمانەمان بەهۆی وەلایەت و دۆستایەتی خواوە دەستگیر دەبێت کە هیچ کەسێکی تر پێی ناگات.

(٢)_ فەیلەسوفە یۆنانیە کۆنەکان بڕوایان بەخوای گەورە نییە، بڕوایان بەوە نییە کە زاتێکی خوڵقێنەر هەبێت، دەڵێن: ئەفلاك: واتە ئاسمانەکان و زەمین و شاخ و هەموو مەخلوقاتی تر نەخوڵقێنراوەو دانەهێنراوە بەڵکو هەر لە گەڵ بوونی خوای گەورەدا هەبووە، ئەمەش بە کۆ دەنگی و یەك دەنگی هەموو موسڵمانان و تەنانەت جوولەکەو گاورانیش کوفرە، چونکە هیچ شتێك ئەزەلیی و بێ سەرەتا نییە جگە لە خوای گەورە، خوای گەورە خوڵقێنەرەو، هەر شتێکی تر خوڵقێنراوە.

(٣)_ (موجَبُ بذاته): (موجَبُ) پێچەوانەی (مُحْدَثْ)ە واتە: پێچەوانەی داهێنراو خوڵقێنراوە، واتە هەر خۆی هەبوەو خوای گەورە دروستی نەکردووە، ئەمەش یەکێکە لەو مەسەلانەی کە بەڵگەیە لەسەر کوفری ئیبن وسینا و کەسانی تری هاوڕای، ئەوان لەسەر بیروباوەڕی فەیلەسوفانی یۆنانی کۆن بوون، بڕوانە: الأنترنيت: (موقع الشيخ أبي مالك عبدالحميد بن خليوي الجهني: شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان)، وەرگێڕ.

وەکو ئەوەی پاشینانیان ئیبن وسیناو هاوشێوانی[1] دەیڵێن، ئەو جۆرە کەسانە ناڵێن: هەموو ئەو شتانە هی پەروەردگارێکە کە ئاسمانەکان و زەمین و ئەوەی لە نێوانیاندایە بە شەش ڕۆژ دروستیکردوون[2] وە گوایە خوای گەورە شتەکانی بە خواست و ویستی خۆی دروست نەکردووە (ولا خلق الأشياء بمشيئته وقدرته)[3]،

---

(١)_ ئیبن وسینا: بە(الرئيس) ناو دەبرێت، بنەڕەتی لە تایەفەی ئیسماعیلیە، چووە نێو فەلسەفەوە، بو بە کەسێکی مولحید، بابی جوولەکە بووە.

(٢)_ خوای گەورە ئاسمانەکان و زەمینی بە شەش ڕۆژ دروست کردوون، ئەو بەدیهێنانە ئەفلاکیش: واتە ڕێڕەوەی ئەستێرەکانیش (مجاري الكواكب) دەگرێتەوە، کەواتە ئەمانە بە دیهێنراو و مەخلوقن، فەیلەسوفەکان بڕوایان بە ئەستێرەکان هەبوو، وە لە جیاتی خوای گەورە دەیانپەرستن بۆیە ئەستێرە ناسی لە سەر دەستی ئەوانەوە پەیدا بوو، کە ڕووداوەکانیان بۆ کاریگەری ئەستێرەکان دەگەڕاندەوە، خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوون کە ئاسمانەکان و زەمین و هەموو شتێکی دیکەی دروستکردووە، کەوا بوو ئەمانە دروستکراون و، ئەزەلی نین وەکو ئەوەی فەیلەسوفەکان دەیڵێن.

(٣)_ بەڵکو لەو بڕوایەدان کە شتەکان بەزەرورەت و هەر بۆ خۆی لە سروشتەوە هەن، لە سروشتی هاتونەتە ووجود، پەروەردگارێکی نییە بەدیهێنابێت و خولقاندبێتی، بڕوایان بەپەروەردگار نییە، بڕوایان بەپێغەمبەرانیش نییە، بەڵکو تەنها پشت بەفەلسەفات و بیرو بۆچونەکانی خۆیان دەبەستن.

وه گوایه خوای گەورە علمی بە (الجزئیات) نییە، ئەوان یان بە تەواوی نکوڵیی لە خوای گەورە دەکەن، وەکو قسەکەی ئەرستۆ، یان دەڵێن: لە ڕاستیدا لە گۆڕاوەکاندا تەنها گشتیەکان (الکُلیات) دەزانێت[1] وەکو ئەوەی ئیبن وسینا دەیڵێت.

---

(١)_ بڕوایان بەوە نییە خوای گەورە غەیب بزانێت، بڕوایان بەوەش نییە کە خوای گەورە شتە وورد و بچووکەکان (الجزئیات) لەم گەردوونەدا بزانێت، (الجزئیات): بریتین لە ڕووداوەکان و مەخلوقاتی تری سەر ئەم زەمینە، بڕوایان بەهەر هەموو ئەمانە نییە، ئەمەیە بیروباوەڕی فەیلەسوفەکان، مەبەستی سەرەکی شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ ئەوەیە کە بۆمان ڕوون بکاتەوە صۆفیەکان لە کوێوە ئەو ئیلحادەیان وەرگرتووە. ئەوان لە فەیلەسوفەکانەوە وەریانگرتووە، بە ڕاستی ئەم بیروباوەڕە جێگەی سەرسوڕمانە، گوایە خوای گەورە گشتیات (الکُلیات) دەزانێت و، بەش بەش و دانەدانەکان (الجزئیات) نازانێت، هەرهەمووی گومڕاییە، خوای گەورە هەموو شتێك دەزانێت، ئەوەی بووە، ئەوەی دەبێت، ئەوەی نەبووە، وە ئەگەر ببێت چۆن دەبێت، خوای گەورە بە هەموو شتێك زانایە، لە ڕاستیدا گشتیات (الکُلیات) تەنها لەخەیاڵدا بوونی هەیە، بەلام لەدەرەوە تەنها بەش بەش و دانە دانەکان (الجزئیات) هەن، تەنها شتی تایبەتی بینراوی بەش بەش و دانە دانە (الجزئیات) هەن: ئەوە مانگە، ئەوە خۆرە، ئەوە زەوییە، ئەوە ئاسمانە، ئەوە ئەستێرەیە، ئەوە بەردە، ئەوە ئادەمییە، ئەمانەن بەشبەش و دانەدانەکان(الجزئیات)، بەلام گشتیات(الکُلیات) تەنها لە خەیاڵدا بوونی هەیە بۆ نموونە ئینسانیەت و مرۆڤایەتی ئەمە شتێکی گشتییە(الکُلیة)، ئایا لە دەرەوەی خەیاڵ شتێك هەیە بە ناوی ئینسانیەت و مرۆڤایەتی هەستی پێ بکرێت و ببینرێت، نەخێر شتی بەو جۆرە نییە، شتێك لە دەرەوە نییە ئینسانیەت و مرۆڤایەتی ناوبێت، لە دەرەوە تەنها بەشبەش و دانە دانەکان (الجزئیات) هەن، واتە شتەکان بە وردەکاریی هەن بە نموونەی مرۆڤ: ئەمە زەیدە، ئەمە عەمرە، ئەمە بەکرە، تەماشا دەکەیت شتەکان بەشبەش و دانەدانەن(الجزئیات).

حەقیقەتی ئەم قسەش: نکوڵیکردنە لە زانینی خوای گەورە بەشتەکان، ئەگینا هەموو شتێك لەدەرەوە بینراوەو بەشبەشەو دانە دانەیە (مُعيَّنٌ جُزئي)ە، ئەفلاك: هەموو شتێکی بینراوی بەشبەشی دانەدانەیە(جُزئي)، هەروەها هەر هەموو جۆرو چەشنەکان (الأعيان) سیفات و کردەوەکانیشیان. ئەگەر بە گوێرەی بۆچوونەکانی ئەوان بێت بێگومان ئەوەی تەنها عیلمی گشتیات (الكُليات) هەبێت ئەوا هیچ شتێك لە بارەی موجودات و هەبوونەکانەوە نازانێت[١]، لە کاتێکدا گشتیات (الكُليات) لە ڕاستیدا تەنها لە خەیاڵدا بوونی هەیە نەك لە شتە دیاریکراوەکان(الأعيان)[٢].

ئەم باسەش بە درێژی لە کتێبی (درء تعارض العقل و النقل)[٣] و غەیری ئەویشدا هەیە.

---

(١)_ بەڵێ، هەر هەموو هەبووەکان پارچە پارچە و بەش بەشن، بەڵام گشتیات (الكُليات) تەنها لە خەیاڵدا بوونی هەیە.

(٢)_ بەڵێ، لە دەرەوەی خەیاڵ گشتیات (الكُليات) بوونی نییە بەڵکو تەنها لە خەیاڵدا بوونی هەیە، بەڵام پارچە پارچە و بەش بەشەکان (الجُزئيات) دەبینرێن و بوونیان هەیە.

(٣)_ بەڵێ، شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێبێت_لە کتێبەکانی دیکەیدا درێژەی بەم باسەداوە، کە بەرەنگاریی فەیلەسوفان و مولحیدان بۆتەوەو، بەرپەرچی داونەتەوە، ئەم کتێبە زۆر بەپێزەو، بە چاکترین کتێبەکانی دانراوە، بەگەورەترین کتێبەکانی دانراوە لە سەبارەت بە باسکردنی عەقڵ و نەقڵ، پێشەوا ئیبن ولقەیم _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ فەرموویەتی: کتێبی (درء تعارض العقل و النقل) بخوێنەرەوە کتێبکە لە هەموو گەردووندا هاوتایەکی نییە، واتە هیچ کەسێکی ئەهلی زانست کتێبێکی وەکو ئەوی نەنوسیووە، چونکە بەوردی قوڵ بۆتەوە لە ڕوونکردنەوەو ئاشکرا کردنی چەندین نهێنیدا. ئەو شتی لەو شێوەیە باس نەکردووە مەگەر لەم کتێبەدا.

## بیروباوەڕە پووچەکانی ئیبنوسیناو فەیلەسوفان

بە ڕاستی کوفری ئەو فەیلەسوفانە لە کوفری جوولەکەو گاورەکان[(١)]، بەڵکو لە کوفری موشریك و هاوەڵپەرستەکانی عەرەبیش زۆر گەورەترە[(٢)]، چونکە هەموو ئەمانە دەڵێن: خوا خوڵقێنەرو داهێنەری ئاسمانەکان و زەمینە، هەموو مەخلوقاتی بە خواست و توانای ویستی خۆی خوڵقاندووە.

وە ئەرستۆ و فەیلەسوفە هاوشێوەکانی یۆنان هەسارەو بتیان دەپەرست، فریشتە و پێغەمبەران ناناسن، لە کتێبەکانی ئەرستۆدا باسی هیچ شتێك لەوانە نەکراوە، لە ڕاستیدا زۆربەی زانستی ئەوان تەنها لە بواری زانستە سروشتیەکاندا بوو، بەڵام لە بواری شتە ئیلاهیەکاندا هەر یەکێکیان ڕاستی کەمبوو، هەڵەی زۆر بوو.

---

(١)_ بەڵێ، جوولەکەو گاورەکان باوەڕیان بەوەیە کە خوا ئاسمانەکان و زەمینی خوڵقاندووە، باوەڕیان بە پێغەمبەران هەیە بە باوەڕێکی گشتی (مُجْمَل)، باوەڕیان بەڕۆژی دوایی هەیە، بەڵام ئەوان باوەڕیان بە هیچ شتێك نییە مەگەر ئەوەی عەقڵ و خەیاڵیان بیسەلمێنێ، هەروەها ئەو چینە صۆفیەش کە شوێنیان دەکەون بەم شێوەیە.

(٢)_ چونکە هاوەڵپەرستانی عەرەبیش باوەڕیان بە یەك خوا پەرستی پەروەردگارێتی (توحید الربوبیة) هەبوو، ئەمەش لە قورئاندا هەیە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾[الزمر: ٣٨] واتە: سوێند بەخوا ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بێ گومان دەڵێن: خوا. بەڵام فەیلەسوفان ئەمە ناڵێن، بەڵکو دەڵێن: ئاسمانەکان و زەمین قەدیم و کۆنە بێسەرەتایەو، نەخوڵقێنراوە.

وه جووله‌كـه‌و گاوره‌كـان _ ته‌نانـه‌ت پـاش نه‌سـخ و ده‌سـتكاری و گـۆڕینی ئایینه‌كه‌شیان _ له بواری ئیلاهیاتدا زۆر له‌وان زاناترن، به‌لام فه‌یله‌سوفه پاشینه‌كانی تریان وه‌كو _ ئیبن وسینا _ ویستیان له‌نێوان قسه‌ی فه‌یله‌سوفان و له‌نێوان ئه‌وه‌ی كه پێغه‌مبه‌ران هێناویانه جۆره گونجاندێك دروست بكه‌ن[1]، بۆیه چه‌ند شتێكیان له هه‌ندێ ئوصول و بنه‌ڕه‌تی جه‌همییه‌كان و موعته‌زیله‌كان وه‌رگرت و، له‌گه‌ڵ قسه‌ی ئه‌واندا تێكه‌ڵیان كردوو، بیرباوه‌ڕێكیان لێ دروست كرد كه پێده‌چێت فه‌یله‌سوفانی میلله‌تان و ڕێبازه‌كان خۆیان بده‌نه پاڵی ڕاست بێت یان درۆ بێت، كه خراپه و جیاوازیی و له یه‌ك نه‌چوونێكی زۆری تێدایه و، له شوێنی تردا ئاگادارن، له باره‌وه دراوه .

---

(١)_ ئیبن وسینا فه‌یله‌سوفه، خۆی داوه‌ته پاڵ ئیسلام، كاتێ ته‌ماشای قورئان و سوننه‌تیكردو، ته‌ماشای قسه‌ی فه‌یله‌سوفانی كرد، بۆیده‌ركه‌وت هه‌ر دووكیان ناگونجێن، بۆیه هه‌وڵیدا جۆره گونجاندێك له‌نێوان قسه‌ی ئه‌وان و به‌ڵگه‌كانی قورئان و سوونه‌تدا بكات، بۆیه پۆشاكێكی ئایینداریی به فه‌لسه‌فه پۆشی و، وایڕاگه‌یاند كه فه‌لسه‌فه موخالەفه‌ی قورئان ناكات، له ڕاستیدا ئه‌مه چه‌واشه‌كردنی خه‌ڵكه، كۆكردنه‌وه‌یه له نێوان دوو شتی دژ، سه‌رلێشێواندنی خه‌ڵكه.

وە كاتێك ئەمانە تەماشایان كرد كاروباری پێغەمبەرانی وەكو موساو، عیساو، موحەممەد ﷺ بەڕاستی جیهانی ڕووشن و ڕووناك كردۆتەوە، وە دانیان بەوەدانا كە ئەو ناموس و شەریعەتەی بۆ موحەممەد ﷺ دابەزێنراوە گەورەترینی ناموس وشەریعەتێكە لە دەروازەی جیهانی دابێت، وە تەماشاین كرد پێغەمبەران باسی فریشتەو جنۆكەیان كردووە، ئیتر ویستیان لە نێوان ئەوانەو لە نێوان قسەی پێشینانە یۆنانیەكانیاندا جۆرە كۆكردنەوەو گونجاندنێك بكەن[1]، ئەو یۆنانیانەی كە دورترین خەڵكن لە ناسینی خواو، فریشتەكانی و، كتێبەكانی و، پێغەمبەرانی و، ڕۆژی دواییەوە. فەیلەسوفان دە عەقڵیان داناوە[2]: بە(المجرّدات و المفارقات)ی ناو دەبن.

---

(١)_ فەیلەسووفەكانی یۆنان لە فریشتەو، لە جنۆكە و، لە زانینی غەیب نكۆڵیی دەكەن، بەڵام ئیبن وسینا كاتێك تەماشای كرد پێغەمبەران باسی فریشتەكان و جنۆكە دەكەن، ویستی پاكانە بۆ فەلسە بكات، بۆیە جۆرە ڕازاندنەوەیەكی بۆ پۆشیی و، گوتی: فەلسەفە پێچەوانەی ئەوانە نییە كە پێغەمبەران هێناویانە، چەند شتێكیان داهێنا بۆ ئەوەی فەلسەفەی كۆنی پێبگونجێنن و، لە نێوان خەڵكدا بڵاوی بكەنەوە، چونكە پێیان ناخۆش بوو پووچێتی و خراپەكانی فەلسەفە دەركەوێت. ئا ئەمەیە ڕێگەی ئەهلی گومڕایی كاتێ تەماشایان كرد بەڵگەكان پێچەوانەی گۆفتارەكانیانە، دەیگۆڕن بۆ ئەوەی لەگەڵ گوفتارەكانیاندا سازیار بێت.

(٢)_ فەیلەسوفەكان دە عەقڵیان داناوە كە گوایە تەصرووف بە گەردوونەوە دەكەن، بە بۆچونی ئەوان عەقڵی یەكەم عەقڵی دووەمی درستكردو، ئەقڵی دووەمیش عەقڵی سێ یەمی دروستكردوو، بەو جۆرە تاوەكو دەیەم عەقڵ، بە بۆچونی ئەوان هەموو شتێك لە دروستكردنی عەقڵی دەیەمە، كە بە(العقل الفعال)ی ناودەبەن، بەلای

---

---

---

ئەوانەوە ئەو عەقڵە کێیە ؟ جبریلە _ علیه السلام _، ئەم بیروباوەڕە کوفرە. بۆیە ڕاستی فەرمووە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێبێت _ کاتێك دەڵێت: کوفری ئەمانە لەکوفری جوولەکەو گاورەکان گەورەترە. چونکە هەموو شتێکیان لەم گەردوونەدا کرووە بە مەخلوقات و دروستکراوی دەستی جبریل. کە بە(العقل الفعال)ی ناودەبەن، دەیەم عەقڵ، ئەمان ئەم جۆرە ئەقڵانەیان هەبوو پێش ئەوەی چاویان بە گوفتاری پێغەمبەران بکەوێت، دوای ئەوان شوێنکەوتوانیان هاتن تەماشایان کرد پێغەمبەران لە بارەی فریشتەکانەوە دواون، بۆیە جۆرە سازیار بوون و ڕێککەوتنێکیان لە نێوان گوفتاری پێغەمبەران و قسە پڕوپوچەکانی ئەو فەیلەسوفانەدا کردو، گوتیان: ئەو عەقڵانەی کە فەیلەسوفان لە بارەیانەوە دواون ئەو فریشتانەیە کە لە گوفتاری پێغەمبەران دایە، بڕوانە: (شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان، موقع الدكتور خالد بن عبدالله المصلح على الإنترنيت)، وەرگێڕ.

بنچینەی وشەی (المفارقات)یش لە زمانی عەرەبیدا لە (مفارقة النفس للبدن)ەوە وەرگیراوە، واتە: (جیابونەوەی نەفس لەجەستە)، ئەوەیان بە (المفارقات) ناونا، واتە لە مادە جیا بۆتەوە، بە (المجرّدات)یشیان ناونا بەهۆی سەربەست بوونیەوە لێی(لتجرّدها عنها)، بۆ ئەفلاکیش بۆ هەر فەلەکێك نەفسێکیان دانا، وە زۆربەشیان کردویانن بە عەرەز، هەندێکیشیان کردویانن بە جواهر[1].

وە ئەو (المجرّدات)انەی کە فەیلەسوفەکان دایان ناوە _ ئەگەر بە تەواوی لێی بکۆڵیتەوە _ دەبینیت شتانێکن تەنها لەزەین و بیردا بوونیان دەبێت بەڵام لەشتە بینراوە واقیعیەکاندا نین[2]

---

(١)_ بەڵێ، هەندێ کردویانن بە عەرەز، دەڵێن: ئەم ئەفلاکانە لە دەرەوەی زەین و بیردا بوونی نییە بەڵکو عەرەزن، عەرەزیش بریتیە لەوەی کە بوونی بەهۆی شتی غەیری خۆیەوەیەتی و، دێت و نامێنێت وەکو ڕەنگەکان رەش و سپی و ڕەنگەکانی تر ئەمانە بەهۆی شتی ترەوە دەبن و دەوەستن، بەڵام جەوهەر هەر شتێکە خۆی خۆی ڕادەگرێت.

(٢)_ هەر هەمووی خەیاڵاتە جەوهەر و عەرەزو شتانیتری لەو جۆرەی ئەوان باسی دەکەن تەنها خەیاڵاتن و هیچی تر.

نموونـەی ئـەمانیش وەکـو نموونـەی هـاوەڵانی فیساغۆرسـە کـە ژمارەگـەلێکی بێکۆتایـان دانـاوە، بـە نموونـەی هـاوەڵانی ئەفلاتۆنـە کـە نموونـە ئەفلاتۆنیـە خەیاڵاویـەکانیان دانـاوە(الأمثال الأفلاطونية المجرّدة)، وەکـو ئـەوەی هیـۆلای بێـوێنەیان داناوە[(١)] زەمەن و شوێنیان داناوە کە لە بوون بەدەر بێت. لە کاتێکدا زیرکە چا بووکە بەسەلێقەکانیان دانیان بەوەدا ناوە کە ئەو شتانە لـە راسـتیدا تـەنها لـەزەین و بـیردا بوونی هەیە نەك لە واقیعی بینراودا.

وە کاتێك کەسانێکی پاشینانیان وەکو _ ئـیبن وسـینا _ ویسـتی پێغەمبەرایـەتی لەسـەر ئوصـول و بنەڕەتـە بۆگەنـەکانی ئـەوان جـێگیر بکـات: وای ڕاگەیانـد کـە پێغەمبەرایەتی سێ تایبەتمەندی هەیە[(٢)] لە هەر کەسێکدا بێت ئەوە پێغەمبەرە:

---

(١)_ هیۆلاو وێنە: هیۆلا واتـە مـاددە، وێنـەش واتـە ئـەو وێنەیـەی لـەو مـاددەوە دروست دەبێت، بۆ نموونە هیۆلای مایکرەفون ئاسنە یان هەر کانزایەکی ترە، هیـۆلای کتێب کاغەزە، ئەوان هیۆلایان داناوە بەڵام بەبێ وینەو شێوە، ئایا هیچ کەسـێك هەیـە کانزایەکی بێـوێنەو شێوەی بینیبێت، نەخێر، هیچ شتێك بێـوێنەو شێوە نییـە، ئەگـەر وێنەی نەبوایە بیرو هۆشی مرۆڤ هەستی پێنەدەکرد، شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خـوا لێبێت _ دەیەوێت ئەوەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کە لە کوێەوە فەیلەسوفەکان ئەو جۆرە قسە خراپەیان وەرگرتووە، ئەوان تەنها لە فەیلەسوفەکانەوە وەریانگرتووە، ڕێباوەڕی فەیلەسوفان ئەمەیە.

(٢)_ بە لای ئەوانەوە پێغەمبەرایەتی بە دەست دەهێنرێت، بە هەڵبژاردن نییە لە لایەن خوای گەورەوە، بەڵکو بەچەند سیفاتێك کە ئەگەر لە هەر مرۆڤێکدا هەبێت ئـەوا بە دەست دێت.

یەکەم: هێزیەکی زانستیی هەبێت، کە بەهێزی قودوسی ناوی دەبەن، کە بە هۆیەوە زانست وەرگرێت بەبێ فێر بوون[١].

دووەم: هێزێکی خەیاڵکردنی هەبێت[٢] کە شتانێکی بە خەیاڵدا بێنێت لە نەفسی خۆیەوە هەستی پێبکات و لێی تێبگات، بە جۆرێك لە نەفسی خۆیەوە وێنە گەلێك ببینێت یاخود لە نەفسی خۆیەوە دەنگەلێك ببیستێت، وە لە دەرەوە هیچ بوونێکی نەبێت، وە وایانزاگەیاند گوایە ئەو وێنانە فریشتەکانی خوان، وە ئەو دەنگانە گوفتاری خوای گەورەن.

سێ یەم: وە هێزێکی کاریگەریی هەبێت، کاری پێبکاتە سەر هیۆلای جیهان.

وە موعجیزاتی پێغەمبەران و، کەرامەتی ئەولیاو، کردەوە نائاسایە لە سروشت بەدەرەکانی جادووگەرانیان بۆ هێزی نەفس (قوى النفس) گەڕاندۆتەوە، بۆیە دانیان بەهەندێ لەوانەدا ناوە کە لەگەڵ ئوصول و بنەڕەتەکانی خۆیاندا گونجاوە، کەچی دانانیان بە موعجیزاتێکی وەکو گۆڕینی دارەکە بۆ مارو، لەتبوونی مانگ و، چەند شتێکی دیکەی بەو شێوانەدا نەناوەو، نکۆڵیی لێدەکەن.

---

(١)_ بە هۆی هێزە قودوسیەکەیەوە زانست بە دەست دەهێنێت بەبێ فێر بوون، ئایا ئەمە دەشێت؟ ئایا زانست بە بێ فێر بوون بە دەست دێت لە نێوان هەر هەموو مرۆڤایەتیدا؟

(٢)_ هێزێکی خەیاڵکردنی بۆ خەڵك هەبێت، شتانێکیان پێ بڵێت هیچ حەقیقەتێکی نەبێت، بڵێت: زیندوو بوونەوەو، کۆ کردنەوەو، بە هەشت و دۆزەخ هەیە، خەیاڵی ئەم شتانە بکات کە گوایە هیچ حەقیقەتێکی نییە، بەڵام تەنها لە پێناو بەرژەوەندیەکانی خەڵکدا. ئەمەیە قسەی فەیلەسوفان.

وە لە چەندین شوێنی دیکەدا بەدرێژی باسی ئەمانەمان کردووە، وە ئەوەمان ڕوونکردۆتەوە کە ئەو قسانەیان بۆگەنترین قسەن، وە ئاماژەمان بەوە داوە کە ئەوەی ئەوان بە سێ تایبەتمەندیەکەیان داناوە بۆ دەست هێنانی پێغەمبەرایەتی، لەوەش گەورەتر بۆ زۆرێك لە تاکەکانی خەڵك و، شوێنکەوتوانی پێغەمبەران بەدیدێت، وە ئەو فریشتانەی پێغەمبەران هەواڵیان لە بارەیانەوە پێداوین زیندەن، بوێژن، گەورەترین مەخلوقاتی خوان، زۆر زۆرن، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاَّ هُوَ﴾[1] [المدثر: ٣١] واتە: وە کەس ژمارەی لەشکرانی پەروەردگاری تۆ نازانێ مەگەر هەر خۆی. کەوا بوو فریشتە تەنها دە دانە نین، عەرەزیش نین، بە تایبەت بانگەشەی وا دەکەن کە ئەوەی هەموو شتێکی لێکەوتۆتەوە: عەقڵی یەکەمە، کە جگە لە خۆی هەموو شتێکی لێکەوتۆتەوە، بە لای ئەوانەوە پەروەردگاری هەموو شتێکە جگە لە خوا، هەروەها هەر عەقڵێك پەروەردگاری هەموو ئەوانەیە کە لە خوار خۆیەوەن، وە عەقڵی کاریگەری دەیەم پەروەردگاری هەموو ئەو شتانەیە کە لە ژێرەوەی خولگەی مانگدان.

---

(١)_ ئەوان دە فریشتە نین وەکو ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن و، بە دە عەقڵەکەیان (العقول العشرة) ناو دەبەن، لە ڕاستیدا بە تەنها خوای گەورە هەرخۆی دەزانێت ژمارەی ئەو فریشتانە چەندن، ئەو فریشتانە هێزی نەفسانی(قوى نفسانية) نین، ئەندێشەی نەفسانیش (هواجس نفسانية) نین، وەکو ئەوەی فەیلەسوفان ڕای دەگەیەنن و، دەڵێن: ئەو ئەندێشە نەفسانیانە ئەگەر چاك بن ئەوە فریشتەن و، ئەگەر پیس و خراپیش بن ئەوە شەیتانن، دەڵێن: بە ڕاستی لە دەرەوەدا هیچ فریشتەو شەیتانێك نییەو تەنها ئەو ئەندێشە نەفسانیانەن.

وه له ئایینی هەموو پێغەمبەراندا پووچەڵی و بێ بنەمایی ئەو شتانە بە ئاشکرا دەزانرێت، چونکه هیچ یەکێك له فریشتەکان داهێنەری هەموو شتێکی جگه له خوای گەورەنین[1].

---

(١)_ فریشتەکان هیچ شتێك دروست ناکەن، خۆیان خولقێنراون، بەندەی خوای گەورەن، بەندەگەلێکی بەڕێزن، لەڕاستیدا تەنها فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ دەکەن، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿لا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ﴾ [الأنبياء: ٢٧] واته: له خوا پێش ناکەون به قسەو گوته وه ئەوان به فەرمانی خوا کار دەکەن. ئا ئەمانه فریشتەکانن، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿جَاعِلِ الْمَلائِكَةِ رُسُلا أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ﴾[فاطر: ١] واته: فریشتەکانی کردووه به نێرراوانێك خاوەنی (چەند جۆره) باڵن: دووان و سیان و چوار. ئەوان هیچ نین جگه لەوەی بەدیهێنراوێکن له بەدی هێنراوانی خوای گەورە، بوونیان هەیەو دەبینرێن.

## (ضعيف) بوونى

## ئەو فەرموودانەی کە لە بارەی چاکێتی ئەقڵەوە هاتوون

وە ئەوان بانگەشەیەکی وا دەکەن گوایە عەقڵی یەکەم بریتیە لەو عەقڵەی کە لەم فەرموودەیەدا باس کراوە: ((إن أول ماخلق الله العقل[1]، فقال له: أقبل، فأقبل، فقال له: أدبر، فأدبر، فقال: وعزتي ما خلقت خلقاً أكرم عليَّ منك، فبك آخذ، وبك أعطي، ولك الثواب، وعليك العقاب))[2] واتە: ((یەکەم جار خوا عەقڵی دروست کرد، پێی فەرموو: وەرەپێشەوە، هاتە پێشەوە، پێی فەرموو: بچۆ، چوو، ئیتر فەرمووی: بە شکۆمەندیم هیچ بەدیهێنراوێکم بەدی نەهێناوە لە تۆ بەڕێزتر بێت بەلامەوە، بۆیە بە تۆ وەردەگرم، بە تۆ دەبەخشم، پاداشت بۆ تۆیە، سزاشت لە سەرە)).

---

(١)_ موضوع: قال الصاغاني (كما نقل عنه في كشف الخفاء ٨٢٣)، بلفظ: ((أول ما خلق الله العقل)): موضوع بأتفاق.

ولمزيد كلام على هذا الحديث انظر ((كشف الخفاء)) (٧٢٣)، بلفظ: ((إن الله لما خلق العقل، قال له: أقبل...)).

وانظر: ((سلسلة الأحاديث الضعيفة)) حديث رقم (١)، ففيها كلام جيد بشأن الأحاديث الواردة في العقل وبيان ضعفها ووضعها، وهذا الحديث الذي بين أيدينا عزاه السيوطي إلى زوائد عبدالله ابن الإمام أحمد على ((الزهد)) لأبيه بسند فيه ضعف عن الحسن البصري مرفوعاً مرسلاً.

قلت: وفضلاً عن الضعف الذي فيه فإن مرسلات الحسن البصري من أضعف المراسيل.

(٢)_ بەڵێ، ئەو فەیلەسوفانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام دەیانەوێ بڕەو بە فەلسەفەی کۆن بدەن، بۆیە ئەم فەرموودە (موضوع)ە هەڵبەستراوە درۆیەیان وەرگرتوە، گوایە یەکەم شت کە خوای گەورە خولقاندبێتی عەقڵە، ئەمە درۆیە، یەکەم جار خوای گەورە قەڵەمی خولقاندووە.

هەروەها ئەو عەللە بەقەلەمیش ناو دەبەن[1] لە بەر ئەوەی گێردراوەتەوە: ((إن أول ما خلق الله القلم)) صحيح: أخرجه أبوداود (٤٧٠٠)، والترمذي (٢١٥٥)، و(٣٣١٩)، واحمد (٥/٣١٧)، من حديث عبادة بن الصامت رضي الله عنه مرفوعاً[2].

وە ئەو فەرموودەیەی سەبارەت بە عەقل دەیگێڕنەوە درۆیەو (موضوع)ە بە لای هەموو فەرموودە ناسانەوە، وەکو ئەوەی ئەبو حاتم ئەلبوستی[3]و، و، ئەبولحەسەنی ئەلدارەقوتنی و، ئیبن و لجەوزی و کەسانی تر باسی دەکەن[4].

---

(١)_ ئەوەی ئەوان دەیکەن (تحريف)ە گۆڕینە چونکە قەڵەم عەقل نییە، قەڵەم بوونەوەرێك بوو خوای گەورە خوڵقاندی، پێی گوت: بنووسە ؟ گوتی: چ بنووسم؟ فەرمووی ئەوەی دەبێت. کەواتە ئەو بەدی هێنراوێکی خوای گەورەیە، عەقل نییە، لە نێوان عەقل و قەڵەمدا جیاوازی هەیە، بەڵام ئەوان تێکەڵ و پێکەڵ دەکەن و، سەر لە خەڵك دەشێوێنن، بەدوای ئەو شتانەدا دەگەڕێن کە برەو و بازا بەڕێبازە پووچەکەیان بدات، ئەگەر چی بەم فەرموودە هەڵبەستراوانەش بێت.

(٢)_ دەڵێن مەبەست بەقەڵەم عەقڵە، ئەوەی دروست بێت یەکەم جار خوای گەورە قەڵەمی دروست کرد وەکو ئەوەی لە فەرموودەکەدا هاتووە، بەڵام قەڵەم عەقل نییە.

(٣)_ ئەبو حاتم ولبوستی: ئیبن و حیبانی دانەری کتێبی (الصحيح)ە.

(٤)_ ئەو پێشەوایانە دەڵێن: بە ڕاستی ئەو فەرموودەیە درۆیە، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە شێرە سوارانێکی لەئەهلی سووننەت ڕەخساندووە لەم درۆزنانەو هەڵبەستکارانە دەیپارێزن، خوای گەورە کارەساتەکەی بۆ خۆیان گەڕاندەوە، سوپاس بۆ خوا، هیچ کەسێك زاتی نییە بە دەم پێغەمبەری خواوە ﷺ درۆ هەڵبەستێت، ئەگەر هەوڵی ئەوەش بدات خوای گەورە کەسانێکی بۆ دەرەخسێنێت ئاشکرایان بکەن.

وە فەرموودەکە لە هیچ یەکێك لەو کتێبە فەرموودانەدا نییە کە پشتی پێدەبەسترێت[١] لەگەڵ ئەوەشدا بێژەکەی _ ئەگەر جێگیریش بێت _ بەڵگەیە لەسەریان، چونکە لەم بێژەیەدا هاتووە: ((أول ما خلق الله تعالى العقل قال له . . . )) واتە ((یەکەم سات کە خوای گەورە ئەقڵی خولقاند پێی فەرموو . . . . ))، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((لما خلق الله العقل قال له . . . )) واتە: ((کاتێ خوای گەورە عەقڵی خولقاند پێی فەرموو . . . . ))، کەوا بوو مانای فەرموودەکە: ئەوەیە کە خوای گەورە لە یەکەم ساتەکانی خولقاندنی عەقڵدا لەگەڵیدا دووا، مانای فەرموودەکە بەو جۆرە نییە کە عەقڵ یەکەم مەخلوقاتی خوای گەورە بێت[٢].

---

(١)_ ئەم فەرموودە لەکتێبەکانی فەرموودەدا نییە، چونکە ئەگەر فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بوایە فەرموودەناسان پشتگوێیان نەدەخست.

(٢)_ وشەی (أول) مانای ئەوەنییە کە عەقڵ یەکەم بەدی هێنراوانی خوای گەورە بێت، بەڵکو مانای ئەوەیە کە یەکەم سات خوای گەورە خولقاندی لەگەڵیدا دووا، وەکو ئەوەی سەبارەت بە قەڵەمیش هاتووە، خوای گەورە یەکەم سات کە قەڵەمی بەدیهێنا پێی فەرموو: بنووسە، کەوا بوو وشەکە بۆ ئەوەیە کە خوای گەورە هەر کە خولقاندنی لەگەڵیدا دووا، بەڵام مانای یەکەمین بوون، لە دروست کردندا نا بەخشێت، وشەی (أولَّ) (منصوبٌ)ە لەسەر (الظرفية) واتە: لێرەدا ئاوەڵفەرمانە بۆ کات، واتە: خوای گەورە یەکەم سات کە دروستی کرد پێی فەرموو: وەرە پێشەوە، وە یەکەم ساتیش کە قەڵەمی دروستکرد پێی فەرموو: بنووسە، یەکەمیەتێکی ڕێژەییە نەك یەکەمیەتێکی ڕەهایی وەکو ئەوەی دەگوترێت.

وشەی (أَوَّلَ)[1] (منصوبٌ)ە لەسەر (الظرفية)ت، وەکو ئەوەی لەبێژەکەی دیکەشدا هاتووە (لما)، واتە ئاوەڵفەرمانە بۆ کات. تەواوی فەرموودەکەش: ((ما خلقت خلقاً أكرمَ عليَّ منك. . . )) واتە: ((هیچ بەدیهێنراوێکم بەدینەهێناوە لە تۆ بەڕێزتربێت بەلامەوە. . . )) ئەمە مانای ئەوەیە کە خوای گەورە پێش ئەو شتانێکیتری بەدیهێناوە[2]. پاشان دەفەرموێت: ((فبك آخذ، وبك أعطي، ولك الثواب، وعليك العقاب)) لێرەدا تەنها چوار جۆر کردەوەو عەرەزی باس کردووە، کەچی بەلای ئەوانەوە هەر هەموو شت و جەواهیرەکانی جیهانی سەروو و ژێروو لەو عەقڵەوە کەوتۆتەوە، کەوا بوو ئەمە لە کوێ و ئەوە لەکوێ؟!

---

(١)_ ئەگەر وشەکە (أَوَلُ) بوایە بە(رَفْع)، دەبووە (مُبْتَدَأ)و ئیتر داواکاریەکەی ئەوانی بەجێدەهێنا، بەڵام وشەکە لەنێو فەرموودەکەدا بە(نَصْبْ) هاتووە بەم شێوە (أوَّلَ) واتە ئاوەڵفەرمانە بۆ کات.

(٢)_ بڕوانە چۆن درۆکانیان بەسەر خۆیاندا شکایەوە، ((ما خلقت خلقاً أكرمَ عليَّ منك...)) ((هیچ بەدیهێنراوێکم بەدینەهێناوە لە تۆ بەڕێز تربێت بەلامەوە...)) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە پێش عەقڵ شتانێکی دیکەی بەدیهێناوە، بەڵام تەنها لە مەخلوقاتەکانی پێشتر چاکتر بووە، هەر چەندە فەرموودەکە هەڵبەستراوە بەڵام شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێبێت _ دەیەوێت هەر لە چوار چێوەی قسە درۆکانی خۆیانەوە وەڵامیان بداتەوە.

# حەقیقەتی عەقڵ

هۆکـاری کەواتنـە هەڵـەیان: بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە وشـەی عـەقڵ لـەزمانی موسڵمانانـدا مانایەکی جیاواز دەبەخشێت لـە وشـەی عـەقڵی ئـەو یۆنانیانـەدا[1]، (فإن العقل في لغة المسلمين مصدر عَقَلَ يَعْقِلُ عقلاً) واتـە (عـەقڵ لـە پێناسـەی زمانـەوانی دا چاووگە بـۆ تێگەیشـت تێـدەگات تێگەیشـتن)، ئەمـەش لـە قورئـانی پـیرۆزدا هـاتووە: ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾[2] [الملك: ١٠] واتــە: وە دەڵێن ئەگەر قسەی (پێغەمبەران)مان ببیستایە یـا تێبگەیشـتینایە ئـەمڕۆ لـە هـاوڕێ یانی دۆزەخ نەدەبوین. هەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ [الرعد: ٤] واتە: بە ڕاستی لەوانەدا چـەند نیشـانەی ڕوون هەیـە بـۆ ئەوانـەی تێدەگەن.

---

(١)_ عەقڵ هەیە، وە ئەقڵ خولقێنراوە هیچ گومانی تێدا نییـە، بـەڵام ئـەو عەقڵـە نییـە کـە فەیلەسـوفان مەبەسـتیانەو دەیانـەوێت، بـەڵکو بـەلای موسـڵمانانەوە عـەقڵ بریتیە لەوەی کە خـوای گـەورە خولقاندویـەتی و، بـە مرۆڤـی سـپاردووە، بـۆ ئـەوەی زیانبەخش و سوودبەخش، هەق و باتڵ پێ لێك جیاکاتـەوە، پێـوە بکـات، بـە ڕاسـتی عەقڵ بەهرەو نیعمەتێکی خوای گەورەیـە، بۆیـە هـەر کـات مرۆڤـ عـەقڵی لـە دەسـتدا وەکو ئاژەڵی لێدێت، کەوا بوو عەقڵ نیعمەتە، لە مەخلوقەکانی خـوای تەعالایـە بـەبێ هیچ گومانێك، کەوا بوو مانای عـەقڵ بـە لای موسـڵمانەوە زۆر جیـاواز تـرە لـە مانـای عـەقڵ بـە لای فەیلەسـوفە یۆنانیەکانـەوە، بـەلای ئەوانـەوە گوایـە عـەقڵ خولقێنـەری گەردوونە و، تەنها عەقڵ ئەم گەردونەی دروست کردووە.

(٢)_ عەقڵ بریتیە لـەوەی کـە مرۆڤـ وێنـای شـتەکان لـە مێشـکی خۆیـدا بکـات، سیفەتێکە خوای گەورە بە مرۆڤی سپاردووە، هەروەها عەقڵیش بریتیە لە درك پێی

........................................................................

........................................................................

........................................................................

کەڕن و تێگەیشتن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ﴾ [الفرقان: ٤٤] واتە: ئایا وادەزانی زۆربەی ئەوانە دەبیستن یا تێدەگەن، واتە تێناگەن و عەقڵیان پێدا ناشکێت ئەگینا ئەوان عاقڵن، شێت نین، بەڵام عەقڵیان پێدا ناشکێت و، لە شتەکان تێناگات لەسەر خۆیان، هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِنْ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ﴾ [البقرة: ٧٥] واتە: کەچی لە پاش تێگەیشتنی دەستکاریان دەکرد. واتە پاش ئەوەی لێی تێگەیشتن و عەقڵیان پێدا شکا هەستان بە دەستکاری کردنی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾(1) [الحج: ٤٦] واتە: دەی ئایا ئەوانە بەزەوی دا نەگەڕاون تا دڵیان هەبێ بیری پێ بکەنەوە (لەو وێران بوونە) یا گوێیان هەبێ گوێی پێ بگرن (بۆ ڕاستی).

هەروەها مەبەست بە عەقڵ: ئەو غەریزەو خەسڵەتە سروشتی و زگماکیەیە کە خوای گەورە بەمرۆڤی داوە تاوەکو بەهۆیەوە تێبگات و کاروبارەکانی خۆی جێبەجێبکات(2).

---

(١)_ (يعقلون بها) واتە: بە هۆیەوە تێدەگەن، مانای ئایەتەکە ئەوە نییە کە بە زەویدا بگەڕێن بۆ ئەوەی دڵیان بۆ بخوڵقێنرێت، نەخێر، چونکە دڵەکانیان تێدا خوڵقێنراوەو هەیە، بەڵام بۆ تێگەیشتن بەکاری ناهێن، وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ [الأعراف: ١٧٩] واتە: دڵیان هەیە بەڵام پێی تێناگەن لە (ڕاستی).

(٢)_ عەقڵ دوو مانا دەبەخشێت، یەکێکیان ئەو غەریزەو خەسڵەتە سروشتیە زگماکیەیە کە خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیوەو، لە ئاژەڵان جیای دەکاتەوە، لەشێت جیای دەکاتەوە، بەڵام مانای دووەم: تێگەیشتن و عەقڵ پێدا شکاندن دەگەیەنێت.

بەڵام بەلای فەیلەسوفانەوە: عەقڵ جەوهەرێکی سەربەخۆیە پێویستی بە یارمەتی نییە وەکو هەست پێکارێکی تێگەیشتوو[1]، ئەمەش لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەرو قورئان دەیڵێن دژەو نەگونجاوە[2].

---

(١)_ عەقڵ شتێك نییە ببینرێت، بەڵكو شتێكە خوای گەورە بە مرۆڤی سپاردووەو، لەنهێنیەكانی خوای گەورەیە، وەكو ڕوح وەكو شتانی تر، نابینرێت. تەنانەت مرۆڤ توانای جیاكردنەوەی كەسێكی عاقڵ و كەسێكی شێتی نییە مەگەر لەمیانەی ڕەفتاری هەر دوكیانەوە بزانرێت، ئەگەر بە لای كەسێكی عاقڵ و كەسێكی شێتدا تێپەڕ بوویت، لەو كاتەدا هەر دووكیان بێدەنگ بوون، تۆ ناتوانیت بزانیت كامیان عاقڵەو كامیان شێتە، چونكە عەقڵ نابینرێت، بەڵكو نهێنیەكە خوای گەورە بە مرۆڤی سپاردووە، بەڵام فەیلەسوفان دەڵێن: نەخێر، عەقڵ شتێكی خولقێنراوە، جەستەی هەیە، چارەسازی دەكات، فەرمان دەكات، قەدەغە دەكات، نەخێر ئەم شتانە درۆیە، عەقڵ لە دەرەوە نییە تا خەڵكی ببینن، بەڵكو شتێكی نهێنییە جگە لە خوای گەورە كەسی دیكە نایزانێت، وەكو ڕوح كە لە مرۆڤ و ئاژەڵدایەو كەسیش نایبینێت، شتێكی نهێنی مەعنەوییە، شتێكی بینراوی هەستپێكراو نییە بخولقێنێت و، چارەسازی بكات، فەرمودەكەش درۆ و هەڵبەستراوە، خوای گەورە نەیفەرمووە: دوواوە وەرە پێشەوە بچۆ.

(٢)_ عەقڵ شتێك نییە بە خۆی ڕاوەستێ و پێویستی بە یارمەتی نەبێت، جەوهەریش نییە، عەرەزیش نییە، چ كەسێك عەقڵی بینیوە، ئایا كەسێك لە ئێوە عەقڵی بینیوە ڕێ بكات؟ كێ بینویەتی؟ نهێنیەكە بەم مرۆڤە سپێردراوە وەكو ڕوح نابینرێت، بە بۆ چونی ئەوان عەقڵ شتێكە دەچێتە دەرەوە، سەردەكەوێت، دادەبەزێت، بەڵام هەر هەموو ئەمانە درۆیە، خوای گەورە چەندها مەخلوقاتی هەیە بەدەر لە خۆی كەسی تر نایان بینێت.

وه جیهانی دروستكراو (عالَم الخَلق): به لای ئەوانەوه _وەكو ئەوەی ئەبوحامدی ئەلغەزالی باسی دەكات_ جیهانی جەستەكانه (عالم الأجسام).

وه عەقلّ و نەفسەكانیش (العُقُول والنُفوس)، بەجیهانی فەرمانەكان (عالم الأمر) ناو دەبات.

وه پێدەچێت عەقلّەكان: به (عالَم الجَبَروت) ناو بەرێت، نەفسەكانیش: به (عالَم الملَكوت) ناو بەرێت، وه جەستەكانیش به (عالَم المُلْك) ناوبەرێت[1].

ئەو كەسەی شارەزای زمانی پێغەمبەر نەبێت و، ماناكانی قورئان و سوونەت نەزانێت: واتێدەگات ئەوەی لە سوونەتدا سەبارەت بە (المُلْك) و (الملَكوت) و (الجَبَروت) هاتوون جووت و سازیاری ئەوانەن كە فەیلەسووفەكان دەیڵێن، كەچی شتەكە بەو جۆرە نییە.

وه ئەمانە زۆر سەر لە موسڵمانان دەشێوێنن، وەكو ئەوەی دەڵێن: فەلەك داهێنراوه(مُحْدَثْ)، واتە: مەعلولە، لە كاتێكدا بەلایانەوه فەلەك كۆنە (قدیم)[2]، داهێنراوەیش (مُحْدَثْ) نەبوونی لە پێشی كەوتووه، لە زمانی عەرەبی و هیچ زمانی یەكێكی تریشدا نییە كۆنی ئەزەلی (القدیم الأزلي) بە داهێنراو (مُحْدَثْ) ناوبرێت[3]،

---

(١)_ هەر هەموو ئەمانەش هەڵەن و، تیایدا شوێنی قسەی فەیلەسوفەكان كەوتووه.

(٢)_ دەڵێن: فەلەك داهێنراوه(مُحْدَثْ)، پاشان دەڵێن: فەلەك كۆنە (قدیم)، كەوا بوو جیاوازی و لە یەك نەچوون لە قسەكانیاندا بەدی دەكرێت.

(٣)_ مەبەستیان سەرلێشێواندنە، دەڵێن: فەلەك داهێنراوه(مُحْدَثْ)، پاشان دەڵێن: فەلەك كۆنە (قدیم)، كەوا بوو جیاوازی و لە یەك نەچوون لە قسەكانیاندا بەدی دەكرێت، كاتێك دەڵێن: داهێنراوه(مُحْدَثْ) دەیانەوێت سەر لە خەڵك بشێوێنن، دەڵێن: جیهان داهێنراوه (مُحْدَثْ)ە، هەر هەموو مەخلوقات داهێنراوه (مُحْدَثْ) و هیچ شتێكی هەر بوو (قدیم) تێدا نییە.

بەڵام بە ڕاستی خوای گەورە هەواڵی داوە کە تەنها خۆی خولقێنەری هەموو شتێکە. وە هەموو خولقاوێکیش داهێنراوە (مُحدَث). وە هەموو داهێنراوێکیش (مُحدَث)یش ئەوەی کە نەبووە بەبوونی پێی بەخشراوە، هاتۆتە بوونەوە[1]. ئیتر مەزهەبەکانی نەفی و کەلامییەکانی جەهمی و موعتەزیلە موناقەشەیەکی کەمیان دەکرد[2]. چونکە بە تەواوی زانا نەبوون بەوەی کە پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە[3].

---

(١)_ هیچ شتێک نییە هەر بوو (قدیم) بێت _ واتە: هەر خۆی بۆ خۆی هەبوو بێت و خوای گەورە دروستی نەکرد بێت _ کەوابوو هەموو شتێکی مەخلوقات لە لایەن خوای گەورەوە داهێنراوە (مُحدَث)، پاش ئەوەی کە نەبووە لەلایەن خوای گەورەوە، هاتۆتە بوونەوە. یەعنی هیچ گومانێک خوای گەورە داهێنەرو خولقێنەری هەموو شتێکە. هەموو شتێک داهێنراوەو خولقێنراوە، خولقێنراویش پاش ئەوەی کە نەبووە هاتۆتە بوون.

(٢)_ جەهمی و موعتەزیلەکان ویستیان موناقەشەی فەیلەسوفان بکەن، بەڵام زانستێکی تەواویان پێنەبوو بۆ ئەوەی تیایدا بەکاری بێنن، چونکە پشتیان بە زانستی مەنتیق و مشتومڕ دەبەست بۆیە بەباشی وەڵامیان نەدایەوە، بە باشی وەڵامی فەیلەسوفانیان نەدایەوە. بۆیە ئەوان بە سەریاندا سەرکەوتن، چونکە خۆیان بە قورئان و سوننەت پڕ چەک نەکرد بوو، بەڵکو زانستی مەنتیق و مشتومڕیان پێبوو، فەیلەسوفانیش لەو جۆرە زانستەدا لەوان بەهێزتر بوون ئیتر وەڵامیان دایەوەو، بەسەریاندا سەرکەوتن. هەر کەسێک بیەوێت بەرپەرچی ئەهلی (باطل) بداتەوە، زانستی پێنە بێت باوەڕ حەق وەکو ئەوانی لێنێت و بەسەریدا سەردەکەون، کەوا بوو شیاو نییە وەڵامیان بدرێتەوە مەگەر بە زانستێکی تەواوەوە.

(٣)_ پشتیان بە عەقڵی خۆیان و مەنتیق و مشتومڕ بەست.

وە مەسەلە عەقلیەکانیشیان بە تەواوی تێدا بەکار نەهێنا، بۆیە نە ئیسلامیان سەرخست و، نەدوژمنانیشیان بەزاند[١]، لەهەندێ مەسەلە بۆگەنەکانیاندا هاوبەشیان کردن، کەچی لە هەندێ شتی ماقووڵی ڕاست و دروستیشدا مشتومڕیان لەگەڵ دەکردن[٢] ئیتر بێتوانایی ئەوان لە زانستەکانی قورئان و سووننەت و عەقڵیدا بوو بە هۆکارگەلێکی ئاشکرا بۆ بەهێزتر بوونی گومڕایان[٣] وەکو ئەوەی لە شوێنەکانی تردا ئەم بە درێژی باسمان کردووە[٤].

---

(١)_ ئەو جەهمی و موعتەزیلانە نەئیسلامیان سەرخست و، نە دوژمانیشیان بەزاند، چونکە زانستیان پێنەبوو، بەو زانستەی کە لە خوای گەورەوە دابەزیوە وەلامیان نەدانەوە.

(٢)_ بەڵێ، لە شتە ماقووڵە ڕاستەکاندا مشتومڕیان لە گەڵ دەکردن، کەچی لە شتە ناماقووڵە پووچەکاندا هاوڕایان بوون و دانیان پێدادەنا، لەبەر ئەوەی نەفام بوون و زانستیان پێ نەبوو، هەر کەس بە تێگەیشتنەوە خۆی بە قورئان و سووننەت پڕ چەك نەکات دەرەنجام و ئاکامی وەکو دەرەنجام و ئاکامی جەهمی و موعتەزیلەکانی لێدێت.

(٣)_ بەڵگەکانی قورئانی و سووننەت و زانستی پێغەمبەریان پێنەبوو، هەروەها بەڵگەی عەقڵی ماقوڵیی ڕاستیشیان پێنەبوو، بۆیە بەرامبەر بە دوژمنان شکستیان هێنا، چونکە چەکی بەهێزیان پێنەبوو بۆ بەرگری کردن.

(٤)_ شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ بۆ چەند کتێبێکی دیکەی خۆی دەتان گەڕێنێتەوە، وەکو کتێبی (العقل والنقل) و کتێبی (نقض المنطق).

وه لەوانەیە ئەو فەیلەسوفانە جبریل(علیه السلام) بکەن بەو خەیاڵ و تارماییەی کە لە نەفسی پێغەمبەری خوادا ﷺ دروست دەبێت[1] و، ئەو خەیاڵ و تارماییەش هی عەقڵە[2]، پاشانیش مولحیدانی صۆفی هاتن و، بوون بە هاوبەشی فەیلەسوفە مولحیدەکان و وایان ڕاگەیاند ئەوان ئەولیاو دۆستانی خوان، گوایە وەلی و دۆستیش لە پێغەمبەر چاکترەو، ئەوان بە بێ هیچ واسیتەو نێوەندکارێك چیان بوێ لە خواوە وەردەگرن، وەکو ئەوەی ئیبن وعەرەبی[3] دانەری کتێبەکانی ((الفتوحات)) و ((الفصوص)) بانگەشەی بۆ دەکات و دەڵێت: ئەو لەو سەرچاوەوە وەردەگرێت کە فریشتەکە لێوەی وەردەگرێت و، بۆ پێغەمبەری سرووش دەکات.

سەرچاوەکەش بە لای ئیبن وعەرەبیەوە عەقڵە، فریشتەکەش بریتیە لە خەیاڵ، خەیاڵەکەش سەربە عەقڵە.

---

(١)_ وەکو ئەوەی پێشتر ئاماژەی پێدرا بەلایانەوە فریشتە خەیاڵ و تارماییەکە پێغەمبەر خەیاڵی دەکات و، قسەی لەگەڵ دەکات و، دەیبیستێت، ئەوان دەڵێن: ئەم شتە لە دەرەوە بوونی نییە بەڵکو تەنها لەزەین و بیری خۆیدایە، بەڵێ بەلای ئەوانەوە فریشتە بریتیە لەو تارمایی و ئەندێشەو خەیاڵانەی کە بەبیری مرۆڤدا دێت.

(٢)_ هی عەقڵە: واتە تارمایی و خەیاڵ و سێبەری جبریلە، کە ئەوان بە (العقل الفیاض) واتە عەقڵی بەخشەری ناو دەبەن. بڕوانە: الشیخ الدکتور خالد المصلح، شرح الفرقان بین أولیاء الرحمن وأولیاء الشیطان. وەرگێڕ.

(٣)_ جیاوازی هەیە لە نێوان ئیبن وعەرەبی، کە ئەلف و لامی نییەو، لە نێوان ئیبن وئەلعەرەبیدا بە ئەلف و لام، یەکەم صۆفیەو، دووەمیش زانایەکی پایە بەرزە، مالیکی مەزهەبە، کتێبی لە تەفسیردا هەیە، کتێبی شەرحی ترمذي هەیە. چەندین کتێبی تری بەنرخ و بە سوودی هەیە.

ئیبن وعەرەبی _ بە بانگەشەکردنی خۆی _ لە عەقڵەوە وەردەگرێت کە بنەڕەت و ئەصلی خەیاڵە، بەڵام پێغەمبەر لە خەیاڵەوە وەردەگرێت، بۆیە بە لای خۆیەوە چۆنە سەرووی پێغەمبەر، بەڵام ئەگەر تایبەتمەندانی پێغەمبەر شتێکی ئاوەهایان باس نەکرد بێت، بە دڵنیایی ئیبن وعەرەبی لەو جۆرە نییە، ئیتر چۆن بەسەریدا سەرکەوێت، بە تایبەت ئەو خەیاڵاتانەی ئەوان باسی دەکەن بۆ تاکەکانی ئیماندارانیش بەدیدێت، پێغەمبەرایەتیش شتێکی ترە.

ئیبن وعەرەبی و هاوشێوەکانی _ ئەگەر چی بانگەشەی ئەوە بکەن کە لە صۆفیەکانن _ ئەوا لە صۆفیەکانی سەربە فەیلەسوفە مولحیدەکانن[1] لە صۆفیەکانی ئەهلی زانست نین، ئیتر چۆن لە شێخانی ئەهلی قورئان و سووننەت بن[2]،

---

(١)_ ئەوان لە صۆفیە میانڕەوەکان نین، هەندێ لە نووسەرانی هاوچەرخ سەر لە خەڵك دەشێوێنن و، دەڵێن: صۆفیەکان لەسەر هەقن، ئەوان خواپەرستن، ئەوان... ئێمەش دەڵێین: بەڵێ پێشینانیان ئاوەها بوون، بەڵام پاشینانیان، نەخێر.

(٢)_ بەڵێ، چونکە صۆفیەکان دوو بەشن وەکو ئەوەی ئاماژەی پێدرا، بەشی یەکەم: صۆفیە زاهیدو خواپەرستەکان، ئەمانە لە چوار چێوەی قورئان و سووننەت نەچوونە دەرەوە، وەکو فوضەیلی کوڕی عیاض و، جونەیدو، بیشری حافی و، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، ئەوانە صۆفیەکی میانڕەو بوون، ئەو پەڕی شتەکەیان زوهدو خوا پەرستی زۆر بوو، بەشی دووەم: صۆفیەکانی پاشینن ئەمانە مولحید بوون، کەواتە جیاوازی لە نێوان هەردوو بەشەکەدا هەیە، هێندێك لەسەر لە خەڵك دەشێوێنێت و دەڵێت: صۆفیەت هەقە، بە نموونە بە صۆفیەکانی یەکەم دەهێنێتەوەو، دەڵێت: صۆفیەت هەقە.

وەکو چۆن فوضـەیلی کوڕی عیاض و، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و، ئـەبی سـولەیمانی دارانی و، مەعرووفی کەرخی و ئەلجونەیدی کوڕی موحەممەد و، سەهلی کوڕی عەبدوڵای ئەلتەستوری[1] و، هاوشێوانیان ـ ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ـ شێخانی ئەهلی قورئان و سووننەت بوون. هاوشێوانیان ـ ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ـ شێخانی ئەهلی قورئان و سووننەت بوون.

---

(١)ـ ئەمانە زانـان، صـۆفین بـەڵام لـە قورئـان و سـووننەتدا زانـا بـوون، شـوێنی قورئان و سـووننەت دەکـەوتن. دەرەنجـامیش ئەوەیـە کـە نابێـت صـۆفیە چـاکەکانی زەمەنی یەکەم بە نموونە بێنیتەوە بـۆ ئـەوەی صـۆفیەکانی پاشـینی پـێ بەچـاك نـاو بەرێت، بڵێیت: صۆفیەت خێری تێدایە، تەماشای جونەید بکەن، تەماشای فوضـەیلی کوڕی عیاض بکەن، تەماشای ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بکەن، ئایا صۆفیەکانی پاشین کە دەڵێن: لەگەڵ خوادا دادەنیشم و، لێـوەی وەردەگـرم، فـەرمانم پێـدەکات، ڕێگـریم لێدەکات، ڕاست و خۆ زانست و زانیاریتان لە خواوە بۆ دێـنم وەکـو فـوضـەیلی کـوڕی عیاض و، جونەیدو، بیشری حافی و، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمن.

## وەسفی فریشتەکان لە قورئاندا

خوای گەورە لە قورئاندا بە چەند سیفاتێك فریشتەکانی وەسفکردووە کە لەگەڵ قسەی ئەو گومڕایانەدا جیاوازی زۆری هەیە[1]،

---

(١)_ پێشتر ئاماژەی پێدرا کە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ ئەوەی بیر هێناوەتەوە کە فەیلەسوفان دەڵێن: فریشتەکان هیچ حەقیقەتێکیان لە بووندا نییەو تەنها خەیاڵاتێکن کە بە خەیاڵی مرۆڤدا دێن، بریتین لە هێزێکی زەینی وبیری پێغەمبەر وای خەیاڵ دەکرد کە بۆ لای دێت و، قسەی لەگەڵدا کردوەو....هتد، هەروەها شەیتانەکانیش کە هێزگەلێکی شەڕانین لە زەین و بیری مرۆڤدا ئامادە دەبن، ئا ئەمەیە گوفتاری فەیلەسوفان سەبارەت بە فریشتەو شەیتانەکان، فەیلەسوفان بڕوایان بە غەیبیات نییە، شتەکان بە تێگەیشتنی خۆیان لێك دەدەنەوە، بۆیە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوای لێ بێ _ بەر پەرچی داونەتەوەو، فەرموویەتی: فریشتەکان بەدیهێنراوێکن لە بەدیهێنراوانی خوای گەورە، لە گەردووندا بوونیان هەیە، چەندەها سیفاتیان لە قورئاندا هەیە، ئەوان هێز گەلێکی زەینی و بیری نین، بەڵکو مەخلوقاتن، وەکو چۆن خوای گەورە نەوەی ئادەمی دروست کردووە ئاوەها جیهانی جنۆکەو، جیهانی فریشتەو، جیهانی شەیتانەکانی دروست کردووە، جیهانگەلێك هەن خوای گەورە دروستی کردوون جگە لە زاتی خۆی هیچ کەسێکی تر نایزانێت، خوای گەورە وەسفی فریشتەکانی کردووە بەوەی بەندەگەلێکی خوان و، لە ئاسمان لای خۆین و، بە فەرمانی خۆی بۆ زەوی دادەبەزن، هێندێکیان سرووش دادەبەزێنن، هێندێکیان بۆ نووسینی کاروکردەوەی نەوەی ئادەم دادەبەزن، وە چەندەها جۆریتر کە ئەو ساتی تایبەت بە خۆیان هەیە، ئەوان جیهانێکی غەیبن، جگە لە خوای گەورە هیچ کەسێکی تر زانینی لە بارەیانەوە نییە.

**خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ(٢٦)[1] لاَيَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ (٢٧) يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَنِ ارْتَضَى وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ(٢٨) وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِّن دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ(٢٩)﴾ [الأنبياء: ٢٦_٢٩] **وە (وە بـێ بـاوەڕان) گووتیـان خـوای گەورە مندالّی بۆ خۆی بڕیارداوە (کە فریشتەکانن) خوا پاك و بێگـەردە (لـەم شتانە) بەڵکو ئەوانە (فریشتە) بەندەی ڕێزگیراو (ی خـوا)ن لـە خـوا پـێش ناکـەون بـە قسـەو ووتە: وە ئەوان بەفەرمانی خوا کار دەکەن (خوا) دەزانێ، ئاگادارە بە ئەوەی لە دونیا لەبەر دەستیاندایە وە بەئەوەی لە ڕۆژی دواییدا بۆیان ئامادەکراوە وە (فریشـتەکان) تکا ناکەن تـەنها بـۆ ئـەو کەسـە نـەبێ (خـوا) ڕازی بـێ (تکـای بـۆ بکـرێ) وە ئـەوان (فریشتەکان) لە ترس و هەیبەتی خوا زۆر دەترسن وە هەر کـام لەوانـە (فریشـتەکان) بڵـێ بێگومـان منـیش پەرسـتراوم جگـە لـە خـوا ئـەو بـە (ئـاگری) دۆزەخ تۆڵـەی لـێ دەسەنین هەر بەو جۆرە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە (تۆڵەیان لێ دەکەینەوە).**

---

**(١)_** ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا﴾ **وە بێبـاوەڕان گوتیـان: خـوای گـەورە منـدالّی بـۆ خـۆی بڕیـارداوە کـە فریشـتەکانن، چـونکە گاورەکـان دەڵـێن: عیسـا کـوڕی خوایـە، هاوەڵپەرستانی عەرەبیش دەڵێن: فریشتەکان کچانی خوان، کـوڕ و کچـیان بـۆ خـوای گەورە داناوە، فەیلەسـوفانیش وەکـو ئـەوەی گوێبیسـتی بـوون، دەڵـێن: هێزگـەلێکی زەینی و بیری و نەفسین، ئا ئەمەیە گوفتاری ئەوان دەربارەی فریشتەکان، بۆیە خوای گەورە بەر پەرچی گاوران دەداتەوەو، لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ:** ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِن إِلَه﴾[المؤمنون: ٩١] **واتە: خوا هیچ ڕۆڵەیەکی بۆ خۆی بڕیار نەداوە وە هیچ پەرستراوێکی تری لە گەڵدا نەبووە. لـە ئایـەتێکی تریشـدا بـە هاوەڵپەرسـتان دەفەرموێت:** ﴿وَجَعَلُوا الْمَلائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثًا﴾[الزخرف: ١٩]

------------------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------------------------

وە ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای بەخشندەن بەمێیینەیان دادەنان. وە لەو ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ﴾، واتە: هاوەڵپەرستان و گاوران گوتیان: خوای گەورە منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە، هێندێکیان دەڵێن: مەسیحەو، هیندێکی یشیان دەڵێن: فریشتەکان کچانی خوان، چوونکە وشەی ﴿وَلَدًا﴾ لە زمانی عەرەبیدا کوڕو کچیش دەگرێتەوە، هەردوکیان بە(وَلَدْ) ناودەبرێن، پاشان دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَهُ﴾ خوای گەورە پاکو بێگەردە لەو شتانە، چونکە منداڵ بەشێکە لە باب و لە بابی خۆی دەچێت، خوای گەورەش هیچ هاوشێوەیەکی نییە، وە باب پێویستی بە کوڕ دەبێت، خوای گەورەش پێویستی بە هیچ یەکێکی بەدیهێنراوانی خۆی نییە، بۆیە خوای گەورە خۆی بەدور گرتووە لەوەی کە منداڵی هەبوبێت، ﴿بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ﴾ بەڵکو ئەو فریشتانە بەندەی ڕێزگیراوی خوان، وەسفی فریشتەکانی کردووە بەوەی کە کچانی خوانین، بەڵکو بەندەگەلێکی ڕێزگیراون، بەندەگەلێکن لە بەندەکانی خوای گەورە، ﴿مُكْرَمُونَ﴾ واتە: خوای گەورە ڕێزی گرتوون بە گوێڕایەڵی و تاعەتی خۆی، لە ئاسمان دایناون، سیفاتانێکی پێداون لە غەیری ئەواندا نییە، خوای گەورە فریشتەکانی لە قسەڵۆکەی هاوەڵپەرستان و فەیلەسوفان بەدور گرتووە، چەندەها ئەو سانی گەورە گەورەی پێداون.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَى﴾(١) [النجم: ٢٦] واتە: وە چەندەها فریشتە کە لە ئاسمانەکاندا هەن تکاو شەفاعەتیان هیچ سوودە نییە مەگەر دوای ئەوەی کە خوا مۆڵەت بدات بۆ کەسیّ کە خۆی بیەویّ و ڕازی بیّ.

---

(١)_ ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ﴾ وە چەندەها فریشتە کە لە ئاسمانەکاندا هەن، وشەی ﴿كَم﴾ واتای زۆریتی دەگەیەنیّت، چونکە وشەی ﴿كَم﴾ پیّدەچیّ خەبەری بیّت، لیّرەدا خەبەریەو، هەواڵ و خەبەری شتیّکمان دەداتیّ، وە پیّدەچیّت بۆ ئیستیفهام و پرسیارکردن بیّت بۆ نموونە دەڵیّت: (كم عندك من كتب؟) واتە (چەند کتیّبت هەیە؟)، ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ﴾ واتە زۆر، چەندەها فریشتە لەئاسمانەکاندا هەن بە فەرمانی خوای گەورە بۆ سەر زەوی دادەبەزن، ﴿لا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا﴾ تکا کاریان هیچ سوودیّکی نییە مەگەر بەمۆڵەتی خوای گەورەو، ڕازیبوونی لە کەسی تکا کار با پیّغەمبەران و، ئەولیاو، پیاو چاکانیش بن، چونکە هیچ یەکیّك لای خوای گەورە تکا ناکات مەگەر بە مۆڵەتی خوای گەورە، وە ڕازی بوونیشی لە کەسی تکا بۆکراو، بەڵام کافر تکاکاری سوودی بۆ نابیّت، بەڵکو تکاکاریی سوود بە موسڵمانان دەگەیەنیّت، لەوانە شایستەی سزای خوای گەورە بوونە، تکا کاریان بۆ دەکریّت، ئیتر لە سزادان ڕزگاریان دەبیّت، مەگەر دوای ئەوەی کە خوا مۆڵەت بدات، واتە بەکەسی تکاکار ﴿وَيَرْضَى﴾ وە لە کەسی تکا بۆکراویش ڕازی بیّت کە پیّویستە لە ئەهلی ئیمان بیّت، بەڵام کافران خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرمویّ: ﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ﴾[المدثر: ٤٨] واتە: ئیتر تکای تکاکاران هیچ قازانجیّکیان پیّناگەیەنیّت. هەروەها دەفەرمویّت: ﴿مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلاَ شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾[غافر: ١٨] واتە: ستەمکاران نە هیچ دۆستیّکیان هەیە وە نەتکاریّك بەگویّی بکریّت. ئائەوەبوو مەرجەکانی شەفاعەت و تکاکاری، شاهیّدیّ قسەکانیشیّ ئەوەیە کە ئایەتەکە وەسفی فریشتەکانی تیّدایە، لە ئاسمانن، زۆر زۆرن، لەگەڵ خوای گەورەدا بە ئەدەبن، تکا کاری بۆ هیچ کەسیّك ناکەن مەگەر خوای گەورەی لیّ ڕازیبیّت.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ (٢٢) وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ (٢٣)﴾[1] [سبأ: ٢٢_٢٣].

---

(١)_ ﴿قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ واتە: موحەممەد ﷺ بڵێ هاوار بکەن لەوانەی کە بێجگە لە خوا بە پەرستراوتان دەزانین بەقەدەر هەرە وردیلەیەکیان بەدەست نییە، ئەوە فریشتەکانیش دەگرێتەوە، چونکە فریشتەکان عیبادەت کران و پەرستران، کران بە هاوبەشی خوای گەورەو، خەڵکانێکی زۆر فریشتەیان دەپەرست، ﴿ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ بەڵام ئەوانە نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا بە قەدەر هەرە وردیلەیەکیان بە دەست نییە، ﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ﴾ وە ئەو پەرستراوانە هاوبەشی خوای گەورە نەبوون لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا، واتە: نەخاوەن موڵك بوون و نەهاوبەشی خوای گەورەش بوون، ﴿وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ﴾ وە هیچ یەك لەوان یارمەتی دەری خوا نەبوون، لە خوڵقاندن و تەگبیرسازی ئاسمانەکان و زەمیندا هیچ یەکێکی ئەوان یارمەتیدەری خوای گەورە نەبوون، بەڵکو خوای گەورە پێویستی بە یارمەتی هیچ کەسێك نییە، ﴿وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ﴾ وە تکاکردن لای خوا سوودی نییە مەگەر بۆ کەسێ کە خوای گەورە ڕێگە بدات، گوتراوە: ئەم ئایەتە ڕیشەکانی شیرك و هاوەڵپەرستی لەبنەڕەتەوە دەرهێناوە، چوونکە پەرستراو و هاوار پێکراو لە جیاتی خوای گەورە یا دەستەڵاتدارە یان هاوبەشی دەستەڵاتدارە یان نزیك بە دەستەڵاتدارە بە وەزارەتێك یا بە ڕاوێژکاریەك، وەکو چۆن پادشایان ڕاوێژکار و پیاوانی نزیکیان هەیە، یان هەر تکاکارێکە لای خوای گەورە تکا بۆ خاوەن داواکە دەکات، خوای گەورە هەموو ئەو شتانەی قەدەغە کردووە، هیچ کەسێك بچوکترین شتی لەئاسمانەکان و زەمیندا بەدەست نییە، هیچ کەسێکیش لەئاسمانەکان و زەمیندا هاوبەشی خوای گەورە

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

ناكات، هيچ يارمەتيدەرێكى نييە ئامۆژگارى بكات و، كاريگەرى بخاتە سەر، چونكە پێويستى بە يارمەتيدەران نييە، خەڵكى پێويستيان پێيانە، بەڵام خواى گەورە پێويستى بەو شتانە نييە، بەڵام دۆستانێكى هەيە خۆشى دەوێن و، خۆشيان دەوێت، ئەمە هەيە، شەفاعەت و تكاكاريش تەنها بەرێگەدانى خواى گەورە نەبێت دروست نابێت، بەڵام پادشايان و سوڵتانەكانى دونيا بە پێچەوانەوەن ئەگەر رازيش نەبن هەر تكايان لێدەكرێت، بەڵام هيچ كەسێك زات ناكات تكاكارى لاى خواى گەورە بكات مەگەر خواى گەورە خۆى رێگە بدات، كەوا بوو هيچ بەهانەيەك، هيچ بەڵگەيەك بۆ هاوەڵپەرستان نەمايەوە بۆ ئەوەى غەيرى خواى گەورە بپەرستن، چونكە ئەوانە هاوبەشى خوانين، نزيكانى خوانين بۆ ئەوەى شتێكيان بەدەست بێت، شەفاعەت و تكاكاريش تەنها بە رێگە پێدانى خواى گەورە دەبێت، بەڵام مرۆڤەكان تكايان لێدەكرێت ئەگەرچى رێگەش نەدەن، ئەگەرچى رازيش نەبن، بەڵام ناچارن ئەو شەفاعەتە قبوڵ بكەن چونكە پێويستيان بە كەسى تكا كارە، بۆيە ئەم ئايەتە شيرك و هاوەڵپەرستى لە بنەرەتەوە پووچ كردەوە، شاهێد لە ئايەتەكە ئەوەيە كە فريشتەكان لە كۆى ئەوانەن كە هاوەڵپەرستان دەيانپەرستن و داوايان لىَ دەكەن، لە كاتێكدا ئەوان هيچ شتێكيان بەدەست نييە، هاوبەشى خوا نين، وەزيرو يارمەتى دەريش نين، تەنانەت شەفاعەت و تكاش ناكەن مەگەر بە رێگەپێدانى خواى گەورە نەبێت.

هەروەها سەبارەت بە فریشتەکان خوای عزوجـل دەفـەرموێ: ﴿وَلَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ عِنْدَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ (١٩) يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ(٢٠)﴾(١) [الأنبياء: ١٩_٢٠]

---

(١)_ ﴿وَلَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ تەنها بۆ خوایە ئەوەی لە ئاسمانـەکان و زەویدایـە، هیچ کەسێك هاوبەشیی خوای گەورە ناکات لە موڵکایەتیـدا، جگـە لـە کەسـانێك کـە خـوای گەورە موڵك و دەستەڵاتێکی کاتییان دەداتێ، پاشان لێیان دەسێنرێتەوەو بـە کەسـانێکی دیکـە دەدرێـت، ئـەوەی دانیشـتووی دونیایـە خـاوەن موڵـك و دەسـتەڵات نییـە، لێـی وەردەگیرێتەو بەکەسـانیتر دەبەخشرێت، سـوڵتانەکان، ئـەمیرەکان و بەوشـێوە بـەردەوام دەبێت، ئەگەر ئەو هەموو مەخلوقاتە موڵکی خوا بن کەواتە: چـۆن لەگـەڵ خـوای گـەورەدا بپەرسترێن، ﴿وَمَنْ عِنْدَهُ﴾ وە ئەو فریشتانەی کە لای خوان، ﴿لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ﴾ هەرگیز لە پەرستنی خوای گەورە لووت بەرزی نانوێنن، لە کاتێکدا پلەو پایەیەکی بـەرزیان بـە لای خوای گەورەوە هەیە کەچی هیچ لووت بەرزیەکیش نانوێنن، ئەوان بەندەن ئیتر چۆن لەگەڵ خـوای گـەورەدا بپەرسـترێن، ﴿وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ﴾ هـەرگیز مانـدووش نـابن، لەبـەردەوامێتی خواپەرستنیشدا بێزار نـابن و، بـە بـەردەوامیش خـوای گـەورە دەپەرسـتن، ﴿يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ﴾ شـەوو ڕۆژ تەسـبیحات و سـتایش دەکـەن مانـدوو نـابن و سـارد نابنـەوە.
پاشان خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێت: ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِّن دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾[الأنبياء: ٢٩] واتـە: وە هـەر کـام لەوانـە (فریشـتەکان) بڵـێ بێگومان منیش پەرستراوم جگە لە خوا ئەو بە (ئاگری) دۆزەخ تۆڵەی لێ دەسەنین هەر بەو جۆرە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە (تۆڵەیان لێ دەکەینەوە)، ئەگەر گریمـانێکی وا کـرا کە یـەکێك لـە فریشـتەکان گـوتی: مـن خواوەنـدم، خـوای گـەورە تونـدترین جـۆری سـزای بەسـەردا دەسـەپێنێت، چـونکە داوای شـتێکی کـردووە کـە مـافی خـوای گەورەیـە. ئەمـە گەورەترین ستەمە چونکە شیرك و هاوەڵپەرستی ستەمێکی زۆر گەورەیە، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[لقمان: ١٣] واتە: چونکە بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دووپاتی دەکاتەوەو پێی ڕاگەیاندووین کە فریشتەکان لەسەر شێوەی ئادەمیزاد چوونەتە دیدەنی إبراهیم (علیه السلام)[1]

---

(١) فریشتەکان هەن و، هێزگەلێکی زەینی و بیری نین، بەڵکو زات گەلێکی خولقێنراون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ)) رواه مسلم، واتە: ((فریشتەکان لەنورو ڕووناکی خولقێنراون)). لەسەر شێوە گەلێکی مرۆڤ بوون بەمیوانی پێغەمبەر ئیبراهیم _ علیه السلام _، چونکە ئادەمیزاد توانای بینینی فریشتەکانی نییە لەسەر شێوەی خۆیان، بۆیە فریشتەکان بەچەند شێوەیەك کە بەلای مرۆڤەوە ئاسایی بێت بۆیان دەردەکەون، خوای گەورە توانای خۆگۆڕینی لە فریشتەکانی داوە، بۆیە لەسەر شێوەی مرۆڤ بوون بە میوانی پێغەمبەر ئیبراهیم _ علیه السلام _، کاتێ بۆ سەر گەلی لوط نێردران، ئەویش ڕێزیگرتن و، ئەوەندەی پێنەچوو خێرا پێغەمبەر ئیبراهیم _ علیه السلام _ گوێرەکەیەکی برژاوی بۆ هێنان، بەلام کە بینینی هیچ ناخۆن لێیان ترسا، چونکە ئەگەر میوان لە خواردنەکەی نەخوارد یەکسەر کەسی بەرامبەر دەترسیت میوانەکە نیاز خراپێکی هەبێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ(٧٠)﴾[هود: ٧٠] واتە: جا کاتێ بینی دەستیان درێژ ناکەن بۆی (و لێی ناخۆن) نائاسایی هاتنە بەر چاوی و لە دەروونی خۆیدا مەترسی لێکردن (کە نیازی خراپیان هەبێ) گوتیان مەترسە بەڕاستی ئێمە نێرراوین بۆ سەر گەلی لوط. لەئایەتێکی تریشدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمٍ مُجْرِمِينَ (٣٢) لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ طِينٍ (٣٣)﴾[الذاريات: ٣٢_٣٣] واتە: گوتیان بێگومان ئێمە نێرراوین بۆ سەر گەلی تاوانباران بۆ ئەوەی بەرد بەسەریاندا ببارێنین لەگڵی سورەوەکراو. دڵنیایان کردەوەو هەواڵی کارو ڕاسپێریەکەیان پێگوت، پووختەی شاهێدی قسەکانمان ئەوەیە کە فریشتەکان لەسەر شێوەی ئادەمیزاد دا دەبەزن، کەوا بوو ئەگەر هێزگەلێکی زەینی و بیری بوایەن لەسەر شێوەی مرۆڤ دانە دەبەزین.

**هەروەها جبريل _** عليه السلام **_ بە شێوەی مرۆڤێكی تەواو خۆی پیشانی مەریەم دا[1]، هەروەها جبريل _** عليه السلام **_ لەسەر شێوەی دەحیەی ئەلكەلبی** رضي الله عنه[2]

---

(١)_ هەروەها جبريل _ عليه السلام _ هاتە لای مەریەم، لە كاتێكدا خۆی لەقەومەكەی دوورە پەرێز گرتبوو، لەنێوان خۆی و كەسو كاریدا پەردەیەكی دانا بوو، خۆی بۆ خواپەرستی یەكلا كردبۆوە، فریشتەكە لەشێوەی مرۆڤێكی تەواودا خۆی پیشاندا، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾[مريم: ١٧] واتە: ئینجا پەردەیەكی دانا لە نێوان خۆی و ئەوان (كەسوكاری)دا ئێمەش جوبرەئیلمان نارد بۆ لای وەكو بەشەرێكی تەواو خۆی پیشانی (مەریەم)دا. واتە: جبريل لەسەر شێوەی فریشتەیی خۆی دانەبەزی، چونكە مەریەم توانای بینینی ئەو شێوەیەی نییە، بەڵكو لەسەر شێوەی مرۆڤێك كە ئەندامەكانی تەواو بێت چووە لای مەریەم، بۆ ئەوەی پێی شادومان بێت و، لێی دوور نەكەوێتەوە، ئیتر هەموو شتێكی پێگوت و، شتەكە بەوە تەواوبوو كە فریشتەكە لەڕوحی خۆی واتە لەو ڕوحەی كە لەخوای گەورەوە هەڵیگرتبوو فوی پێداكرد، ئیتر بەعیسا دوو گیان بوو، باشە ئایا ئەمە خەیاڵ ئەندێشەی نەفسیەو هەروەها دا بە ئاسانی بۆ مرۆڤ دروست دەبێت؟ نەخێر، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە فریشتەكان مەخلوقێكن، لە دەرەوە بوونیان هەیە نەك تەنها لەزەین و بیردابن.

(٢)_ هەروەها جوبریل _ عليه السلام _ دەهاتە خزمەتی پێغەمبەرەكەمان موحەممەد ﷺ لەسەر شێوەی پیاوێك، هاوەڵانیشی لە خزمەتیدا بوون پیاوەكەیان

-------------------------------------------------------------------------------

-------------------------------------------------------------------------------

-------------------------------------------------------------------------------

دەبینی و، نەیاندەزانی کێیە، دەهات و لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەدواو پاشان دەچووە دەرەوە هەر وەکو پیاوێك، چونکە ئەگەر بەو جۆرە نەهاتبا هاوەڵان توانای بینینی یان نەدەبوو، تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ تەنها دوو جار فریشتەکەی بینیبوو، لە بارەی جارێکیانەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ﴾[التکویر: ٢٣] واتە: سوێند بەخوا بێگومان (فریشتەی سرووشی) دیوە لەئاسۆی ڕووندا، لەئاسمان و لە ئاسۆی ڕووندا لەسەر شێوەی فریشتەیی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ دیبووی، جاری دووەمیش لای (سِدرة المنتهی) _ درەختی کونارە لەو پەڕی بەهەشتەدا کەوتۆتە لای ڕاستی عەرشەوە _ بینیبویەتی، جگە لەم دوو جارە لەسەر شێوەی پیاوێك دەیبینی، هەروەها لەسەر شێوەی دیحیەی ئەلکەلبی رضي الله عنه کە پیاوێکی سەرو سیما جوان بوو، هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

صحيح: أخرجه البخاري (٢٦٣٤)، (٤٩٨٠)، ومسلم (٢٤٥١)، من حديث أسامة ابن زيد ﷺ، دەچووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە لەسەر شێوەی پیاوێکی دەشتەکیش[1] البخاري (٥٠)، ومسلم (٩)، من حديث أبي هُريرة ﷺ. هەروەها خەڵکیش فریشتەکان دەبینن . خوای گەورە وەسفی جبریل _ عليه السلام _ دەکات و، دەفەرموێت: ﴿ذِي قُوَّةٍ عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ (٢٠) مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ(٢١)﴾[2] [التكوير: ٢٠_٢١] ﴿ذِي قُوَّةٍ عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ ﴾.

---

(١)_ جار بە جاریش لەسەر شێوەی پیاوێکی دەشتەکی دەهاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەگەر لەسەر شێوەی دەیحیەی ئەلکەلبی ﷺ بهاتبا هاوەڵان وایاندەزانی دیحیەیە ﷺ، بەڵام ئەگەر لەسەر شێوەی پیاوێکی دەشتەکی بوایە نەیاندەناسی.

(٢)_ لە کۆتاییەکانی سورەتی (التكوير)دا خوای گەورە وەسفی دەکات و، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ (٢٣) وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ (٢٤)﴾[التكوير: ٢٣_٢٤] واتە: سوێند بەخوا بێگومان (فریشتەی سرووشی) دیبوە لە ئاسۆی ڕووندا وە ئەو ڕژدەو چرووك نییە لە گەیاندنی سرووشدا. لێرەدا بەوە وەسفی جبریل دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەئاسۆی ڕووندا دیویەتی. هەر

-------------------------------------------

-------------------------------------------

-------------------------------------------

لەهەمان سورەتدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (١٩) ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ (٢٠) مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ (٢١)﴾[التكوير: ١٩_٢١] واتە: بێگومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایە بەرزە (کە فریشتەی سرووشە)، واتە: بەهێزە، لای خاوەنی عەرش (خوای گەورە) خاوەن پایەیە، قسە ڕەوایە لە ناو فریشتەدا، دەست پاکە. ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ واتە: جوبریل _ علیه السلام _ قورئانی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزاند، گوفتاری خوای گەورەیەو ئەو بەپێغەمبەری خوای ﷺ ڕاگەیاندووە، واتە: نێرراوێك بووە لە نێوان خواو پێغەمبەرەکەیدا، ﴿ذِي قُوَّةٍ﴾ هێزی جوبریل _ علیه السلام _ گەورەیە، تا ئەو ئاستەی هەموو لادێکانی قەومی (لوط)ی بە لایەکی باڵی هەڵگرت، هێزێکی گەورەی هەیە، وە کاتێ هاواری بە گەلی (ثمود)دا کرد هەر هەموویان بەیەکجار تیاچوون، هەورە تریشقەیەك بوو هەر هەموویانی لە ناوبرد، هێزێکی لە ڕادەدە بەدەری هەیە، ﴿ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ﴾ بەهێزەو پایەی خۆی هەیە بەلای خوای خاوەن عەرشەوە، لە خوای گەورەوە نزیکە، ﴿مَكِينٍ﴾ واتە: بە لای خواوە پایەی خۆی هەیە، هەر هەموو ئەمانە وەسف و ستایشن بۆ جبریل _ علیه السلام _، ﴿مُطَاعٍ﴾ فریشتەکان گوێڕایەڵی دەبن، لە ئاسمان، سەر ڕاست و دەست پاکی سەر سرووشە بەجۆرێك نەزیادی دەکات و، نەکەمیشی دەکاتەوە، بەڵکو وەکو خۆی ڕادەگەیەنێت.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ جبڕیلی لەئاسۆی ڕووندا بینی . هەروەها خوای گەورە وەسفی دەکات و، دەفەرموێت: ﴿عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى (٥) ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى (٦) وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَى (٧) ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى (٨) فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى (٩) فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى (١٠) مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى (١١) أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى (١٢) وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى (١٣) عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى (١٤) عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى (١٥) إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى (١٦) مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى (١٧) لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى (١٨)﴾[1].

---

(١)_ ئایەتەکان لە سوڕەتی (النجم)دایە، خوای بێ وێنە لە ئایەتەکانی سەرەوە دەفەرمووێ واتە: جبڕیل _ علیه السلام _ فێری کردووە، ڕووخسار، ڕووخسار جووانی، لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی ڕاوەستاو بوو، کاتێ لە ئاسۆی بەرزی ئاسمان دابوو، واتە: جبڕیل _ علیه السلام _ لە موحەممەد ﷺ نزیکبوویەوە، واتە جبڕیل لە ئاسۆدا لە موحەممەد ﷺ نزیکبوویەوە، ئیتر خوای گەورە لە ڕێگەی جبڕیلەوە لە گوفتارەکانی خۆی بۆ بەندەکەی خۆی موحەممەد ﷺ سرووشی نارد، لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بە چاوی خۆی بینیویەتی هەواڵی پێداوەو، لە گوفتارەکانیدا درۆی نەگوتوە واتە: دەمەقاڵێ و مشتومڕی لەگەڵ دەکەن دەربارەی ئەوەی کە بینیویەتی لە شەوی میعراجدا پێغەمبەری خوا ﷺ جوبڕەئیلی لای درەختی (سدرة المنتهى) بینی، ئەمە جاری دووەم بوو واتە: چاوی موحەممەد ﷺ لاینەداو، لەمەبەستیش تێ نەدەپەڕی، واتە: لە شوێنە تایبەتەکە لاینەدا، نەلایداو نەیشوو. پوختەی شاهێدی سەرەکی قسەکانمان لە ئایەتەکان ئەوەیە کە جوبڕیل _ علیە السلام _ لە دەرەوە دەبینرێت، لەزەین و بیردا نییە، دێت، دێتە ژورەوە، دەچێتە دەرەوە، فریشتەکان چوونە دیدەنی پێغەمبەر ئیبراهیم _ علیە السلام _ چوونە ژورەوە پاشان چوونە دەرەوە، ئەمە شێوەو وێنەی زەینی وبیری و خەیاڵات نین وەکو ئەوەی فەیلەسوفەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

هەروەها بە(صحيح)ی لە فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتووە کە عن عائشة رضي الله عنها عن النبي ﷺ أَنَّهُ لَمْ يَرَ جبريل في صورتِهِ التي خُلِقَ عليها غيرَ مرتين، صحيح: أخرجه البخاري (٤٨٥٥)، ومسلم (١٧٧)، من حديث عائشة رضي الله عنها. واتە: خاتوو عائیشە _ ڕازی خوای لێ بێت_ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ جبریلی نەبینیوە لەسەری ئەو شێوەیەی لەسەر خوڵقێنراوە دووجار نەبێت . واتە جاری یەکەم: لە ئاسۆی هەرە بەرزداو، جاری دووەمیش: لای درەختی (سدرة المنتهى).

وە خوای گەورە لە شوێنێکی تردا بە (الروح الأمين) وەسفی کردووە[1] لە قورئان دا، وە بە(الرّوح القدس)یش وەسفی کردووە[2]،

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ(١٩٤)﴾[الشعراء: ١٩٢_١٩٤] واتـە: وە بـە ڕاستی ئەم (قورئان)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی. لەم ئایەتانەدا خوای گەورە ئەوەی پێ ڕاگەیاندوین کە ئەم قورئانەی بە جوبرەئیلدا ناردۆتە خوارەوە کە بە (الروح الأمين) وەسفی کردووە، واتە: ئەمین و سەر ڕاستە لەسەر ئەو سرووش و وەحیەی پێی سپێردراوە بە پێغەمبەری خوای ﷺ ڕاگەیەنێت، بە ئاستێك نە زیادی دەکات و، نەکەمیشی دەکاتەوە، وەکو خۆی ڕایدەگەیەنێت، شەیتانەکان بە هیچ شێوەیەك ناتوانن نزیکی ببنەوە.

(٢)_ خوای گەورە لە سورەتی (الشعراء)دا بە(الروحُ الأمين)ی وەسف دەکات، هەروەها بە (روحُ القُدُس)یشی وەسف دەکات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِنْ رَبِّكَ﴾[النحل: ١٠٢] واتـە: بڵێ جوبرەئیل دایبەزاندووە لە لایەن پەروەردگاتەوە، هەر هەموو ئەمانە بەڵگە گەلێکی بەهێزن لەسەر ئەوەی کە فریشتەکان زاتگەلێکن، بوونیان هەیە، دەبینرێن، موحەممەد ﷺ بینیبوونی لەسەر

---------------------------------------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------------------------------------

-----------------------------------------------------------------------------------------

ئەو شێوەیەی خۆی پیشان دابوون، کەوا بوو ئەگەر فریشتەکان هێزگەلێکی نەفسانی
بن هەرگیز دەر نەدەکەوتن و، هەروەها قسەشیان نەدەکرد، جوبرەئیل ـ علیه السلام
ـ چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وە چەند پرسیارێکی سەبارەت بەئیسلام و،
ئیمان و، ئیحسان و، تا کۆتایی فەرموودەکە لێکرد، ئایا ئەمە هێزی نەفسانییە ؟،
تەنانەت هاوەڵانیش ئەمەیان بینی.

وە چەندین سیفاتی تریش کە ڕوونی دەکاتەوە جوبرِیل _ علیه السلام _ گەورەترین مەخلوقاتی خاوەن عەقڵی خوای گەورەیە، جەستەو جەوهەرێکە بۆ وەستان پشت بەخۆی دەبەستێت[1]، خەیاڵ نییەو لە نەفسی پێغەمبەری خوادا بێت وەکو ئەوەی فەیلەسوفە مولحیدەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەوانەی بانگەشەی وەلایەتی و دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن و، گوایە لە پێغەمبەران زاناترن[2].

---

(١)_ جەوهەر بەرامبەر بەعەرەزە، چونکە شتەکان یا جەوهەرن یان عەرەزن، جەوهەر بریتیە لەهەر شتێك ببینرێت، جەستەیەکە دەبینرێت، بەڵام عەرەز جەستەی نییە پشت بەغەیری خۆی دەبەستێت، بۆ نموونە ڕەنگەکان: سپی و، ڕەش و، سوور ئەمانە عەرەزن کە دەردەکەون و پاش ماوەیەك نامێنن، بۆیە عەرەز پشت بەخۆی نابەستێت و بەخۆی ڕاناوەستێت، بەڵکو بەهۆی شتێترەوە دەوەستێت. بەڵام جەوهەر بریتیە لەهەر شتێك کە بەخۆی بوەستێت، بۆ وەستان پشت بەخۆی دەبەستێت پێویستی بەیارمەتی هیچی تر نییە، وەکو عەرەز نییە کە بۆ وەستان و مانەوە پشت بە غەیری خۆی ببەستێت، بەنموونەی ئەو ئەندێشەو خەیاڵانەی کە لەزەین و بیردایە، ئەمانە عەرەزن کە پاش ماوەیەك نامێنن، ئەندێشەو خەیاڵات عەرەون جەستەیان نییە، زاتیان نییە.

(٢)_ لەگەڵ هەموو ئەو درۆ و لە ڕێی ڕاست لادانەیاندا بانگەشەی وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورەش دەکەن و، گوایە لە پێغەمبەرانیش چاکترن،

---------------------------------------------------

---------------------------------------------------

---------------------------------------------

فەیلەسوفەکان وارادەگەیەنن خۆیان لە پێغەمبەران چاکترن، گوایە درکیان بەنهێنیەکانی گەردوون کردووە وە... وە...، تەنها لەخۆیان بایی بوبون و هیچی تر. مەبەستیان بەوەنە کرد کە خەڵکێکی بێتواناو بیٚ دەسەڵات و دەستە پاچەن، هیچ نازانن جگە لەوەی کە خوای گەورە فێری کردوون، ئەوان بانگەشەی تەواویتی و کەماڵیتی بۆ خۆیان دەکەن، بانگەشەی زانست و درك بە حەقیقەتەکان بۆ خۆیان دەکەن و... هتد. وە گوایە ئەوان لە پێغەمبەران زاناترن، چونکە پێغەمبەران بە هۆی فریشتەکەوە لە خواوە وەر دەگرن، بەڵام ئەوان ڕاستەوخۆ لە خواوە وەردەگرن، بۆیە ئەوان لەپێغەمبەران چاکترن، گوایە پێغەمبەران لەغەیری خۆیانەوە وەردەگرن بەڵام ئەوان ڕاستەخۆ وەردەگرن، درك بەشتەکان دەکەن، تاوەکو ئەم ئاستە لەخۆیان بایی بوون، بۆیە خۆیان لەپێغەمبەران بەچاکتر دانا، دەڵێن: وەلی _مەبەستیان خۆیانە_ لەپێغەمبەران چاکترە.

## ئیلحادیی ئەوانەی باوەڕیان(وحدة الوجود)ە

مەبەستی حەقیقی ئەمانە: نکۆڵی کردنە لەپایەکانی ئیمان، پایەکانی ئیمان بریتین لە بڕواهێنان بەخواو، فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی[1] مەبەستی ڕاستەقینەشیان نکۆڵیکردنە لەخوای خولقێنەر، ئەوان بوونی خولقێنراوانیان کردووە بەهەمان بوونی خوای خولقێنەرو[2] گوتوویانە:

---

(۱)_ نکۆڵیی لە پایەکانی ئیمان دەکەن، بڕواهێنان بەخواو فریشتەکانی و بڕواهێنان بە پێغەمبەران، چونکە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەوان لە پێغەمبەران چاکترن، هەروەها بڕوا بە ڕۆژیی دوایی ناکەن، شتەکانیش بەپێی بەرژەوەندی خۆیان لێکدەدەنەوە.

(۲)_ بەڵێ، لە کۆتادا گەیشتنە بیروباوەڕی (وحدة الوجود)، گوایە گەردوون دابەش نابێت بۆ خولقێنراوان بە جیاو و خوایەکی خولقێنەر بەجیا، بەڵکو هەرهەمووی پێکەوە بریتیە لەخوا، دەڵێن: یەکتاپەرستی ئەوەیە کە گەردوون بۆ خولقێنراوان بەجیاو خوایەکی خولقێنەر بەجیا دابەش نەکەین، بەڵکو هەر هەموو گەردوون پێکەوە بکەین بەخوا، ئیتر هەر شتێکت پەرست ئەوە تۆ خوات پەرستووە، بە بۆچونی ئەوان ئەو کەسانەی بت و، جنۆکەو، مرۆڤ دەپەرستن خوایان پەرستووە، چونکە خوا بوونی ڕەهایە بۆیە بە خەڵکانی (وحدة الوجود) ناودەبرێن، چونکە لەو باوەڕەدان کە بوون و وجود بۆ پەروەردگارو و خولقێنراو دابەش نابێت، بەڵکو هەر هەمووی بەیەکەوە پەروەردگارە، ئا ئەمەیە یەکتاپەرستی بەلای ئەوانەوە، ئەو کەسەش کە بوون و وجوود بۆ خوایەکی خولقێنەر بەجیاو، خولقێنراوان بەجیا دابەش دەکات، موشریکە لای ئەوان.

(وجود ـ بوون) هەمووی یەکە، بە ئاستێك هەندێ لە دروستکراوەکان بە زات و نەفس و هەندێکی تر بە جۆرەکەیان لەیەك جیانەکردەوە( لم يميزوا بين الواحد بالعين والواحد بالجنس)[1]، هەموو ئەوانەی لە بوون (وجود) دان بەژدارن لەوەی ناوی (بوون) یان بەسەردا بدرێ (فإن الموجودات تشترك في مُسَمّى الوجود)[2] وەکو چۆن مرۆڤەکان لە ناوی ئادەمیزددا هاوبەشن، وە جۆرەکانی ئاژەڵیش لەناوی ئاژەڵدا هاوبەشن، بەڵام ئەم هاو بەشبوونە گشتیە دروست نابێت و نابێت بە هاوبەشی گشتی مەگەر لەزەین و بیردا[3]،

---

(١)_ یەك بەزات و نەفس (الواحد بالعين): بۆ نموونە: دەگوترێت: زەید ئەمە یەکێکە بەزات و نەفس، تەنها یەکێکە دەبینرێت و ئاماژەی بۆ دەکرێت، دەگوترێت: سەعد ئەمە تەنها یەکێکە بەزات و نەفس، بەڵام یەك بەجۆر(الواحد بالنوع)، بەم شێوەیە بۆ نموونە دەگوترێت: ئادەمیزاد، ئەمە یەك جۆرە، یا بۆ نموونە دەگوترێت: وشتر ئەمە یەك جۆرە، دەگوترێت: مەڕ و ماڵات ئەمە یەك جۆرە، ئەوان لە نێوان ئەم دووانەدا جیاوازییان نەکرد. بڕوانە: ئینتەرنێت: شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان، الشيخ عبدالله بن الجبرين. وەرگێڕ.

(٢)_ هەر هەموو بوونەوەرەکان لەوەدا کە ناونراوە بەبونێتی و وجود هاوبەشن، واتە: هەر هەموویان لەبوندان و مەوجودن، بەڵام لە دەرەوەدا دابەش دەبن بۆ خوڵقێنراو و خوای خوڵقێنەر، دابەشدەبن بۆ چەندەها جیهان و جۆر، بەڵام ئەوان دان بەوەدا نانێن کە جیابونەوەو دابەشبوون هەبێت.

(٣)_ هەر هەموو شتەکان هەن و مەوجودن، بەڵام خوای گەورە بونێتی و وجودی تایبەت بەخۆی هەیەو، مەخلوقاتیش بونێتی و وجودی تایبەت بە خۆیان هەیە، ئەگەرچی هەر هەموویان لە ناوی بونێتی و وجوددا هاوبەشن، ئەمە تەنها لەزەین و بیردایە.

چونكه تۆ بڕوان ئەو زیندیەتیەی كە لە مرۆڤدایە هەمان ئەو زیندەیەتیە نییە كە لە ئەسپدایە (وإلا فالحيوانية القائمة بهذا الإنسان ليست هي الحيوانية القائمة بالفرس)(١).

وە بونێتی و وجودی ئاسمانەكان كوتومت خودی بونێتی و وجودی مرۆڤ نییە، كەوا بوو بونێتی و وجودی خوای خولقێنەریش وەكو بونێتی و وجودی خولقێنراوەكانی خۆی نییە.

حەقیقەتی گوفتارەكەشیان: هەمان گوفتارەكەی فیرعەونە كە خوای دروستكاری پەكخست(٢) فیرعەون نكوڵیی لەم بوون و وجودە بینراوە نەدەكرد، بەلام وای ڕادەگەیاند هەر خۆی بۆ خۆی لەبوندایەو، هیچ دروستكارێكی نییە، وە ئەوانیش هاوڕا و سازیاری بوون لەو بۆچونەیدا، بەلام ئەو بانگەشەیەشیان بۆ زیاد كرد كە گوایە خودی فیرعەون خوایە،

---

(١)_ ئادەمیزادەكان و ئاژەلان هەرهەموویان لە ناوی بونێتی و وجوددا هاوبەشن، هەر یەكێك لەوانە هەن و مەوجودن، هاوبەشن لە بونێتی و وجوددا، بەلام هەر یەكێكیان جیان و دابەش دەبن بۆ نموونە: ئەمە ئەسپە، ئەمە گوێدرێژە، ئەمە وشترە، ئەمە مەڕە، ئەمە سەگە، ئەمە شێرە، ئەمە مرۆڤە، ئەمە فریشتەیە، ئەمە جنۆكەیە، لە بوونێتی و وجوددا جیا دەبنەوە، گەردوون بۆ چەندەها بەش دابەش دەبێت، جگە لە خوای گەورە، چەندەها بەشە، مەخلوقات هەن لە جیهانەكانی سەروو و خواروو، كە چی ئەو نەفامن دەڵێن: دابەش بوون نییەو ئەم گەردوونە پێكەوە بریتیە لەخوا.

(٢)_ حەقیقەتی گوفتارەكەیان بریتیە لەوەی گوایە پەروەردگار نییە، وەكو گوفتارەكەی فیرعەون ﴿قَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى﴾[النازعات: ٢٤] واتە ووتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم. مەبەستی ئەوە بوو كە خوا نییە، هەروەها دەیگوت

---------------------------------------------

---------------------------------------------

---------------------------------------------

﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي﴾ [القصص: ٣٨] واتـه: وانـازانم جگـه لـه خـۆم هـیچ پەرسـتراوێکی ترتـان هـەبێ، نکـۆڵیکردن و بـڕوا نەبوونـە بـەخوای خوڵقێنـەر، بـیرو بۆچوونی فەیلەسـووفەکان ئـەو نەفامانـە دەڵـێن: فیرعـەون بـۆی بـوو بەموشـریک و هاوەڵپەرست چونکە دابەش بونیکردو، گوتی: من پەروەردگاری هـەرە گـەورەتانم، لـە کاتێکدا هەر هەموو بونێتی و وجود پێکەوە بریتیە لە پەروەدگار، موسا پێغەمبـەریش _ علیه السلام _ نکۆڵی لە دابەشیەتیەکەی کـرد، دەیانـەوێت مووسا پێغەمبـەریش _ علیه السلام _ بکەن بەئەهلی (وحدة الوجود)، گوایە مووسا پێغەمبـەر _ علیه السلام _ تەنها نکۆڵی ئەم دابەشبوونەی لێکرد، گوایە ئەگەر فیرعەون بیگوتبا هەموو بـونێتی و وجود یەکە دەبـووە کەسێکی یەکتاپەرسـت و مووسـا پێغەمبـەریش _ علیه السلام _ نکـۆڵیی لێ نـەدەکرد. ئەمـە قسـەی ئـیبن و عـەرەبی و قسـەی شـوێنکەوتوانی لـە فەیلەسـوفە صـۆفیەکان بـوو، قسـەی ئـیبن و عـەرەبی و، ئـیبن وفـارض و، ئالعەفیفولتلمسـانی وغـەیری ئـەوانیش بـوو، ئائەمەیـە قسـەکانیان دەربـارەی (وحدة الوجود).

بۆیە لە فیرعەون گومڕاتر بوون[1]، ئەگەر چی ئەم گوفتارەی فیرعەون لەهی ئەوان بۆگەنتر بوو، بۆیە بتپەرستانیان وادانا کە تەنها خوایان پەرستووە[2]، وە گووتیشیان: فیرعەون لەپایەی حوکمداریدا بوو، قوتبی کاتی خۆی بوو، بەڵام هۆگریی بەکارهێنانی شمشێر بوو، با ستەمکاریش بێت لە ڕووی عورفی شەریعەتی ڕواڵەتییەوە[3]، بۆیە گووتی: من خوای هەرە گەورەتانم واتە: ئەگەرچی هەمووان خوابن بەڕێژەیەکی ئەوتۆ، ئەوە من لەهەمووتان گەورەترم، چونکە لە ڕواڵەتەوە فەرمانڕەوایی ئێوەم پێدراوە .

---

(١)_ بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە گەردوون بریتیە لە خوا بەوەش لە فیرعەون گومڕاتر بوون، چونکە فیرعەون بانگەشەی ئەوەی نەکرد کە گەردوون بریتیە لە خوا، بەڵکو گوتی: ﴿قَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى﴾[النازعات: ٢٤] واتە ووتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم، خۆی لەوان جیاکردەوە، بەڵام ئەوان لە نێوان خولقێنراوان و خوای خولقێنەردا جیاوازی ناکەن، لە نێوان پەروەردگارو بەندەکانیدا جیاوازی ناکەن، لەنێوان دوو شتدا جیاوازی ناکەن.

(٢)_ ئا ئەمەیە ئەنجامی باوەڕ بوون بە(وحدة الوجود)، گوایە هەر کەسێك شتێکی پەرست ئەوە خوای پەرستووە، چونکە هەموو گەردوون بریتیە لە خوا، بۆیە بت و، مرۆڤ و، ئاژەڵ و، بەردو، درەخت بە قسەی ئەوان خوایە.

(٣)_ مەبەستی ئیبن وعەرەبی و هاوڕاکانی ئەوەیە کە جیاوازی هەیە لەنێوان عورفی ڕواڵەتی و عورفی پەنهان (العُرف الظاهر والعُرف الباطن)، گوایە فیرعەون وەلی و دۆست بووە لە ناوەڕۆکدا بەڵام لە ڕووکاردا زۆردار بوەو، بەهێزی شمشێر حوکمداری کردووە، بڕوانە: www.audio.islamweb.net، الشيخ ناصر بن عبدالكريم العقل:شرح باب توحيد الربوبية من فتاوى ابن تيمية، وەرگێڕ.

وە فەیلەسوفەکان دەڵێن: کاتێ جادووگەرەکان ڕاستگۆیی فیرعەونیان بۆ دەرکەوت لەو قسانەدا کە کردی، دانیان پێدانا بۆی و، وتیان: ﴿فَاقْضِ مَا أَنْتَ قَاضٍ إِنَّمَا تَقْضِي هَذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾[1] [طه: ٧٢]،

---

(١)_ ئەمە تەحریف و هەڵگێڕانەوەی قورئانە، چونکە جادووگەرەکان تەوبەیان کردو، کاتێ موعجیزەو بەڵگەو ڕاستگۆیی مووسا پێغەمبەریان _ علیه السلام _ بۆ دەرکەوت سوژدەیان بردو، تەوبەیان کرد، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ (٤٦) قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ (٤٧) رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ﴾ [الشعراء: ٤٦-٤٧] واتە: ئینجا جادووگەرەکان خران (کەوتن) بە ڕوودا بەسوژدە بردنەوە (بۆخوا) گوتیان: ئەوا باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری جیهانیان کە پەروەردگاری مووسا و هاروونە. کاتێکیش فیرعەون هەڕشەی کوشتنی لێکردن، گوتیان: ﴿فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ إِنَّمَا تَقْضِي هَذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا(٧٢) إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ وَاللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَى(٧٣)﴾[طه: ٧٢_٧٣] واتە: جا هەرچیت لە دەست دێت بیکە بێگومان تۆ تەنها لەم ژیانی دونیا دەستت دەڕواو بڕیار دەدەیت بە ڕاستی ئێمە باوەڕمان هێنا بە پەروەردگارمان بۆ ئەوەی لە تاوانەکانمان خۆش ببێت هەروەها لەو جادووەش کە بە زۆر پێتکردین وە خوای گەورە (پاداشتی) چاکترەو بەردەوامترە. تۆ لەم دونیایەدا دەمانکوژی بەڵام ئێمە بە ڕاستی بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە، دەرەنجاممان هەر گەڕانەوەیە بۆ لای خوای گەورە،

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

گوفتاری جادووگەرەکان ئەوەمان بۆ بە دەردەخات کە ئەوان ئیمانداربوونە بەخوای گەورە، بەتەواوی بەموسا پێغەمبەرو هاروونی برای بڕوایان هێناوە. بەلام فەیلەسوفەکان دەڵێن: نەخێر، جادووگەرەکان کاتێ ڕاستگۆیی فیرعەونیان بۆ دەرکەوت، گوتیان: ﴿فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ﴾ گوایە ڕاستگۆیی فیرعەونیان بۆ دەرکەوت بۆیە کاروباری خۆیان دایەدەستی و، گوتیان: ﴿فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ﴾، بەلام دلنیابن ئەمە واتەگۆڕین و هەڵگێڕانەوەی گوفتارەکانی خوای گەورەیە، وەکو ئەوەی جادووگەرەکان لە فیرعەون ڕازی بن و بەتەواوی زانیبێتیان ڕاستگۆیە، بۆیە گوتیان: ﴿فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ﴾ تۆ پەروەردگاریی. تەماشاکەن دەڵێن: فیرعەون ڕاستی گوتوە، بەلام ئەمە واتەگۆڕین و هەڵگێڕانەوەی گوفتارەکانی خوای گەورەیە.

وە دەڵێن: قسەکەی فیرعەون ﴿قَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى﴾[1] [النازعات: ٢٤] واتە گووتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم، ڕاست دەرچوو، کەوابوو فیرعەون خودی خوای هەق بوو.

پاشان نکوڵیان لە ڕۆژی دواییکردو[2]، خەڵکی دۆزەخیان وا دانا کە لەزەت و خۆشی دەبینن (فَيَتَنَعَّمون) وەکو چۆن ئەهلی بەهەشت لەزەت و خۆشی دەبینن (فَيَتَنَعَّمون)، ئیتر بە خواو، بە ڕۆژی دوایی و، بەفریشتەکانی و، کتێبەکانی و، پێغەمبەورانی کافر بوون[3]،

---

(١)_ بە لای ئەوانەوە کاتێ جادووگەرەکان گوتوویانە: ﴿فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ﴾ مانای ئەوەبووە ئەوان باوەڕیان کردووە کە فیرعەون خوای هەرە گەورەیانە، لێرەدا (شيخ الإسلام) _ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ گوفتارەکانی سەبارەت بەپەروەردگار تەواوبوو، شێخ دەیەوێت کوفری ئەوانمان سەبارەت بە پایەکانی ئیمان، ئیمان بەخوامان بۆ ڕوونبکاتەوە، گوایە هەموو گەردوون پێکەوە بریتیە لە خوا.

(٢)_ هەروەها نکوڵیان لە ڕۆژی دوایيش کرد، وتیان: ڕۆژی دوایی بریتیە لە باروحاڵێك تەنها دەگۆڕێت و هیچی تر، بەلای ئەوانەوە ڕۆژی دوایی بریتی نییە لە زیندوبونەوەو، پاداشت و، حیساب کردن و، بەهەشت و، دۆزەخ، شتی ئەوەهایان نییە.

(٣)_ ئەمەیە حەقیقەتی فەیلەسوفان ئەوان بەخوای گەورە کافرن، بەفریشتەکان کافرن، واتە: دەڵێن: فریشتە نییە، خوا نییە، بەڵکو هەموو گەردوون پێکەوە بریتیە لە خوا، خوایەکی سەربەخۆ نییە، بە ڕۆژی دوایی کافرن، واتە: دەڵێن: بەهەشت و دۆزەخ نییە، باروحاڵی هەموو خەڵك یەکەو، هەمووان لەوەت و چێژ وەردەگرن، ئەهلی دۆزەخیش چێژ وەردەگرن.

له کاتێکدا بانگەشەیەکی وا دەکەن کە گوایە خۆیان پوختەی تایبەتە تایبەتەکانن (خُلاصة خاصة الخاصة)[1] لە ئەهلی وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورەن و، گوایە خۆیان لە پێغەمبەران چاکترن و، پێغەمبەران لە تاقەکەی (مِشكاة)کەی ئەوانەوە وەردەگرن[2].

لێرە لەم بابەتەماندا شوێنی ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی ئیلحادی ئەوان نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی میانەی باسەکە سەبارەت بەئەولیاو دۆستانی خوایەو، ڕوونکردنەوەی جیاکاریەکانی نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانەو، ئەمانەش لە هەموو خەڵك زیاتر بانگەشەی وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە بۆ خۆیان دەکەن، لە کاتێکدا لەهەموو خەڵك زیاتر دۆستی شەیتانن بۆیە ئاگاداریمان لەبارەوە داوەو، خستومانەتە ڕوو[3].

---

(١)_ بانگەشەیەکی وا بۆ نەفسی خۆیان دەکەن گوایە تەواوترین و کاملترین تێکڕای خەڵکن لەڕووی ئیمان و عەقڵەوە، گوایە شتەکەی ئەوان بەیەکتاپەرستی گەیاندوونی، کە بریتیە لە (وحدة الوجود)، بۆیە بە لای ئەوانەوە هەر کەسێك باوەڕی بە (وحدة الوجود) نەبێت هاوەڵپەرست و موشریکە، ئەو کەسەش باوەڕی پێی بێت یەکتاپەرستە.

(٢)_ لە تاقەکەی (مِشكاة)ەکەی ئەوانەوە وەردەگرن، گوایە ئەوان ڕێنیشاندەری پێغەمبەرانن، چونکە لە پێغەمبەران زانا ترن.

(٣)_ لەبەر ئەوەی کتێبەکە سەبارەت بە جیاکاریەکانی نێوان دۆستانی ڕەحمان و دۆستانی شەیتانەو، ئەوانیش بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن و، گوایە دۆستانی تایبەتمەندی خوان، بۆیە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ ئاشکرای یکردووە کە دۆستانی شەیتانن و، دۆستانی خوای گەورە نین، بەدرۆی خستونەتەوەو، گوفتارو گومانەکانی ئەوانی هەڵوەشاندۆتەوە.

بۆیە زۆربەی قسەکانیان لە ڕاستیدا تەنها دەربارەی باروحاڵەتە شەیتانیەکانە[1]، ئەوەش دەڵێن کە ئیبنوعەرەبی خاوەنی کتێبی (الفتوحات) گوتویەتی: بەشی زەمینەی حەقیقەت، وە دەڵێن: بریتیە لە زەمینەیەکی خەیاڵ[2]، دانی پێدادەنێت ئەو حەقیقەتەی کە لەبارەیەوە قسەدەکات بریتیە لە خەیاڵات، خەیاڵاتیش جێگەی ئەصەڕوفی شەیتانە، چونکە شەیتان شتەکان بە پێچەوانەوە بەخەیاڵی مرۆڤدا دێنێت.

---

(١)_ پێویستە گومڕایەکانیان ڕوون بکرێتەوە، چونکە هەیەو، گومڕایەکانیان هەیەو، کتێبەکانیشیان هەیە، ئەمە هەیە، لە کتێبەکانی ئیبنوعەرەبیدا هەیە، لە (الفتوحات المكية) دا هەیە، لە (فصوص الحِكَمْ) دا هەیە، کە ئێستا چاپ دەکرێت و تەحقیق دەکرێت و لە نێوان خەڵکیدا بڵاو دەکرێتەوەو، لە پێشانگا کتێبیەکاندا دەفرۆشرێت، واتێدەگەن ئیبن وعەرەبی لە بەرزترین پلەکانی زانست و تێگەیشتن دایە، ئەوەی ترسی لێدەکرێت بریتیە لەوەی پێدەچێ شتەکە سەر لە نەفامان بشێوێنێت، بۆیە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ شتەکەی ڕوون کردۆتەوە.

(٢)_ بە لای ئەوەوە خەیاڵات هیچ حەقیقەت و بەڵگەو جێگیریەکی نییە، لە ڕاستیدا قسەکانیان تەنها گومڕایی و کوفریاتە، لە کاتێکدا بانگەشەی ئەوەدەکەن کە تەواوترین و کامڵترینی هەموو خەڵکن لە ڕووی زانست و تێگەیشتنەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ (٣٦) وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ (٣٧)[1] حَتَّى إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ (٣٨)[2] وَلَنْ يَنْفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذْ ظَلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ (٣٩)﴾[الزخرف: ٣٦_٣٩].

---

(١)_ ئەمانەن دۆستانی شەیتان چونکە ڕوویان لە یادی خوای گەورە وەرگێڕا، بۆیە شەیتانەکان لە ئەستۆی گرتن و، خستنییە نێو ئەم گومڕایی و، تاریکستانی و، بارودۆخە پڕ مەترسیدارو سامناکانەوە _ پەنا بە خوا _، ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ﴾ وە هەر کەس پشت لە یادیی خوا هەڵکات، لەئاستی یادکردنەوەی خوای گەورەدا خۆی نابینا بکات و، تەماشای نەکات، ﴿نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا﴾ شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکرێت، وەکو سزایەك، کەوا بوو هەر کەسێك پشت لە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵکات شەیتان لە ئەستۆی دەگرێت، ﴿فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾ کە هەمیشە لەگەڵی بێ و لێی جیا نەبێتەوە، ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ﴾ شەیتانەکان ئەمانە لە ڕێگەی ڕاست لادەدەن، بۆ ئەوەی بەتەواوی گومڕاییان لەسەر قایم بکات، ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ واش دەزانن بە بێگومان هەر ئەوانن ڕێنووین، ئەمەش لە تەواوێتی سزاکەیە، چونکە مرۆڤ ئەگەر هەڵە بکات و، بزانێت هەڵەی کردووە، زۆر لەو کەسە باشترە کە هەڵەی کردوەو، نازانێت هەڵەی کردووە، بەڵکو خۆی بەڕاست دادەنێت، چونکە یەکەم دەگەڕێتەوە بەڵام دووەم ناگەڕێتەوە.

(٢)_ خوای گەورە لە دونیادا شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکات، کە لەگەڵیدایەو لێی جیا نابێتەوە، بەڵام ئەگەر ڕۆژی قیامەت هات، مرۆڤەکە بەو شەیتانەی گومڕایی کردبوو لەدونیادا دەڵێت: ﴿قَالَ يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ﴾ دەڵێ خۆزگە نێوانی

-----------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------

مـن و تـۆ بەقـەدەر نێـوان خۆرهـەڵات و خۆرئـاوا بوایـە، ﴿فَبِئْسَ الْقَرِينُ﴾ ئـای کـە هاوڕێیەکی خراپ بوویت، ﴿وَلَنْ يَنْفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذْ ظَلَمْتُمْ﴾ ئـەم خۆزگـە خواستنە هـیچ سودێکتان پێ ناگەیـەنێ چـونکە سـتەمتان کـرد، واتـە لـەڕۆژی قیامەتـدا، ﴿أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ بێگومان ئێوە لە سزای سـەخت دا هاوبەشـن، نـەریتی بـاوی خـەڵك ئاوەهایە کە ئەگەر زیان و ئازار بەسەر هەموو خەڵکدا هاتبێت، دەڵێت: لەبـەر ئـەوەی هەموو خەڵکی ئاوەهان کێشـە نییـە، ئازارەکـەی لەسـەر سـووك دەبێتـەوە، بـەڵام لـە ڕۆژی قیامەتدا هەر کەسێك وا دەزانێت هەر هەموو سزاکە لەسەر خۆیـەتی بـەبێ هـیچ کەسی تر.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾[(١)].

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا﴾[النساء: ١٢٠] واتە: (شەیتان) بەڵێنیان پێدەدات و ئاوات و ئومێدیان دەخاتە بەر دڵنیا بن شەیتان هیچ بەڵێنێکیان پێ نادات جگە خەڵەتاندن نەبێت .

---

(١)_ ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ﴾ شیرك و هاوەڵپەرستی نابوردرێت مەگەر بەتەوبە کردن، ئەمە بەپێچەوانەی ئەو تاوانانەوەیە کە لە خوار هاوەڵپەرستیەوەن، ئەمانە ئومێدی بوردنیان دەکرێت، ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ بەلام جگە لەوە هەرچی بێت لێی خۆش دەبێت لە هەر کەسێك ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لەو تاوانانەی لە خوار شیرك و هاوەڵپەرستیەوەن، ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ وە هەر کەسێك هاوەڵ بۆ خوا دابنێت ئەوە بەڕاستی گومڕابووە بە گومڕابونێکی دور لەڕاستی. ئەمەیە ئەنجام و ئاکامیان _ پەنا بە خوا _ چونکە کاتێ وازیان لە قورئان و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، وە لەگەڵ بیرو ئەندێشەو خەیاڵاتی خۆیاندا چوون شەیتان لە ئەستۆی گرتن و، فریویدان و هەڵیخەڵەتاندن و، تاوانەکانی بۆ ڕازاندنەوە تا بەو دەرەنجامە ناشیرینە گەیشتن، ئەوانەن دۆستانی شەیتان بڕوانە چۆن وێڵبوونە، ئەمەیە جیاوازی نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان لە دونیاو ڕۆژی دواییدا، ئیتر چۆن دەگوترێت: دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان یەکسانن، ئەوان یەکسان نین.

هەروەها لە ئايەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلَّا أَنْ دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ مَا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنْتُمْ بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِنْ قَبْلُ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[1] [إبراهيم: ٢٢].

---

(١)_ شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ پێشتر ئەوەی بۆ ڕوونکردینەوە کە زیندەڕۆییکارانی و فەیلەسوفان تووشی ئیلحادو کوفر بوو بوون، چونکە سەرپێچی پێغەمبەرانیان کرد، کاتێکیش سەرپێچی پێغەمبەرانیان کرد سەرپێچی کتێبەکانی خوایان کرد، بۆیە خوای گەورە شەیتانی بەسەردا زاڵ کردن، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ (٣٦) وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ (٣٧)﴾ {الزخرف: ٣٦_٣٧} هەر کەس پشت لە یادی خوای گەورە بکات شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین کە هەمیشە لەگەڵی بێ و لێی جیا نەبێتەوە، وە بێگومان شەیتانەکان لە ڕێگەی ڕاست ڕێگرییان دەکەن واش دەزانن بە بێگومان هەر ئەوانن لەسەر ڕێنموونی ئەوا هۆکاری ئەوەش بۆ دووشت دەگەڕێتەوە.

یەکەم: ڕوو وەرگێڕانیان لە پێغەمبەران و کتێبەکانی خوای گەورە.

دووەم: بە هەواو ئارەزووات و عەقڵی خۆیان کاردەکەن. بۆیە خوای گەورە شەیتانی بەسەردا زاڵکردن گومڕایی کردن و، پێشەوایەتی کردن و فریویدان و هەڵی خەڵەتاندن، پاشان خوای گەورە بەیادی هێناوەتەوە ئەو شەیتانەی کە لەدونیادا فریوی دان و هەڵیخەڵەتاندن و بۆ کوفر و ئیلحاد شەیتان پێشەوایەتی کردن، لە ڕۆژی قیامەتدا خۆی لەوانە بەریدەکات، هەرکات بەیەکەوە چوونە دۆزەخەوە خۆی لە شوێنکەوتوانی بەریدەکات، ﴿وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ﴾ کاتێ کە کارەکان تەواو دەبێ و، خوای گەورە لەگەڵ مەخلوقاتی خۆیدا حیساب تەواو دەکات و ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوەو، ئەهلی دۆزەخ دەچنە دۆزەخەوە، ﴿إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾ شەیتان دەڵێ: بێگومـان خـوا بـەڵێنی پێـدان بـە بـەڵێنی هـەق و ڕاسـت وە منـیش بـەڵێنم پێـدان بـەڵام درۆم لەگـەڵ کـردن، شـەیتان بـۆی ڕوونکردنەوە کە هەر خۆی بوو سەرپێچی پێکردن و نەیهێشـێت پـەیمانی خـوای گـەورە بەجێبێنن، بەهۆی تاوان و ڕوو وەرگێڕانیانەوە، لە ڕاستیدا شەیتانیش بەسەر ئەم جۆرە کەسـانەو هاوشـێوەکانیاندا زاڵ دەبێـت، ئـەگینا هـیچ دەسـەڵاتێکی بەسـەر بەنـدە دڵسـۆزەکانی خـوای گـەورەدا نییـە، لـەو بـارەوە خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ﴾[الإسراء: ٦٥] واتە: بێگومان بەندەکانی من دەسـەڵاتت بەسـەریاندا نییـە (و نـاتوانی گومڕایـان بکـەیت). شـەیتانیش گوتویـەتی [ص: ٨٣] واتە: ئەوانەیان نەبێ کە بەندەی پاك و هەڵبژێردراوی تۆن. ئەوانەی دڵسۆزی خوای گەورە بـوون، ئەمـەش بـاس دەکـات بـۆ ئـەوەی خەفـەتباریان بکـات و، ئاخیـان پێهەڵکێشـێت و، زیـاتر خـەمبارین و پەشـیمانی هەڵکێشـن، پاشـان شـەیتان بـۆی ڕوونکردونەتەوە کە زۆری لێنەکردوون و، هیچ دەسـەڵاتێکی بەسـەریانەوە نییـە زۆریـان لێبکات، بەڵکو بـەخوا خۆیـان شـوێنی کـەوتن، ﴿وَمَا كَانَ لِي عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ﴾ وەمـن هیچ زۆری و دەسەڵاتێکە نەبوو بەسەرتاندا، هیچ بەڵگـەو، زۆرو، ناچـاریەکی بەسـەریاندا نەبوو، ﴿فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ کەواتـە لۆمـەی مـن مەکـەن بـەڵکو لۆمـەی خۆتـان بکەن، لەسەر ئەوەی پێمکردن لۆمەی من مەکـەن، چـونکە مـن زۆرم لێنـەکردن، بـەڵکو لۆمەی خودی خۆتان بکەن، چونکە ملکەچم بوون بـەبێ هـیچ زۆرو دەسـەڵاتێك، ﴿مَا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ﴾ بە ڕاستی من ناتوانم بێم بەهاواری ئێوەوە، چونکە ناتوانم فریاتان بکەوم و، ڕزگارتان بکەم لەوەی کە ئێوەی تێدان، ﴿وَمَا أَنْتُمْ بِمُصْرِخِيَّ﴾ وە ئێوەش ناتوانن بێن بـە هاواری منەوە، چونکە ئێوەش ناتوانن ڕزگـارم بکـەن و، سـەرم بخـەن لـەوەی کـە مـنی تێدام، ﴿إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِنْ قَبْلُ﴾

---------------------------------------------
---------------------------------------------
---------------------------------------------

بەڕاستی من بڕوام نەبوو بەوەی کە پێشتر لەدونیادا منتان کردبوو بە هاوبەش بۆ خوا، خۆی بەریکرد لە هەموو ئەو شتانەی کە بەهۆی ئەوەوە لە دونیادا ئەنجامیان دابوو، هەموو پەیوەندیەکانی نێوان خۆی و ئەوانی بچڕاند، ئائەمەیە چارەنوسیان لە ڕۆژی قیامەتدا، چارەنوسی هەموو کەسێکیشە کە لە قورئان و سوونەت پشت هەڵکات و، ئەو صۆفیانەش کە شوێنی شەیتان دەکەون چارەنوسیان هەمان چارەنووس دەبێت، ﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بەڕاستی ستەمکاران سزایەکی سەختیان بۆ دەبێت. کەچی خوای گەورە لەبارەی تەقواکارانەوە دەفەرموێ: ﴿وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلامٌ﴾[إبراهيم: ٢٣] واتە: وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە دەخرێنە ناو بەهەشتانێك کە ڕوبارەکان دێن و دەچن بە ژێریاندا بە هەمیشەیی تیایدا دەبن بەئیزنی پەروەردگاریان بەخێرهاتنیان لەو (بەهەشتە)دا بە گوتەی سەلامە. ئا ئەمەیە ئاکام و دەرەنجامی هەر کەسێك شوێنی پێغەمبەران بکەوێت، ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ دەخرێنە نێو بەهەشتانێکەوە ترسیان نابێت لێیان بسەنرێتەوە یان لێی دوربخرێنەوە، بە هەمیشەیی هی خۆیان دەبێت، ئا ئەمەیە دەرەنجامی بڕوابون بە خواو، کتێبەکانی و، پێغەمبەرانی و، ڕۆژی دوایی، بەڵام ئەمە صەبرو ئارامگرتنی دەوێت، لە دونیادا هەر لە خۆوە بە دەست نایەت، بەڵکو پێویستی بە ئارام گرتن و خۆقایم کردنە، پێویستی بە زانست و زانینە، هەر لە خۆوە بەبێ ماندووبن بەدەست نایەت، بەبێ هیچ زانستێك و، بەبێ ئارامگرتن و خۆجێگیر کردن، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَالْمَلآئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ(٢٣) سَلاَمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ(٢٤)﴾ [الرعد: ٢٣ـ ٢٤] واتە: فریشتەکانیش دەچنە ژورەوە بۆ لایان لە هەموو دەرگایەکەوە (پێیان دەڵێن)

سەلامتان لێ بێ چونکە ئارامتان گرت (لەدونیادا) جا چەند سەر ئەنجامێکی چاکتان بوو. کەوابوو ئەو شتەیان بەرِیککەوت و، ئاسانی دەست نەکەوت، بەڵکو نارەحەتیان چەشت و ئارامیان گرت تا بەدەستیان هێنا. سەرەنجامیش ئەمەیە چارەنوسی ئەوانەو هاوشێوەکانیان ئەوانەی سەرپێچی پێغەمبەرانیان کرد، سەرپێچی کتێبەکانی خوای گەورەیانکرد، بە گوێرەی عەقڵ و هەواو ئارەزواتی خۆیان ڕەفتاریانکردو، شەیتانەکان بوون بە پێشەنگیان، شەیتانەکانی ئادەمیزاد و جنۆکە بۆ ئەم چارەنووسە بەئازارە کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕزگار بوونی بۆ نییە بردنی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكُمْ إِنِّي أَرَى مَا لاَ تَرَوْنَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾(١).

---

(١)_ ئەمە هەڵوێستێکە لە هەڵوێستەکانی شەیتان لەگەڵ ئەوەی ئادەمدا، کە بریتی بوو لە هەڵوێستی شەیتان لە ڕۆژی جەنگە بەدر دا، شەیتان بە وێنەی سەرکردەیەك لە سەرگەورەکانی عەرەبدا بۆ بێباوەڕان دەرکەوت و، پێی گوتن: ﴿وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ﴾ بێگومان من پەنادەرو پارێزەری ئێوەم، چونکە نەریتی باوی عەرەبیش ئەوەبوو کە هانایان بۆ کەسانی بەهێزو سەرکردەکان دەبردو، داوای یارمەتیان لێدەکردن، بۆیە شەیتانیش لە شێوەی پیاو ماقوڵێکدا خۆی نیشاندان، ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ﴾ شەیتان کردەوەکانی بۆ ڕازندنەوە و پێی گوتن ئەمڕۆ هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ بێگومان من پەنادەرو پارێزەری ئێوەم، پێی گوتن: مەترسن، ئەوە بوو تووشی کردن و، فریویدان و، هەڵیخەڵەتاندن بۆ ئەوەی بجەنگن، پێی گوتن: ﴿وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ﴾ ئەمڕۆ هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ، ئەمە لووتبەرزی و خەڵەتاندنە _ پەنا بە خوا _، پێی گوتن: ﴿وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ﴾ بێگومان من پەنادەرو پارێزەری ئێوەم، هیچ کەس بەئێوە ناگات، ﴿فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ﴾ ئینجا کاتێ هەر دوو تاقمەکە ڕوو بەڕووی یەکتربوونەوە، ﴿نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ﴾ شەیتان پاشەو پاش بەدوای خۆیدا گەڕایەوە، کاتێکیش هەردوو بەرەکە تێکچڕژان و، جەنگەکە دەستی پێکرد، شەیتان ڕایکردو، بەجێی هێشتن و ﴿وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكُمْ﴾ گوتی: بە ڕاستی من بەرییم لە ئێوە، کاتێ تووشی کردن خۆی لێبەری کردن، هۆکارەکەی چ بوو؟ گوتی: ﴿إِنِّي أَرَى مَا لاَ تَرَوْنَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، فریشتەکانی لەگەڵ هاوەڵان، لە گەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەدیکرد، شەیتانیش هەرگیز لەگەڵ فریشتەکاندا یەکناگرێت، بۆیە کە فریشتەکانی بینی ڕایکرد گوتی: ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ لە خوا دەترسێت. ئەمە تەنها یەك هەڵوێستی شەیتان بوو بەرامبەر بە دۆستانی خۆی لە دونیا دا کە بریتی بوو لە جەنگی بەدر، هەڵوێستیشی لە ڕۆژی قیامەتدا بەو جۆرەیە کە لە ئایەتەکەی سەرەوەدا زانیتان.

هەروەها پێغەمبەری خوا لە فەرموودەیەکی (صحیح) دا دەفەرمووتی: ((إنَّهُ قَدْ رَأَى جِبْرِيلَ يَزَعُ الْمَلاَئِكَةَ))[1] مرسل: أخرجه مالك في ((الموطأ)) (باب جامع الحج) من طريق إبراهيم بن أبي عبلة. واتە: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ((شەیتان لە جەنگی بەدردا جوبرەئیلی بینی سەرپەرشتی ڕیزی فریشتە دەکات و ڕێکیان دەخات بۆ چوونە پێشەوە))، شەیتانەکانیش هەر کات فریشتەکانی خوایان بەدیکرد کە بۆ پشتگیری بەندەکانی خۆی دیانێرێت لێیان هەڵدێت، چونکە خوای گەورە بەندە ئیماندارەکانی خۆی بەفریشتەکانی خۆی پشتگیریدەکات.

لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلاَئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا﴾[2] [الأنفال: ١٢] واتە ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ﴾ (بینەوەبیر) کاتێك کە پەروەردگارت نیگای نارد ﴿إِلَى الْمَلاَئِكَةِ﴾ بۆ فریشتەکان ﴿أَنِّي مَعَكُمْ﴾ کە بێگومان من (خوا) لە گەڵتانم ﴿فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ دەی دڵی کەسانێك قایم و دامەزراوکەن کە باوەڕیان هێناوە.

---

(١)_ تەفسیرو ڕاڤەی ئایەتەکەی پێشوو: ﴿إِنِّي أَرَى مَا لاَ تَرَوْنَ﴾ واتە شەیتان گوتی: چونکە بە ڕاستی ئەوەی من دەبینم ئێوە نایبینن، شەیتان چ بینی ؟ شەیتان لە جەنگی بەدردا ئەوەی بینی کە جوبرەئیل سەرپەرشتی ڕیزەکانی فریشتە دەکات و ڕێکیان دەخات بۆ چوونە پێشەوە.

(٢)_ بەڵێ، ئەمە لە جەنگی بەدر دا بوو، ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلاَئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ﴾ کاتێك کە پەروەردگارت نیگای نارد بۆ فریشتەکان کە بێگومان من (خوا) لەگەڵتانم، لەگەڵ دابوونەکەی خوای گەورە لەگەڵدا بوونی سەرخستن و پشتگیریە، ﴿فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ دڵی کەسانێك قایم و دامەزراوکەن کە باوەڕیان هێناوە، فریشتەکان دادەبەزن بۆ قایم کردن و دامەزراندنی دڵی ئیمانداران و پشتگیری

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------

کردنیان، نەك خۆیان بجەنگن، بەلام پشتگیری و یارمەتی موسڵمانان دەدەن بۆ ئەوەی بەسەر دوژمنەکانیاندا سەرکەون، دەشگوترێ: لە جەنگی بەدر دا لەپاڵ هاوەلاندا جەنگاون، بەلام بە زۆری دا دەبەزن بۆ بەهێزکردن و دڵنیایی و ئارام بەخشین بە موسڵمانان و دورخستنەوەی شەیتان لێیان، ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ﴾ ئەو فریشتانەی دابەزینە بەدر من (خوا) لەگەڵتانم، پاشان لەهەمان ئایەتدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ﴾ خوای گەورە قایمی و جێگیر بوونی خستە دڵی ئیماندارانەوە ئەگەرچی بە ژمارەش کەم بوون، بەلام ترس و بیمێکی گەورەی خستە دڵی کافرانەوە ئەگەر چی بەژمارەش دوو ئەوەندی موسڵمانان بوون، بەلام هێزەکەیان هیچ سوودێکی پێنەگەیاندن، خوای گەورە ترسێکی گەورەی خستە دڵیانەوە، لە هەمان کاتیشدا هێزو ئازایەتی و قایمی و جێگیر بوونی خستە دڵی باوەڕدارانەوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا﴾[1] [الأحزاب: ٩].

---

(١)_ ئەمە لە جەنگی ئەحزاب دابوو کە بە جەنگی خەندەق ناو دەبرێت، جەنگەکە بە خەندەق ناوبرا، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەوری شاری مەدینەی پیرۆزدا چاڵێکی قوڵ و درێژی هەڵکەند، بۆ ئەوەی رێگریی لە کافران بکات و، نەتوانن بێنەنێو شارەکەوە، جەنگەکە بە ئەحزابیش ناو دەبرێت، چونکە هەر هەموو هاوەڵپەرستان کۆبونەوەو، بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵیان بەست و، دەیانویست پێغەمبەری خواو ﷺ هاوەڵانی لە ناو بەرن، بە هۆی ئەو کۆمەڵە زۆرو سەربازە زۆرانەوە، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە بیر لەچاکەو بەهرەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە، کە سەرکەوتنی پێبەخشین، ﴿إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ﴾ کاتێ لەشکرێکی زۆرتان بۆ هات لە جەنگی خەندەقدا، لەشکری زۆری بێباوەڕان، نەك قورەیش بە تەنها، بەڵکو هۆزگەلێکی زۆری تری عەرەبیشیان لەگەڵدا بوو، بۆیە بە ئەحزاب ناو بران، ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا﴾ ئینجا ئێمە بایەکی بەهێزمان بۆ ناردن، کاتێ ئابلۆقەی سەر موسڵمانان درێژەی کێشا خوای گەورە لە شەوێك لە شەوەکاندا بایەکی بەهێزی بۆ ناردن، خێوەتەکانی هەڵکەندن، بەرد بارانی کردن، ترسێکی زۆری خستە دڵیانەوە، بۆیە هەڵهاتن، هەروەها فریشتەکانیش لەگەڵ با بەهێزەکەدا دابەزین بۆیە ترسان و خێرا هەڵهاتن، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾ [الأحزاب: ٢٥] واتە: وە خوا کافرەکانی (قورەیش لەشکریان هێنابوو بۆ سەر مەدینە) گەڕاندەوە بەڕق و مەراقەوە (بۆ وەڵاتی خۆیان) هیچ خێرو ئاواتێکیان (لەناوبردنی ئیمانداران) دەست نەکەوت خوا ئیمان دارانی لە جەنگ پاراست (بەهۆی بای توندو فریشتەوە کافرانی پرژو بڵاوکرد) وە خوا

---

---

---

هەمیشە بەهێزی بە دەسەڵاتە. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ الَّذِينَ ظَاهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا (٢٦) وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَارَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَئُوهَا(٢٧)﴾[الأحزاب: ٢٦_٢٧] واتە: خوا (بەنی قورەیزە) کە پشتگیری ئەوان (قورەیش و غەطفان)یان کرد هێنانی یە خوارەوە، چونکە جولەکەکانی بەنی قورەیزە لە گەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ناپاکیان کردو، پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە، چونکە پێشتر پەیمانیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دابوو کە ئەگەر مەدینەی پیرۆز تووشی پەلامار هات ئەوان لە گەڵ موسڵماناندا دەجەنگن، بەڵام کاتێ ئەحزابەکان هاتن پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوەو، چوونە ڕیزی ئەوانەوە، پاش شکست خواردنی بێباوەڕان پێغەمبەری خوا ﷺ غەزایکردن، غەزای بەنو قورەیزەی کرد، ئابلۆقەی دان تا لە قەڵاکانیان هاتنە خوارەوە، هاوەڵی بەڕێز سەعدی کوڕی مەعاز ﷺ حوکمی بەسەردادان، چونکە خۆیان بە حوکمی سەعد ڕازیبوون، ئەو حوکمەی بەسەردادان کە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و، ژن و منداڵ و سەرەوەت و سامانیشیان بکرێ بەدەسکەوت، بەهۆی ئەوەوە کە پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە، لە قەڵاکانیان وە ترسی خستە ناو دڵیانەوە کۆمەڵێکیان دەکوژن وە کۆمەڵێکی تریان بەدیل دەگرن (دوای تیاچوونی ئەوان خوا) زەوی و خانو و سامانی ئەوانی دا بە ئێوە هەروەها زەوی یەکیش کە پێتان پیا نەنابوو، ئەو زەویەش خەیبەر بوو کە هی جولەکەکان بوو کە دواتر خوای گەورە بە موسڵمانانی بەخشی. دەرەنجام ئەوەیە کە هەموو ئەو شتە بە هۆی صەبرو ئارامگریی و جێگیر بوونی موسڵمانانەوە بوو، پوختەی شتەکەش ئەوەیە کە موسڵمانان فریشتەیان لەگەڵدا دەبێت بەڵام کافران و هاوەڵپەرستان شەیتانیان لە گەڵدایە.

هەروەها هەر سەبارەت بەم بابەتە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهَا﴾[1] [التوبة: ٤٠].

---

(١)_ هەروەها لە هەڵوێستێکی سێ یەمدا کە بریتی بوو لە باروحاڵی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ویستی کۆچ بکات و، بەهاوەڵەکانی بگات، هاوەڵپەرستان ویستیان ڕێگریی لێبکەن، لە نێوان خۆیاندا ڕاوێژیان کردو کۆبونەوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾[الأنفال: ٣٠.] واتە: وە (بیربکەرەوە) کاتێك ئەوانەی بێباوەڕ بوون پیلانیان لە دژت دەگێڕا تا بەندو کۆتت بکەن، یان بتکوژن یان (لە مەککە) دەرت بکەن وە ئەوانە (بەردەوام) فڕوفێڵ دەکەن وە خوایش لە بەرامبەر ئەواندا پیلان دەگێڕێت وە خوا چاکترینی پیلان گێڕانە (بەرامبەر پیلان گێڕان). خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ لەنێویانەوە دەرهێنا لە کاتێکدا هیچ هەستێکیان پێنەکرد، خۆی و ئەبوبەکری هاوەڵی رضي الله عنه چوونە نێو ئەشکەوتی سەورەوە لە باشوری مەککەو، خۆیان تێدا شاردەوە، هاوەڵپەرستانیش بە هەموو هۆکارێك بە دوایاندا گەڕان، خەڵات و بەخششیان دانا بۆ هەرکەس بیانهێنێتەوە، بە دوایاندا گەڕان تا چوونە سەر ئەشکەوتەکە و نەیانبینین، خوای گەورە چاوی بێباوەڕانی لەوان دورخستەوە، ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهَا﴾ ئەو کاتە بەهاوەڵەکەی دەووت خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە ئینجا خوا ئارامی و ئاسایشی بۆ ناردە خوارەوە وە یارمەتی دا بەسەربازانێك کە نەتاندیین، فریشتەکان دابەزینە خوارەوە بۆ پشتگیری کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکەی رضي الله عنه، ئیتر لە ئەشکەوتەکە هاتنەدەرێ و، چوون بۆ مەدینەی پیرۆز

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------

بە سەلامەتی خوای گەورە، هیچ کەسێك ڕێگریی لێنەکردن تا بە مەدینەی پیرۆز گەیشتن، ئا ئەمەیە ئاکام و ئەنجامی صەبرو ئارام گریی و جێگیر بوون لە پێناوی خوادا. ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ﴾ بە ئەبوبەکری هاوەڵی فەرموو، ئەمە شایەتیدانی هاوەڵێتیە بۆ ئەبوبەکر، خوای گەورە شایتی هاوەڵێتی بۆ ئەبوبەکر ﷺ داوە، بۆیە ئەگەر گوترا ئەو هاوەڵە کێیە؟ کە خوای گەورە شایێتی هاوەڵێتی بۆ داوە؟ ئەبوبەکرە ﷺ، ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ چونکە ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ بەترسەوە بەپێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر یەکێکیان تەماشای بەرپێی خۆی بکات دەمانبینێت، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەبوبەکری ﷺ دڵنیاکردەوەو، فەرمووی: چۆن گومان بە دووان دەبەی خوای گەورە سێیەمیان بێت، ئیتر خوای گەورە ئەوەی دابەزاند دابەزاندو، بێباوەڕانی بەسەرشۆڕی گەڕاندەوەو، پێغەمبەری خواو هاوەڵەکەی لەوان پاراست، تەماشاکەن دوو کەس هەر هەموو خەڵکی مەککە چوونە دەرەوە بۆ گرتنیان کە چی بێتوانا بوون لە گرتنیاندا، دووان بوون و کەسی تریان لە گەڵ نەبوو.

دیسان له ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَنْ يَكْفِيَكُمْ أَنْ يُمِدَّكُمْ رَبُّكُمْ بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُنْزَلِينَ (١٢٤) بَلَى إِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ (١٢٥)﴾[1] [آل عمران: ١٢٤_١٢٥]

واته: (بیریان بخەرەوە) ئەو کاتەی دەت گووت بە بڕوادارەکان ئایا بەستان نییە پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات بە سێ هەزار لە فریشتە دابەزێنراوەکانبەڵێ ئەگەر ئارام بگرن وە لە خوا بترسن پەلامارتان بدەن لەم کاتانەدا پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات بەپێنج هەزار لە فریشتە نیشانەدارەکان.

---

(١)_ گوتراوە ئەمە لە جەنگی بەدردا بووە، وە گوتراوە لە جەنگی ئوحوددا بووە کە خوای گەورە بەهێزو سەرکەوتن یارمەتی موسڵمانانیودا، ﴿وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا﴾ پەلامارتان بدەن لەم کاتانەدا، ﴿يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات بەپێنج هەزار لە فریشتە نیشانەدارەکان، گوتراوە نیشانەکرابون بەنیشانەگەلێك کە لەهی مرۆڤ ناچێت، یان ئەسپەکانیان نیشانەکرابوون، گوتراوە فریشتەکان مێزر گەلێکی سپیان بەسەرەوە بوو، گوتراوە تووکی ئەسپەکانیان لە تووکی ئەسپی ناسراو نەدەچوو. ئەمە کۆمەکی خوای گەورە بوو کە بۆ دۆستان و ئەولیای خۆی ناردی، چونکە کتێبەکە باسی دۆستانی ڕەحمان و دۆستانی شەیتان دەکات، ئەمە بوو کۆمەکی خوای گەورە بۆ دۆستانی ڕەحمان، بە فریشتە و بەسەرکەوتن یارمەتیدان و، ئیمانداران لە بارودۆخە قورسەکان ڕزگار دەکات و، ڕێگای دەرچوونیان بۆ دەکاتەوە. ئەوەش هەڵویستی شەیتان بوو لەگەڵ دۆستەکانیدا کە تەنها سەر شۆڕی و ئابڕوو چون و دۆڕاوی بوو.

هەروەك چۆن بڕواداران فریشتەكانیان بۆ دێت و یارمەتی یان دەدەن بە ئیزنی خوا عزوجل بە پێچەوانەوە دۆستانی شەیتان ڕوحی نادیاریان بۆ دێت، قسەیان لەگەڵ دەكەن و، خۆیان بە چەندەها شێوە نیشاندەدەن[1]، لە كاتێكدا ئەو شتانە تەنها جنۆكە و شەیتانەكانن[2]، كەچی وادەزانن فریشتەن[3] وەكو ئەو ڕوحە نادیارانەی لەگەڵ ئەو كەسانەدا قسەدەكەن كە ئەستێرەو بتەكان دەپەرستن[4].

---

(١)_ دۆستانی شەیتان ڕوحیان بۆ دێت قسەیان لەگەڵ دەكەن، ئەو ڕوحانە تەنها شەیتانن و هیچی تر قسەیان لەگەڵدەكەن و دەڵێن: ئێمە فریشتەین، (ڕوح) واتە: شاراوەو نادیار، چونكە شەیتانەكان خۆیان بە چەندین شێوە دەگۆڕن بە جۆرێك نە ناسرێنەوە، خۆیان دەچوێنێن بە مرۆڤ بەجانەوەر بەهەر شتێك و خۆیان پیشان دەدەن.

(٢)_ لە حەقیقەتیاندا جنۆكەن و شەیتانن بۆ فریودان و هەڵخەڵەتاندنی نەوەی ئادەم.

(٣)_ بەو شتانە دڵخۆش دەبن وادەزانن فریشتەن و بۆ ئەوانیش دابەزیون بە هاوشێوەی ئەو فریشتانەی كە بۆ پێغەمبەران دادەبەزین، بۆیە دەڵێن: گوایە پێویستیان بەپێغەمبەران نییە، چونكە فریشتەیان بۆ دادەبەزێت وەكو چۆن بۆ پێغەمبەران دادەبەزێت، یاخود وادەزانن باروحاڵی ئەوان لە پێغەمبەران چاكترە.

(٤)_ بەڵێ، پێشتر ئەوەمان باسكراو كە بتپەرستان و گۆڕپەرستان دەنگ دەبیستن یان وێنەو شێوە دەبینن، وێنەو شێوەی ئەو مردووانەی كە لێیان دەپاڕێنەوەو، قسەیان لەگەڵ دەكەن و، پێویستیەكانیان بۆ جێبەجێ دەكەن، ئیتر وادەزانن فریشتەن لە كاتێكدا بە حەقیقەت شەیتانن و لە گۆڕەكانەوە قسەیان لەگەڵ دەكەن، لە بتەكانەوە قسەیان لەگەڵ دەكەن بۆ ئەوەی هەڵیان خەڵەتێنن.

یەکەمین کەسیش لەوانە کە دەرکەوت _لە سەردەمی ئیسلامدا_ ئەلموختاری کوڕی ئـەبی عوبێـدی الثقفي بـوو[(١)] پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەواڵی بـە دەرکەوتنیـداوە لەفەرموودەیەکی (صحیح) دا کە ئیمامی موسلیم لە (صحیح) ەکەیدا دەیگێڕێتـەوە، عن النبي ﷺ أنه قال: ((سَيَكونُ فِي ثَقِيفٍ كَذَّابٌ وَمُبِيرٌ)) ، صحيح: أخرجه مسلم (٢٥٤٥)، من حديث أسماء رضي الله عنها. واتە: ((لە هۆزی (ثَقِيفٍ)دا درۆزنێك و خوێنڕێژێك پەیدا دەبن)).

ئەوەبوو درۆزنەکە ئەلموختاری کوڕی ئەبی عوبێدی الثقفي بـوو، خوێنڕێژەکـەش حەججاجی کوڕی یوسف بوو[(٢)].

---

(١)_ ئـەلموختاری کـوڕی ئـەبی عوبێـدی الثقفي لـە هـۆزی ثقیف بـوو لـەتائیف، سەرەتا بە چاکێتی و ڕاستێتیەوە دەرکـەوت و، لەگـەڵ زووبـێر دا بـوو، پاشـان لـەڕێ ڕاستەکە لایداو لە گەڵ شیعەکاندا چوو، لە کۆتاشدا بانگەشەی پێغەمبەرایـەتی کـردو، گوایە سرووشی بۆدێت، ئەوە ئەلموختار بوو شەیتانەکان هەموو شتێکیان پێکرد وەکو چۆن بەهاوشێوەکانی ئەویش کردیان، تا ئەو ئاستەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، شەیتانەکان قسەیان لەگەڵ دەکرد کەچی واتێدەگەیشت ئەوانە فریشتـەن، بانگەشـەی پێغەمبەرایـەتی کـرد لـە کاتێکـدا هـیچ پێغەمبـەرێکی تـر پـاش پێغەمبـەری خـوا ﷺ نایەت، پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی بە دەرکـەوتنی داوەو، فەرموویـەتی: ((سَيَكونُ فِي ثَقِيفٍ كَذَّابٌ وَمُبِيرٌ)) واتـە: ((لـە هـۆزی (ثَقِيفٍ)دا درۆزنێـك و خوێنڕێـژێك دەبـن))، درۆزنەکە ئـەلموختاری کـوڕی ئـەبی عوبێـدی الثقفي بـوو، خوێنڕێژەکـەش حـەجاجی کوڕی یوسفی الثقفي بوو.

(٢)_ حەججاجی کوڕی یوسـف ئـەمیر بـوو لـە کـاتی خیلافـەتی بـەنی ئومەییـەدا، پیاوێکی بکوژی چاو نەترسی بەهێز بوو، لە ڕاستیدا ئەم حەجاجە سزایەك بوو بۆ سـەر بکوژانی ئیمامی عوسمان رضي الله عنه، شوێنیان کەوت تا هەر هەموویانی لە ناوبرد، ئـەم پیـاوە سوودی هەبوەو زیانیشی هەبووە، ئیماندارێکی ستەمکار بوو، وەکو ئەبوعوبێد نەبوو.

بە ئیبن و عومەریان گووت: موختار بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە سرووشی بۆ دادەبەزێت، ئەویش فەرمووی: ڕاست دەڵێ، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَنْ تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ (٢٢١) تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ (٢٢٢)﴾[1] [الشعراء: ٢٢١_٢٢٢] واتە: هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنە سەر هەموو (کەسێکی) زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار.

---

(١)_ موختـار بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد گوایـە سرووشـی بـۆ دادەبـەزێت، ئـەم هەواڵەیان بە ئیبن وعومەر و ئیبنوعەباس ڕاگەیاند، ئەوانیش فەرموویان: ڕاست دەڵێت شەیتانەکانی بەسەردا دادەبەزێت، چونکە خوای گەورە هەواڵی ئـەوەی پێـداوین ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَنْ تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ هـەواڵتان بـدەمێ شـەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنە سەر هـەموو کەسـێکی زۆر درۆزنـی زۆر تاوانبـار. ئـەو کاهین و غەیبزانانەن کە شەیتانەکانیان بەسەردا دادەبەزێت، ئەو شەیتانانە هەواڵەکان دەدزن و بـۆ کاهینـەکانی دەبـەن و ئـەوانیش درۆی تێکـەڵ دەکـەن، موختـار ڕاسـتی دەگوت، بەڵام شەیتانەکانی بەسەردا دادبەزی، نەك فریشتەکانی خوای گەورە.

کاتێ بە ئیبن وعەباسیشیان گووت: بەڕاستی موختار بانگەشەی ئەوەدەکات گوایە سرووشی بۆ دادەبەزێت، فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ﴾[1] [الأنعام: ١٢١] واتە: وە بێگومان شەیتانەکان بە نهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلەو دەمەدەمێتان لەگەڵ بکەن.

---

(١)_ دوو جۆر سروش (الوحي) هەیە، سرووشێك لە لایەنی خوای گەورەوەیە، سروشێکی درۆزنانەش لە لایەن شەیتانەوەیە، پێغەمبەران _ عليهم الصلاة والسلام _ لە لایەنی خوای گەورەوە سرووشیان بۆ دێت، بەڵام کاهین و خۆ بەغەیبزان و درۆزنان لە لایەنی شەیتانەوە سرووشیان بۆ دێت، ئەی وشەی سرووش مانای چییە؟ وشەی سرووش (الوحي): واتە بەنهێنی هەواڵی شتانێك بە کەسێك ڕاگەیەنرێت، کەوا بوو شەیتانەکان بەدرۆ شتیان پێدەڵێن و، واش دەزانن ڕێنوێنی کراون خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ [الأعراف: ٣٠] واتە: بە ڕاستی ئەوانە شەیتانەکانیان کرد بە دۆست و پشتیوانی خۆیان لە جیاتی خوا وە واگومان دەبەن کە ڕێ نموونی کراون، ئەمەیە هۆکارەکە شەیتان دەکەن بەدۆستی خۆیان و، واش دەزانن ڕێنوێنی کراون _ پەنا بە خوا _ ئا ئەمە بوو کە بۆ موختار دروست بوو، وە بۆ هەموو درۆزن و کاهین و خۆبەغەی زانێکیش دروست دەبێت.

لـەو ڕووحـە شـەيتانيانەش: ئـەو ڕووحەيـە كـە دانـەری كتـێبی ((الفتوحات)) بانگەشەيەكی وا دەكات گوايە ئەو كتێبـەی پـێ ڕاگەيانـدوەو پێـی گووتـوە[1]، لەوێدا جۆرەها خەڵوەت و تاكبونەوە بە خواردن و بارو حاڵگەلێكی تايبەت باس دەكات[2]،

---

(١)_ دانەری كتێبی ((الفتوحات)) ئـيبن وعەرەبيـە، هـەروەها كتێبێكـی ديكەشـی هەيە بەناوی (فصوص الحِكَمْ) كە ژێـرن لـە ئيلحـادو گـومڕايی، لـە كاتێكدا بانگەشـەی ئەوە دەكات گوايە كتێبەكەی پێگـوتراوە، ئـيبن وعـەرەبی ڕاسـتی گـوتـوە كتێبەكـەی پێڕاگەينراوە، بەڵام كێ پێی ڕاگەيانـدووە؟ بێگومـان شـەيتان پێـی ڕاگەيانـدووە، بـە واتايەكی تر ئيبن وعەرەبی بانگەشەيەكی وا دەكات گوايە كەسێك هـاتوەو كتێبەكـەی داوەتێ، گوتشيەتی: گوايە نێردراو و پەيامبەرە (إنه رسول)، كەچی ئەوەی كتێبەكـەی داوەتێ تەنها شەيتان بوەو هيچی تر.

(٢)_ لە گومڕايی صۆفيەكان تاكبونەوەيانە لەخەڵكی بە گۆشەگيرانێك كە چەندين ڕۆژ نـاخۆن و ناخۆنـەوە، گوايـە بـۆ ئـەوەی نەفسـيان پاكبێتـەوە تـا ئـەو ئاسـتەی هەنـدێكيان شـتی بـەو جۆرانـە دەكـەن بـۆ ئـەوەی نەفسـی خـۆی ئامـادە بكـات بـۆ وەرگرتنی پـەيام، بۆيـە خۆيـان تاكدەكەنـەوەو خـەڵوەت دەكێشـن، گوايـە دەيـەوێت فريشتەكانی بەسەردا دابەزێت، نەفس و ڕووحی پاكبێتەوە، بەڵام تـەنها خەڵەتانـدن و فريودانی شەيتانەو هيچی تر، لە خەڵك تاك دەبێتەوەو، لـە خـواردن و خواردنـەوە واز دێنێت، بۆ ئەوەی نەفس و ڕووحی بۆ شەيتان پاكبێتەوە، ئـيتر لـەو كاتـەدا شـەيتانی بەسەردا دادەبەزێت. بەڵام مرۆڤی ئيماندار خۆی گۆشـەگير ناكـات و، لـە خـەڵكی تـاك نابێتەوە، بەڵكو دەچێت لەگەڵ موسڵماناندا نوێژ دەكات، لەگەڵيانـدا دادەنيشـێت، لـە كۆڕەكانی زيكرو يادی خوای گەورەو دەرسەكاندا ئامادە دەبێت. بەڵام ئەوان خۆيان

گۆشەگیر دەکەن بۆ ئەوەی گومڕاییان بۆ دروست بێت، تەنانەت کەسانێکیشیان کە گۆشەگیر دەبێت چەندەها بیروبۆچونی کوفری و بیروبۆچونی لاریان بۆ دروستدەبێت، وەکو ئەوەی لە هەندێ لاوانەوە یان دەبینرێ، کەوا بوو تاکبونەوەلە جەماوەری موسڵمانان و، خۆ دورخستنەوەو لە مزگەوتان ، خۆبێبەش کردن لە زیکرو یادی خوای گەورە ئەم گومڕاییانە بۆ مرۆڤ دروست دەکات، یا شەیتانەکانی جنۆکە دێن و گومڕای دەکەن، یان شەیانەکانی مرۆڤ چەندەها بیرو بۆچونی لاری بۆ دێنن و، بەگوێیدا دەچرپێت و، پێی دەڵێن: موسڵمانان کافرن، پێویستیان بە جیهادەو چەندەها یتر، هۆکاری هەر هەموو ئەمانەش بۆ گۆشەگیری و، تاکبونەوە لە موسڵمانان و، خۆدورخستنەوە لەماڵەکانی خواو، لەزیکری خوای گەورە دەگەڕێتەوە.

ئەوەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە پەیوەندی و پەیوەست بوون بەجنۆکە و شەیتانەکان بۆ کەسەکە دەکاتەوە[١] ئیتر وا دەزانن شتەکە لە کەرامەتی ئەولیاو دۆستانی خوای گەورەیە، لە کاتێکدا ئەو شتە تەنها لە باروحاڵە شەیتانیەکانەو هیچی تر[٢].

لەوانەش ژمارەیەکیان دەناسم[٣] کە کەسی وایان تێدابوو بۆ جێگائێکی دوور بە هەوادا هەڵدەگیراو دەهاتەوە[٤]،

---

(١)_ ئەگەر خۆی گۆشەگیر بکات و، بۆ ماوەیەك لە خواردن و خواردنەوە وازبێنێت، شەیتانی بۆ دێت و، پێی دەڵێت: گوایە فریشتەیەکە لە فریشتەکان.

(٢)_ واتێدەگەن ئەو شتە سەرسوڕمێنانەی کە بۆیان بەدیدێت ڕێزو کەرامەتەو ئەوان بوونە بە ئەولیاو دۆستی خوای گەورە، بەڵام لە واقیعدا ئەو شتانە کەرامەت نییە، بەڵکو تەنها کردەوەگەلێکی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانیەو هیچی تر، بەوەش لە سەر دەستی شەیتان سووك دەبن و، گومڕایان دەکات.

(٣)_ شەیخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێ_ لەوانە کەسانێکیان دەناسێت کە پەیوەندیان بەم گۆشەگیری و تاکبونەوانەوە هەیە لە کاتی خۆیدا.

(٤)_ کەسانێکیان ئەگەر لەشەیتانەکان خۆی نزیك بکاتەوەو ملکەچیان بێت ئیتر خزمەتی دەکەن، بە هەوادا دەیفڕێنن، خەڵکیش واتێدەگەن کە خودی خۆی بە هەوادا دەفڕێت و، دەڵێن: ڕێزو کەرامەتی خوای گەورەیە، بە هەوادا دەفڕێت، بەسەر ئاودا ڕێدەکات، بەسەر دەریادا ڕێدەکات و، ناخنکێت، دەچێتە نێو ئاگرو ئەسکڵەوە ناسوتێت، لەڕاستیدا ئەمانە تەنها کردەوانێکی شەیتانین و هیچی تر، شەیتانەکان خزمەتی دەکەن چونکە ئەو گوێڕایەڵیان بووە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ قَدِ اسْتَكْثَرْتُمْ مِنَ الْإِنْسِ وَقَالَ أَوْلِيَاؤُهُمْ مِنَ الْإِنْسِ

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِي أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾[الأنعام: ١٢٨] واتـه: وه ڕۆژێـك (خـوا) تێكـڕا كۆیان دەكاتەوە (دەفەرموێ) ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ﴾ ئـەی دەسـتەو كۆمـەڵی جنۆكـە وە بێگومان ئێوە زۆر كەستان لە ئادەمیەكان گومڕا كرد وە دۆستەكانیان لە ئـادەمی دەڵێن ئـەی پەروەردگارمان هەنـدێكمان سـوودو كـەڵكمان لـە هەنـدێكمان وەرگـرت وە بـەو كاتـەو مۆڵەتە گەیشتین كە بۆت دیاری كردبوین خوا فەرمووی ئاگر شوێنتانە بە هەمیشەیی و بێبڕانەوە دەمێننەوە تیایدا جگە لەو كاتەی كە خوا بیـەوێ بـە ڕاسـتی پـەروەردگارت كار دروستی زانایە. ئەی جنۆكەو ئادەمی چۆن سوودو كـەڵك لـە یـەكتر وەردەگـرن ؟ ئادەمی ملكەچ و گوێڕایەڵی جنۆكە بوو، ئەمـە سـوودو كـەڵك وەرگرتنـی جنۆكەیـە لـە ئادەمی، ئادەمیش سوودو كەڵك لە جنۆكە وەردەگرێت بەوەی خزمەتی دەكات و، بە هەوادا دەیفڕێنێت و چەندین كردەوەی نائاسای تر.

کەسی واشیان تێدابوو پارەو ماڵێکی دزراوی بۆ دەهێنرا کە شەیتانەکان دەیاندزی و بۆیان دەهێنا[1]،

---

(١)_ شەیتانی وا هەیە شتە وون بووەکان بۆ خاوەنەکەی دێنێتەوە، ئەگەر کەسێك شتێکی وون بوو، دەچێتە لای درۆزنان و فاڵچیان پێی دەڵێت: شتەکەم وونبووە، ئیتر بەهۆی شەیتانەکانەوە شتەکەی بۆ دێنێتەوە، مرۆڤی ساوێلکەش دەڵێت: ئەوە کەرامەتی ئەولیایە. کەچی تەنها شەیتانەکان ئەو شتەیان بۆ هێناوەتەوە، چونکە شەیتانەکان شتانێك ئەنجام دەدەن کە مرۆڤ لە توانایدا نییە ئەنجامی بدات، وە شتانێکیش دەزانێت کە مرۆڤ ناتوانێت بیزانێت، بۆیە شتە وونبووەکان دێنێتەوە، یان پێی ڕادەگەیەنێت لەفلانە شوێندایە. یان لەماڵ و سامانی خەڵکی دەدزێت و بۆ دۆستانی خۆی دەیبات، ئەویش دەڵێت: ئەمە ڕێزو کەرامەتی خوای گەورەیە، بەڵام ئەمە تەنها لە لایەن شەیتانەوەیەو لەلایەن خواوە نییە. چونکە پێشتر بۆتان ڕوونکرایەوە کە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر ئەگەر لەگەڵ گوێڕایەڵیی و خواپەرستیدا بوو ئەوە ڕێزو کەراماتی خوای گەورەیەو، ئەگەر ئەو کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرانە لەگەڵ کوفرو گومڕاییدا بوو ئەوە شەیتانییەو، کەرامەتی خوای گەورە نییە، بۆیە با ئەمەو ئەوە تێکەڵ بە یەکتر نەکرێن.

کەسی واشیان تێدابوو شوێنی شتە دزاروەکانی بەخاوەنەکەی نیشاندەدا بەرامبەر بە هەندێك پارە کە لەو خەڵکانەوە دەستی دەکەوت یان بەرامبەر بە خەلات و بەخشش کە دەیاندایە ئەگەر شوێنی شتە دزراوەکانی پێشاندانایە[1]، وە شتی تری بەو هاوشێوانە.

وە لەبەر ئەوەی باروحاڵی ئەو جۆرە کەسانە شەیتانین بۆیە پێچەوانەی ڕێڕەوی پێغەمبەران _ صلوات الله وسلامه علیهم _ بوونەوە[2]،

---

(١)_ ئەگەر شتێکیان بدزرێت دەچنە لای ئەو کاهین و خۆبەغەیبزان و درۆزنانە یان دەچنە لای ئەو صوفیە گومڕایانەو ئەویش شوێنی ماڵ و سامانە دزراوەکەو، ئەو کەسەی دزیویەتی پێیان ڕادەگەیەنێت، ئیتر ئەو کەسە وادەزانێت ئەمە کەڕامەتە، بەڵام لەڕاستیدا تەنها لە لایەن شەیتانەکانەوەیە. بە واتایەکی تر کرێی دەدەنێ و، ئەویش شتە دزراوەکانیان بۆ دێنێتەوە، یان شوێنەکەیان پێ پیشان دەدات، پێیان دەڵێت: وشترەکەت، شتە دزراوەکەت، مەڕەکەت لەفلان شوێندا دەلەوەڕێت، کەسەکەش کە دەچێتە ئەو شوێنە شتەکەی خۆی دەدۆزێتەوە، ئەمەش تەنها کاری شەیتانەو هیچی تر.

(٢)_ لەبەر ئەوەی باروحاڵیان شەیتانی بوو بۆیە پێچەوانەو دژ بەڕێڕەوی پێغەمبەران بوون _ صلوات الله وسلامه علیهم _ چونکە جیاوازیەکی زۆر لەنێوان ئەو کەسەدا بەدیدەکرێت کە فریشتەی بەسەردا دادەبەزێت و، لەنێوان ئەو کەسەدا کە شەیتانەکانی بەسەردا دادەبەزێت، جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوەو ئەوەدا.

بە نموونـە لـە گوفتارەكـانی خـاوەنی كتـێبی ((الفتوحـات المكيـة)) و ((الفصـوص))و كتێبی دیكەی بەو هاوشێوانە ستایش و پیا هەڵدانی كـافرانی وەكـو قـەومی نـووح و، هودو، فیرعەون و، غەیری ئەوانیش هەیە[١]، لـە هـەمان كاتـدا لـە ڕێـزی پێغەمبـەرانی وەكو نووح و، ئیبراهیم و، موساو، هاڕوون و، غەیری و ئەوانیش كەم دەكاتەوە[٢]،

---

(١)_ چونكە لە كتێبەكانیاندا پیاهەڵدانی كافران بەدی دەكرێت، گوایـە پاڵـەوانن، دلێرو ئازان، گوایە خاوەنی جێگەو پایـەی خۆیـانن، بۆیـە دەبینـی بەقـەومی نـووح و، ئەومی هودو، قەومی صاڵحدا هەڵدەدەن، گوایە برایانن، چـونكە وەكـو خۆیـان كـافرن ستایشـیان دەكـەن، بـە داخـەوە لـە نێـو نووسـەرانی خۆمانـدا كەسـانێك هـەن بـە ئیبنوعەرەبیـدا هەڵـدەداو، دەڵێـت: ئەمانـە ڕۆشـن فكـر بـوون بـەڵام ئێـوە ئێرەییـان پێدەبەن و ئێـوەوان... ئێـوەوان هتـد، سەرزەنشـتی ئـەو دەسـەڵاتدارانە دەكـەن كـە كوشتنیان و، دەڵێن: ئەوان ڕۆشن فكرانیان لە ناو برد، بە داخەوە ئەم شتە لـە نێـوان هەندێك لە نوسەرانماندا بەدیدەكرێت.

(٢)_ شـتێكی زۆر ئاسـاییە كـە ئـەو كەسـانەی ستایشـی كـافران دەكـەن و پێیانـدا هەڵدەدەن، بەدڵنیایی لەڕێزو قەدری پێغەمبەران و شوێنكەوتوانیان كەم دەكەنەوەو، بە نـەزانین و بێئاگـایی وەسـفیان دەكـەن و، بـە هـەموو جـۆرە وەسـفێكی ناشـیرین ناویـان دەبەن.

زەمی شێخانی ستایشکراو بە لای موسڵمانانەوە دەکات، وەکو جونەیدی کوڕی موحەممەدو، سەهلی کوڕی عەبدوڵای تەستوری و هاوشێوەکانیان[1]، وە ستایش و پیاهەڵدانی کەسانی زەمکراو بەلای موسڵمانانەوە دەکات، وەکو حەلاج و کەسانی تری بەو هاوشێوانە[2]، ئەمانەش لەمیانەی تەجلیات و بۆ ڕوونبوونەوە خەیاڵاوییە شەیتانیەکانیدا باسیان دەکات.

---

(١)_ ئەمەش واقیعەو ڕویداوە، چونکە ئەو کەسەی بە کافراندا هەڵ بدات و پێیان سەرسام بێت، بێگومان لەڕێزو قەدری موسڵمانان کەم دەکاتەوە، بە تایبەت زانایان، چونکە زانایان میراتگەری پێغەمبەرانن، تەماشادەکەی ئەوان پێغەمبەران و میراتگەرانیان زەم دەکەن، ڕێگرییان لێدەکەن و، بە گومڕا ناویان دەبەن، قسەیان پێدەڵێن و، جنێویان پێدەدەن و، لە ڕێزیان کەم دەکەنەوەو، هەموو شتێکیان پێدەڵێن، ئەمەش شتێکەو هەیە ئێستا. صۆفیە پێشینە زاهیدەکان لەم دەروازانەیان نەدا، بەڵکو تەنها خواپەرست و، زاهیدو، تەقواکاربوون، ناسراون و زانان، لەگەڵ ئەوەشدا زەمیان دەکەن.

(٢)_ وە ستایش و پیاهەڵدانی زانایانی گومڕابوو دەکەن و، دەڵێن: ئەمانە ڕۆشن فکرن، ئەمانە خاوەن زانیاری و تێگەیشتن و تێڕوانینن، ئەمانە... ئێوە دوژمنایەتیان دەکەن و، بیروبۆچونە ڕاستەکان و ڕۆشنەکان لە ناو دەبەن، ئیتر بە چەندەها قسەی ناشیرین و جوێندان و شتی تر لە زانایانی موسڵمانان بەردەبن، بە کەسانی مولحیدو زانایانی گومڕا بوودا هەڵدەدەن، وەکو حەلاج، مەنصوری حەلاجی مولحیدی کافر کە وای بۆ دەچێت خۆی خوایە.

کەچی جونەید لە پێشەوایانی چاکی ڕێنموونی کار بوو، چونکە سەبارەت بە یەکتاپەرستی لێیان پرسی، فەرمووی: ((یەکتاپەرستی بریتیە لەوەی کە تازەداهێنراو لەقەدیم جیابکرێتەوە))((التوحید إفراد الحدوث عن القدم))[1]، جونەید ڕوونی کردەوە کە یەکتاپەرستی بریتیە لەوەی قەدیم و تازەداهێنراو، واتە خوای خولقێنەرو شتە خولقێنراوەکان لێك جیا بکرێتەوە.

---

(١)_ بەڵێ داهێنراو و قەدیم لە یەك جیا بکرێتەوە، واتە: داهێنراو کە مەخلوقاتە لە قەدیم کە لە سیفاتی خوای گەورەیە جیا بکرێتەوە، کەوا بوو لە نێوان خوای خولقێنەرو خولقێنراوانیدا جیاوازیەکی زۆر هەیە، ئەوە جونەید بوو، ئەوەش یەکتاپەرستیەکەی بوو، بەڵام ئەوان دەڵێن: نەخێر، هیچ جیاوازیەك لە نێوان خواو بەدی هێنراوانیدا نییە، یەکتاپەرستی بریتیە لەوەی باوەرت بەیەکبوونی بوون و وجود (وحدة الوجود) هەبێت، بە لای ئەوانەوە هەرهەموو ئەم بوون و وجودە بریتیە لەخوا، دابەشبوونی تێدانییەو هەرکەسێك بوون و وجود بۆ خولقێنەرو خولقێنراو دابەش بکات بەلای ئەوانەوە موشریك و هاوەڵپەرستە، بەلای ئەوانەوە شیرك و هاوەڵپەرستی بریتیە لە دابەشبوونی بوون و وجود بۆ خولقێنەرو خولقێنراو. بەلای ئەوانەوە پەروەردگار بەندەیەو بەندەش پەروەردگارە.

بـەڵام خـاوەنی کتـێبی (الفصوص) نکـۆڵیی لەمـە دەکـات، لەقسـە بێسـەروبەرە خەیاڵاوییە شەیتانیەکانیدا بە جونەید دەڵێت: ئەی جونەید ئایا کەسێك هەیە جیاکاریی لە نێوان تازە داهێنراو و قەدیمدا بکات مەگەر یەکێك لەو دوانە بەدەر بێـت[1]؟ ئـەوەبوو جونەیدی بە هەلە دانا لەبەرئەوەی جونەید گووتوویەتی: ((یەکتاپەرستی بریتیە لـەوەی کە تـازەداهێنراو لـە قـەدیم جیـا بکرێتـەوە))((التوحيد إفراد الحدوث عن القدم))، چونکە خۆی دەڵێت: بوون و وجودی داهێنراو بریتیە لە هەمان بوون و وجودی قـەدیم (إن وجود المحدث هو عين وجود القديم)، هەروەها لە کتێبی (فصوص)ەکەیدا دەگـووت: ((لـە نـاوە جوانەکانی خـوا: (العلي)ە واتـە: بـەرزو بڵنـدە، بـەڵام بەسـەر کێـدا بـەرزو بڵند بۆتـەوە (العليُّ: على مَنْ؟) لە کاتێکدا لە خودی خۆی زیاتر هیچ شتێکی دیکە بوونی نییـە (وما ثَمَّ إلا هو)؟ وە لە چ شتێك بەرزو بڵند بێتەوە

---

(١)_ بەڵێ، خاوەنی کتێبیی (الفصوص) کە ئیبنوعەرەبییـە بـاوەڕی بـە یـەك بـوونی بوون و وجود (وحدة الوجود) هەیە، بۆیە نکۆڵیی لـە جونـەیـد دەکـات لـەو بـارەوە کـە لـە نێوان خوای خولقێنەرو خولقێنراوانیـدا جیاکـاریی دەکـات، پێـی دەڵێـت: تـۆ جیاکاریـان لەنێواندا دەکەیت ئەمەش دەبێتە شـتێکی سـێیەم و، ئەمـەش دابەشـکردنە، دابەشـبوون نییـە، هـەر هـەموو گـەردوون بریتیـە لـەخوا، هەرکەسـێك دابەشـیان بکـات موشـریك و هاوەڵپەرستە، ئەمەیە شیرك و هاوەڵپەرستی بـە لای ئیتیحادیەکانـەوە، بـە واتایـەکی تـر شیرك و هاوەڵپەرستی بە لای ئەوانەوە بریتیـە لـەوەی دان بـەوەدا بنێیـت کـە خوایـەکی خولقێنەر و بەجیاو خولقێنراوان بەجیا هەن، بەلاشیانەوە یەکتاپەرسـتی بریتیـە لـەوەی بڵێیت: هەر هەموو گەردوون پێکەوە بریتیە لە خوا، دابەشبوون لە نێوان خوای خولقێنەرو خولقێنراوانیدا نییـە. ئەمـەش وەکـو بیروبـاوەڕی موعتـەزیلـە و شـوێنکەوتوانیانە، بـەلای ئەمانەوە هەر کەسێك سیفاتەکانی خوای گەورە جێگیر بکـات موشـریك و هاوەڵپەرسـتە، هەر کەسێکیش سیفاتەکان جێگیر نەکات، دەڵێن: یەکتاپەرستە.

(وعن ماذا؟) له کاتێکدا هیچ شتێکی تر نییە جگە لە خۆی (وماهو إلا هو)، (فعلُوُّه لنفسه)[1]، وە خوا خودی مەوجودات و هەبووەکانە (وهو عين الموجودات)، (فالمسمى محدثات هي العليَّة لذاتها)[2]،

---

(١)_ (فعلُوُّه لنفسه): ئیبنوعەرەبی ئەم دەستەواژەیە ڕاڤەدەکات و دەڵێت: (العلي لنفسه) واتە: خوا کامڵەو هەر هەموو سیفاتەکانی تێدایە چ ستایشکراو بن لە ڕووی شەرع و عەقڵ و عورفەوە یان زەمکراو بن لە ڕووی شەرع و عەقڵ و عورفەوە. واتە: ئەو سیفاتە زەمکراو و کەم وکورتیانەی کە لەمرۆڤدا هەن لەخوای خوای گەورەشدا هەن، چونکە جیاوازی لە نێوان مرۆڤ و خوادا نییەو هەر دووکیان یەکن، داواکارین خوای گەورە لەو باوەڕە پووچانە بمانپارێزێت، بڕوانە: ابن عربي، فصوص الحِكم، وەرگێڕ.

(٢)_ ئەم قسەیە زۆر بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ئەوە دکات کە ئیبن وعەرەبی باوەڕی بە یەکبوونێتی بوونی ماددی و ڕووحی هەیە (وحدة الوجود المادية و الروحية) گوزارشت لەو باوەڕەی خۆشی دەکات بەوەی کە دەڵێت: (فالمسمى محدثات هي العليَّة لذاتها)، پاشان ئیبن وعەرەبی بێباوەڕیەکەی خۆی زیاتر پەرەپێدەداو دڵنیای دەکاتەوە کاتێ دەڵێت: (وليست إلا هو) ئەمەش بەهێزترین و دڵنیاکردنەوەترین شێوازە لە شێوازەکانی کورت قسەکردن. لەمیانەی ئەمەوە هۆکاری ڕقی صۆفیەکان لە وشەی تەقواو یەکخواپەرستی (لا إله إلا الله) ئاشکرا دەبێت، لە جیاتی ئەوە ئەم دەستەواژانە بەکاردێنن: (ليس إلا الله)، (لا هو إلا هو)، غەزالیش ملکەچی قسەکانیان بوو و لە کتێبی (مِشكاة الأنوار) دا دانی بە وانە دانا، هەروەها دەڵێن: (هو الله)، (هو هو)، بەم جۆرە دەستەواژانە شتەکانیان بە لای بێ عەقڵ و ناهۆشمەندانەوە زلّ دەکەن و قەبە دەکەن، ئامانجیشیان تەنها بە دەست هێنانی پشتگیری ئەو جۆرە کەسانەیە بۆ بە ڕاست دانانی مەزهەب و ڕێباوەڕی (وحدة الوجود)ەکەیان، بڕوانە: إبراهيم بن عُمر بن حسن الرباط بن علي بن أبي بكر البقاعي (المتوفى ٨٨٢هـ)، مصرع التصوف، تحقيق عبدالرحمن الوكيل، وەرگێڕ.

وه جگه له خوا هیچی تریش نین (ولیست إلا هو) _ تا دەڵێت: هەر خوایه که نادیاره وه هەر خوایه که دیاره (وهو عين ما بطن وهو عين ما ظهر)، وه هەر ئەویشه کی دەیبینێت (وما ثَمَّ من تراه غيره)، وه هیچ کەسێکی تریش لێیەوه نادوێ جگه له خۆی (وما ثَمَّ من ينطق عنه سواه)، وه هەر خۆشیەتی که به ئەبوسەعیدی ئەلخەرراز ناو براوەو، وه چەندین ناوی داهێنراوی تر)).

بۆیه بەم مولحیده دەگوترێت: مەرج نییه ئەو کەسەی که دوو شت جیا دەکاتەوه، به زانست و گوفتار، سێیەمێکی غەیری ئەوان بێت[1] چونکه هەر تاکێکی خەڵك له نێوان خۆی و غەیری خۆیدا جیاوازی دەکات و، نەشبووه به سێیەم.

بەنده دەزانێت خۆی بەندەیەو، خودی خۆی و خوای خوڵقێنەری له یەك جیا دەکاتەوه.

خوای خوڵقێنەریش نێوان خودی خۆی و خوڵقێنراوانی له یەك جیا دەکاتەوه، وه دەزانێت خۆی پەروەردگاریانەو ئەوانیش بەندەی ئەون، وەکو ئەوەی قورئانی پیرۆز له چەندین جێگەدا لەم بارەوه دواوه، با بزانیت بەلگەهێنانەوەو پەنا بەردنه بەر قورئانیش به تەنها کاری ئەو ئیماندارانەیه که له نێو و دەرەوەدا دانی پێدادەنێن و پێی قایلن.

بەڵام ئەو مولحیدانه هەمان ئەو بانگەشانه دەکەن که عەفیفه تلمسانیەکەیان _ که له هەموویان به سەلیقەترو کارامه تر بووه له ئیلحادەکەیاندا _ بانگەشەی بۆ دەکرد، ئەو مولحیده کاتێ کتێبی ((الفصوص))ی بەسەردا خوێندرایەوه، پێی گووترا: قورئان پێچەوانەی گوفتاری ئێوەیه .

ئەویش گوتی: ((قورئان هەر هەمووی شیرك و هاوەڵپەرستییه، له ڕاستیدا یەکخواپەرستی به تەنها له گوفتارەکانی ئێمەدایه)).

---

(١)_ خوای گەوره نەفسی خۆی به ناو و سیفات جیا کردۆتەوه، ناشگوترێت ئەوەی ناو و سیفاتەکانی جیا کردۆتەوه غەیری خوای گەورەیه، بەڵکو خودی خوای گەورەیه وەسفی نەفسی خۆی کردووه، ناوی خۆشیناوه.

ئینجا پێی گووترا: بەپێی قسەکانی تۆ ئەگەر بوون و وجود یەك بێت، ئیتر بۆچی خێزان حەڵاڵ کراوەو و خوشکیش حەرام کراوە.

ئەویش لە وەڵامدا گووتی: بە لای ئێمەوە هەموویان حەڵاڵن[١]، بەڵام ئێوەی مەحجون[٢]

---

(١)_ شیرك و هاوەڵپەرستی بەلای ئەوەوە بریتیە لەوەی کە گەردوون دابەش بکرێت بۆ خوای خولقێنەر بە جیاو خولقێنراوانی بەجیا، یەکتاپەرستیش بریتیە لەوەی گەردوون دابەش نەکرێت، بەلای ئەوەوە هەر هەموو گەردوون پێکەوە بریتیە لە خوا. ئەگەر بەپێی قسەکانی ئەو بێت گوایە هەر هەموو گەردوون یەکەو جیاکاری تێدا نییە کەوا بوو خێزان و خوشکیش هەر یەکەو جیاکاریان لە نێواندا نییە، ئیتر بۆ خێزان حەڵاڵ بێت و خوشکیش حەرام بێت، بەڵام شتەکە بەو جۆرە نییە، هەر هەموو گەردوون یەك نییە، بەڵکو شتەکان جیاکاریان لەنێواندایە بۆیە خێزان حەڵاڵەو خوشکیش حەرامە، ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە خێزان مرۆڤێکی دیکەی غەیری خوشکە. ئەوان هاوسەرگیری مەحرەمەکان بە حەڵاڵ دادەنێن، چونکە بە لایانەوە هیچ جیاوازیەك لە نێوان خوشك و خێزاندا نییە، بەڵکو خوشك خێزانەو، خیزانیش خوشکە.

(٢)_ مەحجوب: سیفەت و ناوێکە صۆفیەکان بۆ ئەو موسڵمانانە بەکاری دێنن کە دژیان دەوەستن و نکۆڵیان لێدەکەن، دەڵێن: (إنه محجوب) یان (إنه محجوب عن الله) واتە لە نێوان ئەو و خوای گەورەدا پەردەو بەربەستێك هەیە ڕێگریی لێدەکات و، ناهێڵێت ئەو نهێنیانە بزانێت کە ئەوان دەیزانن، چونکە گوایە خۆیان هیچ پەردەو بەبەستێك لەنێوان خۆیان و خوادا نەماوەو، ڕاستەوخۆ هەموو شتەکان لەخواوە وەردەگرن، بڕوانە: www.egabat.google.com، وەرگێڕ.

گوتبان حەرامە، ئێمەش گوتمان: لێنان حەرام بێت))[١].

وە ئەمە لەگەڵ ئەوەی کوفرێکی گەورەیە_ جیاوازی و لە یەك نەچوێنێکی ئاشکرای تێدایە چونکە ئەگەر بوون و وجود یەك بن، کەوا بوو کێ مەحجوبەو کێ حاجیبە؟!

بۆیە شێخێکیان بەموریدەکەی خۆی گووت: هەر کەسێك پێی گووتیت: بێگومان لە گەردووندا شتی تری جگە لە خوا هەیە دڵنیابە درۆی گووتوە.

موریدەکەشی پێی گووت: ئەگەر وا بێت کێیە ئەوەی درۆدەکات[٢]؟!

---

(١)_ گوتیان: بەلای ئێمەوە هەرموویان حەڵاڵن بە یەکسانی خوشك و، کچ و، بورو، بێگانە، یەکسانن، بەڵام خەڵکەکە گوتیان: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە بۆیە ئێمەش لە ڕواڵەتەوە هاوڕایان بووین و، هەمان قسەکانی ئەوانمان کرد بۆ ئەوەی نکۆڵیمان لێنەکەن.

(٢) موریدەکەی وەلامیدایەوە، موریدەکەی واتە خوێندکارەکەی، شێخەکەی پێی گوت: هەر کەسێك پێی گوتیت لە گەردووندا خوای خوڵقێنەرو خوڵقێنراو هەیە درۆزنە، چونکە بە لایەوە گەردوون بریتیە لە خوا، بۆیە پێی گوت: هەرکەسێك پێی گوتیت: لە گەدروندا شتێکی دیکەی جگە لە خوا هەیە کافرەو درۆی کردووە، موریدەکەشی وەلامی قسەکەی دایەوەو، پێی گوت: ئەگەر وابێت درۆزن کێیە ؟ چونکە درۆزن غەیری ڕاستگۆیە، کەوا بوو بە پێی قسەکەی خۆت درۆزن و ڕاستگۆ هەن، بۆیە دابەش بوون ڕویدا، بەم جۆرە خۆیندکارەکەی وەلامی دایەوە.

وه ئەمانە لەپەیڤ و واژەی (الحلول) هەڵدێن، چونکە پێویستی بە دابەزەرێکە وە پێویستی بە جێگەیەکیشە ئەو دابەزەرە لە خۆ بگرێت[١]، هەروەها لە پەیڤ و واژەی (الإتحاد)یش هەڵدێن[٢]، چونکە وا پێویست دەکات دوو شت هەبن یەکێکیان لەگەڵ ئەوی تردا یەك بگرێت، لە کاتێکدا بە لای خۆیانەوە بوون(وجود) و هەمووی یەکە.

وە دەڵێن: بێگومان گاورەکان کوفریان کرد کاتێك باوەڕیان بەوەهێنا کە خودی مەسیح خوایە، بەڵام ئەگەر بوونی خوایان بگشتاندایە کافر نە دەبوون[٣].

---

(١)_ ئەم جۆرە کەسانە بڕوایان بە (حلول) نییە، چونکە (حلول) یەکان دەڵێن: خوای خوڵقێنەرو خوڵقێنراوانی هەن، بەڵام خوا چۆتە نێو خوڵقێنراوەکانیەوە، بەڵام ئەهلی (وحدة الوجود) دەڵێن: زاتێك نییە چوبێتە نێو خوڵقێنراوانیەوە، چونکە بە بڕوای خۆیان جیاکردنەوەی خوا لە خوڵقێنراوانی دەگەیەنێت، کەوا بوو ئەمانە لە (حلول) یەکان _ هەر چەند کافرن _ زۆر گومڕاترن.

(٢)_ بۆیە (أهل الإتحاد) یان پێناگوترێت، بەڵام ئەهلی (وحدة الوجود) یان پێدەگوترێت، چونکە (الإتحاد) مانای ئەوە دەبەخشێت کە دوو شت هەبن یەکیان گرت بێت و تێکەڵ بە یەکتر بن، بەڵام ئەوان ئەم بیروباوەڕیان نییە.

(٣)_ گاورەکان کوفریان کرد چونکە مەسیحیان بەوە تایبەت کرد کە خوایە، لە کاتێکدا بە لای ئەوانەوە مەسیح و خوا یەك شتە، بەلای ئەوانەوە ناگوترێت: ئەمە مەسیحەو ئەمە خوایە، بەڵکو هەر هەموو گەردوون یەکە. دەشڵێن: بێگومان فیرعەون کوفری کرد چونکە گوتی: من خوای هەرە گەورەتانم، لە کاتێکدا هەر هەموو گەردوون پەروەردگارە، کەچی فیرعەون پەروەردگارێتی بەخۆیەوە تایبەت کرد.

وە لە بارەی بتپەرستانیشەوە دەڵێن: لە ڕاستیدا بە هەڵەدا چوون کاتیٚ تەنها هەندیٚ شتیان پەرست بەبیٚ هێندێکی تر[١]، بە لای ئەوانەوە ئەگەر هەموو شتێکیان بپەرستایە بە هەڵەدا نەدەچوون[٢]. بە لای ئەوانەوە عاریفی موحەقیق[٣] ئەگەر بتیش بپەرستێت زیانی پێناگەیەنێت[٤].

هەموو ئەو شتانە[٥] بەردەوام هێندێك لە یەك نەچوون و جیاواز بوون و نادروست بە یەك لە بۆچونەکانیاندا دەخاتە ڕوو، چونکە پێیان دەگوترێت: کەوا بوو هەڵە کار کێیە؟[٦] بەهانە دێننەوەو

---

(١)_ واتە هێندیٚ لە شتەکانیان پەرست و هێندێکیان نەپەرست، کەچی بەپێی بۆچونی ئەوان دەبوو هەموو شتەکانیان پێکەوە بپەرستایە، وەرگێڕ.

(٢)_ بە لای ئەوانەوە بتپەرستان کافربوون چونکە جیاکاریان کرد، گوتیان: بتەکان خوان و، جگە لەوانیش بەندەن، بەلای ئەوانەوە لەم ڕوەوە بە هەڵەدا چوون، بەڵام ئەگەر هەر هەموو گەردونیان بپەرستایە بە هەڵەدا نەدەچوون، بەلایانەوە ئەگەر بتەکان بپەرستن ئەوا بەشێکیان لە گەردوون پەرستووە، بەڵام ئەگەر گەردوون پەرست بوایەن کافر نەدە بوون.

(٣)_ واتە: ئەو کەسەی کە بڕوای تەواوی بە (وحدة الوجود) هێناوە، وەرگێڕ.

(٤)_ بتپەرستی زیانی پێناگەیەنێت، چونکە هیچی نەپەرستووە جگە لە خوا، تەنانەت ئەگەر سەگ و بەرازیش بپەرستێت دەڵێن: هیچی نەپەرستووە جگە لە خوا، چونکە ئەوانەی پەرستویەتی ڕواڵەت و (مظاهر)ی خوایە.

(٥)_ لەگەڵ ئەو هەموو کوفرەی کە تیایدایە.

(٦)_ واتە: ئێوە دەڵێن ئەوانە هەڵەیان کردووە، کەوا بوو هەڵە کار کیٚ یە ئەگەر هەموو شتێك خوا بێت، بە گوێرەی قەسەکانی ئەوان بێت هەڵەکە تەنها بۆ خوای گەورە دەگەڕێننەوە، ئەمەش لە یەك نەچوون و جیاواز بوون و دژ بە یەك بوونی قسەکانیان دەخاتە ڕوو. بڕوانە: الشيخ الدكتور خالد المصلح: شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان. وەرگێڕ.

دەڵێن: بێگومان پەروەردگار بریتیە لەوەی کە وەسف دەکرێت بەهەر هەموو ئەو کەم وکورتیانەی کە خولقێنراوی[(١)] پێ وەسف دەکرێت[(٢)].

دەڵێن: مەخلوقاتیش وەسف دەکرێت بە هەر هەموو ئەو تەواوێتی و کە ماڵاتانەی کە خوای خولقێنەری پێ وەسف دەکرێت، وە هەمان قسە دەڵێن کە خاوەنی کتێبی ((الفصوص))[(٣)] دەیڵێت: العلي لِنفسه: بەرزو بڵند بۆ نەفسی خۆی، بریتیە لەوەی کە بە رادەیەك تەواوەو کامڵە بەهۆیەوە هەر هەموو سیفاتێکی وجودی جێگیر و سیفاتێکی سلبی لە خۆ دەگرێت چ لە ڕووی عورفەوە یا عەقڵەوە یا شەرعەوە ستایش کراو و پەسەند بێت، یا لە ڕووی عورفەوە یان عەقڵەوە یا شەرعەوە زەم کراو پەسەند نەبێت، ئەوەش تەنها بۆ خوای تاکە بە تایبەت کە هەر هەموو ناوو سیفاتەکانی بۆ کۆبۆتەوە[(٤)].

---

(١)_ واتە هەموو ئەو شتانەی کە هەن و خولقێنراون، وەرگێڕ.

(٢)_ هیچ جیاوازیەك لە نێوان خولقێنەرو خولقێنراودا نییە، خولقێنراو لە گەڵ ئەو هەموو کەم و کوڕیانەو عەیبانەی تیایدایە دەڵێن: خوایە _ پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە _.

(٣)_ ئیبن وعەرەبی خاوەنی ئەو کتێبەیە، وەرگێڕ.

(٤)_ هەر هەموو ئەمانە کوفرو گومڕاین، بەڵام شەیخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ دەیەوێت لە هەموو لایەکەوە ڕێگەکەیان لێ دابخات و ڕاو بۆچونەکانیان پووچ بکاتەوە، هەرچەند هەر لەسەرەتاوە بۆچوونەکانیان پووچ بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوانە بوونیان هەیەو بە خواپەرستان و زانایان و ڕۆشن فکران وەسف دەکرێن پێویست بوو شێخولئیسلام_ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ گومڕایەکانیان ڕوون بکاتەوەو، بیروڕا دژ بە یەکەکانیان بخاتە ڕوو.

ئەوان _ سەرەڕای ئەو کوفرەشیان _ بەڵام هێشتا لە یەك نەچوون و جیاواز بوون و نادروست بە یەکیان لێ دورناکەوێتەوە، چونکە بە هەست و بە عەقڵ زانراوە کە سیفاتی ستایشکراو و پەسەند غەیری سیفاتە سلبی و ناپەسەندکانە[١].

ئەمانە هەمان قسەکانی عەفیفی تلمسانیش[٢] دەڵێنەوە کە دەڵێت: بێگومان لە کەشفەکانی ئێمەدا شتانێك جێگیر بووە کە دژ بە عەقڵی ڕاست و سەلامەتە کە بە قورئان و سوونەتی ڕاست پڕبووە[٣].

وە دەڵێن: هەر کەس خوازیاری بە دەست هێنانی تەحقیقە _ واتە: تەحقیقەکەی ئەوان کە بریتیە لەو کوفرو زەندەقە و ئیلحادانە _ با واز لە عەقڵ و شەرع بێنێت[٤].

---

(١)_ لێرەدا شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ مەبەستی ئەوەیە کە ئیتر چۆن سیفاتی باش و خراپ لەخوای گەورەدا کۆ دەبێتەوە _ بەرزو بڵندی بۆ خوای گەورە_، وەرگێڕ.

(٢)_ یەکێکە لە سەرانی، وەرگێڕ.

(٣)_ بە لای ئەوانەوە کەشف لە سرووشیش گرنگترە، وا تێدەگەن بە کەشفانێکەوە تایبەت کراون کە هیچ کەسێکی تر توانای کەشف کردنی نییە، ئەوان گوێ بە عەقڵ نادەن، دەڵێن: ئێمە پشت بەو نهێنیانە دەبەستین کە بۆمان کەشف بووە، ئایا مرۆڤ لە توانایدایە واز لە عەقڵ بێنێت؟ ئایا مرۆڤ لە توانایدایە واز لە شەرع بێنێت؟ بێگومان هیچ کەسێك توانای وازهێنانی شەرعی نییە ئەگەرچی ئەوپەڕی زیرەکی و زرنگی و دانایشی پێدرا بێت، هەرگیز ناتوانێت واز لە عەقڵ و شەرع بێنێت.

(٤)_ کەوا بوو چ شتێك مایەوە، ئەگەر لە شەرع و عەقڵ واز بێنێت، ئاکام و دەرەنجامی چۆن دەبێت؟ دەبێتە کەسێکی شێت، بڕوانن مرۆڤ بەو ئاستە بگات کە لە یاساکانی عەقڵ وازبێنێت و لەسوڵتانی شەرع بچێتە دەرەوە ؟ دەڵێن: ئەمەیە تەحقیق، عەقڵ تەحقیقی تێدا نییەو شەرع تەحقیقی تێدا نییە، کوفرو زەندەقەی ئەوان تەحقیقە؟ بێگومان ئەمە ئەو پەڕی گومڕا بوونە.

بە کەسانێکیانم گوت کە قسەم لەگەڵ داکردن: زانراوە کە کەشفی پێغەمبەران لە کەشفی کەسانی دیکەی غەیری خۆیان گەورەترو تەواو ترە(١)

---

(١)_ خوای گەورە ئەوەی بۆ پێغەمبەرانی کەشف دەکات بۆ کەسانی دیکەی غەیری ئەوانی کەشف ناکات، وە بەزانینی هێندێ غەیبەوە تایبەتیان دەکات کە هەرگیز کەسانی دیکە نایزانن، خوای گەورە ئەو غەیبەیان پێدەدات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا(٢٦) إِلاَّ مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ(٢٧)﴾ [الجن: ٢٦_٢٧] واتە: هەر خوایە زانا بەنهێنیەکان وە کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیدا مەگەر پێغەمبەرێکی کە لێی ڕازی بێ. چونکە پێدەچێ خوای گەورە هێندێك غەیب بە پێغەمبەرەکەی ڕاگەیەنێت لە پێناوی بەرژەوەندیەکانی خەڵکدا، کەوا بوو هیچ کەشفێك لەو کەشفە گەورەتر نابێت کە خوای گەورە بە پێغەمبەرانی خۆی داوە. بەڵام ئەوان دەڵێن: ئێمە لە سەرووی پێغەمبەرانەوەین، ئێمە لە پێغەمبەران زاناترین، تا ئەو ئاستەی دەڵێن پێغەمبەران لە ئێمەوە وەردەگرن، کەوا بوو ئەگەر شتەکە مرۆڤی بەم ئاستە گەیاند ئیتر قسە لەگەڵکردنیان هیچ سوودێکی نابێت، چونکە هەقیان ناوێت، ئەوەش کە هەقی نەوێت هەرچەند مشتومڕی لە گەڵکەیت و هەرچەند بەڵگەی بۆ دامەزرێنیت، ڕازینابێت و قبوڵیناکات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنْتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا (٤٣) أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلاَّ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا(٤٤)﴾[الفرقان: ٤٣_٤٤] واتە: ئایا دیت ئەو کەسەی هەواو ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی ئایا تۆ ئەبیتە پارێزەر بۆ ئەو (کە شوێنی ئارەزووی نەکەوێت)؟ ئایا وا دەزانی زۆرینەی ئەوانە دەبیستن یا تێدەگەن ئەوانە هەروەك ئاژەڵن بەڵکو ئەوان گومڕاتریشن. چونکە دەرك بەبەرژەوەندیەکانی خۆی دەکات، وە دەرك بەوانەش دەکات کە هەستەکانی پێی هەڵدەستێت، بەڵام ئەوان لە پلەی ئاژەڵیش هاتنە خوارێ، بەڵکو زۆر گومڕاتریشن.

هەواڵیشیان لە هەواڵی کەسانی دیکەی غەیری خۆیان ڕاست ترە[1] وە پێغەمبەران هەواڵی شتانێك ڕادەگەیەنن کە عەقڵی خەڵکی لە ئاستی زانینیدا بێتوانان، نەك شتانێك کە خەڵك بە عەقڵی خۆیان بزانن قەدەغە کراوە، هەواڵی شتانێك ڕادەگەیەنن کە عەقڵ ڕێی پێداوە نەك بە لای عەقڵەوە مەحاڵ بێت، مەحاڵە لەو هەواڵانەدا کە پێغەمبەر ڕایدەگەیەنێت شتانێك هەبن دژ بە ماقوڵی ڕاست و تەواو و بێگەرد بێت[2]

---

(١)_ چونکە پێغەمبەران هیچ شتێك لە خۆیانەوە ناهێنن، یا پشت بە تەنها عەقڵی خۆیان نابەستن، بەڵکو پێغەمبەران لە خوای گەورەوە وەردەگرن، سرووش و، فەرمان و، قەدەغە کردن، ئەوان گەورەترینی خەڵکانن لەڕووی زانستەوە، لەڕووی کەشفەوە، لە ڕووی عەقڵەوە، هەرگیز ئەو شتانەی ئەهلی (وحدة الوجود) باسی دەکەن ئەوان باسیان نەکردوەو، نەیانهێناوە.

(٢)_ پێغەمبەران هەواڵی شتانێك ڕادەگەیەنن کە بەلای عەقڵەوە ڕێپێدراو بێت، شتانێکیان نەهێناوە دژ بە عەقڵی ڕاست و ساغ بێت، بۆیە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ کتێبێکی داناوە کە بە یەکێك لە گەورەترین کتێبەکانی دادەنرێت بەناوی (موافقة العقل للشرع)، تیایدا فەرموویەتی: ئەقڵی ڕاست و ساغ دژ بە نەقڵی (صحیح) _ واتە قورئان و فەرموودە (صحیح)ەکان نییە، هەر کات عەقڵ و نەقڵ جیاواز بوون، ئەوە بێگومان یا نەقڵ ڕاست و دروست نەبووە، یان عەقڵ تەواو و ساغ و بێگەرد نەبووە، ئەمە یاسایە، پێغەمبەران شتانێکیان نەهێناوە دژ بە عەقڵی ساغ و تەواو بێت بەڵکو شتانێکیان هێناوە کە عەقڵ لە ئاستی زانینیدا بێتوانا بوون، بەڵام بۆ ئەوەی شتانێکیان هێنا بێت دژ بە عەقڵ بێت، ئەم شتە هەرگیز ڕێی تێناچێت.

وه مەحاڵە دوو بەڵگەی(قطعي)[1] دژ بە یەکبن: ئەگەر عەقڵی بن _ واتە: هەموو کێشەیەك کە عەقڵ توانای درك پێکردنی هەبێت و بتوانرێت حوکمێکی شەرعی لێوە هەڵهێنجرێت _ یان (سَمعي) بن _ واتە بەڵگەکانی قورئان و سوونەت و ئیجماع، هەروەها دوو بەڵگەش کە یەکێکیان عەقڵی بێت و ئەوی تریان (سَمعي) بێت[2]،

---

(١)_ الدليل القطعي: بریتیە لەو بەڵگەیەی کە ڕاستیەکەی یەکلابۆتەوە بەجۆرێك هیچ زیادکردن و، کەم کردن و، ئیجتیهادو، تەرجیح کردنێکی قبوڵ ناکات، ئەمەش دوو بەشە: یەکەم: (قطعي الثبوت): واتە: جێگیر بوونی یەکلابۆتەوەو کۆتایی پێهاتووە، وەکو ئەوەی کە قورئان لە لایەن خوای گەورەوەیە، ئەمە جێگیر بوونی یەکلابۆتەوە، هەروەها فەرمووده موتەواتیرەکانیش، وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار)) متفق علیه، واتە: ((هەر کەس بەقەستی درۆم بەدەمەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگری دۆزەخدا دیاری بکات)).

دووەم: (قطعي الدلالة) واتە لەیەکمانا زیاتر هەڵناگرێت، وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قل هو الله أحد﴾، ئەمە بەدەر لە یەك مانا زیاتر هەڵناگرێت، واتە تەنهایەتی بۆ خوایە بە تەنها، وە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە خوای گەورە. بڕوانە: www.alokab.com، وەرگێڕ.

(٢)_ هەرگیز دوو بەڵگەی (صحیح) دژ بە یەك نابن، پێدەچێ عەقڵ توانای یەك خستنی نێوانیانی نەبێت، بەڵام بۆ خودی بەڵگەکان هەرگیز دژ بە یەك نابن، بەڵام ئەگەر یەکێك لە بەڵگەکان (ظني) بێت(طني) ئەو بەڵگانەیە کە زیادکردن و،

كەمكردنو، ئیجتیهادو، تەرجیح كردن و، جیاوازی كردن هەڵدەگرن، پێدەچێ لەگەڵ بەڵگە (قطعي)ەكەدا دژ بە یەك بوون دروست بكات، بەڵام ئەگەر هەردوو بەڵگەی (قطعي) بن عەقڵیبن یا شەرعی بن، یان یەكێكیان عەقڵیبێت و ئەویتریان شەرعی بێت هەرگیز دژ بە یەك بوون دروست ناكات، چونكە خوای گەورە لەبارەی شەرعەوە دەفەرموێ: ﴿ تَنزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾[فصلت: ٤٢] واتە: نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن (خوای) كار دروستی ستایش كراوەوە، هەر خوای گەورەیە كە عەقڵەكانی دروستكردووە، كەوا بوو هەرگیز دوو بەڵگەی (قطعي) دژ بە یەك بوون دروست ناكەن، بەڵام ئەگەر (قطعي) نەبن جیاوازی دروست دەكەن.

ئیتر چۆن جیاوازی و دژ بەیەك بوون لە کەسانێك قبوڵ بکرێت کەوا بانگەشەی کەشفانێك[1] دەکەن کە دژ بە شەرع و عەقڵی تەواو و ساغە[2]؟!

---

(١)_ واتە کەشفی (وحدة الوجود).

(٢)_ شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ وەڵامی ئەو قسەی داونەتەوە کە دەڵێن دین و ڕێبازو تەحقیقەکەیان ڕاست و تەواو نابێت مەگەر بە وازهێنان لە عەقڵ و شەرع، چونکە بەو کەشفەی کە گوایە بۆیان بەدی دێت شتانێك دەبینن کە لەگەڵ عەقڵ و شەرعدا ڕێك ناکەوێت، شێخیش وەڵامی داونەتەوە کە ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە زۆر لەو کەشفەی ئەوان هێناویانە گەورەترە، چونکە ئەوەی بۆ پێغەمبەران بەدی هاتووە کەشفێکە هەرگیز بۆ هیچ کەسی تر بەدی نەهاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا نابینیت لە هەواڵی پێغەمبەراندا شتانێك هەبن عەقڵ ڕێگری لێبکات و بەمەحاڵی دابنێت، هەروەها نابینیت لە هەواڵی پێغەمبەراندا شتانێك هەبن لەگەڵ خودی خۆیدا دژ بە یەکتر بن، ئەو شتانە لەگەڵ خودی خۆیاندا دژ بە یەکتر نیین و هەروەها دژ بە عەقڵیش نیین. بڕوانە: الشيخ الدكتور خالد المصلح: شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان.

وە ئەمانە ڕەنگە بە قەستی درۆ نەکەن، بەڵام خەیاڵی شتانێك دەکەن لە نەفسی خۆیاندایەو، وا دەزانن لە دەرەوەی زەین و بیریشیاندا هەن[١]، وە شتانێکیش دەبینن لە دەرەوەی زەیـن و بیردایـەو وا دەزانـن لـە کەرامـەتی پیـاو چـاکانە کەچـی لـە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسەوەیە[٢].

---

(١)_ ئەمانە ئەهلی گومڕا بوون و ئـەهلی ئیلحـادن بـەڵام پێدەچێت کەسانێکیان بەقەستی درۆ نەکـەن، بـەڵام وای بـۆ دەچێت ئـەوەی بـە خەیاڵیـدا هـاتووە ڕاسـت و دروستە کە چی بە هەڵەدا چووە، بەڵام ئەو کەسەی بە قەستی ئیلحادیی و درۆ دەکات گفتوگۆکردن لەگەڵیدا هیچ سوودێکی نابێت، گفتوگۆ کردن تەنها لەگـەڵ ئـەو کەسـەدا دەکرێت کە مەبەستی درۆ کردن نەبووە، ئەم کەسـە موناقەشـەی لەگەڵدا دەکرێـت و شتەکانی بۆ ڕووندەکرێتەوە، ڕەنگە ڕاست و دروسـتی بـۆ دەرکـەوێت، کـەوا بـوو ئـەم جۆرە کەسانە دوو بەشن: بەشی یەکەم: بەقەستی درۆیان نەکردووە، ئەمانـە ئومێـدی ئەوەیان لێدەکرێت کـە ئەگـەر موناقەشـەیان لەگەڵدا بکرێـت و، هەڵـەکانیان بـۆ ڕوون بکرێتـەوە قبـوڵی بکـەن، شێخولئیسـلامیش _ ڕەحمـەتی خـوا لێ بێـت _ لەگـەڵ هێندێکیاندا موناقەشەی دەکرد، بەڵام کەسی قەستیار ئەوەی پوچێتی ڕێبـازی خـۆی دەزانێت، بەڵام هەر سوورە لەسەر پێداپۆشـتنیی، ئـەم جـۆرە کەسـە موناقەشـەکردن هیچ سوودێکی بۆ نابێت.

(٢)_ ڕەنگە وا بزانن لە دەرەوەی زەین و بیردا بـوونی هەیـەو، بەشـێکە لـە ڕێـزو کەرامەتی ئەولیا، بەڵام لە واقیعدا کەرامەتی ئەولیانییە بـەڵکو بەشـێکە لـە فەلسـەفەو بیروباوەڕە پڕوپوچەکانی دۆستانی شەیتان.

وه ئەوانـەی باوەڕیـان بـە(وحدة الوجود)ە: لەوانەیـە ئـەولیا بخەنـە پێشـی پێغەمبەرانەوەو[١]، دەڵێن: پێغەمبەرایەتی تەواو نـەبوەو کۆتـایی پێنـەهاتووە، وەکـو ئەوەی لە ئیبن و سەبعین و هاوشێوەکانیەوە باس دەکرێت[٢].

---

(١)_ بەڵێ، ئەوانەی بانگەشـەی (وحدة الوجود) دەکـەن، ئەگـەر پێیـان بگوترێت پێغەمبەران شتانێکیان هێناوە پێچەوانەی قسەکانی ئێوەیە، دەڵێن: قسـەکانی ئێمـە نسەی ئەولیایە، مەبەستیان بە ئەولیا دۆستانی خۆیانە کە شتە پـووچ و گومانـاویی و کردەوە نائاسـاییەکانی شـەیتانیان پێیـەو، دەڵـێن: ئێمـە لەپێغەمبـەران چـاکترین، پێغەمبەران بەوە نەگەیشتن کە ئێمە پێی گەیشتین، لە ڕاستیدا پێغەمبەران تـەنها بـۆ کەسانی ئاسایی هاتوون، بۆ ئێمە نەنێردراون، چونکە پێویسـتمان پێیـان نییـە، ئێمـە درکمـان کـردو گەشـتین و پێویسـتمان بـە پێغەمبـەران نییـە، بـەڵکو پێغەمبـەران بـۆ خـەڵکانی ئاسـایی نێـردراون کـە نەگەشـتوون بـەوەی ئێمـە پێـی گەیشـتوین، وە بـە ئەولیاکانی خۆیان دەڵێن: تایبـەتی تایبـەت، چـونکە گوایـە بـەزانیاری و بیرکردنـەوەو دووربینی خۆیان بەشتانێك گەیشـتن کـە پێغەمبـەران پێـی نەگەیشـتن، بۆیـە وەلـی و دۆست لە پێغەمبەران بە چاکتر دادەنێن.

(٢)_ دەڵـێن: پێغەمبەرایـەتی تـەواو نـەبووە، موحەممـەد ﷺ کۆتاهـەمینی پێغەمبـەران نییـە، بـەڵکو پێغەمبەرایـەتی تـاوەکو ڕۆژی قیامـەت بەردەوامـە، خـوای گەورە پێغەمبەران دەنێرێـت، بـەم جـۆرە قسـانە دەروازەیـان بـۆ درۆزنـان و خـۆ بـە پێغەمبەرکاران کردەوە.

وە پلەکانی گوێڕایەڵی و گوناهو تاوانیان کردووە بە سێ پلەوە، دەڵێن: بەندە سەرەتا تاعەت و گوناهو تاوان دەبینێت[١]، پاشان تاعەت بە بێ گوناهو تاوان[٢]، پاشانیش نەتاعەت و نەگوناهو تاوان[٣].

وە بینینی یەکەم بریتیە: لە بینینی ڕاست، بریتیە لە جیاوازی نێوان تاعەت و گوناهو تاوان[٤].

---

(١)_ بە لای ئەوانەوە ئەمە یەکەم پلەیە کە نزمترین پلەیەو هی کەسانی ئاساییە، ئەوانەی جیاوازی لە نێوان تاعەت و سەرپێچیدا دەکەن.

(٢)_ دەڵێن: مرۆڤ هەرشتێك ئەنجام بدات بریتیە لە تاعەت و گوێڕایەڵی، چونکە هەر کەسێك سەرپێچی فەرمانی خوای کرد بێت بێگومان گوێڕایەڵی قەدەرەکەی بووە، کەوا بوو بە هەر حاڵ ئەو گویڕایەڵی خوا بووە.

(٣)_ بە لای ئەوانەوە لەم پلەیەدا مرۆڤ ئازاد دەبێت، ئەمە بەرزترین پلەیە، کە چی لە حەقیقەتدا نزمترین پلەیە، بەڵام بەلای ئەوانەوە ئەمە بەرزترین پلەیە، تیایدا مرۆڤ نەتاعەت و نەسەرپێچی نابینێت، سەرفەراز بووە فەرمان و قەدەغە کردنی هیچ کەسێکی بە سەرەوە نییە.

(٤)_ بەڵام ئەوان دەڵێن: ئەمە پلەی کەسانی ئاساییە، ئەوانەی توانای جیاکاریان نییە، وە پلەی شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانە ئەوانەی لە نێوان تاعەت و سەرپێچیەکاندا جیا کاری یدەکەن، لە حەقیقەت و واقیعدا ڕاستەکە ئەمەیە، بەڵام بە لای ئەوانەوە ئەمە ڕاست نییە، بەڵام بە لای ژیرو هۆشمەندانەوە ئەمە ڕاستە، چونکە هێندێ کردەوەکان تاعەتەو هێندێکیشی سەرپێچییە، سوژدە بردن و (الله أكبر)کردن و، (لا إله إلا الله) کردن تاعەتەو، داوێن پیسی و، دزیکردن و، مەی خواردنەوەش سەرپێچییە.

بەڵام مەبەستیان بەبینینی دووەم: بینینی قەدەرە[1]، کەسی وایان تێدایە دەڵێت: من کافرم بەپەروەردگارێك سەرپێچی فەرمانەکانی بکرێت[2]

---

(١)_ ئەمە بینینی قەدەرە، ئەوان تەماشای هەر هەموو مەوجودێك لەخەیرو لەشەڕ بەو جۆرە دەکەن کە لەلایەن خوای گەورەوە تەقدیر کراوە، ویست و مەشیئەتی خوای لەسەر بووە، کەوا بوو خۆشی دەوێ و پێی ڕازییە، پێویستە مرۆڤیش خۆشی بوێ و پێی ڕازی بێت، ئەوان دەڵێن: شەرع و قەدەر یەکشتە، کەوا بوو ئەگەر مرۆڤ شتێکی ئەنجامداو پێچەوانەی شەرع بوو، هیچی تێدا نییە چونکە لە لایەکی ترەوە گوێڕایەڵی قەدەرەکەی بووە، کەوا بوو ئەو گوێڕایەڵی خوای گەورە بووە، دەڵێن: ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی بکات هیچی تێدا نییە چونکە لە لایەکی ترەوە گوێڕایەڵی قەدەرەکەی بووە.

(٢)_ مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر بەشیاومان دانا سەرپێچی فەرمانەکانی بکرێت ئەوا شایستەی پەرستن نییە، دەڵێت: من کافرم بەپەروەردگارێك کە سەرپێچی کار قەدەغە ناکات، بەڵام بێ ئاگان لەوەی خوای گەورە ئازادی هەڵبژاردنی بەبەندەکانی خۆیداوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾[الإنسان: ٢] واتە: بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان دروست کرد لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ لە گەڵ توخم تا تاقیبکەینەوە ئینجا گێڕامان بەبیسەری بینەر، دەوتوانێت جیا کاریی لەنێوان شتەکاندا بکات. هەروەها لە ئایەتێکی تریشدا

-----------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------

دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ﴾[التغابن: ٢] واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست کردووە ئینجا هەندێکتان بێ باوەڕو هەندێکی تریشتان باوەڕدارن، چونکە خوای گەورە هێزو، ویستن و، هەڵبژاردنی بە بەندەکانی خۆیداوە، کەوابوو بەویستی خۆیان تاعەت و گوێڕایەڵیدەکەن و، بەویست و هەڵبژاردنی خۆشیان سەرپێچی دەکەن، ئەوان ناچاری سەر کردەوەکانی خۆیان نەکراون، مرۆڤ لەتوانایدایە بچێت بۆ مزگەوت بەویستی خۆی، لەتوانایدایە بەویستی خۆشی بچێت بۆ مەیخانەو مەی بخواتەوە، خوای گەورە ئەو ئازادیەی پێداوە، بەڵام پاداشت و سزای بۆ کردەوەکانی داناوە، بە بۆچونی وان گوایە پەروەردگارێك نییە سەرپێچی بکرێت، کەوا بوو خەڵکی هەر کردەوەیەکیان ئەنجامدا تاعەتە، بۆیە دەڵێن: نەتاعەت و نە سەرپێچی کردن.

چونکە ئەم کەسە لەو باوەڕەدایە کە گوناهو تاوان پێچەوانەی ئیرادەو خواستە کە بریتیە لە مەشیئەت و ویستی خوای گەورە(١)، هەموو خەڵکیش لە ژێر حوکمی مەشیئەت و ویستی خوای گەورەدان(٢) ئیتر بۆیە شاعیرێکیان دەڵێت:

أَصْبَحْتُ مُنْفَعِلًا لِمَا يَخْتَارُهُ مِنِّي، فَفِعْلِي كُلُّهُ طَاعَاتُ(٣)!

واتە: گوێڕایەڵی ببووم لە هەر هەموو ئەوانەدا کە لە من ویستیدەکات، لە خەیرو لە شەڕ، بەم پێیە بێت کردەوەکانم هەر هەمووی تاعەت و گوێڕایەڵییە، چونکە بە فەرمان و قەدەرو مەشیئەت و یستی خۆی ئەنجامم داوە .

---

(١)_ بەڵێ، موخالەفەی قەدەرە، بە بۆچونی ئەوان سەرپێچی کردن موخالەفەی قەدەرە، دەڵێن: ئایا کەسێك هەیە توانای موخالەفەی قەدەری هەبێت.

(٢)_ بەڵێ، لە ژێر حوکمی مەشیئەتی قەدەری خوای گەورەدان، چونکە مەشیئەت یەك بەشە ئەویش مەشیئەتی قەدەریە بەڵام مەشیئەتی شەرعی بوونی نییە، بەپێچەوانەی ئیرادەوە کە دوو بەشە، ئیرادەی کەونی قەدەری و، ئیرادەی شەرعی.

(٣)_ بە بانگەشەی خۆیان بێت شتێك نییە ناوی تاعەت و سەرپێچی بێت، بەڵکو هەر کردەوەیەك خەیر بێت یان شەڕبێت تاعەت و گوێڕایەڵییە، چونکە دەڵێت: من بەپێی قەدەرو چارەنووسی خوا دەجوڵێمەوە، بۆیە لە هەموو بارێکدا من گوێڕایەڵی و تاعەتم بۆ دەنووسرێت خەیر ئەنجام بدەم یان شەڕ ئەنجام بدەم، ئەگەر زینا بکەم هەر تاعەت و گوێڕایەڵی خوام بۆ دەنوسرێت، چونکە چارەنووس و قەدەری خوایە، وە ئەگەر نوێژیش بکەم هەر تاعەت و گوێڕایەڵیم بۆ دەنوسرێت، چونکە چارەنووس و قەدەری خوایە. شاعیرێکی دیکەشیان دەڵێت:

(وَكُلُّ كَلَامٍ فِي الْوُجُودِ كَلَامُهُ سَوَاءٌ عَلَيْنَا نَثْرُهُ وَنِظَامُهُ) واتە: هەر گوفتارێك لەم گەردوونەدا گوفتاری خوایە، بەلای ئێمەوە یەکسانە پەخشان و هۆنراوەو هەق و باتڵ و جادوو و کوفرو جوێن و هەموو قسەیەك خودی گوفتاری خوای گەورەیە.

لێرەدا شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ ئەم باوەڕەیان پووچ دەکاتەوەو، دەڵێت: زانراوە ئەم بۆچونانەیان پێچەوانەی هەر هەموو ئەوانەیە کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی لە بارەوە ناردووەو، کتێبەکانی لە بارەوە دابەزاندووە[1]، چونکە ئەو گوناهو تاوانەی کە خاوەنەکەی بەزەم و سزادان شایستە دەبێت بریتیە لەسەرپێچی کردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی[2].

---

(١)_ بە بێ هیچ گومانێك، خوای گەورە لە نێوان قەدەرو شەرعدا جیاوازی کردووە، پاشتر گوفتاری خوای گەورەمان بۆ دێتە پێشەوە کە دەفەرموێ: ﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ﴾ [الأعراف ٥٤] واتە: بێدار بن کە بەدیهێنان و فەرمانـدان هەر بۆ خوایە. لە نێوان ئەو دوانەدا جیاوازی هەیە، بەجیاوازی کردن لە نێوان سەرپێچی و گوێڕایەڵیدا.

(٢)_ گوناهو تاوان سەرپێچی کردنی فەرمانی شەرعیە(الأمر الشرعي)، خوای گەورە فەرمانی بەگوێڕایەڵی و تاعەت کردووە، فەرمانی بەعیبادەت وپەرستنکردووە فەرمانی بەبەجێهێنانی خزمایەتی و چاکەکردن لەگەڵ دایك و بابدا کردووە، ئەمانە بریتین لەفەرمانی شەرعی(الأمر الشرعي)، بەڵام فەرمانی قەدەری(الأمر القدري)، نابێتە بەهانە بۆ هیچ کەسێك، ئەمە کاری خوای گەورەیە، کەوا بوو نابێ ئێمە دوژمنایەتی و مشتومڕ لەگەڵ خوای گەورەدا بکەین، بەڵکو مشتومڕ لەگەڵ خودی خۆماندا دەکەین، مەحاسەبەی خودی خۆمان دەکەین، دەڵێین: بۆچی ئەوەمکرد ؟ بۆچی وازم لەئەوە هێنا ؟ کەوابوو ئێمە نابێ مشتومڕەکەمان بەرەو ڕووی پەروەردگاری جیهانیان بکەینەوە، بەڵکو موناقەوشەو مەحاسەبەکەت بەرەو ڕووی نەفسی خۆت دەکەیتەوە، بۆچی ئەوەم کرد؟ بۆچی وازم لەئەوە هێنا؟ لە کاتێکدا توانای ئەنجامدانیم هەبوو، لە کاتێکدا توانای وازهێنانی فلان کردەوەی ناشیرینم هەبوو؟ بۆچی کاتی خۆمم بە فیڕۆدا؟ لە کاتێکدا فەرمانی کاتپاراستنم پێکراوە؟ بەو جۆرە مەحاسەبەی خۆت دەکەیت، خۆت بەمەحاسەبەی نەفسی خۆتەوە سەرقاڵبکە، نەك بە قەزاو قەدەرەوە، چونکە قەزاو قەدەر ئیشوکاری خوای گەورەیە؟

لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٣) وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُهِينٌ (١٤)﴾[1] [النساء: ١٣_١٤] واتە: ئەو (یاسایانە) سنوورەکانی خودان هەر کەسێك گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بێت (خوا) دەیخاتە ناو بەهەشتانێك کە ڕوبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا تیایدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی وە ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە هەر کەسێکیش سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات و سنوورەکانی (خوا) ببەزێنێت دەیخاتە ئاگرێکەوە هەمیشە دەمێننەوە تیایدا وە سزایەکی ڕیسواکەری بۆ هەیە.

---

(١)_ ئەم ئایەتە بە ڕوونی و بە ئاشکرایی لە نێوان گوێڕایەڵی و گوناهو تاواندا جیاوازی دەکات، دەرەنجامی هەر دوکیشیان دیاری دەکات بەوەی کە گوێڕایەڵی هۆکارە بۆ بە دەست هێنانی فەزڵ و پاداشت، گوناهو تاوانیش هۆکاری سزا وەرگرتنە، ئەمەیە دەرەنجامی هەر دوکیان، بەڵام بۆ تەقدیر کردن، هەر دوکیان گوێڕایەڵی و گوناهو تاوانیش لە لایەن خوای گەورەوە تەقدیر کراون و چارەنووس کراون، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە چونکە هەر دووکی تەقدیر کردون ئیتر هەر دووکی خۆش دەوێن و پێی ڕازین، بۆیە شێخولئیسلام پاش ئەوەی بەڵگە لەسەر گوێڕایەڵی و گوناهو تاوان دێنێتەوە، دەڵێت: (( وە دواتر جیاوازی نێوان ئیرادەی کەونی و دینی، وە ئەمری کەونی و دینی باس دەکەین)). بڕوانە: الشيخ الدكتور خالد المصلح، شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان.

وە دواتر جیاوازی نێوان ئیرادەی کەونی و شەرعی، وە ئەمری کەونی و دینی باس دەکەین(١).

-------------------------------------------

(١)_ ئیرادە دوو ئیرادەیە، ئیرادەیەکی کەونی: بریتیە لەو ئیرادەو خواستەی کە خوای گەورە شتەکانی پێ دەخوڵقێنێت، شتەکانی پێدێنێتە بوون و، ئەمەش هەر دەبێت ڕووبدات، وە ئیرادەیەکی شەرعیش هەیە: بریتیە لە فەرمان و قەدەغە کردنەکانی خوای گەورە، بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَنْ تَمِيلُوا مَيْلًا عَظِيمًا(٢٧) يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ وَخُلِقَ الْإِنْسَانُ ضَعِيفًا(٢٨)﴾ [النساء: ٢٧_٢٨] واتە: وە خوا دەیەوێت کە لێتان ببورێت بەڵام ئەیانەوێ ئەوانەش کە شوێن ئارەزووات کەوتوون کە لاتان بدەن بە لادانێکی گەورە خوا دەیەوێت کە ئەرکتان لەسەر سووك بکات چونکە ئادەمی بە لاواز دروستکراوە. ئەمە ئیرادەی شەرعیە، بەڵام ئیرادەی کەونی مەرج نییە خۆشەویستی لەگەڵدا بێت، بەڵکو خوای گەورە شتانێکی ویستووەو ئیرادەکردووە کە خۆشی ناوێن، هۆکارەکەشی تەنها بۆ حیکمەت و تاقیکردنەوەیە، بەڵام ئیرادەی (شەرعی) خوای گەورە خۆشی دەوێت، بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ [الزمر: ٧] واتە: وە ڕازی نییە بەبێباوەڕیی بۆ بەندەکانی وە ئەگەر سوپاسی خوا بکەن (گەردن کەچ بن) بەوە لێتان ڕازی دەبێت. ئیرادەو خواستی شەرعی خوای گەورە خۆشی دەوێت، بەڵام ئیرادەو خواستی کەونی ڕەنگە خوای گەورە خۆشی بوێت وە ڕەنگە خۆشیشی نەوێت، ئەمەیە یەکەم جیاوازی نێوان هەردوو ئیرادەکە، جیاوازی دووەمیش: ئیرادەو خواستی کەونی دەبێت هەر ڕوو بدات، بەڵام ئیرادەی شەرعی پێدەچێت ڕوو بدات و پێدەچێت ڕووش نەدات، بۆنموونە خوای گەورە خواستی ئیمانی بۆ هەموو بەندەکانی کردووە، بەڵام هەندێکیان ئیمان دێنن و هەندێکیشیان ئیمان ناهێنن.

ئەم مەسەلەیە بەلای تایەفەیەك لە صۆفیەكانەوە ئالۆز بوو تا جونەید بۆی ڕوون كردنەوە، بۆیە هەر كەس لەوەدا شوێنی جونەید كەوت بێت ئەوا لەسەر ڕاستی و دروستیی بووە، ئەوەش پێچەوانەی ئەوی كرد گومڕا بوو.

ئەوان دەیانگووت: هەر هەموو شتەكان بە ویست و مەشیئەت و قودرەتی خوای گەورەیە، وە لە بینین و شهودی ئەم یەكتاپەرستیەدایە[1]، كە بە (الجمع الأول) ی ناو دەبەن.

جونەیدیش بۆی ڕوونكردنەوە كەوا پێویستە جیاوازی دووەم بزانرێت، كە ئەگەرچی هەر هەموو شتەكان لەویست و مەشیئەت و قودرەت و بەدیهێنانی خوای گەورەدا هاوبەش بن، بەڵام پێویستە جیاوازی بكرێت لە نێوان ئەوانەدا كە خوای گەورە خۆشی دەوێن و پێی ڕازییە، وە لە نێوان ئەوانەدا كە ڕێگریی لێكردوون و حەزی پێیان نییەو ڕقی لێیان دەبێتەوە[2]،

---

(١)_ دەڵێن: جگە لەویست و مەشیئەتی خواو قودرەتی خوا هیچی تر نییە، وە هەر كەسێكیش ئەمە بزانێت یەكتاپەرستە، وە نكۆڵی لە ئیرادەی كەونی و ئەمری شەرعی دەكەن. ئەوان گوێڕایەڵ بوون بۆ قەدەر دەگەڕێننەوە، بەڵام ئەهلی زانست و ئیمان دەڵێن: گوێڕایەڵ بوون بۆ ئەمرو فەرمانی خوای گەورە دەگەڕێتەوە، كەوا بوو گوێڕایەڵ بوون بۆ فەرمان و شەرع دەگەڕێتەوە، نەك بۆ قەدەر، چونكە خوا لەوانەیە تاعەت و گوێڕایەڵ بوون بێت، وە لەوانەشە گوناهو تاوان بێت، بەڵام شەرعی تەنها تاعەت و گوێڕایەڵ بوونە.

(٢)_ مەرج نییە ئەوەی خوای گەورە خواست و ئیرادەو تەقدیری كردبێت خۆشی بوێت، خوای گەورە كوفری تەقدیر كردووە، ئیمانی تەقدیر كردووە، گوێڕایەڵی تەقدیر كردووە، گوناهو تاوانی تەقدیر كردووە، ئەمەی خۆش دەوێت و، ئەوەی خۆش ناوێت، ئەمە بە پێچەوانەی ئیرادەی شەرعەوە، چونكە لە شەرعدا خوای گەورە هیچ شتێك

دانانێت جگە لەوانەی کە خۆشی دەوێن، شتانێك بە شەرع دانانێت کە حەزێ پێیان نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٢٨) قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ(٢٩)﴾ [الأعراف: ٢٨] واتە: وە کاتێ کردەوەیەکی زۆر بەدو ناشیرینیان دەکرد (کە بە ڕووتی تەواف کردن یەکێ لە نموونەی ئەو کردەوانیە) دەیان ووت: لە باوو باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە وەخوا فەرمانی ئەو (کردەوە)ی پێداوین (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بێگومان خوا فەرمان نادا بەکردەوەی بەدو خراپ ئایا بەدەم خواوە شتێ دەڵێن کە نایزانن و بێئاگان لێی بڵێ پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە وە لە کاتی هەموو نوێژێکدا ڕاست ڕوو بکەنە خوا.

بێباوەڕان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد گوایە خوای گەورە فەرمانی دەرخستنی عەورەتی پێدا بوون لە کاتی تەواف کردنداو، دەیانگوت: ﴿وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ وەخوا فەرمانی ئەو (کردەوە)ی پێداوین، خوای گەورەش وەڵامی دانەوەو، پێی فەرموون: ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ﴾ ئایا بەدەم خواوە شتێ دەڵێن کە نایزانن و بێئاگان لێی بڵێ پەروەردگارم فەرمانی بەدادپەروەری داوە، فەرمانی بەگوێرایەڵی داوە ئەمەیە کە خوای گەورە فەرمانی ئەنجامدانی پێداوین، هەروەها دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بێگومان خوا فەرمان نادا بەکردەوەی بەدو خراپ، ﴿قُلْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٢٨) قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ وە لەنوێژیشدا ڕاست ڕووبکەنە خواو لە نوێژو هەموو کردەوەکانی دیکەدا بۆ خوا یەکدابنەوە.

و له نێوان دۆستان و دوژمنانیشیدا جیاوازی بکرێت، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ (٣٥) مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ (٣٦)﴾[1] [القلم: ٣٥_٣٦] واتە: چۆن ئێمە موسڵمان و بەدکاران وەك یەك لێدەکەین؟ ئەوە چیتانە چۆن بڕیارێك دەدەن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾[ص: ٢٨]. واتە: ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە لەگەڵ خراپەکاران لە زەویدا وەك یەکیان دانێین (لە دوا ڕۆژدا، نەخێر وانییە) یا پارێزکاران وەك بەدکاران لێ دەکەین.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾[2] [الجاثية: ٢١] واتە: ئایا ئەوانەی کە خراپەکانیان کردووە وا گومان دەبەن ئێمە ئەوانە وەکو کەسانێ دادەنێین کە بڕوایان هێناوەو چاکەکانیان کردووە وەکو یەك بێت ژیانیان و مردنیان ئای چەند خراپ دادوەری دەکەن.

---

(١)_ دەڵێن لە نێوان کەسی گوێڕایەڵ و کەسی یاخیبوودا جیاوازی نییە، چونکە هەردوکیان ملکەچی قەدرو مەشیئەت و ویستی خوای گەورە بوون، کەوا بوو هەر دووکیان گوێڕایەڵ و ملکەچی خوا بوون و هەردوکیشیان وەکو یەك پاداشت دەدرێنەوە، ئەمەش درۆ گوتنە بەدەم خوای گەورەوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ (٣٥) مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ (٣٦)﴾ چۆن ئێمە موسڵمان و بەدکاران وەك یەك لێدەکەین؟ ئەوە چیتانە چۆن بڕیارێك دەدەن.

(٢)_ خوای گەورە ئەو کەسانەی کە کردەوە خراپەکانیان کردووە یەکسان ناکات لەگەڵ ئەوانەدا کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر جیاوازی نێوان قەدەر و شەرع.

هەر لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَلَا الْمُسِيءُ قَلِيلًا مَا تَتَذَكَّرُونَ﴾[1] [غافر: ٥٨] واتە: وەنابینا و بینا یەکسان نین وە کەسانێ باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە لەگەڵ بەدکاراندا وەك یەك نین زۆر کەم بیردەکەنەوە.

بۆیە بیرباوەڕی پێشینی چاك و پێشەوایانی ئومەت: بریتیە لەوەی کە خوای گەورە خولقێنەرو پەروەردگارو خاوەنی هەر هەموو شتێکە، ویستی هەر شتێك بکات، دەبێت، وە ویستی هەر شتێکیش نەکات، نابێت، هیچ پەروەردگارێکی غەیری ئەو نییە[2]

---

(١)_ ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى﴾ مەبەستی کوێر نییە بەڵکو مەبەستی ئەوانەیە کە عەقڵ و زرنگی و کارامەییان کوێر بووە، ﴿وَالْبَصِيرُ﴾ مەبەستی ئەوانەیە کە دڵیان بینایەو هیدایەت و ڕێنموونی کراون و، ملکەچی فەرمانەکانی خوان، ئەم دووانە بە لای خوای گەورەوە یەکسان نابن. کەوا بوو هەر کەسێك جیاوازی لەنێوان کەسی گوێڕایەڵ و کەسی یاخی بوودا نەکات و، بڵێت: هەر دووکیان خواپەرستیان کردووەو، هەر دووکیان ملکەچی خوا بوونە، چونکە هەردووکیان ملکەچی ویست و قەدەرو چارەنووس و ئەمری کەونی خوای گەورە بوونە، بۆیە هەر دوکیان خواپەرستیان کردووە، دڵنیا بن درۆی بە دەم خواوە کردووە.

(٢)_ خوای گەورە خولقێنەری هەر هەموو شتێکە، کافر، ئیماندار، خولقێنەری گوێڕایەڵی و گوناه و تاوانە، خولقێنەری کوفرو ئیمانە، لەو بارەوە حیکمەت و دانایی زۆر گەورەی هەیە کە بریتیە لە تاقیکردنەوەی بەندەکانی خۆی، پێویستە دەست بەئیمان و گوێڕایەڵیەوە بگرن و، بێباوەڕی و کوفر واز لێبێنن، چونکە بۆ هیچ کەسێك نییە کوفرو تاوان ئەنجام بدات و پاشان بڵێت: ئەی چ بکەم قەدەری خوایە تاوان دەکەم، لەچارەی نووسیوم، هیچ کەسێکی ژیرو عاقڵ ئەم قسە پووچانە ناڵێت، کەوا بوو پێویستە جیاوازی لە نێوان گوێڕایەڵی و گوناه و تاواندا بکرێت. گوێڕایەڵی ئەنجام بدرێت و، دەست لە گوناه و تاوان هەڵبگیرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا _ فەرمانی بە گوێڕایەڵی و خواپەرستی کردوەو، ڕێگری لە گوناهو تاوان کردووە[1] خوای گەورە حەزی بە خراپەکاری نییە[2]، ڕازی نابێت بە کوفر بۆ بەندەکانی[3]،

---

(١)_ هەر خوای گەورەیە کە هەر هەموو شتەکانی خوڵقاندووە _ لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانی بەگوێڕایەڵی و خواپەرستی کردوەو، لە گوناه و تاوانیش ڕێگری کردووە، ئەوە شتێکەو ئەمیش شتێکی ترە، ئەو دووانە تێکەڵ بە یەکتر ناکرێن، لە نێوان ئەدەرو شەرعدا جیاوازی هەیە، لە نێوان خوڵقاندن و شەرعدا جیاوازی هەیە، سەرەڕای ئەوەی خوای گەورە ویست و مەشیئەتی خوڵقاندنی گوناه و تاوانی هەبووە بەلام ڕێگریی لە ئەنجامدانی کردووە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە نێوان گوێڕایەڵی و گوناه و تاواندا جیاوازی هەیە.

(٢)_ خوای گەورە هەموو شتێکی بە قەزاو قەدەری خۆی لە خەیرو لە شەڕ لەم گەردونەدا خوڵقاندووە، لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانی بە گوێڕایەڵی و خواپەرستی کردوەو، نەدەغەی ئەنجام دانی گوناه و تاوانی کردووە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر دوو شتەکە جیاوازیان لە نێواندایە، ئەوەی لە لایەن خواوەیەو، ئەوەشی کە لە لایەن بەندەکانەوەیە، ئەوەی لە لایەن خواوەیە کە بریتیە لە خوڵقاندنی هەر هەموو شتەکان لە هەموو بارێکدا ستایش کراوە، بەلام ئەوەی لە لایەن بەندەکانەوەیە کە بریتیە لە گوێڕیاڵی و گوناه و تاوان یەکەم ستایش کراوەو دووەمیش زەم کراوە.

(٣)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ﴾ [الزمر: ٧] واتە: ئەگەر ئێوە بێ باوەڕبن ئەوە بێگومان خوا بێ نیازە لە ئێوە و ڕازی نییە بەبێباوەڕی بۆ بەندەکانی. بەڵکو بەوە ڕازییە کە بەندەکانی ئیماندارбن، ئەوان دەڵێن: نەخێر، خوای گەورە ڕازی بووە بە کوفرو ئیمان بۆ بەندەکانی، بە بەڵگەی ئەوەی کە هەر دوکیانی تەقدیر کردووە.

فەرمان بە ئەنجام دانی کارو کردەوەی ناشیرین و نا بەجێ ناکات[1] ئەگەرچی بەویست و مەشیئەتی خۆشی ڕووی دابێت، خۆشی ناوێت و پێی ڕازی نییە، بەڵکو ڕقی لێیەتی و زەمی ئەنجام دەرانی دەکات و، سزایان دەدات[2].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء أَتَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٢٨) قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ(٢٩)﴾ {الأعراف: ٢٨ _ ٢٩} (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بێگومان خوا فەرمان نادا بە کردەوەی بەدو خراپ، وەکو بە دەرخستنی عەورەت، دەڵێن: خوای گەورە فەرمانی بەمەداوە، درۆ بەدەم خواوە دەڵێن، ئایا بەدەم خواوە شتێ دەڵێن کە نایزانن و بێئاگان لێی بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە وە لە کاتی هەموو نوێژێکدا ڕاست ڕوو بکەنە خوا، پاشان لە هەمان سورەتدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ [الأعراف: ٣١] واتە: ئەی نەوەی ئادەم پۆشاکی جوان و ڕازاوەتان بپۆشن لە کاتی هەموو نوێژێکدا. کەوابوو پێویستە مرۆڤی موسڵمان لە کاتی نوێژدا عەورەتی داپۆشێت، چونکە ئەوە لە مەرجەکانی دروست بوونی نوێژە. خوای گەورە فەرمانی بە داپۆشینی عەورەت کردووە، فەرمانی بە خستنەدەری نەکردووە، چونکە خستنەدەری فاحیشەیە، وشەی فاحیشەش لە زمانی عەرەبیدا واتە هەر کارێکی ئەو پەڕی بەدو ناشیرین و قیزەون. داپۆشینی عەورەت گوێڕایەڵییە، گوێڕایەڵیش هەر هەمووی خەیرە.

(٢)_ وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا خوای گەورە کە شتەکان بە قەزاو بە قەدەری خۆی دەخوڵقێنێت، مەرج نییە خۆشی بوێن، بەڵکو لەوانەیە خۆشی بوێن و لەوانەشە

---------------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------------

رقی لێیان بێتەوە، لێرەدا ڕەنگە بپرسن: بۆچی شتەکان بە قەزاو قەدەری خۆی دەخولقێنێت و، ڕقیشی لێیانە، لەوەڵامدا دەڵێین: ئەمە بۆ تاقیکردنەوەیە، بۆ ئەوەی کەسی گوێڕایەڵ و کەسی یاخی بوو، کەسی ئیماندارو کەسی کافر، ڕاستگۆو درۆزن لێك جیابنەوە، بۆیە بواری بۆ بەندەکانی ڕەخساندووە بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆیان هەڵبژێرن بە ویستی خۆیان ئەنجامی بدەن، تواناو هێزیشی پێداون، ئەمە دەتوانێت نوێژ بکات، ئەوە دەتوانێت زینا بکات، تواناو هێزی پێداون، دەتوانێت واز لە زینا بێنێت، واز لە نوێژکردن بێنێت، توانای هەموو ئەوانەی پێدراوە، لە لایەن هیچ کەسێکەوە ناچار نەکراوە، بە تواناو هەڵبژاردنی خۆی ئەوانە دەکات، ئیتر بۆچی مرۆڤ توانای خۆی بیردەچێتەوەو، دەڵێت، چبکەم قەزاو قەدەرە، ئەو زاتەی بە قەزاو قەدەری خۆی شتەکان دەخولقێنێت بەکردەوەی ناشیرین و نابەجێ ڕازی نابێت و، فەرمانیشی پێناکات.

بەلام پلەی سێ یەم: بریتیە لەوەی نەگوێڕایەڵی و نەگوناه و تاوان نەبینێت[١]، چونکە وادەبینێت کە بوون و (وجود) یەکە[٢]، بە لای ئەوانەوە ئەمە ئەو پەڕی تەحقیق و گەیشتن و دۆستایەتیە بۆ خوا[٣]،

---

(١)_ گوتیان پلەکان لە ڕووی گوێڕایەڵی و گوناه و تاوانەوە سێ پلەن، یەکەم: لێرەدا مرۆڤ گوێڕایەڵی و گوناه وتاوان دەبینێت، دووەم: گوێڕایەڵی بەبێ گوناه و تاوان دەبینێت، ئیتر هەر شتێك ئەنجام بدات دەبێ بە تاعەت و گوێڕایەڵی، دابەش بوون ناکات، هەر شتێك ئەنجام بدات تاعەت و گوێڕایەڵییە، دەڵێت: چونکە خوا بە قەزاو قەدری خۆی داینـاوە، ئێمەش دەڵێین: بەڵێ خوای گەورە قەزای کردوەو تەقدیری کردووە، بەلام بەشەرعیی دانەناوە، ئێمە فەرمانمان پێکراوە ئەوانە جێبەجێ بکەین کە خوای گەورە شەرعیکردووە، بەلام قەزاو قەدەر ئەمە کاری خوای گەورەیە، سێیەم: نە گوێڕایەڵێ و نە گوناه و تاوان نەبینێت، واتە دەگاتە ئەو ئاستەی کە لەو باوەڕدا دەبێت کە لە بنەڕەتەوە گوێڕایەڵی و گوناه و تاوان بوونی نییەو، هەر هەموو گەردوون یەکەو خولقێنەرو خولقێنراو نییە، ئەمەش (وحدة الوجود)ە.

(٢)_ ئەمە (وحدة الوجود)ە، چۆن کردەوەکان و گوێڕایەڵی و گوناه و تاوان جیاجیا دەبن ئەگەر گەردوون یەك شتبێت؟ ئەگەر بەو جۆرە بێت جیاجیا نابن، ئەمە تەنها باوەڕێکی بێ بنەمایە.

(٣)_ ئەگەر بە ئاستی ئەم پلەیە گەیشتن ئەوە ئەوپەڕی تەحقیق و گەیشتن و دۆستایەتیە بۆ خوا، بەلایانەوە ئەمەیە یەکتاپەرستی، بەلام لە واقیعدا ئەمە کوفرێکە کە هیچ کوفرێکی دیکە لەو گەورەتر نییە، لە کوفری فیرعەون و هامان و قارون و ئەبو جەهلیش گەورەترە، چونکە ئەمانە لەگەڵ کوفرەکەشیاندا دانیان بەوەدا دەنا کە خوا خولقێنەرو بەدیهێنەرە، ڕۆزیدەرە، دەژێنێت، دەمرێنێت، چارەسازە، بەلام ئەمان دەڵێن: نەخێر، هیچ خولقێنەرو بەدیهێنەرو، چارەسازێك نییەو هەر هەموو گەردوون یەکە، هێندێکی لە هێندێکی جیا نابێتەوە.

بەڵام _لە حەقیقەتدا_ ئەو پەڕی ئیلحادە[١] لە ناو و ئایەتەکانی خوا دا، ئەوپەڕی دوژمنایەتیە بۆ خوا . پاشان شیخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ گومرایی و کوفری ئەوانە ڕووندەکاتەوەو دەڵێت: بەڵام خاوەنی ئەم پلەیە جوولەکەو، گاورو، سەراپای کافران بەدۆست وەردەگرێت[٢]،

---

(١)_ وشەی ئیلحاد لەزمانی عەرەبیدا مانای لادان دەبەخشێت، لادان لەشت، لە زمانی عەرەبیدا (لَحْدُ القبر) واتە: گۆڕیچکەی قەبریش لەمەوە وەرگیراوە، چونکە چاڵێکە لەلایەکی گۆڕەکەوە هەڵکەندراوەو، لادانێکە لە شێوەو بارودۆخی قەبرەکە، بەڵام وشەی ئیلحاد لە شەرعدا: لادانە لەهەموو ئەوانەی کە خوای گەورە بە شەرعی داناوەو فەرمانی پێکردووە.

(٢)_ ئەمە کارەساتەکەیە لەم ڕۆژگارەدا، ئێستا ئەمە واقیعەو ڕوویداوە، دەڵێن: لە نێوان جوولەکەو، گاورو، موسڵماناندا جیاوازی مەکەن، هەر هەموویان خاوەنی ئایینی خوان، هەر هەموویان خوا دەپەرستن، هەر هەموویان شوێنکەوتووی پێغەمبەرانن، درۆ بەم دەم خوای گەورەوە دەکەن، دڵنیا بن پاش ناردنی موحەممەد ﷺ گوێڕایەڵی هیچ پێغەمبەرێکی تر ناکرێت جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر هەموو شەریعەتەکانی تر کۆتاییان هات جگە لە شەریعەتی موحەممەد ﷺ، بەڵام ئەهلی (وحدة الوجود) دەڵێن: هەموویان یەکسانن جوولەکەو، گاورو، موسڵمان، هەر هەموویان گوێڕایەڵی خوا دەکەن، ئەمەیە کارەساتەکە، گوفتاری ئەو کەسانەش کە بانگەشە بۆ نزیك بوونەوەی نێوان ئایینەکان دەکەن لە مڕۆدا لە گوفتاری ئەهلی (وحدة الوجود) دەچێت، دەڵێن: لە نێوان ئایینی ئیسلام و، ئایینی جوولەکەو، ئایینی گاوردا جیاوازی نییە، دەڵێن: هەموویان بران، بۆیە کەسانێکیان دەڵێن: برا مەسیحیەکانمان _ پەنا بە خوا_.

بە واتایەکی تر بە لای ئەوانەوە لە نێوان ئەمەو ئەوەدا جیاوازی نییە، بە بۆچونی ئەوان کافرو موسڵمان نییەو، هەر هەموو ئەم گەردوونە یەکە.

لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾[1] [المائدة: ٥١]
واتە: ئەوەتان ئەوان بکات بەپشتیوان و دۆست ئەوە بە ڕاستی ئەو کەسە لەوانە.

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ [المائدة: ٥١] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکەو گاور مەکەن بە دۆستی خۆتان، خۆشتان بوێن و پشتگیریان بکەن، ئەوانە هێندێکیان دۆستی یەکترن جا ئەوەتان ئەوان بکات بە دۆستی خۆی، خۆشی بوێن و پشتگیریان بکات و بەرنامەو ڕێبازی ئەوان بەشیاو دابنێت و، بڵێت: ئەوان لەسەر هەقن، ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆست ئەوە بە ڕاستی ئەو کەسە لەوانە، دەبێت بە جوولەکە یان گاور چونکە لە نێوان کوفرو ئیماندا جیاوازی ناکات، ئیتر وەکو ئەهلی (وحدة الوجود)ی لێدێت کە لە نێوان گوێڕایەڵی و گوناهو تاواندا، کوفرو ئیماندا جیاوازی ناکەن، ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ بێگومان خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات، بروانە ستەمکاران بەهۆی کوفرەکەیانەوە خوای گەورە ڕێگریی هیدایەت دانی لێکردن، وەکو سزایەك. بەڵام ئیماندار خوای گەورە هیدایەتی دەدات، چونکە ویستی هیدایەتی هەبوو.

هەروەها خاوەنی ئەو پلەیە خۆی لە شیرك و هاوەڵپەرستی و بتەكان بەری ناكات، بۆیە لە ئاینیی پاكی ئیبراهیمی خەلیل دەچێتە دەرەوە[1] خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَاؤُا مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾[2] [الممتحنة: ٤] واتە: بە ڕاستی سەرمەشقێكی جوان و چاك بۆ ئێوە هەیە لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون كە بە گەلەكەی خۆیانیان ووت بە ڕاستی ئێمە بێزارو بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش كە دەیناپەرستن لە جیاتی خوا ئێمە باوەڕمان نییە بە (ئایینی) ئێوە وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتی و كینە بۆ هەمیشە تا كاتێك كە بڕوا بە خوای تەنیا دەهێنن جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم كە بە باوكی ووت بێگومان داوای لێخۆشبونت بۆ ئەكەم وە من هیچم بەدەست نییە لە بەرانبەر خوادا بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان تەنها پشتمان بەتۆ بەستووە وە هەر بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە سەر ئەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە.

---

(١)_ لە ئایینە پاكەكەی ئیبراهیمی خەلیل دەچێتە دەرەوەو، چیتر لە نێوان كوفرو ئیماندا جیاوازی ناكات، وەكو ئەوەی پێغەمبەر ئیبراهیم _ علیه السلام _ جیاوازی دەكرد، چونكە پێغەمبەر ئیبراهیم تەنانەت خۆی لە بابیشی بەری كرد، كاتێ بۆی ڕوونبویەوە دوژمنی خوایە، بۆیە ( الولاء والبراء) پشتیوانیكردن و خۆبەری كردن لە ئایینی ئیسلامدا پێویستە، پشتیوانیكردن و سەرخستنی موسڵمانان و، خۆبەری كردن لەهاوەڵپەرستان، بەڵام ئەو كەسەی هەموویانی بەلاوە یەكسان بێت، موسڵمانان و غەیری موسڵمانانیش، بڵێت: هەموویان بران جوولەكەو گاور، بابزانێت هیچ ( الولاء والبراء) پشتیوانیكردن و خۆبەری كردنێكی ئەنجام نەداوە.

(٢)_ خوای گەورە بە ئوممەتی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ بە ڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقێكی جوان و چاك، سەرمەشقیش یا

چاك دەبێت یا خراپ دەبێت، سەرمەشقی خەیرو سەرمەشقی شەر هەیە، بەڵام ئیبراهیم _ علیه السلام _ سەرمەشقی خەیر بوو، ﴿فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ﴾ لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، ئەوانەی شوێنی کەوتن و بڕوایان پێهێنا، ﴿إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَاؤُا مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ کە بە گەلەکەی خۆیانیان گوت بە ڕاستی ئێمە بێزارو بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیناپەرستن لە جیاتی خوا، لە خۆیان و لە ئایینەکەیان خۆیان بەری کرد، ﴿كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا﴾ ئێمە باوەڕمان نییە بە ئایینی ئێوە وە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە پەیدابوو، هەرگیز لەگەڵتاندا نزی کنابینەوە، کەچی لەم زەمەنەی خۆماندا دەڵێن: لە جوولەکەو گاورەکان نزیك بنەوە، ﴿حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ تا کاتێك بڕوا بە خوای تاکو تەنیا دێنن، تا بڕوا بە خواو پێغەمبەرەکەی نەهێنن ئەم دوژمنایەتی و کینەیە لاناچێت، مەگەر ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ بێنن، ﴿إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ﴾ جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم کە بە باوکی گوت بێگومان داوای لێخۆش بونت بۆ دەکەم، پێغەمبەر ئیبراهیم _ علیه السلام _ بانگی بابی کرد بەڵام ڕازی نەبوو، لە کۆتادا خۆی لێبەری کرد، لەو بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ﴾[التوبة: ١١٤] واتە: وە داوای لێخۆش بوونی ئیبراهیم بۆ باوکی تەنها لەبەر وادەو بەڵێنێك بوو کە بەباوکی دابوو (کە داوای لێبوردنی بۆ بکات) جا کاتێ بۆی ڕوون بویەوە کە بێگومان باوکی دوژمنی خوایە خۆی لێبەری کرد، تەماشاکەن پێغەمبەر ئیبراهیم _ علیه السلام _ تەنانەت خۆی لە بابیشی بەری کرد کاتێك بۆی دەرکەوت کە دوژمنی خوایە، لێرەدا هیچ کەسێك خۆشناویستریت، لەو بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ

--------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------

...ائهم أو إخوانهم أو عشيرتهم﴾ [المجادلة: ٢٢] واتـه: كەسانێكت دەستناكەوێ كـه باوەڕیان هەبێت بە خواو بەڕۆژی دوایی كە دۆستایەتیبكەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەكەن هەرچەندە ئەو دوژمنانەش باوكیان بن یا كوڕو براو خزمیان بن. هەرگیز خۆشیان ناوێن، مەگەر بابیان بن، لە دونیادا گوێڕایەڵیان دەكەن لە ڕووی مامەڵە كردنەوە بە چاكە، خۆشیان ناوێن بەڵام لە چاكەدا گوێڕایەڵیان دەبن، چونكە مەقیان بەسەریانەوەیە، ئەگەرچی كافریش بن، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ [لقمان: ١٤_١٥] واتە: وە فەرمانمان داوە بەئادەمی (بە چاكی هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ) دایك و باوكیدا دایكی هەڵیئەگرێ بە دووگیانی (پێی لاواز دەبێ) لاوازی لە دوای لاوازی و بڕینەوەی لەشیر لە (دوا تەمەنی) دوو ساڵیەوە (وە فەرمانمان بە ئادەمیدا) كە سوپاس گوزاری من (خوا) و باوك و دایكت بكە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان وە ئەگەر (باوك و دایكت) ئەوپەڕی هەوڵیاندا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێ بكەیت بە هاوبەشی من كە هیچ زانیارییەكت پێی نییە ئەوە گوێڕایەڵیان مەكە بەڵام لە دونیادا زۆری بە چاكی هاوڕێیەتیان بكە و شوێن ڕێبازی كەسێك بكەوە كە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای من (لە ڕۆژی دوایدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆ لای منە ئینجا هەواڵتان دەدەمێ بەو كردەوانەی كە كردوتانە. خۆ بەری كردن لە كافران واجیبەو بەشێكە لە ئاین، ئەو كەسەش كە خۆی لێیان بەری ناكات دەبێتە یەكێك لە ئەوان بەدەقی ئەم ئایەتە ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ [المائدة: ٥١] واتە: ئەوەتان ئەوان بكات بە پشتیوان و دۆست ئەوە بە ڕاستی ئەو كەسە لەوانە. ئەمە مەترسیەكی زۆر گەورەیە، كەچی لەم ڕۆژگارەدا بانگەواز دەكرێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەمە، بەبیانووی ئەوەی گوایە توندڕەوییە، گوایە ئیرهابە، بە ڕاستی كارەساتێكی گەورەیە.

هەروەها ئیبراهیمی خەلیل _ علیه السلام _ بە گەلە هاوەڵپەرستەکەی خۆی فەرمووی: ﴿قَالَ أَفَرَأَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ (٧٥) أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ (٧٦) فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ(٧٧)﴾[1] [الشعراء: ٧٥_٧٧] واتە: گووتی: ئایا ئێوە دەزانن چی دەپەرستن؟ ئێوەو باو باپیرە پێشوەکانتان جا بە ڕاستی هەموو ئەوانە دوژمنی منن جگە لە پەروەردگاری جیهانیان.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ﴾[2] [المجادلة: ٢٢] واتە: کەسانێک دەستناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە خواو بە ڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن هەرچەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕو براو خزمیان بن ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە بەهێزی کردوون و سەری خستوون بە قورئان و ئیمان لە لایەن خۆیەوە.

---

(١)_ ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي﴾ بە ڕاستی هەموو ئەوانە دوژمنی منن، خۆی بەری کرد لە هەموو ئەو شتانەی کە جگە لە خوای گەورە دەیان پەرستن، ﴿إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ جگە لە پەروەردگاری جیهانیان، ﴿الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ﴾ کە ئەو منی دروست کردووە پاشان هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات، بۆیە هەر ئەو دەپەرستم و هەر ئەویشم خۆش دەوێت.

(٢)_ هەروەها ئەم ئایەتەشە نکۆڵیی دەکات کەسێك ئیمانی بەخواو پێغەمبەرەکەی هەبێت و، لەهەمان کاتیشدا کافرانی خۆش بوێت ئەگەر چی نزیکترین خزم و کەسوکاری خۆشی بن، چونکە پێویستە ئەگەر دوژمنی خوابن ئەویش

........................................................................

........................................................................

........................................................................

دوژمنایەتیان بکات، ئەوەبوو خوای گەورە دەربارەی پێغەمبەر ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ﴾[التوبة: ١١٤] واتە: جا کاتێ بۆی ڕوونبویەوە کە بێگومان باوکی دوژمنی خوایە خۆی لێ بەریکرد. هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ﴾[الممتحنة: ١] واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بە دۆستی خۆتان دۆستایەتی خۆتانیان بۆ بنێرن.

کەچی کەسانێکیان چەندین کتێب و قەسیدەی لەسەر بیروباوەڕەکەی خۆی نوسیوە[١] وەکو قەسیدەکەی (إبن لفاریض) کە بە((نظم السلوك)) ناوبراوە، تیایدا دەڵێت:

لَهَا[٢] صَلاَتِي بِالْمَقَامِ أُقِيمُهَا * * * وَأَشْهَدُ فِيهَا أَنَّهَا لِي صَلَّتْ[٣]

كِلاَنَا مُصَلٍّ وَاحِدٌ سَاجِدٌ إِلَى * * * حَقِيقَتِهِ بِالْجَمْعِ فِي كُلِّ سَجْدَةِ[٤]

---

(١)_ بەڵام ئەوان تەواو بە پێچەوانەوەن و کەسی گوێڕایەڵ و کەسی سەرپێچی کاریان بەلاوە یەکسانە، بۆیە کەسانێکیان چەندین کتێبیان لەبارەی (وحدة الوجود)ەوە نوسیوە، وەکو ئیبنوعەرەبی کە هەر یەك لە کتێبەکانی ((الفتوحات المكية)) و ((الفصوص))ی نوسیووە، کەسی واشیان تێدایە وەکو (ئیبن و لفاریض) کۆبەندێکی شیعری دەربارەی ڕێبازەکەی خۆی نووسیووەتەوە کە بە((نظم السلوك)) ناو دەبرێت و، تیایدا ئاشکرای دەکات کە هیچ خولقێنەرو خولقێنراوێك بە جیا جیا نییە بەڵکو هەر هەموو گەردوون یەکە، وە ئەو بۆ خودی خۆی نوێژ دەکات و، خودی خۆی دەپەرستێت، چونکە خودی خۆی خوایەو، جیاوازی لە نێوان خۆی و خوادا نییەو هەموان بریتین لەم گەردوونە. قەسیدە تائیەکەی (ئیبن و لفاریض) چاپ کراوەو بڵاوەو ناسراوە، گرنگی پێدەدرێت و لە لایەن ئەوانەوە دەکڕدرێت.

(٢)_ مەبەستی بە(لها)ی نێو دێڕە شیعرەکە خودی خۆیەتی، وا ڕادەگەیەنێت کە خودی خۆی خوایە، هەر هەموو ئەم دونیایە بریتیە لە خوا، دەڵێت: من بۆ خودی خۆم نوێژ دەکەم چونکە من خوام.

(٣)_ (أنها لي صَلَّتِ) واتە: خودی خۆم بۆ خۆم نوێژی کرد، بۆ خوای گەورە نوێژینەکرد، بەڵکو خودی خۆی بۆ خۆی نوێژی کردو، هیچ جیاوازیەك لە نێوان خودی خۆی و خوادا نییە، چونکە هەر هەموو گەردوون پێکەوە یەك ڕواڵەتە (مَظْهَرْ)ە.

(٤)_ بەڵێ، خودی خۆی بۆ خۆی سوژدە دەبات، چونکە خودی خۆی خوایە، ئەو خۆی دەپەرستێت چونکە ئەگەر بڵێت: خوا دەپەرستم جیاکاریی دروست دەبێت لەنێوان خودی خۆی و خوادا، لە کاتێکدا بەبۆچونی خۆی ئەو جیاکارییە نییە، بەڵکو ئەو خودی خوایە.

وَمَا كَانَ لِي صَلَّى سِوَائِي وَلَمْ تَكُنْ * * * صَلاَتِي لِغَيْرِي فِي أدا كُلِّ رَكْعَةِ(١)

إِلَى أَنْ قَالَ:

وَمَا زِلْت إِيَّاهَا وَإِيَّايَ لَمْ تَزَلْ * * * وَلاَ فَرْقَ بَلْ ذَاتِي لِذَاتِي صَلَّتِ

إِلَيَّ رَسُولًا كُنْت مِنِّي مُرْسَلًا * * * وَذَاتِي بِآيَاتِي عَلَيَّ اسْتَدَلَّتْ(٢)

فَإِنْ دُعِيت كُنْت الْمُجِيبَ وَإِنْ * * * أَكُنْ مُنَادًى أَجَابَتْ مَنْ دَعَانِي وَلَبَّتْ(٣).

وە چەندین قسەی تری بەم جۆرە، بۆیە لە کاتی سەرەمەرگدا ئەم شاعیرە دەیگووت:

إِنْ كَانَ مَنْزِلَتِي فِي الْحُبِّ عِنْدَكُمْ . . . مَا قَدْ لَقِيتُ فَقَدْ ضَيَّعْتُ أَيَّامِي

أُمْنِيَّةٌ ظَفِرَتْ نَفْسِي بِهَا زَمَنًا . . . وَالْيَوْمَ أَحْسَبُهَا أَضْغَاثُ أَحْلاَمِ(٤).

---

(١)_ بەڵێ، وا ڕادەگەیەنێت کە نوێژ دەکات و، خودی خۆی دەپەرستێت، چونکە خودی خۆی خوایە، خوای خوڵقێنەر بەجیاو خوڵقێنراوان بە جیا بوونی نییە.

(٢)_ وا ڕادەگەیەنێت پێغەمبەران لەلایەن خواوە نەنێردراون، بەڵکو خودی خۆی پێغەمبەرە بۆ خودی خۆی، چونکە خودی خۆی خوایە، وە جیاکاریی لەنێوان بەندەو پەروەردگاردا نییە، بەڵکو هەموو شتێکی گەردوون پێکەوە بریتیە لەخوا، بۆیە پێغەمبەران لەخۆیەوە بۆ خۆیەتی.

(٣)_ وا ڕادەگەیەنێت کە خودی خۆی بانگەواز کارەو خودی خۆشی وەڵامدەرەوەیە، خوایەك نییە تا وەڵام بداتەوە، ئەو بانگەوازی خودی خۆی دەکات و، خۆشی وەڵامی خۆی دەداتەوە.

(٤)_ (ئیبنولفاریض) لەکاتی سەرەمەرگدا فریشتەکانی بینی دەهاتن دەیانویست ڕوحی بکێشن، ئەو کاتە هەڵەکانی خۆی بۆ دەرکەوت، بۆی ڕوون بویەوە کە لەسەر گومڕایی بووە، بۆیە ئەو شیعرەی گوت، بەڵام ئەوە هیچ سوودێکی بۆ نابێت، هەموو کافرێك لە کاتی مردندا دان بەکوفرو هەڵەکانی خۆیدا دەنێت بەڵام ئەوە هیچ

چونکه شتێکی ئاساییە کاتێ سوودێکی پێناگەیەنێت، چوونکە کاتەکەی تێپەڕ بووە، شتەکە ڕوون دەبێتەوەو، فریشتەکان بیزا یەکسەر مرۆڤ هەڵەکانی خۆی دەزانێت، ئەوکات کافران و مولحیدان هەموویان دەزانن ئەوان تەنها بەندەن و هیچی تر، پەروەردگارێکیان هەیە بۆی دەگەڕێنەوە، بەڵام تەوبەکەیان سوودیان پێناگەیەنێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الآنَ﴾[النساء: ١٨] واتە: پەشیمانی (وەرگرتن) نییە بۆ ئەوانەی تاوانی زۆر دەکەن هەتا کاتی سەرەمەرگی یەکێکیان دێ دەڵێت: بەڕاستی من ئێستا تەوبەم کرد. ئەو کاتە تەوبە وەرناگیرێت، تەنانەت فیرعەونیش کاتێ ئەوەندەی نەمابوو بخنکێت گوتی: ﴿حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُواْ إِسْرَائِيلَ وَأَنَاْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ (٩٠) آلآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ(٩١)﴾[یونس: ٩٠ـ٩١] واتە: هەتا ئەو کاتەی خەریك بوو (فیرعەون) بخنکێ ئەوسا ووتی بڕوام هێنا کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە ئەو (خوایە) نەبێت نەوەی ئیسرائیل کە بڕوایان پێهێناوە وە منیش لە موسڵمانانم ئێستا (باوەڕ دێنیت؟) کە بێگومان لەوەو پێش سەرپێچیت کرد وەتۆ لە خراپەکاران و تێکدەران بوویت. کاتی غەرغەرەی سەرەمەرگ تەوبەکردن سوودی نابێت. ئەمە حەقیقەتەکە بوو، گومڕاییەکەی خۆی بۆ ڕوون بوویە، چونکە ئەگەر جیاکاریی نەبوایە و هەموو گەردوون پێکەوە بریتی بوایە لە خوا، فریشتەکان نەدەهاتن بۆ ڕوح کێشانی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تەنها بەندەیەکە و هیچی تر، وە فریشتەکانیش نێردراوی خوای گەورە بوون.

چونكه وايدەزانى خودى خۆى خوايە[1] بەلام كاتێ فريشتەكانى خواى بينى ئامادە بوون بۆ ڕووح كێشانى پووچ بونەوەى بيروباوەڕەكانى خۆى بۆ دەركەوت .

خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[2] [الحديد: ١] واتە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەر چى لە ئاسمانەكان و زەويدا هەيە تەسبيحاتى خوا دەكەن وە هەر ئەوە بالا دەستى كار بەجێ.

لێرەدا جيگەى ئامارژە پێكردانە كە هەر هەموو ئەوانەى لە ئاسمانەكان و زەويدايەو تەسبيحاتى خوا دەكەن، خودى خواى گەورە نين.

---

(١)_ تەماشاكەن واى دەزانى خودى خۆى خوايە لە ژيانيدا، بەلام لەكاتى سەرەمەرگدا بۆى دەركەوت ئەو خوانييە. شيعرەكەى (ئيبنولفاريض) لە لايەن بورهانودين ئەلبيقاعيەوە وەلامى دراوەتەوە بەناونيشانى (تنبيه الغبي على كفر ابن عربي) وە شێخ عەبدولڕەحمان ئەلوەكيل هەستاوە بەتەحقيق يكردنى، چاپ كراوەو لەبەر دەستايە.

(٢)_ ئەم ئايەتە بەر پەرچى ئەهلى (وحدة الوجود) دەداتەوە، ئەوانەى پێشتر ئامارژەمان بە بير و بۆچوونەكەياندا، لە زمانى عەرەبيدا وشەى (تسبيح)ماناى پاك ڕاگرتن دەبەخشێت، كەواتە هەر هەموو ئەو مەخلوقاتانەى لە ئاسمانەكان و زەويدان خواى گەورە لە هەر كەم و كورتى و عەيبێك پاك ڕادەگرن، بە تايبەت لەو ڕێباوەڕە ناشيرين و پووچە، چونكە كە هەر هەموو ئەوانەى لە ئاسمانەكان و زەوى دابن خواى گەورە لەو ڕێباوەڕە پووچە پاك ڕابگرن، ئەمە بەلگەيە لەسەر ئەوەى ئەم مەخلوقاتانە بەجيان و غەيرى خواى گەورەن، چونكە تەسبيحاتى خوا دەكەن و، لە هەر باتل و پووچيەك بە دورى دەگرن، كەوا بوو ئەوان خودى خواى گەورە نين، بەلكو ئەوان بەجيان مەخلوقاتن و خواى گەورەش خولقێنەرە.

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢) هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ(٣)﴾[1] [الحديد: ٢_٣] **واتە: هەر بۆ ئەوە دەسەڵات و خاوەندانێتی ئاسمانەکان و زەوی دەژێنێ دەمرێنێ** ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ **وە ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە هەر ئەوە یەکەمین و دواهەمین وە دیارو نادیار وە ئەو بەهەموو شتێك ئاگایە.**

---

**(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ **هەر بۆ ئەوە دەسەڵات و خاوەنداریەتی ئاسمانەکان و زەوی، ئەو زاتە خاوەنی ئەو شتانەیە، وە خوای گەورە خودی ئەو شتانە نییە، هەرگیز ناشێت خاوەنەکە و موڵکەکە یەك شتبن، بە دڵنیایی جیاکارییان لە نێواندایە، هەر بۆ خوای گەورەیە دەسەڵات و خاوەنێتی ئاسمانەکان و زەوی، کەوابوو ئاسمانەکان و زەوی و هەرچیان تێدایە غەیری خوای گەورەن،** ﴿يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ **وە خوایەکە دەژێنێ و دەمرێنێ، خوای گەورە ژیان بەمەخلوقات دەدات، ژیانی گەشەکردنی ڕووەکەکان و درەختەکان، ژیانی جوڵانەوەی زیندەوەرەکان، خوای گەورەیە کە ژیانیان پێ دەبەخشێت، پاشان دەیانمرێنێت، ئەم ژیانەیان لێدەکێشێتەوە، ئیتر دەمرن، خوای گەورە بە تواناو قودرەتی خۆی تەصرووفیان پێوە دەکات، ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە لە نێوان خوڵقێنەرو خوڵقێنراودا جیابوونەوە هەیە،** ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ﴾ **هەر ئەوە یەکەمین و دواهەمین وە دیارو نادیار، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە هیچ شتێکی لەپێشەوە نییە، هیچ شتێکی بە دواوە نییە، هیچ شتێکی لە سەرووە نییە، شتێکی لە**

---------------------------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------------------------

خوارەوە نییە، وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووە، کەوا بوو ئەمە بەڵگەیە لەسەر باتڵ بوون و پووچ بونی (وحدة الوجود)، چونکە ئەگەر ڕێباوەڕەکەیان ڕاست بوایە ئیتر یەکەمین و دواهەمین وە دیارو نادیار نەدەبوو، چونکە هەموو شتێك یەك دەبوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە یەکەمە پێش هەموو شتێك، وە هەموو شتێك دوای ئەوە، ئەو دواهەمینە کە هیچ شتێکی لە دواوە نییە، ئەو دیارە بەسەر هەر هەموو مەخلوقاتەکانیەوە، دیارە بەسەر چ شتێکەوە؟ بەسەر مەخلوقاتەکانی خۆیەوە، ئەوە نادیارە کە هیچ شتێکی لێ پەنهان نابێت، چ لە زەویدا بێت یان لە ئاسمانەکاندا بێت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر پووچ بونی ڕێباوەڕی (وحدة الوجود)، چونکە ئەگەر بەپێی قسەی ئەوان بوایە چیتر یەکەمین و دواهەمین وە دیارو نادیار نە دەبوو، چونکە هەر هەموو شتەکان یەك دەبوون، یەك شت. ئەم ناوانەش هاو بەرامبەرن چونکە (الظَّاهِرُ) بەرامبەرەکەی (الْبَاطِنُ)ە، (الْأَوَّلُ) بەرامبەرەکەی (الآخِر)ە.

هەر لەسەر ئەم بابەت ڕەت دانەوەی بیرو بۆچوون و عەقیدەی (وحدە الوجود) ئەو فەرموودەیە هاتووە لە (صحیح) مسلم پێغەمبەر خوا ﷺ لە یەکێ لە پاڕانەوەکانی دەیفەرمووێ: ((اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ))[1] صحيح: أخرجه مسلم (٢٧١٣)، من حديث أبي هُريرة ﷺ مرفوعاً.

خوایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و پەروەردگاری عەرشی گەورە، پەروەردگارمان و پەروەردگاری هەموو شتێك، تەقێنەری تۆوی دانەوێڵەو ناوك، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنا دەگرم بەتۆ لە خراپەی هەموو شتێك ی ناوچاوان و نسیبی بەدەستی تۆیە، خوایە تۆ یەکەمینی کە هیچ شتێکت لە پێشەوەو لەگەڵتدا نییە، تۆ دوایەمینی کە دەمێنیتەوە بە هەتا هەتایی پاش لە ناوچونی هەموو شتێك، تۆ بەرزو بڵندی بەسەر هەموو شتێکدا کە هیچ شتێك لە تۆ بەرزو بڵند تر نییە، تۆ بەئاگای بەهەر هەموو نهێنیەکان و دەروونەکان و شاراوەکان و تۆ پەنهانی لە مەخلوقاتت هیچ کەس درك بەزاتی تۆ ناکات لەگەڵ کاملێتی بەرزو بڵندیت دا، سا قەرزاریمان بۆ بدەرەوەو دەوڵەمەندمان بکە لە هەژاری.

---

(١)_ بەڵێ، ئەم فەرموودە (صحيح)ەو ئایەتەکەی پێشەوە تەفسیر دەکات ﴿الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ﴾ )[الحديد: ٣]، چونکە مانای (الْأَوَّلُ) ئەوەیە کە هیچ شتێکی لە پێشەوەو لەگەڵیدا نییە، مانای (وَالْآخِرُ)یش ئەوەیە کە دوایەمینە کە دەمێنیتەوە بە هەتا هەتایی پاش لە ناوچونی هەموو شتێك، مانای (وَالظَّاهِرُ)یش واتە: بەرزو بڵندی بەسەر هەموو شتێکدا کە هیچ شتێك لە تۆ بەرزو بڵندتر نییە، مانای (وَالْبَاطِنُ) واتە: بەئاگایە بەهەر هەموو نهێنی و دەروون و شاراوەکان و تۆ پەنهانی لە مەخلوقاتت، ئەم فەرموودە بە ڕوونی ئایەتەکەی پێشوو تەفسیر دەکات، بۆیە ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە نێوان خولقێنەرو خولقێنراودا جیاکاریی هەیە، نەك وەکو ئەوەی ئەهلی (وحدة الوجود) بانگەشەی بۆ دەکەن.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[1] [الحديد: ٤] واتە: (خوا) ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە لە شەش ڕۆژدا پاشان بەرزبویەوە سەر عەرش و قەراری گرت (باوەڕمان پێیەتی بەو شێوەی شیاوی خوا بێ) دەزانێت چی دەچێتە ناوی زەوی وەچی لێدێتەدەرەوە وەچی لە ئاسمانەوە دێتەخوار وەچی بۆ سەردەکەوێ وە لە هەر کوێ بن خوا لە گەڵتانە (بە زانیاری و ئاگاداری) وە خوا بینایە بەهەرچی کە دەیکەن.

---

(١)_ ئەم ئایەتانە لە سەرەتاکانی سوڕەتی (الحديد)ە، ﴿خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە، دروستی کردوون لەگەڵ هەر هەموو ئەو شتانەی کە تیایدایەتی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر جیاکاریی نێوان خولقێنەرو خولقێنراو، کە خوای گەورە خولقێنەرەو هەموو شتێك جگە لەو زاتە خولقێنراوە، ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ لە شەش ڕۆژدا، یەکەم ڕۆژەکەی یەکشەممە، کۆتا ڕۆژەکەشی هەینییە، لەشەش ڕۆژدا هەموو شتێکی خولقاند، لە هێندێ فەرموودەدا هاتووە کە خوای گەورە لەڕۆژی یەکشەممدا ئەوەی خولقاندوەو، لەو ڕۆژەدا ئەوەو... هتد، هەروەها لە ئایەتی تریشدا خوای گەورە بە وردی تەفسیری چۆنیەتی هەستانی بە خولقاندنی ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا باس دەکات، لەو بارەوە خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ (١٠) ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ اِئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ (١١) فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ (١٢)﴾[فصلت: ٩_١٢]

واتە: بلّێ: ئاخۆ بە ڕاستی ئێوە باوەڕتان بەو زاتە نییە؟ کە زەوی لە دوو ڕۆژدا دروست کردووە وە هاوبەشانی بۆ دادەنێن هەر ئەوە پەروەردگاری جیهانیان وە لە سەر زەویدا شاخی زۆری داناوە وە پیت و فڕی تێخستووە وە بژێوی (هەموو گیانداریێکی) لە زەویدا دیاری کرد لە ماوەی چوار ڕۆژدا بە یەکسانی بۆ گشت داواکاران.

لەم دوو ئایەتەدا خوای گەورە بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە زەوی لە دوو ڕۆژدا دروست کردووە، وە هەر هەموو ئەو شتانەش کە لەسەر زەویدان لە دوو ڕۆژدا دیاری کردووە، ئەمە بو بە چوار ڕۆژ.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾ لە پاشان ڕووی کردە ئاسمان لە کاتێکدا کە دوکەڵ بوو ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا﴾ ئەنجا بە ئاسمان و زەوی فەرموو: وەرن ﴿طَوْعًا أَوْ كَرْهًا﴾ بە ویستی خۆتان یا بە ناچاری (بێنە ژێر فەرمانم) ﴿قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ هەر دووکیان گوتیان بە ویستی خۆمان هاتین ﴿فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ﴾ ئەوسا حەوت ئاسمانی لە دوو ڕۆژ دا دروست کرد.

لێرەشدا خوای گەورە بۆی ڕوونکردوینەتەوە کە حەوت ئاسمانەکانی بە دوو ڕۆژ دروست کردووە، واتە ئەگەر چوار ڕۆژەکەی سەرەوە لەگەڵ ئەم دوو ڕۆژەدا کۆبکەینەوە یەکسان دەبێت بە شەش ڕۆژ، ئەمە بوو وردەکاری ئەوەی کە لە ئایەتەکانی سەرەوەدا بەشێوەیەکی گشتی باسکراوە. خوای گەورە لەتوانایدابە بەساتێکی کەم دروستیان بکات، بەڵام لە شەش ڕۆژدا دروستی کردوون لەبەر دانایی و حیکمەتێکی ئیلاهی. پاشان خوای گەورە لە ئایەتەکانی سەرەوەدا دەفەرموێ: ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ لە شەش ڕۆژدا پاشان بەرزبویەوە سەر عەرش و

-----------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------------

قەراری گرت، عەرشیش گەورەترین مەخلوقات و بەدیهێنراوەکانی خوای گەورەیە، وە بەرزترینی هەموو بەدیهێنراوەکانە کە لەسەرووی هەر هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکانەوەیە، وەخوای گەورە لەسەر عەرش بەرز بۆتەوەو قەراری گرتووە، لەگەڵ بەرز بونەوەشیدا لەسەر عەرش هیچ شتێکی لێ پەنهان نابێت، چ لە ژێرەوەی دەریاکاندا بێت یان لە هەر شوێنێکی تردا بێت، ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ﴾ دەزانێت چی دەچێتە نێو زەوی ﴿وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ وەچی لێدێتە دەرەوە، لە مردووەکان و، عەمار کراوەکان و، ڕووەکەکان و، کانزاکان، وە زاناشە بە هەر شتێك لەئاسمان بێتە خوارەوە، وەکو ئاو و، باران و، فریشتەکان و، ڕۆزیەکان، ﴿وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ وەچی بۆ سەردەکەوێت، خوای گەورە زانایە بە هەر هەموو ئەو کردەوانەی بۆی بەرز دەبێتەوە، هەر هەموو کردەوەکانی نەوەی ئادەمی بۆ بەرز دەبێتەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر بەرز بوون و بڵند بوونی خوای گەورە، پاشان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ﴾ وە لە هەر کوێ بن خوا لە گەڵتانە، بە زانیاری و ئاگاداری، ئەی خەڵکینە، ئیمانداران و کافران خواتان لەگەڵە، ئەمە لەگەڵ بوونی گشتیە (المعية العامة)، لەگەڵتانە بەزانیاری و بە ئاگاداری، هەرچەند لەسەر عەرشیشە، ئەو لەگەڵتانەو لێی وون نابن، لەهەر شوێنێکبن، خواتان لەگەڵە، لەزانینی ئەو ناچنە دەرەوە، لە هەر شوێنێکبن دەتانبینێت، ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە خوا بینایە بەهەرچی کە دەیکەن، کردەوکانی ئێوەی لێ پەنهان نابێت، دەیانبینێت لە کاتێکدا کە لەسەر عەرشە، ئەم لەگەڵ بوونە لەگەڵ بوونێکی گشتییە (معية عامة) بۆ هەر هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان، ئەم لە گەڵبوونە گشتیە مانای ئاگادار بوون دەبەخشێت، واتە خوامان لە گەڵدایە بە زانین و بە ئاگاداری خۆی، ئەم لە گەڵبوونە گشتییە مانای تێکەڵ بوون نابەخشێت، وەکو ئەوەی حلولیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

لێرەدا خوای گەورە ئەوەی بۆ ڕوون کردوینەتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی ـ لە جێگەیەکی تریشـدا: ﴿وَمَا بَيْنَهُمَا﴾(١) [المائدة:١٧] واتـە: وە هـەر چـی وا لـە نێوانیانـدا ـ خـولقێنراو و بـەدیهێنراوی خـوان و تەسـبیحاتی ئـەو دەکـەن و، پـاکی ڕادەگرن، وە خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە هەموو شتێك دەزانێت.

لێرەدا جێگەی ئاماژەپێدانە کە دەفەرمووێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾[الحديد: ٤] لە زمانی عەرەبدا مانای ئەوە نابەخشێت کە یەکێك لە شتەکان تێکەڵ بەویتر بێت(٢)

---

(١)ـ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ [المائدة:١٧] واتـە: وە هـەر بـۆ خوایـە خاوەنـداریتی ئاسمانـەکان و زەوی وە هەرچی وا لـە نێوانیانـدا دروسـت دەکـاو دایـدێنێ هەرچـی بیـەوێ. واتـە هـەر هـەموو شتەکانی نێوان ئاسمان و زەوی خولقاندووە، وەکو جەوو، باڵندەو، گیانلەبەرانی ترو، هەموو شتێکی تر و، هەورەکان و هیچ شتێکی لێ پەنهان نابێت.

(٢)ـ ئەمە بەر پەرچدانەوەی ئـەو کەسانەیە کـە تـەئویل دەکـەن تـەئویل ـ بە دەرخستنی یەکێك و، بە ئێمـە دەڵـێن: ئێـوە تـەئویل لـە ئیحتیمـالاتی وشـەیەکە یان ڕستەیەکە بەوادانان و بۆچونی کەسێك ـ قەدەغە دەکـەن و، خۆشـتان تـەئویلی ئـەم ئایەتەتان کردووە، لە کاتێکدا مانا ڕواڵەتیەکـەی ئەوەیـە کـە تێکـەڵ بـە ئێمـە بـووە، چونکە وشەی (معكم) مانای تێکـەڵ بـوون دەبەخشـێت، کەچـی ئێـوە دەڵـێن: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾ واتە خوامان لەگەڵدایە بە زانـین و بـە ئاگـاداری خـۆی، بـەڵام وشـەی (معكم) واتە: خوامان لەگەڵ دایە بەزات و خودی خۆی ـ پاك و بێگەردی بۆ خـوای گـەورە ـ بـە ئێمـە دەڵـێن: ئێـوە تـەئویل قەدەغـە دەکـەن و، خۆشـتان تـەئویل دەکـەن، شیخولئیسلام ـ ڕەحمەتی خـوا لێ بێـت ـ دەڵێت: بۆچـونی ئـەوان هەڵەیـە، چونکە مانای (معكم) لە زمانی عەرەبیدا بە تێکەڵ بوونەوە سنووردار نـەکراوە، بـەڵکو (مَعِية) لەگەڵ بوون چەند مانایەکی هەیەو، تەنها بە تێکەڵاوبونەوە سنوردار نەکراوە، ئەو

---

---

---

بۆچونە بۆ تەئویل کردنی مانای (معکم) تەنها بۆچونی ئێوەیە ئەگینا (معکم) چەندین مانای هەیە بەگوێرەی هاتنی لە ڕستەکانی زمانی عەرەبدا، بۆ نموونە عەرەب دەڵێن: (ما زِلنا نسير والقمرُ مَعَنا) واتە بەردەوام ڕێدەکەین و مانگیشمان لەگەڵدایە، واتە: نورو ڕوناکیەکەیمان لەگەڵدایە، وەکو ئەوەی مانگ لە هەموو شوێنێکدا بێت، چونکە هەر هەموو خەڵکی سەر زەوی دەیبینن، هەموویان دەیبینن و، دەڵێن: ئەمە مانگەو لای ئێمەیە، لە کاتێکدا مانگ تەنها خولقێنراو و دروستکراوێکەو هیچی تر، ئەی خوای گەورە دەبێت چۆن بێت؟ ئەم (مَعية)ە لەگەڵ بوونە چەندین مانای هەیە، لێرەشدا واتە زاناو ئاگادارە بە هەر هەموو بەندکران و کردەوەکانیان، وە لە ماناکانی تریشی تێکەڵ بوون و بەراوردە، بەڵام لێرەدا ئەم مانایە مەبەست نییە، کەوا بوو سنوردارکردنی مانای (مَعَ) بە تێکەڵ بوونەوە هەڵەیە، بۆ نموونە کە دەڵێت: (فلانٌ مَعي) ئایا ماقوڵە مەبەستت ئەوە بێت کە فڵان کەس لەگەڵم تێکەڵ بووە؟ کەواتە ماناکانی (مَعَ) بەپێی هاتنی لە ڕستەی عەرەبیدا، بۆ نموونە دەڵێت: دەڵێت: (فلان معي) واتە هاوەڵێتیم دەکات و لەگەڵمدا ڕێدەکات، دەڵێت: (اللهُ مَعنا) واتە: ئاگادارمانە بە زانینی، کەوا بوو چەندین مانای هەیە بەپێی ڕستەکە، ئەمە تەئویل نییە بەڵکو تەفسیر کردنی مانای مەبەستە.

وەکو ئـەوەی خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾(١) [التوبة: ١١٩] واتە: خۆتان بپارێزن لە (تۆڵـەی)خوا وە لـە گـەڵ ڕاسـتگۆیاندا بـن و لـە ریزی ئەوان دابن.

---

(١)_ ئایا ئەمە ئەو مانایە دەبەخشێت کە تۆ بچیت و لـە جێگەیـەك کـە کۆمـەڵێك پیاوچـاکان و ڕاسـتگۆیانی تێـدا بێـت بمێنیتـەوە، نـەخێر، لـە بـیرو بـاوەڕدا، لـە خۆشەویستیدا، لە ئاییندا لەگەڵیان دابن، تەنانەت لەو بـارەو ئەگـەر تـۆ لـە ڕۆژهـەڵات بیت و ئەوانیش لە ڕۆژئاوا بن تۆ هەر لەگەڵ ئەوانی، تۆ لەگەڵ ڕاسـتگۆیاندای لـە هـەر شوێنێك بن، ئەم لەگەڵ بوونە مانای تێکەڵاو بوون بە یەکتر نابەخشێت، بـەڵکو مانای یاوەری و هاوەڵ دەبەخشێت، ئەگەر ئەمە مانای لەگەڵ بوون بێت لە نێوان خەڵکیدا، ئەی لەگەڵ خوای گەورەدا دەبێت چۆن بێت، ئایا کەسی ژیرەکانی عاقـڵ دەبێت بەو جـۆرە بـیر بکاتـەوە کـە لەگـەڵ ڕاسـتگۆیاندا نابێـت مەگـەر یاوەریـان بێـت و بەتەنیشـتیانەوە بێـت؟ نـەخێر، تـۆ لـە بـوار بیروبـاوەڕو، خۆشەویسـتی و، ئـایین و، سەرخستن و، پشتگیری کردندا لەگەڵ ڕاسـتگۆیاندای ئەگـەر چـی تـۆ لـە ڕۆژهـەڵات و ئەوان لە ڕۆژئاوا بن.

فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ﴾(١) [الفتح: ٢٩] واتە: موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە ئەو (باوەڕدار)انەش کە لە گەڵیدان بەرامبەر بێباوەڕان توندو تیژن .

وە فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا مِن بَعْدُ وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا مَعَكُمْ فَأُولَئِكَ مِنكُمْ﴾(٢) [الأنفال: ٢٩] واتە: وە ئەوانەی لە دواییدا بڕوایان هێنا و کۆچیان کرد و لە گەڵ ئێوەدا تێکۆشان ئا ئەوانە لە ئێوەن .

---

(١)_ ئەم ئایەتە بەڕوونی تێکەڵنەبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بەهاوەڵانی بەدەر دەخات، چونکە لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ وە هاوەڵانیدا جیاکاریی هەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ مَعَهُ﴾ ئەو باوەڕدارانەش کە لەگەڵیدان و پەیڕەوی ڕێبازو پەیامەکەی ئەو دەکەن، چ ئەو ئەو هاوەڵانەی لەسەردەمی خۆدا لەگەڵیدا بوون یان ئەوانەی لە سەردەمەکانی دواتر دا شوێنی دەکەون تاوەکو ڕوودانی قیامەت، ﴿أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾ بەرامبەر بێباوەڕان توندوتیژن و لە نێوان خۆیاندا بەبەزەیین، ئەوەیە سیفاتی ئەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەری خوایە ﷺ لە هەر کاتێکدا، تایبەت نییە تەنها بەوانەی لەگەڵی دابوون و، بەتەنیشتیەوە دەژیان و، لەگەڵیدا ڕێیان دەکرد، بەڵکو لە هەر شوێنێك و، لە هەر زەمەنێکدا ئەوانەی شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەون ئەوە سیفاتیانە، شتەکە تەنها بە هاوەڵانیەوە تایبەت نییە، بەڵکو گشتیە لەهەموو ئیمانداراندا تاکۆتایی دونیا.

(٢)_ هەروەها مانای ئەم ئایەتەش دیسان تایبەت نییە بەو کەسانەوە کە لە کاتی دابەزینی قورئاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بوون ﷺ بەڵکو هەموان کە لەپاش ئەوانەوە دێن دەگرێتەوە تاوەکو ڕۆژی قیامەت، چونکە ئیمانداران هێندێکیان لەگەڵ هێندێکی تریاندان.

وشەی (مَعَ) بە واتای لەگەڵ بوون، لە قورئانی پیرۆزدا بە(عام) گشتی و (خاصة) تایبەت هاتووە[1]،

---

(١)_ واژەی (مَعَ) بە واتای لەگەڵ بوون لە قورئانی پیرۆزدا بە (عامة) گشتی هاتووە وەکو ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ﴾ چپەی هیچ سێ کەسێك نییە کە خوا چوارەمیان نەبێ وە چپەی هیچ پێنج کەسێك نییە کە ئەو شەشەمیان نەبێت وە نە کەمتر لەو ژمارەو نە زۆرتر نییە مەگەر خوایان لە گەڵ دایە بەزانیاری و ئاگاداری، ئەمە لەگەڵبونێکی گشتیی خوای گەورە بۆ هەر هەموو ئیمانداران و کافران، بە واتای خوای گەورە کردەوەکانیان دەژمێرێت، دەیانبینێت، زانیاری پێیان هەیە، گوێبیستی قسەکانیان دەبێت، ئەو لەگەڵ هەموواندایە، ئەمەیە لەگەڵ بوونی گشتی خوای گەورە. هەروەها لەگەڵ بونێکی دیکەی خوای گەورە هەیە کە لەگەڵ بوونی (خاصة) تایبەتە کە تەنها بە ئیماندارانەوە تایبەت کراوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾[النحل: ١٢٨] واتە: بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە (لە تاوان) هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارن. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾[طه: ٤٦] واتە: (خوا) فەرمووی مەترسن بە ڕاستی من لە گەڵتانام دەبیستم و دەبینم، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾[التوبة: ١٢٣] واتە: وە بزانن بێگومان خوا لە گەڵ پارێزکاراندایە.

نموونەی (عام) گشتی لەو ئایەتەی سەرەوەو لەئایەتەکەی سورەتی (المجادلة)شدا هاتووە: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَى مِن ذَلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾[1] [المجادلة: ٧].

لەم ئایەتەدا خوای گەورە فەرمایشتەکەی خۆی بە(العلم) زانین دەستپێکردووە، وە بە(العلم) زانینیش کۆتایی پێهێناوە، بۆیە پێشەوایان ئیبن وعەبباس و، ئەلضحاك و، سوفیای سەوری و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموویانە: خوایان لەگەڵدایە بە زانین.

بەڵام نموونە بۆ (المعية الخاصة) لەگەڵ بوونی تایبەت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾[2] [النحل: ١٢٨] واتە: بە ڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە (لە تاوان) هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارن.

---

(١)_ ئەم لەگەڵ بوونە گشتیە (مَعية عامة)، پێشەوایان ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و کەسانی دیکەی جگە لەویش دەفەرموون: خوای گەورە ئایەتەکەی بە زانین (العلم) دەستپێکردوە ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾، هەروەها بەزانینیش (العلم) کۆتایی پێهێناوە ﴿إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾، کەواتە ئەمە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەم لەگەڵبوونە لەگەڵ بوونی زانینە نەك لەگەڵ بوونی تێکەڵ بوون.

(٢)_ واتە خوای گەورەیان لەگەڵدایە بەپشتگیری کردن و، پاراستن و، سەرخستنیان، کەوا بوو ئەمە لەگەڵبونێکی تایبەتە (المعية الخاصة).

هەروەها خوای گەورە بە مووسا _ علیه السلام_ دەفەرمووێ: ﴿قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾[١] [طه: ٤٦] واتە: ﴿قَالَ لَا تَخَافَا﴾ (خوا) فەرمووی مەترسن بە ڕاستی من لە گەڵتانام دەبیستم و دەبینم.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾[٢] [التوبة: ٤٠] واتە: ئەو کاتە بە هاوەڵەکەی دەگووت خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە.

---

(١)_ کاتێک مووسا و هاڕوون فەرموویان: ﴿رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَى﴾[طه: ٤٥] ئەی پەروەردگارمان بە ڕاستی ئێمە دەترسین ﴿أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا﴾ دەستدرێژی بکاتە سەرمان پێش ئەوەی ئێمە هیچ بڵێین ﴿أَوْ أَن يَطْغَى﴾ یان زیاتر یاخی و سەرکەش ببێت. ئەو کاتە خوای گەورە پێی فەرموون: ﴿قَالَ لَا تَخَافَا﴾ مەترسن، بۆچی؟ چونکە فەرمووی: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ بە ڕاستی من لە گەڵتانام دەبیستم و دەبینم. کەواتە خوای گەورە تێکەڵیان نەبوو، بەڵکو بە بیستن و بینین ئاگاداری دەکردن. ئەمە لەگەڵبونێکی تایبەتە (المعية الخاصة)، وە هەر کەسێك خوای لەگەڵ دابێت لەهیچ مەخلوقاتێك ترسی نابێت.

(٢)_ لە ئەشکەوتەکە دا کاتێ کە هاوەڵپەرستانیان پێگەیشت و لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا وەستان پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوبەکری هاوەڵی دەفەرمووێ: ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە، ئەم لەگەڵ بوونە مانای ئەوە نەبوو خوای گەورە تێکەڵیان بێت بەڵکو لەگەڵیاندا بوو بەسەرخستنی، ئەوەبوو بێباوەڕان گەڕانەوەو نەیانبینین، چونکە خوای گەورە لە ئاستی ئەواندا نابینای کردن. ئا ئەمە بوو ماناکانی لەگەڵ بوون (المعية).

خوای گەورە لەگەڵ مووساو هاڕوندایە، نەك فیرعەون[١]، لەگەڵ موحەممەد ﷺ و هاوەڵەکەیدایە، نەك ئەبو جەهل و دوژمنانی دیکەی[٢] لەگەڵ ئەوانەدایە کە خۆیان پاراستووە لە تاوان وە ئەوانەش کە چاکە کارن.

---

(١)_ لەگەڵ فیرعەوندایە بە ئاگادار بوون بەڵام لە گەڵیدا نییە بە لەگەڵ بوونی تایبەت (المعیة الخاصة)، بەڵام خوای گەورە لەگەڵ مووسا و هاڕوندایە بە لەگەڵ بوونی تایبەت (المعیة الخاصة)، بەڵام سەبارەت بە لەگەڵ بوونی گشتی ئەوە خوای گەورە لەگەڵ هەموو مەخلوقاتی خۆیدایە فیرعەون و غەیری ئەویش، واتە: ئاگاداریانەو دەزانیت چ دەکەن.

(٢)_ خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکەیدایە بە لەگەڵ بوونی تایبەت (المعیة الخاصة)، نەك ئەبو جەهل و، ئەبو لەهەب و، سەرکردەکانی دیکەی هاوەڵپەرستان کە هەوڵێکی زۆریاندا بۆ ڕێگری کردن لە کۆچ کردنی بۆ مەدینەی پیرۆز، بەڵام لەوەدا بێتوانا بوون چونکە خوایان لەگەڵدا بوو بە لەگەڵ بوونی تایبەت، سەری دەخستن و پشتگیری دەکردن، ئەوەبوو لەنێوانیانەوە دەرچوو بەبێ ئەوەی پێی بزانن و هەستی پێبکەن، تەنانەت چوونە بەر دەرگای ئەو ئەشکەوتەش کە ئەو و هاوەڵەکەی تێدابوو بەڵام نەیانبینین، ئیتر خۆی و هاوەڵەکەی لەئەشکەوتەکە هاتنە دەرەوەو سەفەریان کردو، هاوەڵپەرستان نەیانتوانی پێیان بگەن تاوەکو بە سەلامەتی گەیشتن بە مەدینەی پیرۆز.

نەك ستەمکارە شەڕ فرۆشەکان[١]، ئەگەر مانای (المعيَّة) لەگەڵ بوون ئەوە بوایە کە خوای گەورە بە خودی خۆی لە هەموو شوێنێك دابێت، ئەوا (الخَبَر الخاص) لەگەڵ بوونی تایبەت و (الخَبَر العام) لەگەڵ بوونی گشتی دژ بە یەکتر دەبوون[٢]، بەڵام بەم شێوەیە نییە بەڵکو مانای ئەو (المعيَّة) لەگەڵ بوونە ئەوەیە کە خوای گەورە بەسەرخستن و پشتگیری کردن لەگەڵ ئەو پیاو چاکاندایە نەك ئەوان[٣].

---

(١)_ لەگەڵ ئەوانەدایە کە خۆیان پاراستووە لەتاوان وە ئەوانەش کەچاکەکارن بە لەگەڵ بونێکی تایبەت (المَعية الخاصة) سەریان دەخات و پشتگیریان دەکات چونکە کەسانێکی تەقواکارو چاکە خوازن.

(٢)_ بەڵێ، ئەگەر مانای (المعيَّة) لەگەڵ بوون: بریتی بوایە لەوەی کە خوای گەورە بە خودی خۆی لە هەموو شوێنێکدایە وەکو ئەوەی حلولیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەوا (الخَبَر العام) واتە (المعية العامة) لەگەڵ بونی گشتی کە بریتیە لە ئاگادار بوونی خوای گەورە بە هەموو مەخلوقاتی خۆی لەگەڵ (الخَبَر الخاص) واتە (المعية الخاصة) لە گەڵبوونی تایبەتدا کە بریتیە لە سەرخستن و پشتگیری کردنی ئیمانداران دژ بە یەکتر دەبوون، بۆ نموونە: ئەبو جەهل دەیگوت: خوای گەورە لەگەڵ منیشدایە وەکو چۆن لەگەڵ موحەممەدایە ﷺ، بەڵام پێی دەگوترێت: نەخێر خوای گەورە بە لەگەڵبوونی تایبەت (المعية الخاصة) لەگەڵ موحەممەدایە ﷺ، بەڵام بە لەگەڵ بوونی گشتی (المعية العامة)ە لەگەڵ تۆدایە کەوا بوو هیچ دژ بە یەك بونێك لە ئارادا نییە.

(٣)_ خوای گەورە لەگەڵ ئەو باوەڕدارە ئیماندارە پیاو چاکاندایە بە لەگەڵ بوونی تایبەت (المعية الخاصة) سەریان دەخات و پشتگیریان دەکات، نەك کافرەکان، خوای گەورە لەگەڵ کافراندایە بە لەگەڵ بوونی گشتی (المعية العامة) واتە بە ئاگادار بوون و زانیاری پێ هەبوون زانین. بەسەر خستن و پشتگیری کردن لەگەڵ کافراندا نییە.

وە فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَٰهٌ﴾[1] [الزخرف: ٨٤] واتە: وە ئەو (خوایە) زاتێکە پەرستراوە لە ئاسماندا وە پەرستراوە لە زەویدا. واتە: خوای گەورە پەرستراوی هەموو ئەوانەیە کە لە ئاسمانەدان، وە پەرستراوی هەموو ئەوانەشە کە لە زەویدان.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[2] [الروم: ٢٧] واتە: وە هەر بۆ ئەوە (خوا) سیفەتی هەرە بڵند لە ئاسمانەکان و زەویدا وە هەر ئەوە زاڵی کار دروست.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ﴾ [الأنعام: ٣] واتە: وە تەنها ئەو خوایە (باڵا دەست و پەرستراوە) لە ئاسمانەکان و لە زەویدا. پێشەوایانی زانستی وەکو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و غەیری ئەویش بەو جۆرە تەفسیریان کردووە: کەوا بە تەنها خوای گەورە پەرستراوە لە ئاسمانەکان و لە زەویدا[3].

---

(١)_ لێرە دا شێخولئیسلام _ رحمه الله _ دیسان دەگەڕێتەوە سەر وەڵامدانەوەی هێندێك لەو بەڵگانەی کە کردویانەتە بەهانە بۆ شیاوێتی بیروباوەڕە پووچەکانیان، مانای ئایەتەکە ئەوەنییە کە خوای گەورە بە خودی زاتی خۆی لەئاسمانەکان و زەویدا بێت، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە کە پەرستراوی هەموو ئەو شتانەیە کە لە ئاسماندان و پەرستراوی هەموو ئەو شتانەشە کە لەسەر زەویدان.

(٢)_ ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ﴾ واتە: هەموو سیفاتێکی تەواوی کامڵ تەنها بۆ خوای گەورەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، هیچ کەسێك لە ئەو ناچێت، بەڵکو تەنها خوای گەورەیە کە هەر هەموو سیفاتە کامڵ و تەواوەکانی تێدا کۆ بۆتەوە، لەوەدا هیچ کەسێکی تری لەگەڵدا بەشدار نابێت لەئاسمانەکان و زەویدا، کامڵترین و بەرزترین و جوانترین ناو و سیفاتی هەیە، کە بەهیچ شێوەیەك کەم و کورتی تێدانییە.

(٣)_ واتە بە تەنها خوای گەورە پەرستراوە لە ئاسمانەکاندا، وە بە تەنها خوای گەورە پەرستراوە لە زەویدا، وە ئاسمانەکان و زەمین و هەرچیان تێدایە، موڵك و بەندەی خوای گەورەن و لە ژێر تەصەروفی ئەودان.

پێشینان و پێشەوایانی ئوممەت یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە جودایە لـە مەخلوقاتــەکانی خـۆی (أن الرب تعالى بائن من مخلوقاته)[١] وەسـف دەکرێـت بـەو سـیفەتانەی کـە خـۆی پـێ وەسـف کـردووە، وە بەوانـەش کـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ وەسفی پێکردوون بەبێ گۆڕین (تحريف)[٢]،

---

(١)_ مانـای لەگـەڵ بـوون (المعيَّة) تێکـەڵ بـوون ناگەیـەنێت، چـونکە پێشینان و پێشەوایانی ئوممەت یەك دەنگن لەسەر ئەوەی خوای گـەورە جودایـە لـە مـەخلوقاتی خۆی، لە نێوان خواو مەخلوقاتی خۆیدا جیاوازی جـودایی تـەواو هەیـە، زاتـی خوای گەورە بەشێك نییە لە مەخلوقاتەکانی خۆی، وە مەخلوقاتەکانیشـی بەشـێك نین لە خوای گەورە. دەستەواژەی (بائن من خلقه) بەم لەفزە نەهاتووە، بەڵام مانای ماقوڵی بەڵگـەکان دەیسـەلمێنێت کـە خـوای گـەورە جودایـە لەمەخلوقاتـەکانی خـۆی، ئەمە بەرپەچدانەوەیە بۆ ئەو حولولی و ئیتیحادیانەی کە لەو بـاوەڕەدان کـە خـوای گەورە تێکـەڵ بـە مەخلوقاتـەکانی خـۆی بـووە، مانـای (بائن) واتـە: جـودا لـەهیچ دەقێکدا نەهاتووە، بەڵام ماناکەی لە دەقەکانی قوڕئان و سوونەتەوە وەرگیراوە.

(٢)_ ئەمە یاسایەکە یەك دەنگی هەموو پێشەوایانی لەسەرە بەوەی خوای گەورە وەسـف دەکرێـت بـەو وەفسـانەی کـە خـۆی پـێ وەسـف کـردووە، و بەوانـەش کە پێغەمبەرەکەی وەسفی پێکردوون، لە خۆمانەوە نازناو داناهێنین، کە نە لە قوڕئان نە لە سوونەتدا نەهاتبێت و، بدرێتە پاڵ خوای گەورە، بەڵکو خوای گەورە لەو شتانە

---------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------

پاك رادەگیرێت، بەو جۆرە وەسف دەكرێت كە نەفسی خۆی پێی وەسف كردووە، و بەوانەی كە پێغەمبەرەكەی وەسفی پێكردوون بەبێ گۆڕین (تَحريف)، بەڵكو پێویستە لەسەر هەمان ماناكانی خۆیان بن، واتە: دەستكاری ناكرێت بە جۆرێك لەماناكەی بچێتە دەرەوە، بۆ نموونە: بگوترێت: مەبەست لە دەست(يد) لە دەقەكانی قورئان و سوننەت واتە: نیعمەتە، هەروەها بە تووڕە بوون واتە: ویستی تۆڵەسەندنە، مەبەست بە ڕەحمەت ویستی بەهرەو نیعمەت بەسەرا ڕژاندنە، ئەمە گۆڕینی مانای وشەكەیە لە مانا ئاشكراكەی خۆی، بەڵكو وشەكە لەسەر مانا ئاشكراكەی خۆی دەهێڵرێتەوە بەبێ گۆڕین (تَحريف)، (تَحريف)یش دوو بەشە، یەكەم: لەمانادا ئەگەر مانای وشەكە تەفسیر كرا بە مانایەكی تری دوور لە ماناكەی خۆی. دووەم: لە بێژە (لفظە)ەكەدا ئەگەر پیتێك بۆ وشەكە زیاد كرا یان پیتێكی لێ كەم كرایەوە، بۆ نموونە ئەشعەریەكان بە وشەی (أستوى) بەرزبویەوەو قەراری گرت، دەڵێن: (إستولى) دەستی بەسەر داگرت، ئەو (لام)ە زیادەو لە قورئان و سووننەت دا نەهاتووە.

بەبێ پەکخستن (تعطيل)، بەبێ چۆنیەتی (تکييف)، بەبێ وێکچوواندن (التمثيل)، خوای گەورە بە سیفاتی کەماڵ وەسف دەکرێت، نەك سیفاتی کەم و کورتی[1]، وە بزانرێت کە هیچ شتێك بە وێنەی ئەو نییە، لە سیفاتی تەواو و کەماڵدا[2] وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)﴾[3] [الإخلاص: ١ـ٤] واتە: بڵێ: ئەوە، خوای تاك و تەنیا ئەو خوایەی بێ نیازو جێی نازو ئومێدە کەسی لێنەبوەو لە کەس نەبووە وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوەو هاوتای نییە.

---

(١)ـ بەڵێ، خوای گەورە بە بەردەوامی و هەمیشەیی بە سیفاتی تەواوی و کەماڵ وەســـف دەکرێـــت، لـــەم بـــارەوە خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێ: ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ [الروم: ٢٧]و هەر بۆ خوایە سیفەتی هەرە بڵند لە ئاسمانەکان و زەویدا و هەر ئەوە زاڵی کار دروست. پاك ڕادەگیرێت لە هەر هەموو سیفاتەکانی کەم و کورتی وەکو وەنەوزدان و، نووستن و، منداڵ و، مردن و، بیرچونەوەو...هتد لەو سیفاتە کەم و کورتیانە.

(٢)ـ هیچ یەکێك لەخوای گەورە ناچێت (لا يُشابه الله أحد)، هاوشێوەی نییە (لا مِثل له)، هاوتای نییە(لا نِدَّ له)، هاو وێنەی نییە (لا نظير له) هاوشانی نییە.

(٣)ـ کـاتێ هاوەڵپەرسـتانی بەپێغەمبـەری خوایـان ﷺ گـوت: وەسـفی پەروەردگارتمان بۆ بکە، ئەوەی تۆ بانگی ئێمە دەکەی بۆ پەرستنی و وازهێنان لە پەرستنی جگە لەو، وەسفیمان بۆبکە، ئەو جا خوای گەورە ئەم سوڕەتەی ناردە خوارەوە ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)﴾[الإخلاص: ١ـ٤] ئەمەیە سیفەتی ڕەحمان.

پێشەوا ئیبنوعەباس دەڵێت: ﴿الصَّمَدُ﴾[1]: (عالم) زانا کە تەواو کامڵ بووە لە زانینەکەیدا، مەزن کە تەواو کامڵ بووە لە مەزنیەکەیدا، بە توانا کە تەواو کامڵ بووە لە تواناکەیدا، دانا کە تەواو کامڵ بووە لە داناییەکەیدا، فەرمانڕەوا کە تەواو کامڵ بووە لە فەرمانڕەواییەکەیدا.

وە ئیبن و مەسعودو غەیری ئەویش دەڵێن: ﴿الصَّمَدُ﴾: ئەو زاتەیە کە کلۆریی و بۆشیی نییە (هو الذي لا جوف له)، وە (الأحد)یش: واتە: ئەوەی کە هاوتای نییە.

کەوا بوو ناو ﴿الصَّمَدُ﴾ەکەی: هەموو ئەو سیفاتە تەواو و کامڵانەی کە پێوەی ناسراون، لەگەڵ بە دوور گرتنی لە هەموو کەم و کورتیەکان لە خۆ دەگرێت. وە ناوە (الأحد)ەکەشی: ئەو مانایە لەخۆدەگرێت کە هیچ هاوشێوەیەکی نییە.

لە تەفسیرکردنی ئەم سورەتەدا زیاتر درێژەشمان بە باسەکەمان داوەو، بەوەی کە پاداشتی خوێندنی یەکسانە بەسێ یەکی قورئان[2].

---

(١)_ ﴿الصَّمَدُ﴾ واتە: تەواو و کامڵ لە هەر سیفاتێکی تەواوەتی و کامڵیدا، لە گەورەییدا، لە ناو و سیفاتەکانیدا، تەواو و کامڵ لە هەموو ڕوویەکەوە، هەموو ئەوانەش بە تەنها بۆ خوای گەورەیە. لە ماناکانی ﴿الصَّمَدُ﴾ ئەوەیە کە مەخلوقات بۆ بە هاناوە هاتن و جێبەجێکردنی پێویستیەکانیان ڕووی تێدەکەن، هەر هەموو مەخلوقاتیش ڕوو لە خوای گەورە دەکەن بۆ ئەوەی پێویستیەکانیان بۆ دابین بکات، هەروەها تەفسیرکراوە بەوەی کە کلۆرو ناوبۆشی نییە. کەوا بوو چەند مانایەکی هەیە.

(٢)_ شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوای لێ بێ _ نامیلکەیەکی هەیە بە ناوی (جواب أهل العلم والإيمان أن قل هو الله أحد تعدل ثلث القرآن) چاپ کراوەو لە بەردەستایە، لە(مجموع الفتاوى)شدا هەیە.

# بەشێك

## سەبارەت بەئاڵۆز بوون و تێكەڵبوونی مانای حەقیقەتە ئەمریە شەرعیەكان بەحەقیقەتە خەلقیە قەدەریە كەونیەكان

زۆرێك لە خەڵكی حەقیقەتە ئەمریە شەرعیەكان و حەقیقەتە خەلقیە قەدەریە كەونیەكانیان بە لاوە پەنهان دەبێ و سەری لێدەرناكەن و تێكەڵ بە یەكتری دەكەن[1]،

---

(١)_ مەسەلەی جیاوازی كردن لە نێوان شەرع و قەدەردا، ئەمری شەرعی و ئەمری قەدەری، كەسانێك دەڵێن: جگە لە ئەمری كەونی قەدەری هیچی تر نییە، ئەمری شەرعی بوونی نییە بەڵام ئەم كەسانی ئەهلی گومڕایین، لە بەرامبەریشدا كەسانێكی دیكە دەڵێن: جگە لە ئەمری شەرعی هیچی تر نییە، ئەمری قەدەری بوونی نییە. بەڵام ئەهلی سوونەت و جەماعەت دەڵێن: ئەمری شەرعی و ئەمەری كەونی (قەدەرەیش) هەن، بەو بەڵگەیەی كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ﴾ [الأعراف: ٥٤] واتە: بێداربن كە بەدیهێنان و فەرماندان هەر بۆ خوایە، ﴿الأَمْرُ﴾ واتە: فەرماندان بریتیە لە ئەوی شەرع، هەروەها ﴿الْخَلْقُ﴾یش بەدیهێنان بریتیە لە قەزاو قەدەر (ئەمری كەونی، قەدەری)، كەوا بوو هەر دوكیان هەن و جیاوازییان لە نێواندایە. بەڵام بەلای كەسانێكی زۆرەوە پەنهایەو سەری لێدەر ناكەن، بۆیە دەڵێن: بە هەر حاڵ ئێمە گوێڕایەڵی خواین، چونكە خوا بۆی تەقدیر كردوین و ئێمەش بە گوێرەی قەدەرەكەی ئەو كردار دەكەین و، ئەمەشە گوێڕایەڵی، دەڵێن: چونكە گوێڕایەڵی و تاعەت سازیاربوونە لەگەڵ قەدەردا، بەڵام ئەمە قسەیەكی پووچە، چونكە لە ڕاستیدا گوێڕایەڵی و تاعەت تەنها سازیار بوونە لەگەڵ شەرعدا نەك لەگەڵ قەدەردا.

گەواتە بابزانن (الأَمْرُ) فەرماندان و (الْخَلْقُ) بەدیهێنان بۆ خوای گەورەیە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ[1]

---

(١)_ ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي﴾ بە ڕاستی پەروەردگارتان ئەو خوایەیە، پەرستراوتان و خاوەنتان و خولقێنەرتان تەنها خوایەو هیچ کەسێکی تری لەگەڵدا بەشدار نابێت، بەو بەڵگەیەی کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ﴾ کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە پاشان خوا بەرز بووە سەر عەرش و قەراری گرت بەتاریکایی شەو ڕۆشنایی ڕۆژ دادەپۆشێ وە بە پێچەوانەشەوە، بە دواییەکدا ئەمە دەچێت و ئەو دێت بە بەردەوامی بەسەر ئەم گەردونەدا بە دوای یەکدان، ﴿يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾ ڕۆژ بەشوێن شەوەوەیە بەخێرایی و شەو بەشوێن ڕۆژەوەیە بە خێرایی و بەدوای یەکدان، ﴿وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ﴾ بەفەرمانی خوای گەورە ژێربارکراون و دێن و دەچن بە ڕێکوپێکی بەجوانی بە بێتێ کچوون بەبێ خراپبوونی ئەو سیستەمەی کە خوای گەورە دایناوە.

أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ(١) تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[الأعراف: ٥٤] واتـه: بـه ڕاستی پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکردووە پاشان (خوا) بەرزبووە سەر عەرش و قەراری گرت (ئێمە ئیمانمان پێیەتی بەڵام شێوەکەی نازانین، پرسیار کرا لە ئیمامی مالیك دەربارەی (استواء) فەرمووی: وەستانەکە حەقیقەتەو چۆنیەتیەکەی نەزانراوەو پرسیارکردن دەربارەی بیدعەتەو باوەڕ بوون پێی واجیبە) بە (تاریکایی) شەو (ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێ (بە پێچەوانەشەوە) (ڕۆژ بەشوێن شەوەوەیە بەخێرایی و) شەو بە شوێن ڕۆژەوەیە بە خێرایی خۆرو مانگ و ئەستێرەکان ژێربار کراون بە فەرمانی خۆی بێدار بن کە بەدیهێنان و فەرماندان هەر بۆ خوایە پاك و بێگەردە (لە هەموو کەم و کوڕیەك) خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیان.

---

(١)_ ﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ﴾ بێدارین کە بەدیهێنان و فەرماندان هەر بۆ خوایە، خوای گەورە خولقێنەرە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا فەرماندەداو، قەدغەدەکات و، شەرع دا دەنێت بۆ بەندەکانی خۆی، کەوا بوو لە نێوان خولقاندن و فەرماندانندا جیاوازی هەیە. بە واتایەکی تر خوای گەورە خولقێنەرە، چارەسازە، بەدیهێنەرە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا شەرع دادەنێت، بۆ بەندەکانی خۆی ئەو شەرعە دادەنێت کە لە بەرژەوەندیاندایە.

پاشان شێخولئیسلام ـ ڕەحمەتی خوا لێ بێت ـ مانای ئەو فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ﴾ ڕوون دەکاتەوەو، دەڵێت: خوای گەورە خولقێنەرو، پەروەردگارو، خاوەنی هەموو شتێکە، جگە لە خوای گەورە هیچ خولقێنەرێکی تر نییەو هیچ پەروەردگارێکی تر نییە، ویستیی هەر شتێکی هەبێت دەبێت، ویستی هەر شتێکی شینەبێت نابێت[1]، هەموو شتێکی ئەم گەردوونە جوڵانەوە بێت، یا سرەوتن بێت بە قەرزاو قەدەرو ویست و تواناو خولقاندنی خوای گەورەیە.

ئینجا شێخولئیسلام ـ ڕەحمەتی خوا لێ بێت ـ مانای ﴿وَالْأَمْرُ﴾یش ڕوون دەکاتەوەو، دەڵێت: خوای گەورە فەرمانی داوە بە تاعەت و گوێڕایەڵی خۆی و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی[2]

---

(١)ـ هیچ کەسێك مشتومڕ و کێشمەکێشم لە مەدا دروست ناکات، تەنانەت هاوەڵپەرستانیش کێشمەکێشم لەم بارەوە ناکەن و دانیپێدا دەنێن کە بە تەنها خوای گەورە خولقێنەرە، ڕۆزیدەرە، دەژێنێت، دەمرێنێت، چارەسازە.

(٢)ـ ئەمە مانای ﴿وَالْأَمْرُ﴾ە، خوای گەورە فەرمانیداوە بەندەکانی گوێڕایەڵی بن و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی بن، وە ڕێگری کردووە بەندەکانی سەرپێچ بکەن و سەرپێچی پێغەمبەرەکەی بکەن، ئەمەش لەبەر بەرژەوەندی و کامەرانی بەندەکانێتی، پشتگوێی نەخستوون بەجۆرێك کە نەفەرمان و نەڕێگریی شتێکیان لێ بکرێت، بەڵکو خوای گەورە کتێبەکانی دابەزاندووە، پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ڕێنوێنی کردنیان بەرەو ئەو شتانەی کە لە دونیا و قیامەتدا کامەرانیان دەکات، خوای گەورە بەندەکانیی لەسەر نەفامی و، بێئاگایی و، هەواو ئارەزوواتی خۆیان بەجێ نەهێشتوون، وازی لێنەهێناون هەروەها بەو ئاسان نییە زۆرداران و تاغوتان بەسەریاندا زاڵبن، بەڵکو خوای گەورە لە ڕێگەی پێغەمبەرەکانیەوە شەرعی بۆ دابەزاندوون.

وە قەدەغەی بەندەکانی کردووە سەرپێچی خۆی و سەرپێچی پێغەمبەرەکەی بکەن، فەرمانی داوە بە یەکخواپەرستی و ئیخلاص، وە ڕێگریی کردووە لە هاوبەشدانان بۆ خوا[1].

گەورەترینی چاکەکان یەکخواپەرستیە، گەورەترینی خراپەکانیش هاوەڵپەرستیە[2]،

---

(١)_ لە نێوان شەرع و قەدەردا جیاوازی هەیە، ئەگەر قەدەر بەتەنها بەس بوایە ئەوا خوای زانا و دان کتێبەکانی دانە ئەبەزاندو، پێغەمبەرەکانی نەئەنارد فەرمان و قەدەغەکانی خوای گەورە بەخەڵکی ڕاگەیەنن.

(٢)_ لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا﴾[الأنعام: ١٦٠.] واتە: هەر کەسێك چاکە بکات ئەوە (لە ڕۆژی دوایی دا) دە ئەوەندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە وە هەر کەسێك خراپە بکات ئەوە تۆڵەی لێناسێنرێ تەنها بەوێنەی خۆی نەبێ. هەروەها دەفەرموێ: ﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْهَا وَهُمْ مِنْ فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ ( ٨٩ ) وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ( ٩٠ )﴾[النمل: ٨٩_٩٠.] واتە: هەر کەس کردەوەی چاکی کردبێت، لێرەدا مەبەست ﴿بِالْحَسَنَةِ﴾ واتە: کردەوەی چاك یەکتاپەرستییە (لە ڕۆژی دواییدا) پاداشتی چاکتری لەو (کردەوە) ی بۆ هەیە وە ئەوانە دڵنیان لە ترس و داچڵەکانی گەورەی ئەو ڕۆژە، واتە ڕۆژی قیامەت وە هەر کەس خراپەی کردبێت، وە لێرەدا مەبەست ﴿بِالسَّيِّئَةِ﴾ واتە: خراپە هاوەڵپەرستییە، (لەو ڕۆژەدا) بەسەر ڕوو دەم و چاویاندا دەخرێنە ناو ئاگر (ی دۆزەخ). کەوا بوو لێرەدا مەبەست ﴿بِالْحَسَنَةِ﴾ و ﴿بِالسَّيِّئَةِ﴾ یەکتاپەرستی و هاوەڵپەرستییە، بۆیە هەرکات پێیان گوتی: گەورەترین شتێك کە خوای گەورە فەرمانی پێکرد بێت چییە؟ یەکتاپەرستییە. وە هەرکاتێکیش پێیان گوتی: گەورەترین شتانێك کە خوای گەورە ڕێگریی لێکردبێت چییە؟ بڵێ: هاوەڵپەرستییە.

چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾[1] [النساء: ٤٨] واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لە هەر گوناهێکی تر بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت.

---

(١)_ ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ﴾ هەرگیز شیرك و هاوەڵپەرستی نابوردرێت مەگەر بە تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوە، بەڵام هەر کەسێك بمرێت لە کاتێکدا موشریك و هاوەڵپەرست بێت ئەو هیچ ئومێدێکی بەلێبوردن و بەخشینی خواکەی نابێت، بەڵام بە پێچەوانەوە هەر کات کەسێك بمرێت لەکاتێکدا موشریك و هاوەڵپەرست نەبێت ئەوە ئومێدی بەلێبوردن و بەخشینی خواکەی دەبێت، ویستی هەبێت سزای نادات و دەیبورێت، ویستیشی هەبێت سزای دەدات و، پاشان لێی دەبورێت و، ئینجا دەیخاتە بەهەشتەوە، کەوابوو ئەو کەسەی لەشیرك و هاوەڵپەرستی پارێزراو بێت ئەوە ئومێدی ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە دەکات با تاوانی گەورەشی هەبێت چونکە دەفەرموێ: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾ بێجگە لەوە لەهەر گوناهێکی تر خۆش دەبێت، کەوابوو ئیماندار ئومێدی بەبەزەیی خوای گەورە هەیە ئەگەر چەندەها سەرپێچیشی هەبێت، ئەگەرچی بمرێت و تەوبەشیان لێنەکات هەر ئومێدی ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورەی دەبێت، ئەمە بەپێچەوانەی موشریك و هاوەڵپەرستەوەیە کە ئەگەر لەسەر شیرك و هاوەڵپەرستی مردبێت ئەوە هیچ ئومێدێکی بەلێبوردنی خوای گەورە نابێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾[1] [البقرة: ١٦٥]

---

(١)_ خۆشەویستی گەورەترین جۆرەکانی یەکخواپەرستییە، خۆشەویستی خوای گەورە گەورەترین جۆرەکانی یەکخواپەرستییە، بۆیە زانایان پێناسەی دەکەن و، دەڵێن: بریتیە لەو پەڕی مل کەچی لەگەڵ ئەوپەڕی خۆشویستندا، ئەوپەڕی ملکەچبوون بۆ خوا، ئەوپەڕی خۆشویستنی خوای گەورە. عیبادەت و پەرستن: بریتیە لەوپەڕی ملکەچبوون لەگەڵ ئەوپەڕی خۆشویستندا، ئیمانداران خوای گەورەیان بەدڵسۆزیەوە خۆش دەوێت، هیچ کەسێکی تریان لەگەڵیدا خۆش ناوێت، ئەمەیە خۆشویستنی عیبادەت و پەرستن، خۆشویستنی عیبادەت و پەرستن کە مل کەچبوونی لەگەڵدایە تەنها بۆ خوای گەورە دەکرێت، بەڵام ئەو جۆرە خۆشویستنەی کە ملکەچی لەگەڵدا نییە خۆشویستنێکی سروشتییە، وەکو ئەوەی خێزانەکەت خۆش دەوێت، ماڵ و سامانت خۆش دەوێت، ئەوە عیبادەت و پەرستن نییە، بەڵکو سروشتییە، چونکە ملکەچبوونی لەگەڵدا نییە. ئیمانداران بە لسۆزیەوە خوای گەورەیان خۆش دەوێت، بۆیە بە دڵسۆزیەوە دەشیپەرستن، بەڵام هاوەڵپەرستان خوایان خۆش دەوێت و لەگەڵ خوای گەورەشدا شتی تریان خۆش دەوێت وەکو بتەکان، ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا﴾ واتە: هاوبەشگەلێکی نەلد ﴿يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ﴾ واتە ئەو هاوبەشانە لەگەڵ خوادا یەکسان دەکەن لە خۆشویستندا، ئەوان دەپەرستن و خواش دەپەرستن، لەگەڵ خوای گەورەدا

---

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

بەکسانیان دەکەن، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ [الأنعام: ١] واتە: ئینجا ئەوانەی بێباوەڕبوون هاوتاو هاوبەش بۆ پەروەردگاریان بڕیار دەدەن. شتی تر دەکەن بە هاوتای خوای گەورە. خۆشەویستی ئیمانداران پاك و بێگەردە، بەڵام خۆشەویستی هاوەڵپەرستان هاوبەشە، ئەمەش ئەوپەڕی پووچی (باطل)ە، چونکە عیبادەت و پەرستن هەر کات شیرك و هاوبەشی تێکەڵبوو پووچ دەبێتەوە. ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت، لە هاوەڵپەرستان زیاتر خوای گەورەیان خۆش دەوێت، خۆشەویستی ئیمانداران پاك و بێگەردە، بەڵام خۆشەویستی هاوەڵپەرستان هاوبەشە.

واته: وه كه‌سانه‌ی وا هه‌یه له خه‌ڵكی كه هاوبه‌شی زۆر بۆ خوا په‌یدا ده‌كه‌ن له ئیبن و مه‌سعوده‌وه ﷺ هه‌ر له‌و باره‌وه له فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ داهاتووه: قَالَ: قُلْتُ يا رَسُولَ الله، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ ؟ قَالَ: ((أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ))، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ ؟ قَالَ: ((أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مِنْ أَجْلِ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ)) قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ ؟ قالَ: ((أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ))[1]. صحيح: أخرجه البخاري (٤٤٧٧)، (٤٧٦١)، ومسلم (٨٦) من حديث عبدالله بن مسعود ﷺ مرفوعاً.

واته: له ئیبن و مه‌سعوده‌وه ﷺ فه‌رموویه‌تی: گووتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ، گه‌وره‌ترینی تاوانه‌كان چییه؟ فه‌رمووی: ((هاوبه‌شێك بۆ خوای گه‌وره بڕیار بده‌یت له كاتێكدا ئه‌و تۆی خوڵقاندوتی))، گووتم: ئه‌ی پاشان چ تاوانێكی تر؟ فه‌رمووی: ((منداڵه‌كه‌ت بكوژی بۆ ئه‌وه‌ی خواردنت له‌گه‌ڵدا نه‌خوات))، گووتم: ئه‌ی پاشان چ تاوانێكی تر؟ فه‌رمووی: ((له‌گه‌ڵ خێزانی دراوسێكتدا زینا بكه‌یت)).

---

(١)_ تاوانه گه‌وره‌كان جیاوازن هێندێكیان له هێندێكی تریان توندترن، ئه‌و سێ تاوانه گه‌وره‌یه‌ی كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ باسی كردووه خوای گه‌وره‌ش له ئایه‌ته‌كانی سوره‌تی (الفرقان)دا باسی ده‌كات و، ده‌فه‌رموێ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا﴾ كه‌سانێكن كه له‌گه‌ڵ خوادا هیچ په‌رستراوێكی تر ناپه‌رستن، هیچ كه‌سێكیش ناكوژن كه خوای گه‌وره كوشتنی ئه‌وی حه‌رام كردووه به هه‌ق وڕه‌وا نه‌بێ، وه زیناو داوێن پیسی ناكه‌ن، ئه‌مانه گه‌وره‌ترینی هه‌موو تاوانه گه‌وره‌كانن، وه‌كو ئه‌وه‌ی ئیبن و مه‌سعود ﷺ ده‌ڵێت: گوتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا، گه‌وره‌ترینی تاوانه‌كان چییه؟ فه‌رمووی: ((هاوبه‌شێك بۆ خوای گه‌وره بڕیار بده‌یت له‌كاتێكدا ئه‌و خوڵقاندووتی))، گوتم: ئه‌ی پاشان چ تاوانێكی تر؟ فه‌رمووی: ((منداڵه‌كه‌ت بكوژی بۆ ئه‌وه‌ی خواردنت له گه‌ڵدا نه‌خوات))، گوتم: ئه‌ی پاشان چ تاوانێكی تر؟ فه‌رمووی: (( له‌گه‌ڵ خێزانی دراوسێكه‌تدا زینا بكه‌یت))، زینا حه‌رامه‌و له گه‌وره‌ترینی تاوانه گه‌وره‌كانه.

ئەوەبوو خوای گەورە گوفتارەکانی پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ بەڕاست داناو، فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا(٦٨) يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا(٦٩) إِلاَّ مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ[1] وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا(٧٠)﴾[2] [الفرقان: ٦٨_٧٠] واتە: وە کەسانێکن کە لە گەڵ هیچ پەرستراوێکی تر خوادا ناپەرستن ﴿النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ﴾ هیچ کەسێ ناکوژن کەخوا کوشتنی ئەوی یاساغ(حرام) کردووە بە هەق ورەوا نەبێ وە زیناو داوێن پیسی ناکەن وە هەر کەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکراون) تووشی تۆڵەکەی دێت سزای بۆ چەند بارە دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا وەبێ بڕانەوەو بەبێ ڕێزو بە ڕیسوایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ کارو کردەوەی چاکیشی کرد بێت ئا ئەوانە خوا خراپەو تاوانەکانیان دەگۆڕێت بۆ چاکە وە خوا هەمیشە لێبوردەی بە بەزەییە.

---

(١)_ ﴿فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾ مانای ئەوەیە خوای گەورە لە کارو کردەوەی چاکەدا بەکاریان دێنێت و، بەوەش لە جێگای هەرە خراپەیەکیان تاعەت و گوێڕایەڵیەکیان بۆ دادەنێت. هەروەها گوتراوە ماناکەی ئەوەیە کە ئەگەر بەرامبەر بەو کاروکردەوە خراپانەی کە ئەنجامیان داوە ئەگەر تەوبەیەکی ڕاست و دروست بکەن ئەوا دەگۆڕدرێت بۆ تاعەت و گوێڕایەڵیی.

(٢)_ لێرەدا مەبەستی شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ ئەوەیە کە مانای ﴿وَالأَمْرُ﴾ پەیوەندی بە (المحبوبات) ەوە واتە: شتە خۆشویستراو و بە لاوە پەسەند بوەکانەوە هەیە کە خوای گەورە دەیەوێت و فەرمانی پێدەکات، هەروەها پەیوەندی بە (المكروهات و المبغوضات)ەوە واتە: شتە قێزەون و ڕق لێبووەکانەوە هەیە کە خوای گەورە قەدەغەی دەکات و ڕێگریی لێدەکات، بڕوانە: الشيخ الدكتور خالد المصلح، شرح الفرقان بين أولياء الرحمن و أولياء الشيطان. وەرگێڕ.

وە خـوای گـەورە فـەرمانی داوە بەدادپـەروەری و چـاکەکاری و یارمـەتی دان و بەخشندەیی بە خزمان، وە ڕێگریی لە گونـاهو تـاوان و دەسـت درێـژی دەکـات[١]، وە هەواڵیداوە بەوەی کە تەقواکارانی خۆش دەوێت، چاکە کـارو چاکە خـوازانی خۆش دەوێت، دادپەروەرو مافپەروەرانی خۆش دەوێت، تەوبە کارانی خۆش دەوێت، پاکانی خۆش دەوێت[٢]، کەسانێکی خۆش دەوێت کە بەیەك ڕیز لە ڕێی خوادا دەجەنگن وەك کۆشکێکی قایمی چەسپیون[٣].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ﴾ [الفرقان: ٦٨] واتە: هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوای گەورەدا ناپەرستن، ئەم ئایەتە گەورەترین قەدەغە کراوەکانی تێدایە، ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ﴾[النحل: ٩٠] واتـە: بـە ڕاستی خـوا فـەرمان دەدات بـە چـاکە کـاری و دادپـەروەری، ئەمـەش گەورەترینیی فەرمان پێکراوەکانی تێدایە.

(٢)_ ئەمانە لە سیفاتەکانی خـوای گـەورەن، کـە ئیمانـداران و، دادەپـەروەران و مافپەروەران و، تەقواکارن و، پاکان و، تەوبەکارانی خۆش دەوێت بەخۆش ویستنێکی تایبەت، وە ڕقیشی لە کافران و دوو ڕووان دەبێتەوە، کەوا بوو خـوای گـەورە خۆشی دەوێـت، ڕقـی لێ بوونـەوەو تـوڕە بـوون هـەموو ئەمانـە سـیفات گـەلێکن کـە لایـەق و شایستەن بە خوای گەورەوە، وەکو سیفاتی مەخلوقات نین.

(٣)_ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾[الصف: ٤] واتە: بە ڕاستی خوا کەسانێکی خـۆش دەوێ کـە بـە یـەك ڕیز دەجەنگن لەڕێی خوادا ئەڵێیت کۆشکێکی قایمی چەسپیون. ئەو کەسـانەی خۆش دەوێت کە لە پێناو بەرزکردنەوەی وشەی (توحیددا) دا دەجەنگن و، نەفسی خۆیان لە پێنـاوی خـوادا دەبەخشن، ئەمانـە خـوای گـەورە خۆشـی دوێـن بـە خۆشویستنێکی تایبەت، ئەم ئایەتە فەزڵ و گەورەیی جیهاد بەدەر دەخات.

خوای گەورە ڕقیّ دەبێتەوە لەو شتانەی کە قەدەغەی کردوون[١]، وەکو ئەوەی لە سورەتی (الإسراء)دا هاتووە: ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾[٢] [الإسراء: ٣٨] واتە: هەموو ئەوەی باسکرا خراپەکانی لای پەروەردگارت نا بەجیّ و بێزراوە.

---

(١)_ شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لیّ بێت _ کە کاتیّ دەڵێت: (خوای گەورە فەرمانی داوە بەدادپەروەری و چاکە کاریی...) پاشان دەڵێت: (خوای گەورە ڕقی دەبێتەوە لەو شتانەی کە قەدەغەی کردوون...) مەبەستی ئەوەیە کە ویستی شەرعیی ئەمریی دینیی پەیوەندی بەو شتانەوە هەیە کە خوای گەورە خۆشی دەوێت، بەڵام خواستی قەدەریی خەلقیی کەونیی هیچ پەیوەندیەکی بە خۆشویستنەوە نییە، چونکە قەدەرەو خوای گەورە خواستی هەر شتێك بکات دەبێت ئەگەرچی خۆشی بوێت یان خۆشی نەوێت، بڕوانە: الشيخ الدكتور خالد المصلح، شرح الفرقان بين أولياء الرحمن و أولياء الشيطان. وەرگێڕ.

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لاَّ تَجْعَل مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولاً(٢٢) وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا(٢٣) وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا(٢٤) رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُواْ صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ لِلأَوَّابِينَ غَفُورًا(٢٥) وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا(٢٦) إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُواْ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا(٢٧) وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ابْتِغَاء رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلاً مَّيْسُورًا(٢٨) لاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا(٢٩) إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء وَيَقْدِرُ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا(٣٠) وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا(٣١)

ولا تقربوا الزنى إنه كان فاحشة وساء سبيلاً(٣٢) ولا تقتلوا النفس التي حرم الله إلا بالحق ومن قتل مظلوما فقد جعلنا لوليه سلطانا فلا يسرف في القتل إنه كان منصورًا(٣٣) ولا تقربوا مال اليتيم إلا بالتي هي أحسن حتى يبلغ أشده وأوفوا بالعهد إن العهد كان مسئولاً(٣٤) وأوفوا الكيل إذا كلتم وزنوا بالقسطاس المستقيم ذلك خير وأحسن تأويلاً(٣٥) ولا تقف ما ليس لك به علم إن السمع والبصر والفؤاد كل أولئك كان عنه مسئولاً(٣٦) ولا تمش في الأرض مرحا إنك لن تخرق الأرض ولن تبلغ الجبال طولاً(٣٧) كل ذلك كان سيئه عند ربك مكروها(٣٨) ذلك مما أوحى إليك ربك من الحكمة ولا تجعل مع الله إلها آخر فتلقى في جهنم ملوما مدحورا﴾[الإسراء: ٢٩_٣٨] واته: (ئەی ئادەمی) لە گەڵ خوادا پەرستراوێکی تر مەپەرستە ئەگینا دەبیتە لۆمەکراوی یارمەتی نەدراو وە پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتێ نەپەرستن بێجگە لە ئەو وە لە گەڵ دایك و باوکتان چاکە بکەن، ئەگەر یەکێکیان (باوکت و دایکت) یان هەر دوکیان لای تۆ پیر بوون قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ تەنانەت ئوفیش وە تێیان مەخوڕەو پێیاندا هەڵمەشاخێ (بەڵکو) ووتەی نەرم و شیرینیان (لەگەڵدا) بەکار بێنە ﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ﴾ باڵی خۆ بە کەم زانینیان بۆ ڕابخە لەبەر بەزەیی و میهرەبانیت پێیان بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێبکە هەر چۆنی ئەوان منیان پەروەردەکرد بە منداڵی پەروەردگارتان چاك دەزانێ بە هەرچی لە دڵ و دەروونتاندا هەیە ئەگەر ئێوە چاك بن و نیازی چاکەتان ببێ ئەوا بێگومان ئەو (خوا) لێبوردەیە بۆ تەوبە کاران وەماڵی خزمانت بدە (هەروەها ماڵی) هەژار و ڕێبوارانیش زیادەڕۆیش مەکە بە ڕاستی زیادە ڕەوان دۆست و برای شەیتانن شەیتانیش بەرانبەر (نازو نیعمەتەکانی) پەروەردگاری هەمیشە سپڵەیە وە ئەگەر ڕووت وەرگێڕا لەوانە (لەبەر نەداری) چاوەڕوانی بەخشش و ڕۆزیەك بویت لە لایەن

--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------------------

ەروەردگارتەوە ئەوە قسەی جوان و نەرمیان لەگەڵدا بکە، وە دەستت مەکە کۆت
ەگردنندا و کراوەو بەرەڵاشی مەکە بە تەواوی تا نەبیتە کەسێکی لۆمەکراوی هیچ بە
ەستەوە نەماو بە ڕاستی پەروەردگارت ڕزق و ڕۆزی فراوان دەکات بۆ هەر کەسێك کە
یەوێ و تەنگی دەکات بۆ هەر کەسێ بیەوێ بە ڕاستی ئەو هەمیشە ئاگاو بینایە بە
ەندەکانی وە ڕۆڵەکانتان مەکوژن لە ترسی هەژاری و بێنەوایی ئێمە ڕۆزی ئەوانیش و
ئێوەش دەدەین بە ڕاستی کوشتنی ئەوانە هەڵەو تاوانێکی گەورەیەوە نزیکی زیناش
مەکەونەوە بە ڕاستی ئەوە کردەوەیەکی زۆر ناشرین و ڕێگەیەکی پیس و خراپە وە
کەسێك مەکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی حەرام کردوە مەگەر بە(هۆیەکی) ڕاست و ڕەوا
جا هەر کەسێك بە ناهەق و ستەم لێکراوی کوژرا ئەوە دەسەڵاتمان داوە
بەخاوەنەکەی (بەسەر بکوژەکەدا) جا با خاوەنەکەی زیادەڕۆیی نەکات لە
تۆڵەسەندندا چونکە بە ڕاستی ئەو (خاوەنە) یارمەتیدراوە وە نزیکی ماڵی هەتیو
مەکەونەوە مەگەر بە چاکترین شێوە(کە بریتیە لە پاراستن و بەرهەمهێنانی)، هەتا
(هەتیوەکە) دەگاتە کەماڵی ژیری و لێزانی، وەفا بکەن بەبەڵێن و پەیمانەکانتان بە
ڕاستی (خاوەن) بەڵێن و پەیمان پرسیار لێکراون وە کاتێ کە پێوانە دەکەن (بۆ
خەڵکی) بە ڕێك و پێکی پێوانە بکەن و کێشانەش بکەن بە تەرازووی ڕاست ئەمە (بۆ
ئێوە) چاکترەو ئاکامیشی باشترە وە شوێن شتێ مەکەوە کە زانیاریت دەربارەی نییە
بە ڕاستی گوێ و چاو و دڵ هەموو ئەوانە (خاوەنیان) پرسیار لێکراوە، وە مەڕۆ بە
زەویدا بە کەشخەو شانازییەوە (چونکە) بە ڕاستی تۆ نەدەتوانی زەوی کون کەیت وە
نەدەگەیتە شاخەکان لە درێژیدا هەموو ئەوەی باسکرا خراپەکانی لای پەروەردگارت
نابەجێ و بێزراوە ئەوە(ی کەباسکرا) هەندێکە لەو دانایی و حیکمەتەی کە
پەروەردگارت نیگای کردووە بۆت وە هیچ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا مەپەرستە

ئەگینا فریّ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە بەلۆمە كراوی و دوور خراوەیی لە بەزەیی خوا.

لەم ئایەتانەدا خوای گەورە باسی هێندێ شتی كردووە، وەكو ڕێگری كردن لە كوشتنی منداڵان و، ڕێگری كردن لە خواردنی ماڵی هەتیو و، ڕێگری كردن لە وەفانەكردن بەهەقی خەڵكی و، كۆتاشی پێهێناوە بە قەدەغە كردنی شیرك و هاوەڵپەرستی. ئایەتەكانی بە قەدەغە كردنی شیرك و هاوەڵپەرستی دەست پێكردوەو، بە قەدەغەكردنی شیرك و هاوەڵپەرستیش كۆتایی پێهێناوە، ئەم ئایەتانە وەكو سێ ئایەتەكەی كۆتایی سورەتی (الأنعام)ە كە بەقەدەغەكردنی شیرك و هاوەڵپەرستی دەست پێكردوەو، بە قەدەغەكردنی شیرك و هاوەڵپەرستیش كۆتایی پێهێناوە. پاشان دەفەرموێ: واتە: هەموو ئەوانەی كە خوای گەورە لەو ئایەتانەدا باسیكردوون حەرامن، چونكە خوای گەورە ڕقی لە حەرام كراوەكانەو ڕقی لە قەدەغەكراوەكانە، قەدەغەی كردوون چونكە ڕقی لێیانە، بەڵام تاعەت و گوێڕایەڵیەكانی خۆش دەوێت بۆیە فەرمانی پێكردوون.

وە خوای گەورە ڕێگریی لە شیرك و هاوەڵپەرستی كردووە، ڕێگریی لەسەرپێچی كردن و بەگوێنەكردنی دایك و باب كردووە، فەرمانیداوە بە بەجێهێنانی مافەكانی خزمان، ڕێگریی لە بە فیڕۆدان و دەست گرتنەوە كردووە، ڕێگریی لەوە كردووە كە ئەوەندە دەستت نوقا و بێت و كرد بێتت بە كۆت بەگردنتدا، وە ئەوەندەش دەستی كراوەو بەرەڵاش نەبێت بە تەواوی[1]، وەڕێگریی كردووە لە كوشتنی نەفس بە بێ هۆیەكی ڕاست و ڕەوا، وەڕێگریی كردووە لەزیناو داوێن پیسی، وەڕێگریی كردووە لە نزیك بوونەوە لەماڵی هەتیو مەگەر بە چاكە، تاوەكو دەفەرموێ: ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾[2] [الإسراء: ٣٨] هەموو ئەوەی باسكرا خراپەكانی لای پەروەردگارت نا بەجێ و بێزراوە، وە خوای گەورە حەزی بە خراپە نییەو، ڕازی نابێت بەكوفر بۆ بەندەكانی[3].

---

(١)_ واتە خوای گەورە ڕێگری لە دەست قوچاوی كردووە، ڕێگریی لە بە فیڕۆدان كردوەو، فەرمانی داوە بە مام ناوەندی، نێوەنجێتی لە خەرج كردندا بە جۆرێك موسڵمانی لە نێوانی هەردوكیاندا بێت.

(٢)_ ئەمە بەڵگەیە لەسەر گوفتاری شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ كە دەڵێت: ئەوەی خوای گەورە قەدەغەی كردووە ڕقی لێدەبێتەوە.

(٣)_ خوای گەورە ڕقی لە خراپەو خراپەكارییەو، ڕازی نابێ بە كوفر بۆ بەندەكانی، هەموو ئەوەی كە خوای گەورە قەدەغەی كردوون ڕقی لێیانەو پێیان ڕازی نییە، وە هەموو ئەوەش كە فەرمانی داوە بە ئەنجامدانی خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە، چونكە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ [الزمر: ٧] واتە ئەگەر ڕێبازی سوپاس گوزاری بگرنەبەر بەو كارەتان ڕازی دەبێت.

# هاندان بۆ تەوبەکردن و داوای لێخۆشبوون

بەندە فەرمانی پێدراوە بەبەردەوامی تەوبە بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[1] [النور: ٣١] واتە: هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ئەی ئیماندارەکان تا ڕزگارو سەرکەوتوو بن.

وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عن النبي أنه قال: ((أَيُّها النَّاس تُوبُوا إِلى رَبِّكُمْ، فَوَالَّذِي نَفْسي بِيَدِهِ إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ الله وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي اليَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً))[2] أخرجه البخاري (٦٣٠٧)، من حديث أبي هُريرة ﷺ مرفوعاً. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەی خەڵکینە تەوبەبکەن و بۆ لای پەروەردگارتان بگەڕێنەوە، سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە ڕۆژانە لە حەفتا جار زیاتر (أَسْتَغْفِرُ الله وَأَتُوبُ إِلَيْهِ) دەڵێمەوە. واتە: (داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای).

---

(١)_ بەڵێ، خوای گەورە فەرمانی داوە بە تەوبەکردن کە بریتیە لە گەڕانەوە بۆ تاعەت و گوێڕایەڵی، گەڕانەوە لە گوناهو تاوانەوە بۆ تاعەت و گوێڕایەڵی، ئا ئەمەیە تەوبە، چونکە لە زمانی عەرەبیدا مانای تەوبە: بریتیە لەگەڕانەوەو پەشیمان بوونەوە، کەوا بوو پەشیمان بوونەوە مانای تەوبە دەبەخشێت کە بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، ئیتر تاوانبارو یاخیبوو با لەڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە نا ئومێد نەبێت، با تەوبە بکات و لە ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە نائومێد نەبێت، یان تاوانەکانی خۆی بەزۆر دابنێت و، ئیتر نائومێد بێت، با وانە زانێت خوای گەورە لێی خۆش نابێت، چونکە ئەمە لەخودی تاوانەکەش توندترە، تەوبەکردن داواکراوە، لە توانادایە، ئاسانە، سانایە، لای خوای گەورە قبوڵ کراوە ئەگەر مەرجەکانی بەدی هات بن، ئەمەش بە دڵنیایی لە ڕەحمەتە دوانەهاتووەکانی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی خۆی.

(٢)_ پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ تەواویی گوێڕایەڵی کەیداو وە لەگەڵ کەماڵی بەندایەتیەکەیدا بۆ خوای گەورە سەرەڕای ئەوەش سەبارەت بەهەر کەمتەرخەمیەک

---

---

---

داوای لێخۆشبوونی لەخوای گەورە دەکرد، چونکە لەتوانای هیچ یەکێکدا نییە بەتەواوی مافی خوای گەورە بەجێبێنێت، مافی خوا زۆر گەورەیە، بەڵام خوای گەورە دەبورێت، ئەگینا لەتوانای هیچ کەسێکدا نییە مافەکانی خوای گەورە بە تەواوی بەجێبێنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: ((لا أُحْصي ثَناءً عَلَيكَ أَنْتَ كَما أَثْنَيْت على نَفْسَكَ)) واتە: ((ناتوانم ستایشی تۆ بژمێرم تۆ بەو جۆرەی کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە)) کەوابوو لەتوانای هیچ کەسێکدا نییە مافەکانی خوای گەورە بەجێبێنێت، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کەماڵ و تەواوێتی بەندایەتیەکەیدا داوای لێخۆش بوون لە خوای گەورە دەکات و بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، خوای گەوەش فەرمانی ئەو شتەی پێ کردووە، چونکە دەفەرموێ: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ﴾[النصر: ٣] ئیتر پەروەردگارت بەپاك ڕابگرە بەهۆی ستایشیەوەو داوای لێبوردنی لێبکە. هەروەها دەفەرموێ: ﴿واسْتَغْفِرِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[النساء: ١٠٦] واتە: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە بە ڕاستی خوا لێخۆشبووی بە بەزەییە، داوای لێخۆش بوون و تەوبەکردن داواکراون و جەختیشیان لەسەر کراوەتەوە بۆ بەندەکان، تەنها بە تاوانەکانەوە تایبەت نەکراون، بە کەسانی تاوانبار بەڵکو کەمتەرخەمیش پێویستی بەداوای لێخۆشبوون و تەوبەکردن هەیە، کەمتەرخەمی بەرامبەر بەبەجێهێنانی مافەکانی خوا پێویستی بە داوای لێخۆشبوون و تەوبەکردن هەیە.

هەروەها (مسلم) لە صەحیحەکەدا هێناویەتی پێغەمبەر خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي وَإِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ))[1] صحيح: أخرجه مسلم (٢٧٠٢)، من حديث الأغر المزني رضي الله عنه مرفوعاً. واتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((تارمایی دێت بەسەر دڵمداو بیرم دەچێت، وە من لە ڕۆژێکدا سەدجار داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم)).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا لە إبن عمرەوە دەڵێ: كنا نعد لرسول الله ﷺ في المجلس الواحد يقول: ((رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)) مائة مرة، أو قال أكثر من مائة مرة[2] صحيح: أخرجه أبوداود(١٥١٦)، والترمذي (٣٤٣٤)، وابن ماجة(٣٨١٤)، وأحمد(٢/٢١و٦٧)، من حديث ابن عمر رضي الله عنه مرفوعاً.

---

(١)_ ﴿لَيُغَانُ﴾ واتە هێندێك سەرقاڵ بوون و بێئاگا بوونی بۆ دروست دەبوو چونکە ئەویش مرۆڤە ﷺ بە دڵنیایی سەرقاڵیی و کەمێك بێئاگایی بۆ دروست دەبوو، بۆیە زیاتر لە سەد جار داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە دەکردو بۆ لای دەگەڕایەوە، ئەمە یەکێك بوو لە هۆکارەکانی ئیستیغفار کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە واتایەکی تر چەند ساتێکی بەسەردا تێپەڕ دەبوو لە زیکرو یادکردنەوەی خوای گەورە بێئاگا دەبوو بۆیە پێویستی بە ئیستیغفارکردن هەبوو. ئەگەر ئەمە باروحاڵی پێغەمبەری خوابێت ﷺ ئەی پێویستە باروحاڵی کەسانی تری وەکو ئێمە چۆن بێت؟

(٢)_ لە یەك مەجلیسدا سەد جار یان زیاتر، نەك بە درێژایی ڕۆژ، نەخێر، بەڵکو تەنها لە یەك مەجلیسدا، پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام ئیستیغفار و داوای لێخۆش بوونی لە خوای گەورە دەکردو بۆ لای دەگەڕایەوە، ئیتر ئێمەی تاوانبار پێویستە چۆن بین ؟ هەموو ئەمانە بەرپەرچدانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی خۆیان بەزۆر تەواو دادەنێن و، دەڵێن: ئێمە ئەولیاو دۆستانی خواین لە کاتێکدا کوفرو شیرك و گوناه و تاوان ئەنجام دەدەن و، دەشڵێن: ئێمە ئەولیاو دۆستانی خوای گەورەین، دەڵێن: ئێمە تایبەتی تایبەتانین و گوێ بە هیچ شتێك نادەین، هیچ شتێك زیانمان پێ ناگەیەنێت، چونکە دۆستانی خواین، ئەمە وەڵامە بۆ ئەو جۆرە کەسانە.

واته له ئیبن و عومەرەوە ﷺ دەیفەرموو: له یەك مەجلیسدا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ سەد جار، یا فەرمووی زیاتر لە سەد جار ئەم زیکرەی کە دەیفەرموو: ((پەروەردگارا لێم خۆش بەو گەڕانەوەم لێ وەربگرە هەرتۆی تەوبە وەرگری میهرەبان)) دەژمارد.

خوای گەورە فەرمانیداوە بە بەندەکانی کە کردەوە چاکەکان بە ئیستیغفار و داوای لێخۆشبوون کۆتایی پێبێنن(1)

---

(1)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿والَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ(٦٠) أُوْلَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ(٦١)﴾[المؤمنون: ٦٠_٦١] واتە: وە ئەو کەسانەی کە دەیبەخشن (لە زەکات و خێر دەبێ) ببەخشن لە کاتێکدا دڵیان دەترسێ (دەلەرزێ) لەبەر ئەوەی دڵنیان بۆ لای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە ئا ئەوانە (کە خاوەنی ئەو سیفاتانەبوون باسکران) پەلە دەکەن لە ئەنجامدانی چاکەکاندا ﴿وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ﴾ وە ئەوان بۆ چاکەکردن لەپێشن. ئەوان کردەوە چاکە گەورەکان ئەنجام دەدەن سەرەڕای ئەوەش دەترسێن وەرنەگیرێت، چونکە دەترسێن لەکردەوەکانیاندا کەلێنێك یان کەم و کورتیەك هەبێت، بۆیە خۆیان بە تەواو و کامڵ دانانێن و، بە نەفسی خۆشیاندا هەڵنادەن، بەڵکو لەخوای گەورە دەترسێن، بەڵام خوای گەورە بەزەیی بە بەندەکانی خۆیدا هاتۆتەوەو ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون و گەڕانەوەی بۆ داناون کە لە پاش پەرستنەکان ئەنجامی بدەن، کەوا بوو لەپاش گوناه و تاوان و خراپەکاری بە دڵنیاتر پێویستە (إستغفار) کردن ئەنجام بدرێت، کەسانێك کەم تەرخەمی دەنوێنن و، کەسانێکی دیکەش گوناه و تاوان ئەنجام دەدەن، خوای گەورە بۆ هەردوولا ئیستیغفارو تەوبەو داوای لێخۆشبوونی بۆ داناون، ئەوان لەبەر کەم تەرخەمیەکەیان و ئەمانیش لەبەر گوناه و تاوانەکانیان، ئەمەش بەڕاستی ئەوپەڕی بەزەیی هاتنەوەی خوای گەورەیە بەبەندەکانیدا، ئەمەش دیسان بەرپەرچدانەوەیە بۆ ئەو جۆرە کەسانەی کە لەو بڕوایەدان گوایە چیتر پێویستیان بە عیبادات و پەرستن نەماوە چونکە ئەولیاو دۆستن و بە خوای گەورە گەیشتوون و ناسیویانەو چیتر پێویستیان بە عیبادات و پەرستن نەماوە.

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کات سڵاوی نوێژەکەی بدابایەوە سێجار (ئَسْتَغْفِرُ اللَّهَ)ی دەکردو، دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ، وَمِنْكَ السَّلامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ))[1] صحيح: أخرجه مسلم (٥٩١)، من حديث ثوبان ﷺ مرفوعاً. واتە: ((خوایە تۆ سەلامی و، ئاشتی و سەلامەتیش لەتۆوەیە؛ پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە ئەی خاوەن شکۆو ڕێز)).

وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالأَسْحَارِ﴾[آل عمران: ١٧] واتە: وە ئەوانەی کە داوای لێخۆشبوون دەکەن لە پێش بەیانیاندا. لێرەدا خوای گەورە فەرمانی پێداون شەونوێژ بکەن و، لە کاتی بەرەبەیانیشدا داوای لێخۆشبوون بکەن[2].

---

(١)_ ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە کردەوە چاکەکان بە ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون کۆتاییان پێ دەهێنرێت، پێدەچێت کەسی واهەبێت بڵێت: ئەوان نوێژیان کردووە ئایا ئەوان خراپەیان ئەنجام داوە تا ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون بکەن؟ ئێمەش دەڵێین: نەخێر، مەرج نییە تەنها بۆ خراپەکاری ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون بکرێت، بەڵکو لە نوێژەکەدا لە پەرستنەکانیاندا کەم و کورتییەکیان هەیە بۆیە پێویستە ئیستیغفار بکەن.

(٢)_ خوای گەورە فەرمانی پێداون شەونوێژ بکەن، لە کاتی بەرە بەیانیشدا بە ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون کۆتایی پێبێنن، ئەگەرچی ئەوەندە نییە لە عیبادەت و پەرستن بونەتەوە، ئەوان ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون دەکەن سەبارەت بەو کەم و کورتیانەی کە لەوانەیە بۆیان دروست بێت.

هەروەها خوای گەورە سورەتی (المزمل) _ کە سورەتی شەونوێژە _ بەوە کۆتایی پێهێناوە کە دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(1) [المزمل: ٢٠] واتە: وە داوای لێخۆشبوون بکەن لە خوا بە ڕاستی خوا لێخۆشبویەکی میهرەبانە.

---

(1)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ (١) قُمِ اللَّيْلَ إِلاَّ قَلِيلًا (٢)﴾[المزمل: ١_٢] واتە: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیوە شەوهەستە (شەو نوێژ بکە) مەگەر کەمێکی نەبێت، سەرەتا خوای گەورە فەمانی دایە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەشی هەرە زۆری شەو هەستێت بۆ شەو نوێژ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا شەو نوێژی کرد تاوەکو هەردوو پێیەکانی قلیشان بەهۆی درێژیی وەستانەوە، ئەوەش بۆ گوێڕایەڵیی پەروەردگارەکەی بوو، پاشان خوای گەورە لە کۆتایی سورەتەکەدا شەو نوێژ سووك دەکاتەوەو، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾[المزمل: ٢٠] واتە: بێگومان پەروەردگاری تۆ دەزانێ (ئەی موحەممەد ﷺ) کە تۆ هەڵدەسیت (بۆ شەو نوێژ) نەختێك کەمتر لە دوو بەش لە سێ بەشی شەوو نیوەی یاسێ یەکی وە دەستەیەك لەوانەی کە لەگەڵتان وەخوا ئەندازەی شەو و ڕۆژ دیاری دەکات (خوا) زانی کەئێوە ناتوانن ئەندازەی شەو نوێژ ڕابگرن لەبەر ئەوە لێتان خۆشبوو دەی ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لە قورئان دەوری بکەنەوە، واتە: لە شەو نوێژدا، پاشان دەفەرموێ: ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ﴾[المزمل: ٢٠] واتە: (خوا) دەزانێ کە لە مەولا کەسانێکتان نەخۆش دەبێت، چونکە خەڵکی خاوەن عوزرو بەهانەن زۆر بەلایانەوە قورس دەبێت کە هەموو شەوەکە شەو نوێژ بکەن، پاشان دەفەرموێ:

﴿وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ﴾ [المزمل: ٢٠] واتـه: وه كەسانێکی ترتان كه دەڕۆن بـه زەویـدا، سـەفەر دەكـەن بـەو شـوێن ڕۆزی خـوادا دەگـەڕێن، بۆ بازرگانی كردن سەفەر دەكەن، بۆیه هەستانی درێـژی شـەویان بۆ شـەو نوێـژ بـەلاوه قورس دەبێت، بۆیه خوای گەوره لەسەری سووك كردنەوه، هەروەها خوای گەوره لـه هـەمان ئایەتـدا دەفـەرموێ: ﴿وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾[المزمل: ٢٠] وەهـی تـری واتـان دەبـن كـه دەجـەنگن لـه ڕێـی خـوادا، چـونكه جیهـاد كـردن پێویسـتی بـه سووكردنەوەیه، پاشان خوای گەوره دەفـەرموێت: ﴿فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا﴾[المزمل: ٢٠] واته: ئینجا بخوێننەوه له قورئان ئەوەندەی كه بۆتان ئاسانه ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ وه نوێـژ بكـەن و زەكـات بـدەن وه قـەرز بـدەن بـه خـوا بەقەرزێكی چاك هەر چـاكەیەك پـێش بخـەن بـۆ خۆتـان لای خـوا دەسـتان دەكـەوێت ئەوەی لای خوا چاكترو گەورەتره لەڕووی پاداشتەوه، ئینجـا لـەكۆتایی ئایەتەكەشدا دەفەرموێت: ﴿وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واته: وه داوای لێخۆشبوون بكـەن لـه خـوا بـه ڕاسـتی خـوا لێخۆشـبویەكی میهرەبانـه. واتـه: خـوای گـەوره بـه بەندەكانی دەفـەرموێ: پـاش ئـەو كـردەوه چـاكانەی كـه ئـەنجامی دەدەن ئیسـتیغفارو داوای لێخۆشبوون له خوای گەوره بكەن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:﴿فَإِذَا أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُواْ اللَّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّآلِّينَ (١٩٨) ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُواْ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (١٩٩)﴾[1] [البقرة: ١٩٨_١٩٩].

---

(١)_ هەروەها خوای گەورە لەحەجیشدا فەرمانی داوە بەئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون لەگەڵ بەجێهێنانی رێو رەسمەکانی حەجدا، وەستان لە عەرەفەو، مانەوە لە موزدەلیفە، ﴿فَإِذَا أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَاتٍ﴾ ئینجا کاتێك گەڕانەوە لەعەرەفات، پاش بەجێهێنانی وەستانەکە لە عەرەفە، لە ڕۆژی نوێەمدا، گەڕانەوە بۆ کوێ؟ بۆ موزدەلیفە ﴿فَاذْكُرُواْ اللَّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ﴾ ناوی خوا بێنن لەلای (مشعر الحرام)دا، موزدەلیفە، (مَشْعَرِ الحرام) بریتیە لە موزدەلیفە، وە گوتراویشە: بریتیە لەو چیایەی کە لە موزدەلیفەدایە، ناوی خوای گەورە بێنن بەنوێژی مەغریب و عیشا لە کاتی گەشتندا، وە بەنووستن و مانەوەش، چونکە مانەوە لەموزدەلیفە عیبادەت و پەرستنەو رێو رەسمێکیشە لە ریو رەسمەکانی حەج، پاشان نوێژ کردنی بەیانی تیایدا، پاشان دوعا و نزاکردنی پاش نوێژی بەیانیش، هەر هەموو ئەمانە زیکرو ناوی خوا هێنانە لە موزدەلیفەدا، ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ﴾ لە پاشان بگەڕێنەوە لەو شوێنەی خەڵکی لێی دەگەڕێتەوە، گوتراوە: واتە لە موزدەلیفەوە بۆ مینا بچن، دەشگوترێت: واتە بگەڕێنەوە لە عەرەفات لەو شوێنەی کە خەڵکی پێشتر لێی گەڕاونەتەوە وەکو ئیبراهیم _ علیە السلام _، چونکە قورەیشیەکان لە موزدەلیفە دەوەستان و، بۆ عەرەفات نەدەچوون و، دەیانگوت: لەڕاستیدا تەنها (الآفاقیون) _

واته ئەوانەی خەڵكی نیشتەجێی دەرەوەی ئەو میقاتانەن كە بۆ ئیحرام بەستن دیاری كراون بۆ عەرەفات دەچن، ئەم شتە قورەیش لە حەجدا دایهێنا بوو، ئەمەش پێچەوانەی ئایینی ئیبراهیمە، ﴿ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ﴾ واتە: لە عەرەفات بكەڕێنەوە، گوتراوە: مەبەست بە وشەی ﴿النَّاسُ﴾ ئادەمە، وە گوتراویشە: ئیبراهیمە ـ علیه السلام ـ، ئیتر گەڕاندنیەوە بۆ وەستان لە عەرەفە كە ئایینی پێغەمبەرانی پێشترە، ﴿وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ پاش بەجێهێنانی ئەو كردەوە پیرۆزانە، وەستان لە عەرەفات، مانەوە لە موزدەلیفە (استغفر الله) بكەن، داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بكەن پاش بەجێهێنانی پەرستنەكان چونكە لەوانەیە لە پەرستنەكەدا كەلێنێك هەبێت، كەم و كورتیەك هەبێت، پێویستی بە ئیستیغفار بێت بۆ ئەوەی پڕ بكرێتەوەو شوێنی ئەو كەم وكورتیانە بكرێتەوە.

هەروەها خوای گەورە کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ غەزای تەبووك چوو کە کۆتاهەمینی غەزاکانی بوو ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ (١١٧) وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ(١١٨)﴾[1] [التوبة: ١١٧_١١٨] واتە: بێگومان خوا تەوبەی وەرگرت لە پێغەمبەر ﷺ و ئەو کۆچەر و یاری دەدەرانەی کە شوێنی (پێغەمبەر ﷺ) کەوتن لە کاتی سەختی و نارەحەتیدا پاش ئەوەی نزیك بوو دڵی کۆمەڵێکیان لەهەق لا بدات پاشان خوا تەوبەی لێ وەرگرتن بەڕاستی خوا لە گەڵیان دڵسۆزو میهرەبانە هەروەها (خوا تەوبەی وەرگرت) لەو سێ کەسەش کە دواخران (خوا دەربارەیان بڕیاری نەدابوو) هەتا ئەو کاتەی لێیان تەسك بوویەوە زەوی بەو فراوانیەی کەهەیەتی و بێزار بوون لە گیانی خۆشیان و زانیان هیچ پەناگەیەك نییە لە (سزای) خوا مەگەر پەنایی خۆی پاشان پەشیمانی لێوەرگرتن (بەدابەزاندنی چەند ئایەتێك) بۆ ئەوەی تەوبە بکەن بە ڕاستی خوا هەمیشە تەوبە وەرگری میهرەبانە .

---

(١)_ هەواڵ بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت کەوا ڕۆمەکان بە نیازی غەزای مەدینەی پیرۆزن، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئامادەکردو، فەرمانیشیدایە هاوەڵانی ئامادە بن بۆ دەرچوون، ئەو کاتە هاوین بوو، زۆر گەرما بوو، ماوەی نێوان تەبووك و مەدینەی پیرۆز دوور بوو، کاتی پێگەیینی بەروبوم بوو، خەڵکیش بە گەینی بەروبومەکان دڵخۆش بوون، خوای گەورە بەم غەزایە تاقیکردنەوە بۆ ئەوەی ئیمانداری ڕاستگۆ و دوو ڕوو لە یەك جیابنەوە، خوای گەورە لە کۆتاییەکانی ژیانی پێغەمبەری خوا دا ﷺ بەم غەزایە تاقیکردنەوە کە کۆتاهەمینی ئەو غەزایا نەبوون

که پێغەمبەری خوا ﷺ پێی هەستا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ رَجَعَكَ اللَّهُ إِلَى طَائِفَةٍ مِنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُلْ لَنْ تَخْرُجُوا مَعِيَ أَبَدًا وَلَنْ تُقَاتِلُوا مَعِيَ عَدُوًّا﴾[التوبة: ٨٣] واتە: ئەوسا ئەگەر خوا تۆی گێڕایەوە (ئەی موحەممەد ﷺ لە تەبوك) بۆ لای کۆمەڵێك لەو بەجێماوانە و داوایان لێکردیت بۆ دەرچوون (بۆ غەزایەکی تر) تۆش بڵێ: هەرگیز ئێوە لە گەڵ مندا دەرناچن بۆ جیهاد وە هەرگیز ئێوە لەگەڵ مندا جەنگ ناکەن لەگەڵ هیچ دوژمنێکدا. ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەم غەزایە کۆتاهەمینی غەزاکان بوو، خوای گەورە دووڕووانی لەم غەزایە بێبەشکردو، نیفاق و دوو ڕوویشیان بە تەواوی ڕوون بوویەوە، بەڵام موسڵمانان، ئەوانەی توانایان هەبوو، بە پەلە بوون لە بەجێهێنانی فەرمانەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ و هەموویان چوونە دەرەوە، گوێیان بە گەرمای هاوین و، دووری ماوەو، زۆری دوژمن و بەهێزیان کە ڕۆمەکان بوون نەدا، بەڵکو پەلەیان بوو و لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ چوونە دەرەوە، لێرەدا سێ تایەفە لەپێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوتن، تایەفەی یەکەم: نەخۆشەکان و ئەوانەی هیچیان بە دەستەوە نەبوو خەرجی بکەن بۆ پێویستیاتی جیهاد، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ(٩١) وَلاَ عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوْا وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلاَّ يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ(٩٢)﴾[التوبة: ٩١_٩٢] واتە: (گوناهێك) لەسەر بێهێز و پەککەوتە و نەخۆشەکان نییە ئەوانەش کەهیچیان نییە خەرجی بکەن (بۆ پێویستی جیهاد) هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە (کە نەڕۆشتوون بۆ جیهاد) کاتێ کە دڵسۆزی و ڕاستییان ببێ بۆ خواو نێرراوەکەی خوا هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ (تاوانبارکردنی) ئەو چاکەکارانە وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە

--------------------------------------------

--------------------------------------------

وە تاوان لەسەر ئەو کەسانەش نییە کە هاتنە لات (ئەی موحەممەد ﷺ بۆ ئەوەی وڵاخیان بۆ دابین بکەیت و سواریان بکەیت) گوتت وڵاخم دەست ناکەوێ سوارتان بکەم (بۆ جیهاد) ئەوانیش گەڕانەوە لەکاتێکدا چاویان فرمێسکی دەڕشت لە داخ و خەفەتدا کە هیچیان نەبوو خەرجی بکەن (بۆ پێداویستی جیهاد). ئا ئەوانەی لە ئایەتەکەدا باس کراوان خوای گەورە بەهانەو عوزری داونەتێ، ئەمە تایەفەیەکە، تایەفەی دووەم: کەسانێکن لە ئیمانداران هیچ بەهانەو عوزرێکیان نەبوو بەڵام لەسەرەتادا تەمبەڵیی دەیگرتن و، دەیانگوت: ئەمڕۆ خۆمان ئامادەدەکەین و، لەش قورسی گرتنی تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو هێشتا ئەوان پێداویستیەکانی سەفەری خۆیان ئامادە نەکرد بوو، ئەم تەمەبڵی نواندنە لە ڕووی نیفاق و دوو ڕوویی‌ەوە نەبوو، ئەوان ئیماندار بوون، لە بەڕێزترینی هاوەڵان بوون، بەڵام نافیکردنەوە بوو، سەرەتا لەش قورسی گرتنی تا هەلەکەیان لە کیس چوو، بۆیە پێویستە ئیماندار بەرامبەر بە تاعەت و گوێڕایەڵی لەش قورسی نەنوێنیت، چونکە پێدەچێت شتانێکی بۆ بێتە پێشەوە ڕێگریی لێبکات و نەهێڵێت ئەو کارە ئەنجام بدات، خوایان لێ ڕازی بێت لە ش قورسی یان نواند، تایەفەی سێیەم: دوو ڕووەکان بوون، ئەوانەی بەهانەیان هێنایەوەو پێغەمبەری خواش ﷺ بەهانەی لێوەرگرتن چونکە حوکم کردن بە ڕواڵەتە دەرەوەیان ئەگینا ئەوان درۆزن بوون و هیچ بەهانەیەکیان نەبوو، خوای گەورەش چەندین حیکمەت و دانایی لەوەدا هەبوو کە دەرنەچوون بۆ جیهاد، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَوْ خَرَجُوا فِيكُمْ مَا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا خِلَالَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾[التوبة: ٤٧] واتە: ئەگەر لەگەڵتاندا دەرچوونایە هیچ شتێکیان بۆ زیاد نەدەکردن بێجگە لە تێکدان و خراپە و نێوان ئێوەیان تێکدەدا (بەدووزمانی و هات و هوت) ئاژاوەیان بۆ دەنانەوە وە لەناو ئێوەدا خەڵکانێك هەن چاك گوێیان لێدەگرن وە

خوا بەئاگا و زانایە بەستەمکاران. خوای گەورە ڕێگریی لێکردن لە دەرچوون بۆ ئەوەی هەڵنەیێن و، موسڵمانان بێهێز بکەن و، هەواڵی ناخۆش بڵاوکەنەوە، ئاژاوەبنێنەوە لە نێوان موسڵماناندا، پەککەوتەکان و، نەخۆشەکان و، هەژارانیش خوای گەورە بەهانەو عوزری لێوەرگرتن و، لە قورئانیشدا دایبەزاند، دوو ڕووەکانیش خوای گەورە ڕێگری لێکردن وەکو ڕەحمەت و بەزەی هاتنەوەیەك بە موسڵماناندا، ئەگینا ئەوان توانای دەرچوونیان هەبوو، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾[التوبة: ٨١] واتە: (بێ ئیماندارانیان) دەگوت لەم (وەرزە) گەرمایەدا دەرمەچن بۆ جیهاد (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە (لەم گەرمایە) ئەگەر ئەوانە تێبگەن و ژیر بن.

بەڵام ئەو سێیانەی لە غەزای تەبوك دواکەوتن لە چاکترینی هاوەڵان بوون ﷺ، کەعبی کوڕی مالیك و، مەرارەی کوڕی ڕەبیع و، هیلالی کوڕی ئومەییە بوون ئەمان دانیان بە تاوانەکانی خۆیان و دواکەوتنیاندانا و، لە پێش پێغەمبەری خوادا ﷺ درۆیان نەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ مەسەلەکەیانی دواخست، بەهانەو عوزرەکەی وەرنەگرتن، بەڵکو دوایخستن و، چل ڕۆژ هەجری کردن و، فەرمانیشیدا بەهەجر کردنیان، پاشان خوای گەورە تەوبەکەی قبوڵ کردن و لێیان خۆشبوو، ئا ئەمە بوو چیرۆکی غەزای تەبوك و ئەوانەی دواکەوتن لەغەزای تەبوك، شاهێدی قسەکانمان لێرەدا چیرۆکی سێ هاوەڵەکەیە کە خوای گەورە لە کۆتادا تەوبەی وەرگرتن و لێیان خۆشبوو، چونکە لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ڕاستگۆ بوون، لە خۆیانەوە بەهانەو عوزری درۆینەیان باس نەکرد وەکو دووڕووەکان بەڵکو دانیان بەوە دانا کە هیچ بەهانەو عوزرێکیان نییەو، هەڵەیان کردووە، بۆیە پەشیمان بونەوەو تەوبەیان کرد، ئەوەش ئاکام و دەرەنجامەکە بوو کە خوای گەورە بەخشینی. ئەوانەی دواکەوتن لە کۆتادا خوای گەورە بەخشینی و تەوبەکەی لێ قبوڵکردن.

ئەوەش کۆتاهەمینی ئەو ئایەتانە بوون کە لە قورئان دابەزین[(١)] هەروەها گوتراوە: کۆتاهەمینی ئەو سورەتەی دابەزی ئەوە بوو کە خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ (١) وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا (٢) فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا (٣)﴾[(٢)] [النصر: ١_٣] واتە: کاتێك کە یارمەتی و کۆمەکی خوا هات لەگەڵ سەرکەوتن (شاری مەککە ئازادکرا) وە خەڵکت دی کە پۆل پۆل دێنە ناو ئایینی خواوە ئەوسا ئیتر پەروەردگارت بەپاك ڕابگرە بەهۆی ستایشی یەوە وە داوای لێبوردنی لێبکە چونکە بێگومان ئەو زۆر گێراکاری پەشیمانییە.

---

(١)_ کۆتاهەمینی ئەو ئایەتانە بوون کە لە قورئان دابەزین، چونکە پاش غەزای تەبوك بوو کە کۆتا غەزاکان بوو، بۆیە لە کۆتاهەمینی ئەو ئایەتانەبوون کە دابەزین.

(٢)_ خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆی کرد کە تەمەنی بە ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون کۆتایی پێبێنێت، کەوا بوو ئەگەر موسڵمان بەکۆتاکانی ژیانی گەشت با ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون زۆر بکات، چونکە خوای گەورە فەرمانیدایە پێغەمبەرەکەی ﷺ تەمەنی بەئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون کۆتایی پێ بێنێت، نیشانەی کاتی مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ چ بوو؟ ڕزگارکردنی، چونکە پاش ڕزگارکردنی مەککە خەڵك بە پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئایینی ئیسلامەوە، شاندو وەفدەکان لەهەموو خێڵەکانەوە دەهاتن پەیمان و گفتیان دەدایە پێغەمبەری خوا ﷺ، لەم سورەتەدا خوای گەورە فەرمانیدایە پێغەمبەرەکەی تەمەنی خۆی بە ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون کۆتایی پێ بێنێت، کەوابوو نوێژە فەرزەکان بە ئیستیغفار کۆتایی پێدەهێنرێت، شەونوێژ بە ئیستیغفار کۆتایی پێ دەهێنرێت، حەج بەئیستیغفار کۆتایی پێ دەهێنرێت، تەمەنیش بەئیستیغفار کۆتایی پێ دەهێنرێت.

هەروەها بوخاری موسلم هێناویانە لە دایکمان عائیشـە (خـوا لێ رازی بێ) دەڵێ پێغەمبـەر خـوا ﷺ لـە سـوجدەو کڕنووشـەکانی دا دەیفـەرموو: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْـدِك، اللَّهُـمَّ اغْفِـرْ لِي))[1] أخرجـه البخـاري (٧٩٤و٨١٧و٤٢٩٣و٤٩٦٧و ٤٩٦٨)، ومسلم (٤٨٤) من حديث عائشة رضي الله عنها مرفوعاً.

واتە: خاتوو عائیشە _ خوا لێ ڕاز بیبێت_ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکوع و سوجدەدا دەیفەرموو: ((پاکی و بێگـەردی بـۆ تۆیـە پـەروەردگارم سوپاس و ستایش لایەقی تۆیە، ساخوایە لێم خۆشبە)) تەفسیری قورئانی دەکرد.

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ئەم ئایەتەی بەسەردا دابـەزی ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ﴾[النصر: ٣] ئەوسا ئیتر پـەروەردگارت بەپاك ڕابگـرە بـەهۆی ستایشـی یـەوە داوای لێبوردنی لێبکە، ئـیتر لـە ڕکـوع و سـوجدەکانی دا ئـەم دوعایـەی دەخوێند ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِك، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)) (تأويل)ی قورئانی دەکرد، واتە: تەفسیرو ڕاڤەی قورئانی دەکرد، بە کرداری تەفسیرو ڕاڤـەی ئـەم ئایەتـەی دەکـرد، چونکە لە بنچینەدا مانـای (تأويل) تەفسـیرو ڕاڤـە دەبەخشـێت، ئەمـە زانـراوە بـە لای پێشینی چاکەوە، (تأويل) مانای تەفسیرو ڕاڤەکردن دەبەخشێت، هەروەها مانایەکی تری: ئەو دەرەنجام و ئاکامی شتەکانی لە داهـاتوودا پێـی دەگـات، لـەم بـارەوە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿هَلْ يَنْظُرُونَ إِلاَّ تَأْوِيلَهُ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَاءَتْ رُسُـلُ رَبِّنَـا بِـالْحَقِّ فَهَـلْ لَنَـا مِـنْ شُـفَعَاءَ فَيَشْـفَعُوا لَنَـا أَوْ نُـرَدُّ فَنَعْمَـلَ غَيْـرَ الَّـذِي كُنَّـا نَعْمَلُ﴾[الأعراف: ٥٣] واتـە: ئایـا چـاوەڕوانی چـی دەکـەن بێجگـە لـە سـەرەنجامی هەڕەشەکانی ئەو (قورئانە)؟ ئەو ڕۆژەی کە سەرەنجامی (هەڕەشـەکانی) بـەدی دێت ئەوانەی لەوەو پێش لەبیریان کردبوو دەڵێن بە ڕاستی نێرراوەکانی پەروەردگارمان بە ڕاستیەوە هـاتن جـا ئایا (ئـەمڕۆ) تکـا کارانێك بـۆ ئێمـە هەیـە تکامـان بـۆ بکـەن یا بگەڕێنرێینەوە بۆ دونیا تا کردەوەی چاك بکەین. کاتێك سەرەنجام و ئاکامی

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

کارەکانیان لە ڕۆژی دواییدا بەدی کرد ئینجا ئەو قسانەیان دەگوت، ئەمە بوو (تأویل) بەمانای دووەمی، واتە: کە دەرەنجام و ئاکامی شتەکانە لە کۆتادا، هەروەها پێغەمبەر یوسفیش _ علیه السلام _ دەیفەرموو: ﴿هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾[یوسف: ١٠٠] واتە: ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەم بوو کە لەمەو پێش (بینیم) بێگومان پەروەردگارم بە ڕاستی گێڕا، (تأویل)ەکەی ئەوەبوو کە دایك و باب و براکانی سوژدەیان بۆ برد، ﴿يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾[یوسف: ٤] واتە: ئەی بابە گیان بە ڕاستی من لە خەومدا دیم یازدە ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ دیمن سوژدەیان بۆ دەبردم. (تأویل)و دەرەنجام و ئاکامی ئەم خەوە تەنها لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەر یوسفدا _ علیه السلام _ بەدیهات. کەوا بوو لە زمانی عەرەبیدا وشەی (تأویل) دوو مانا دەبەخشێت، مانای یەکەم تەفسیرو ڕاڤە، مانای دووەم دەرەنجام و ئاکامی شتێك لە کۆتادا. بەڵام (تأویل) بە مانای ئەوەی کە وشەیەك لە مانای دیارو ئاشکرای ڕووکاری خۆی لادرێت و بگۆردرێت، ئەمە (تأویل)ێکی داهێنراوە، بەڵام ئەگەر بەڵگەی ڕاست و گونجاوت پێ بوو ئەوە هیچی تێدا نییەو، کارەکەشت بە(تخصیص) تایبەت کردن یان (تفسیر) ڕاڤەکردن ناو دەبرێت، وە ئەگەر هیچ بەڵگەیەکت پێنەبوو ئەوە کارەکەت (تأویل)ێکی پووچە وەکو (تأویل)کردنی ناو و سیفاتەکانی خوای گەورە، وە کە دەڵێت: (يتأول القران) واتە قورئانی تەفسیرو ڕاڤە دەکردو بە کرداری جێبەجێی دەکرد، وە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)) تەفسیرو ڕاڤەی ئەو ئایەتەی خوای گەورەی دەکرد کە دەفەرموێ: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ﴾[النصر: ٣].

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە دەفەرمووێ: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي، وجهلي، وإسرافي في أمري، وما أنت أعلم به مني، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي هزلي وجدي، وخطئي، وعمدي، وكل ذلك عندي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ما قدمت وما أخرت، وما أسررت وما أعلنت، لا إله إلا أنت))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٦٣٩٨و٩)، ومسلم (٢٧١٩)، من حديث أبي موسى رضي الله عنه مرفوعاً. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((پەروەردگارا لە تاوانەکانم، نەزانیم، زیادەڕۆییم لە کارەکانمدا، ئەوەی کە تۆ پێی زاناتری لە من خۆشبە، پەروەردگارا لەو تاوانەم خۆش بە بەجیدی کردوومەو لەوانەش بە گاڵتە کردووم، لە هەڵەو ئەنقەستەکانم خۆشبە، چونکە من هەموو ئەو سیفاتانەم تێدایە، پەروەردگارا لەوەی کە لەمەو پێش کردوومە، لەوەی کە لەمەودوا دەیکەم، لەوەی کە بەنهێنی و ئاشکرا کردو من خۆشبە، هیچ خوایەك نییە بە هەق جگە لە تۆ)).

---

(١)_ ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوە ئیستیغفارو داوای لێخۆش بوون لەپەروەردگاری بکات لە کاتێکدا کە تەواوترین و کاملترینی ئەم ئوممەتەیە، لە کاتێکدا تەواوترین و کاملترین پەرستن بۆ خوای گەورە ئەنجام دەدات، ئەی ئیتر ئێمە دەبێت چۆن بین؟ بەلام هەرگیز نابێت هیچ کەسێك خۆی بە تەواوترین کەس دابنێت، پاکانە بۆ نەفسی خۆی بکات و بە خۆیدا هەڵدات، بەڵکو پێویستە خودی خۆی بەکەمترخەم دابنێت.

ره هاتووه كه پێشه‌وا ئه‌وبه‌كر به پێغه‌مبه‌ری خوا ده‌فه‌رمووێ: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا دوعایه‌كم فێر بكه ئه‌نجامی بده‌م له نوێژه‌كانم ئه‌ویش فه‌رمووی بڵێ: ((قال: اللَّهُمَّ ظلمتُ نفسي ظلماً كثيراً، ولا يغفرُ الذُّنوب إلاَّ أنت، فاغفر لي مغفرةً من عندك وارحمني، إنك أنت الغفورُ الرَّحيمُ))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٨٣٤)، ومسلم (٢٧٠٥) من حديث أبي بكر رضي الله عنه مرفوعاً.

---

(١)_ ئه‌وه ئه‌بوبه‌كره رضي الله عنه كه هه‌ره چاكترینی ئه‌م ئوممه‌ته‌یه، له دوای پێغه‌مبه‌ران _ عليهم الصلاة والسلام _ هیچ كه‌سێك نییه له ئه‌بوبه‌كر رضي الله عنه چاكتر بێت، سه‌ره‌ڕای ئه‌مه‌ش پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فێری كرد به‌م نزای ئیستیغفاره ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون بكات ((اللَّهُمَّ إنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَلا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلاَّ أنْتَ، فاغفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي، إنَّكَ أنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)) له كاتێكدا ته‌واوترین و كامڵترین كه‌سی ئه‌م ئوممه‌ته‌یه بۆ خوا په‌رستی پاش پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش داوای له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كرد ئه‌م نزایه‌ی فێركات، ئه‌ویش فێری ئه‌م ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوونه‌ی كرد، ((ظَلَمْتُ نَفْسِي)) به چ شتێك له ئه‌فسی خۆم سته‌مم كردووه، به تاوان كردن، چونكه سته‌م كردن سێ جۆره، جۆری یه‌كه‌م: سته‌می شیرك و هاوه‌ڵپه‌رستی، خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[لقمان: ١٣] واته: به‌ڕاستی هاوبه‌شدانان بۆ خوا سته‌مێكی زۆر گه‌وره‌یه، جۆری دووه‌م: سته‌م كردن له خه‌ڵك، ئه‌وانه‌ی له ناموس و ئابڕوو ودا، له خویندا، له ماڵدا سته‌م له‌خه‌ڵك ده‌كه‌ن، جۆری سێیه‌م: سته‌م كردنی به‌نده له خودی خۆی، خودی خۆی تووشی تاوان و گوناه ده‌كات و، ئیتر تیا ده‌چێت، بۆیه ده‌ڵێت: ((اللَّهُمَّ إنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً)) ئه‌مه ئه‌بوبه‌كری صیدیقه رضي الله عنه ئه‌وه‌ها ده‌ڵێت، كه‌وا بوو هیچ كه‌س توانای ئه‌وه‌ی نییه واز له‌ئیستیغفار بێنێت ئه‌گه‌ر چی به گه‌وره‌ترین فه‌زڵ و پایه‌ش گه‌یشتبێت، چونكه هێشتا كه‌مته‌رخه‌مه به‌رامبه‌ر به‌جێهێنانی هه‌قه‌كانی خوای گه‌وره، هه‌روه‌ها له‌به‌ر ئه‌وه‌ش كه مرۆڤ به‌ده‌رنییه له‌وه‌ی كه به‌رده‌وام كه‌م و كوڕی و ناته‌واویی هه‌یه بۆیه به‌رده‌وامیش پێویستی به‌ئیستیغفاره.

واته: ((پەروەردگارا من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە ستەمێکی زۆر و، کەس لە گوناه و تاوان خۆش نابێت جگە لەزاتی تۆ. جا لێم خۆشبە بە لێخۆشبوونێکی خۆت و رەحمم پێبکە، بەراستی خۆت لێبووردەو بەخشندەیت)). هەروەها لە (السنن) دا هاتووەکە: عن أبي بكر ﷺ قال: يَا رَسُولَ الله، عَلِّمْنِي دُعاءً أَدْعُوا بِهِ إِذا أَصْبَحْتُ وَإِذا أَمْسَيْتُ، فَقَالَ: ((قُلْ: اللَّهُمَّ فاطِرَ السَّماواتِ وَالأَرْضِ، عالِمَ الغَيْبِ وَالشَّهادَةِ رَبَّ كلِّ شَيءٍ وَمَليكَه، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاّ أَنْت، أَعوذُ بِكَ مِن شَرِّ نَفْسي، وَمِن شَرِّ الشَّيْطانِ وَشِرْكِه، وَأَنْ أَقْتَرِفَ عَلى نَفْسي سوءاً أَوْ أَجُرَّهُ إِلى مُسْلِم، قُلْهُ إِذا أَصْبَحْتَ وإِذا أَمْسَيْتَ وإِذا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ))[1] صحيح: أخرجه أبوداود(٥٠٦٧)، والترمذي(٣٣٩٢)، من حديث أبي هُريرة ﷺ مرفوعاً. واتە: ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، نزایەکم فێرکە هەر کات بەیانی و ئێوارەم بەسەر داهات بلێیمەوە، ئەویش فەرمووی: ((بلێ: پەروەردگارا ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی زانای نهێنی و ئاشکرا، ئەی پادشاو خاوەنی هەموو شتێك، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی نەفسم و، لە شەڕو هاوبەشیی شەیتان، وە لەوەی کە نەفسم تووشی خراپەیەك بکەم یان بە موسڵمانێکەوەی بنالێنم، بەیانیان و ئێوارن و هەر کات چویتە سەر نوێنەکت ئەم نزایە بلێ)).

---

(١)_ ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ لەپێغەمبەری خوای ﷺ داواکرد نزایەکی فێرکات لە بەیانیان و ئێواراندا بیلێتەوە، ئەویش ئەم نزایەی فێر کرد ((أَللَّهُمَّ فاطِرَ السَّماواتِ وَالأَرْضِ، عالِمَ الغَيْبِ وَالشَّهادَةِ رَبَّ كلِّ شَيءٍ وَمَليكَه، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاّ أَنْت، أَعوذُ بِكَ مِن شَرِّ نَفْسي، وَمِن شَرِّ الشَّيْطانِ وَشِرْكِه، وَأَنْ أَقْتَرِفَ عَلى نَفْسي سوءاً أَوْ أَجُرَّهُ إِلى مُسْلِم))، مرۆڤ لەوە بەدەر نابێت کە نەفسی خۆی تووشی خراپەیەك بکات، بۆیە پێویستی بە ئیستیغفارو داوای لێبوردن دەبێت، ئەگەر ئەوە ئەبوبەکری صیددیق بێت ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کرد ئەو نزایە بکات، کەوا بوو ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بەردەوام پێویستی بە ئیستیغفارە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی ئەبوبەکری ﷺ فێرکرد بەیانیان و ئێواران و کە چووە سەر نوێنەکەی ئەو نزایە بلێتەوە.

کەوا بوو بۆ هیچ یەکێك نییە لەو باوەڕە دابێت کە پێویستی بە تەوبەو پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە نەبێت بۆ لای خوای گەورە، وە ئیستیغفارو داوای لێبوردن لەو تاوانانەی کە ئەنجامی داوە، بەڵکو بەردەوام هەموو کەسێك پێویستی بەوە دەبێت[1].

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا(٧٢) لِيُعَذِّبَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا(٧٣)﴾[2] [الأحزاب: ٧٢_٧٣] واتە: بێگومان ئێمە سپاردەمان نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکاندا (هەڵگرتنی ئەمانەتی دینداریمان پێشنیارکرد بۆیان) بەڵام هیچیان ڕازی نەبوون کە هەڵیگرن و ترسان لەو (ئەمانەتە) کەچی ئادەمی ئەو (سپاردەی) هەڵگرت بە ڕاستی ئەو (ئادەمی) زۆر ستەمکارو نەزانە بۆ ئەوەی خوا پیاوان و ئافرەتانی دوو ڕوو سزا بدات و پیاوان و ئافرەتانی هاوەڵ دانەر وە لە پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار تەوبە وەرگرێ وە خوا لێبوردەی میهرەبانە.

---

(١)_ ئا ئەمەیە دەرەنجامی ئەوانەی کە لە پێشتر باسمان کرد کە بۆ هیچ کەسێك نییە لەو باوەڕە دابێت کە پێویستی بە خوای گەورە نەبێت، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه ئیستیغفاریان کرد بێت و، نزایان کرد بێت و، لە خوای گەورە ترسا بن لە کاتێکدا ئەو هەموو فەزڵ و عیبادات و پەرستنانەیان هەبێت، کەوا بوو کەسانی دیکە دەبێت چۆن بن؟

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا﴾ بێگومان ئێمە سپاردەمان نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان داو هەڵگرتنی ئەمانەتی دینداریمان بۆ پێشنیارکردن بەڵام هیچیان ڕازینە بوون کە هەڵیگرن و لەو ئەمانەتە ترسان، خوای گەورە ئەو

ئەمانەتەی نیشـاندان، بـەڵام سەرپشـکی کـرد بـوون، ئـەگینا ئەگـەر بەناچاری بوایە گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگار دەبوون و سەرپێچی فەرمانەکەیان نـەدەکرد، ﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا﴾ بە هەڵگرتنی ڕازی نەبوون چونکە بێوەیی و سەلامەتیان بـە چاکتر دانا، ﴿وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا﴾ لە دەرەنجامەکانی بەرپرسیارێتی ئەو ئەمانەتە ترسان، مەبەستیش بەئەمانەت هەموو ئەو شتانەیە کە بەرپرسیارێتیت هەڵگرتووە بەرامبەر خوای گەورە، بەرامبەر مرۆڤەکان، لەگەڵ نەفسی خۆتدا، بـەجێهێنانی هـەموو ئـەو پەرستنانەی کە خـوای گـەورە خسـتویەتیە ژێـر بەرپرسـیارێتی تـۆوە ئەمانەتـە، خواپەرستیت، یەك خواپەرسـتیت، دڵسـۆزیت بـۆ خـوای گـەورە، بـەجێهێنانی فـەرزەکان، وازهێنـان لـە قەدەغـەکراوەکان هـەموو ئەمانـە ئەمانـەتن و خـوای گـەورە خسـتویەتیە ژێـر بەرپرسـیارێتی تـۆوە، هـەروەها ئـەو ئەمانەتـەی لـە نێـوان تـۆ و خەڵکیدایـە، ئەگەر بەوەزیفەیەك یان لە پلەیەکدا بویتـە بەرپرسیاری کۆمـەڵێك خـەڵك، ئەمـە ئەمانەتـەو خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ [النساء: ٥٨] واتــە: بەڕاسـتی خـوا فـەرمانتان پێـدەکات بەدانـەوەی گشـت سـپاردەکان بـۆ خاوەنەکانیان. مەبەستیش بـە ئەمانـەت ئـەو بەرپرسـیارێتی و وەزیفانەیـە کـە مرۆڤ هـەڵی دەگرێـت، نـەك تـەنها بـۆ مووچـە وەرگـرتن، بـەڵکو بەپرسـیارێتی وەزیفەیـەك هەڵدەگرێت بۆ ئەوەی خزمەتی بـرا موسـڵمانەکانی بکـات، پێویسـتیەکانیان جێبـەجێ بکات، ئا ئەمەیە مەبەستە سەرەکیەکە، مەبەست تەنها پارە نییـە، مەبەسـت ئەوەیـە کارێك ئەنجام بدات و سوود بە براکانی بگەیـەنێت. هـەروەها هـەڵگرتنی نهێنیـەکانیش ئەمانەتـە، ئەگـەر نهێنیـەکیان خسـتیتە ئەسـتۆ و پێیـان گوتیـت مەیدرکێنـە، ئـەوە ئەمانەتـە، نهێنـی ئەمانەتـە. هـەروەها سـپاردەکان کـە لای تـۆ دانـراوە ئەمانەتـە، کەسانێك وا دەزانن ئەمانەت بریتیە لە سپاردەکان بە تەنها هیچی تر، بەڵام لە ڕاستیدا

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

سپاردەکان تەنها یەك جۆرە لە جۆرەکانی ئەمانەت. هەروەها ئەمانەتی نێوان تۆ و نەفسی خۆت، خوای گەورە ئەمانەتی نەفسی خۆتی خستۆتە ژێر بەرپرسیارێتی خۆتەوە بەوەی تەماشای بەرژەوەندیەکانی بکەیت، لە زیانەکان بە دوری گریت، سوودەکانی بۆ فەراهام بکەیت، هانی بدەیت بۆ ئەنجام دانی تاعەت و گوێڕایەڵی خوای گەورە، نەفسی خۆت ئەمانەتە بە لای تۆوە. کەوا بوو ئەمانەت قورسە بۆیە ئاسمانەکان و زەمین بە هەڵگرتنی ڕازینە بوون، چونکە قورسە، ﴿وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ﴾ ئادەم و نەوەکانی هەڵیانگرت، دەستکەوتەکەیان بە چاکتر دانا، چونکە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوای گەورە بکات و، بە جوانی جێبەجێی بکات پاداشتی زۆر گەورەی دەست دەکەوێت، کەوا بوو ئەمان ئەو دەستکەوتەیان بە چاکتر دانا کە تیایدایە، بەلام ئاسمانەکان و زەمین بێوەیی و سەلامەتیان هەڵبژارد، بەلام مرۆڤ هەڵیگرت بە ئومێدی دەستکەوتنی ئەو پاداشتەی کە تیایدایە ئەگەر وەکو خۆی جێبەجێ بکرێت، ﴿إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ ستەمکارە لە نەفسی خۆی، نەفامە بە هەقی ئەمانەت، هیچ حیسابێکی بۆ نەکردو بە جوانی جێبەجێی نەکرد، ﴿لِيُعَذِّبَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ﴾ بۆ ئەوەی خوای گەورە سزای پیاوان و ئافرەتانی دوو ڕوو وە پیاوان و ئافرەتانی هاوەڵپەرست بدات، لە نەوەی ئادەم ئەوانەی ئەم ئەمانەتەیان خستە ئەستۆی خۆیانەوە، ﴿وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ وە بۆ ئەوەی لە پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار تەوبە وەرگرێت، وە خوا لێبووردەی میهرەبانە. لێرەدا جێگەی ئاماژە پێدانە کە خوای گەورە ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە خەڵکی لە ئاستی بەجێهێنانی بەرپرسیارێتی ئەمانەتدا سێ جۆرن، جۆری یەکەم: ئەوانەی لە ڕواڵەت و پەنهانەوە ناپاکیان لە ئەمانەت کرد، ئەوانە بریتین لە کافران و هاوەڵپەرستان، جۆری دووەم: ئەوانەن لەڕواڵەت و پەنهانەوە

بەرپرسیارێتی ئەمانەتیان جێبەجێکردووە، ئەمانیش بریتین لە ئیمانداران و موسڵمانانی لە پیاوان و ئافرەتان، جۆری سێیەم: ئەوانەن لە ڕواڵەت ئەمانەتیان هەڵگرت و، لە پەنهانیشەوە ناپاکیان لێکرد، ئەمانیش دوو ڕووەکانن، ﴿وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیماندارانیش بە تەواوی ئەمانەت جێبەجێ ناکەن بەڵام خوای گەورە دەیان بورێت، خوای گەورە ئەگەر حیسابی لەگەڵ کردانیە سزای دەدان بەڵام لێیان خۆش دەبێت. هەموو ئامانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەوەی ئادەم بەردەوام لە کەم و کوڕی و ناتەواویدا دەژی بۆیە خوای گەورە تەوبەو ئیستیغفاری بۆ داناون.

مرۆڤ ستەمکارو نەفامە، ئەنجامی ئیمانداران پیاوان و ژنانیش هەر تەوبەکردنە[١]، خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا هەواڵی تەوبە کردنی بەندە چاکەکانی خۆی و لێخۆش بوونیانی پێداوین.

بە فەرموودەی (صحیح) سابت بووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لَنْ يَدْخُلَ الجَنَّةَ أَحَدٌ بِعَمَلِهِ))، قالوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ الله ؟ قَالَ: ((وَلاَ أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِي الله بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَفَضْلٍ))[٢] صحيح: أخرجه البخاري (٥٦٧٣) و (٦٤٦٣)، ومسلم (٢٨١٦)، (٢٧١٧)، من حديث أبي هُريرة وعائشة رضي الله عنهما مرفوعاً.

---

(١)_ واتە: تەوبە کردن لەو ستەمکاری و نەفامییەتە.

(٢)_ بە هەشت شوێنێکی برزو بە نرخە، تەنها بە ئەنجام دانی کردەوەی چاك بەدەست ناهێنرێت، کردەوەکان هەرچەندە چاك و زۆریشبن هێشتا هەر نابنە نرخێك بۆ چوونە بەهەشت، چونکە بەهەشت شتانێکی تێدایە کە نەچاوەکان بینیویانە، نەگوێیەکانیش بیستویانە، نە بە دڵی مرۆڤدا هاتووە، وە لەبەر ئەوەی بەهەشت بەردەوامە، نەمان و لە ناوچوونی بۆ نییە، بۆیە کردەوەی نەوەی ئادەم نرخێك نییە بۆ چوونە بەهەشت، بەڵکو تەنها هۆکارێکە بۆ چوونە بەهەشت، تەنها هۆکارێکە، خوای گەورە ئەگەر لەسەر کەم و کورپی و ناتەواویەکان موحاسەبەی مرۆڤ بکات ناچێتە بەهەشتەوە، بەڵکو دەچێتە ئاگرەوە، بەڵام خوای گەورە بەڕەحمەت و بەزەیی خۆی مرۆڤ دەخاتە بەهەشتەوە، کەوابوو نابێ مرۆڤ بەکردەوەکانی خۆیەوە بنازێت و فریوی پێ بخوات، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەسێك بەکردەوەکانی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە))، گوتیان: ((تەنانەت تۆش، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ فەرمووی: منیش))، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەر هەموو خەڵکی زیاتر خواپەرستی و کردەوەی چاکی هەیە، بۆیە پێیان گوت: تەنانەت تۆش بەکردەوەکانت ناچیتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: ((منیش مەگەر خوای گەورە بە

ڕەحمەت و بەزەیی خۆی دام پۆشێت))، وە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ٱدْخُلُوا ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[النحل: ٣٢] واتـە: بچنە بەهەشـتەوە بـەهۆی ئـەوەی کـە کـردەوە چاکەکانتان ئەنجام دەدا لە دونیادا، لەم ئایەتەدا پیتی وشە نێو ﴿بِمَا﴾ پێی دەگوترێ (بائی) سەبەبی نەك مانای (عِوَض) (لەجیاتی)، واتـە مانـای ئایەتەکـە بـەم جۆرەیە: بچنە بەهەشتەوە بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەوە کە لە دونیادا دەتـان کـرد، نـەك بـەم جۆرە: بچنە بە هەشتەوە لە جیاتی ئەو کردەوە چـاکانەی کـە لـە دونیـادا دەتـانکرد، چونکە کردەوەکان هەرچەندە چاك و زۆریش بـن نابنـە نرخێـك بـۆ چـوونە بەهەشت، بەهەشت زۆر زۆر لەوە بەرزتر گەورەترە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە: کردەوە کەم و کوڕیی زۆر و ناتەواویی و کەلێنی زۆری تێدا دەبێت، بۆیـە پێویسـتە ئـادەمیزاد بەخۆیـەوە نـەنازێت و بـە خۆیـدا هەڵنـەدات، لەگـەڵ ئەوەشـدا نابێـت لـە ڕەحمـەت و بەزەیی خوای گەورە بێ ئومێد بێت، وە ناشبێت کردەوەی چاکیش پشتگوێ بخات و، بڵێـت: ئەگـەر خـوای گـەورە بەهەشـتی بـۆ نوسـیبێتم ئـەوە بـە دڵنیـایی دەچمە بەهەشتەوە، ئەمە جایز نییە _ پەنا بە خوا _ بـەڵکو پێویسـتە ئـادەمیزاد هۆکارەکە ئەنجام بدات کە بریتیە لە کـردەوەی چـاکە، چـونکە ئـەوەی کـردەوە نـەکات ناچێتە بەهەشتەوە، بەڵام دڵنیا بن ئەوەشی کـە دەچـێتە بەهەشـتەوە تـەنها بـە ڕەحمـەت و بەزەیی خـوای گـەورە دەچـێتە بەهەشـتەوە، چـوونە بەهەشـتیش بـەکردەوە کردنـە، کردەوەی چاك.

ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە نابێت ئادەمیزاد بەخۆیدا بنازێـت و بەخۆیـدا هەڵدات و، پاکانە بـۆ نەفسـی خـۆی بکـات، نابێـت کردەوەکـانی بـەزۆر بزانێـت و فریـوی پـێ بخوات، بەڵکو پێویستە نەفسی خۆی بە کەم تەرخەم دابنێـت، بـەردەوام ئیسـتیغفارو تەوبە بکات بەرامبەر بەو کەم تەرخەمیانە، دڵنیا بن ئەو کەسەی بەکردەوەکانی خۆی سەرسام بێت و بە زۆریان بزانێت هەرگیز ئیستیغفار و داوای لێبوردن و تەوبە ناکات.

مانای ئەم فەرموودەیەش پێچەوانەی ئەو دەقە قورئانیە نییە کە خوای تەعالا دەفەرمووێ: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾[1] [الحاقة: ٢٤] واتە: (پێیان دەگوترێت) بخۆن و بخۆنەوە، نۆشتان بێت بەهۆی ئەو چاکانەوە کەلە ڕۆژانی ڕابردوودا کردوتانە. لەم ئایەتەدا پیتی بائی نێو ﴿بِمَا﴾ مانای (السَّببية) (هۆکاری شتەکەم) دەبەخشێت نەك مانای (عِوَض) (لە جیاتی)، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نکۆڵیی لە(باء العِوَض)ی بەمانای (لە جیاتی) دەکات[2]،

---

(١)_ مانای ئەم ئایەتە ئاشکرایەو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چوونە بەهەشت بە ئەنجامدانی کردەوەی چاکە، لە ڕواڵەتدا وا دیارە کە پیتی (باء)ی نێو (بِمَا) (باء العِوَض)ە، بەڵام وانییە، لە ڕاستیدا تەنها (باء السببية)یە.

(٢)_ پێغەمبەری خوا ﷺ نکۆڵیی لە (باو المقابلە والمعادلە) کردووە، واتە: نکۆڵیی لەوە دەکات کە ئادەمیزاد ئەوەندە کردەوەکانی چاك و باشبن بکەن بەئاستی چوونە بەهەشت، واتە: ئادەمیزاد کردەوە بکات و لە جیاتی ئەو کردەوانە شایستەی چوونە بەهەشت بێت، چونکە کردەوە نەیەکسان دەبێت بەچوونە بەهەشت نە بەرامبەرویش دەبێت بەچوونە بەهەشت، بەهۆی ئەو کەم و کوڕی و ناتەواویانەوە کە لە کردەوەکاندا دێنەکایەوە، بەم جۆرە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە چوونە بەهەشت بەهۆی فەزڵ و بەخشندەی و لێبوردەیی و ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە بە دەست دێت. ئەنجامدانی کردەوە چاکەکانیش تەنها هۆکارێکن بۆ گرتنەبەری ڕێگای چوونە بەهەشت. ئەگەر ئەو فەزڵ و ڕەحمەتەی خوای لەگەڵدا نەبێت هەرگیز مرۆڤ بەکردەوەکانی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە.

قورئانیش (باء السببیة)ی بەمانای (بەهۆ)ی جێگیرکردووە[١].

وە قسەی ئەوانەی دەڵێن: ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆشویست چیتر تاوانەکان زیانی پێناگەیەنن[٢]،

---

(١)_ ئەمە تەفسیرو ڕاڤەی ئەو ئایەتەی خوای گەورە دەکات کە دەفەرموێ: ﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[النحل: ٣٢] بچنە بەهەشتەوە بەهۆی ئەوەی کە دەتانکرد لەدونیادا، هەروەها تەفسیرو ڕاڤەی ئایەتەکەی تریش دەکات کە دەفەرموێت: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾[الحاقة: ٢٤] پێیان دەوترێت بخۆن و بخۆنەوە، نۆشتان بێت بەهۆی ئەو چاکانەوە کەلە ڕۆژانی ڕابردوودا کردوتانە، کردەوەکان تەنها هۆکارێکن بۆ گرتنەبەری ڕێگای بەهەشت، بەهۆی فەزڵ و بەخشندەی و لێبوردەیی و ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە دەشچیتە بەهەشتەوە. ئەمە ئەو بەڵگەیە کە دەیسلەمێنێت ئادەمیزاد بەردەوام پێویستی بەتەوبەکردن و گەڕانەوە دەبێت بۆ لای خوای گەورە، پێویستی بەئیستیغفارو داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەبێت، پێویستی بەوەیە کە بەردەوام لە خوای گەورە داواکار بێت بە فەزڵ و ڕەحمەت و بەزەیی خۆی بیخاتە بەهەشتەوە.

(٢)_ بەڵێ، خوای گەورە هەر کات بەندەیەکی خۆی خۆشویست بۆ تەوبە کردن و ئیستیغفار کردن ڕێنومایی دەکات، ئەمە مانا ڕاستەکەیەتی، مانای ئەوە نییە کە هەر کات خوای گەورە بەندەیەکی خۆی خۆش ویست ئیتر هەر چەندە تاوان بکات زیانی پێنەگەیەنێت، هەرگیز ئەمە ڕاست نییە، چونکە ئەوە گوفتاری کۆمەڵی مورجیئەیە کە دەڵێن: ئیمان بەدڵە، لەگەڵ بوونی ئەو ئیمانەدا گوناه و تاوان هیچ زیانێکی پێی ناگەیەنن، ئەمە گوفتارێکی زۆر پووچە، بەڵکو گوناه و تاوان و سەرپێچی کردن زیان

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

دەگەیەنن، زیان بە ئیمانداران دەگەیەنن، پێدەچێت لە رۆژی قیامەتدا بە ئاگر سزا بدرێن لە کاتێکدا ئیمانداریشن بەهۆی گوناه و تاوان و سەرپێچیەکانیانەوە، پێدەچێت ماوەیەکی درێژیش لە ئاگردا بمێننەوە، دەسووتێن، پاشان لێی دێنە دەرەوە، هەروەها ئەو موسیبەت و کارەساتانەی کە لە دونیادا بەسەر موسڵمانان و ئیمانداراندا دێن، موسیبەت و کارەسات لە کاتێکدا ئیماندارن، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی گوناه و تاوان لە دونیاشدا ئەو زیانانەی دەبێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ [الشورى:٣٠] واتە: وە هەر ناخۆشییەکتان تووش بووبێ ئەوە بەهۆی کردەوەی (خراپی) خۆتانەوەیە. دڵنیابن گوناه و تاوان و سەرپێچی لە دونیاو قیامەتیشدا زیاندارە، بەدەر لە تەوبە کردن و ئیستیغفارو داوای لێبوردنکردن هیچ شتێکی تر لەسەر ئیمانداری لانابات. کەوا بوو با چیتر هیچ کەسێك زات نەکات و بڵێت: من ئیماندارم و تاوان زیانم پێی ناگەیەنێت وەکو گوفتاری مورجیئەکان.

ئەو مانایە دەبەخشێت: کە ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆشویست بۆ تەوبەو، ئیستیغفارو، داوای لێبوردن ڕێنومایی دەکات، چیتر لەسەر تاوان کردن سوور نابێت، وە هەر کەسێکیش لەو باوەڕ دابێت کە تاوان کردن زیان بەو کەسانە ناگەیەنێت کە سوورن لەسەر ئەنجامدانی، ئەوە کەسێکی گومڕایەو، پێچەوانەی قورئان و سوونەت و یەك دەنگی پێشینی چاك و پێشەوایانیش جولاوەتەوە [1]

---

(١)_ ئاماژە بۆ مورجیئەکان دەکات، دەڵێن: گوناه و تاوان و سەرپێچی کردن زیان بە ئیماندار ناگەیەنێت وەکو چۆن تاعەت و گوێڕایەڵی سوود بە کافر ناگەیەنێت، ئێمەش دەڵێین: بەڵێ، تاعەت و گوێڕایەڵی سوودبە کافر ناگەیەنێت، بەڵام گوناه و تاوان و سەرپێچی کردن زیانبە ئیماندار دەگەیەنێت، ئەی ئیتر بۆچی قەدەغەی گوناه و تاوان و سەرپێچی کردنمان لێکراوەو، فەرمانی تاعەت و گوێڕایەڵیی و تەوبەکردنمان پێدراوە؟ ئایا لەبەر ئەوەنییە کە گوناه و تاوان زیانبەخشن، بەئیماندار زیاندەگەیەنن، ئەو کەسانەی لەسەر ئەنجامدانی سوورن، بەڵام ئەو کەسانە تەوبە دەکەن و بە تەواوای وازی لێدێنن زیانیان پێی ناگەیەنێت، هەرکەس تەوبە بکات خوای گەورە تەوبەکەی وەردەگرێت و لێی دەبورێت، بەڵام ئەو کەسانەی لەسەر ئەنجامدانی تاوانەکان سوورن ئەوە لە دونیاو قیامەتیشدا زیانیان پێدەگەیەنێت. ئەو کەسانەی لەو باوەڕەدان کە تاوان زیان بەوکەسانە ناگەیەنێت کە لەسەر ئەنجامدانی بەردەوامن با دڵنیا بێت پێچەوانەی قورئان و سوونەت و یەك دەنگی زانایان جولاوەتەوە، چونکە

---------------------------------------------

---------------------------------------------

-----------------------------------

قورئان و سوونننەت ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوناھ و تاوان و سەرپێچی کردن زیانی بە ئیمانداران دەگەیەنێت، بەشێك لە هاوەڵان لە جەنگی ئوحوددا سەرپێچی کردن زیانی پێگەیاندن، سەرپێچی کردنێك بوو لە لایەن هێندێکیانەوە کە بریتی بوون لە تیر هاوێژەکان ئەوانەی وازیان لە شاخەکە هێنا لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو بوون: ((شاخەکە چۆڵمەکەن لەکاتێکدا سەرکەوتین یان دۆڕاین)) بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەر لە شاخەکە هاتنە خوارەوە، موسڵمانان شکستیان هێنا بەهۆی تاوانەوە، بۆیە ئەگەر سەرپێچی کردنێك لە لایەن هێندێکیانەوە کاریگەری لەسەر هەموان هەبو بێت لە جەنگێکدا، کەوا بوو ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە گوناھ و تاوان و سەرپێچی کردن زیان بەخشن، چاکترینەکانی هەر هەموو مرۆڤایەتی کە هاوەڵانن سەرپێچی کردن زیانی پێگەیاندن ئیتر بۆ کەسانی تر دەبێت چۆن بێت؟

ئینجا هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێ دەیبینێتەوە، وە هەر کەسێکیش بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی کردبێ دەیبینێتەوە[1].

---

(١)_ لە سورەتی (الزلزلة) دا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا (١) وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا (٢) وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا (٣) يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا (٤) بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا (٥) يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ (٦) فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨)﴾[الزلزلة: ١_٨] واتە: کاتێك زەوی هاتە لەرزە بەلەرزینی خۆی، لە کاتی ڕوودانی قیامەتدا، وە زەوی هەرچی شتی قورس و گرانی (نێوی) هەیە هەمووی فڕێدایە دەرەوە، واتە ئەو مردووانەی لە نێویدایە وە مرۆڤ لەو ڕۆژەدا دەڵێت: ئەوە زەوی چیەتی؟ مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێت لەو زەمین لەرزەیە، لەو شتە ترسێنەرو تۆقێنەرو سامناکە، لەو ڕۆژەدا (زەوی) دەنگوباسی خۆی دەگێڕێتەوە، واتە لەڕۆژی قیامەتدا زەوی شایەتی دەدات لەسەر هەموو ئەو کردەوانەی لەسەر ڕوویدا ئەنجام دراوە، خەیر و شەڕ، کە پەروەردگاری تۆ (وای) بۆ سرووش کردووە، خوای گەورە خۆی دەیانهێنێتە قسەکردن، خۆی فەرمانی پێکردوون شایەتی لەسەر نەوەی ئادەم بدەن، لەو ڕۆژەدا خەڵکی دەردەچن بەپەڕاگەندەو پەشێوی تا (پاداشتی) کردەوەی خۆیان نیشان بدرێ و، حیسابیان لەگەڵ بکرێت، ئینجا هەر کەسێك بەئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێ دەیبینێتەوە، ئەو وردیلەیە بچوکترین شتە، گوتراوە ئەو وردیلەیە بەکێشی مێرۆلەیەکی بچووکە، وە گوتراوە بەکێشی ئەو وردەخۆڵەیە کە هەوا هەڵیگرتووە، وەهەر کەسێکیش بەئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی کرد بێ دەیبینێتەوە، ئەوان دەڵێن: گوناه و تاوان و سەرپێچی کردن زیان بەخش نییە، لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێ: کەسێکیش بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی کردبێ دەیبینێتەوە، کەوا بوو چۆن دەڵێن: گوناه و تاوان و سەرپێچی کردن زیان ناگەیەنێت؟

له راستیدا بەندە ستایش کراوەکانی خوای گەورە تەنها ئەوانەن کەلەم ئایەتانـەدا باسکراون: ﴿وسارعوا إلى مغفرة من ربكم وجنة عرضها السموات والأرض أعدت للمتقين (١٣٣) الذين ينفقون في السراء والضراء والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس والله يحب المحسنين (١٣٤) والذين إذا فعلوا فاحشة أو ظلموا أنفسهم ذكروا الله فاستغفروا لذنوبهم ومن يغفر الذنوب إلا الله ولم يصروا على ما فعلوا وهم يعلمون﴾[1] [آل عمـران: ١٣٣_١٣٥].

---

(١)_ ﴿وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ﴾ پێشبڕکێ بکەن بۆ لێبوردنێکی گەورە لە لایەن پەروەردگارتانەوە، واتە: خێرا بن چەند لە تواناتان دایە، دوانەکەویت و سستی نەنوێنیت، ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ بـۆ بەهەشـتێك کـە پانییەکەی بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە کە بۆ لـە خـوا ترسـان ئـامادە کـراوە، واتە: خوای گەورە خولقاندویەتی لەگەڵ ئەو خۆشگوزەرانی و خێراتـەی کـە تێیدایـە، باشە بۆ کێ؟ بۆ تەقواکاران و پارێزکاران ئەوانەی لە دونیادا تەقوای خوایـان دەکـرد، خۆیان لـە گونـاه و تـاوان و سەرپێچیەکان بـە دوور دەگرت، گوێڕایـەڵیی و تاعـەت و خواپەرستیان دەکرد، باشە ئەو تەقواکارو پارێزکارانە کێن؟ ئەوانەن کە خوای گـەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەوانەی ماڵ دەبەخشن لە ڕێی خـوادا لـە کـاتی خۆشـی و ناخۆشیداو، ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوەو، دەبوورن لەخەڵکی، خواش

چاکەکارانی خۆش دەوێت، بەم شێوە سیفاتەکانیان باس دەکات، تا دەفەرموێ:
﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً﴾، شاهیدی قسەکانمان و مەبەستی سەرەکی مان لێرەدا
ئەمەیە ﴿فَعَلُوا فَاحِشَةً﴾ واتە: هەر کات گوناه و تاوان و سەرپێچیەکی زۆر زۆر قیزەون
و ناشیرینیان ئەنجام دا ﴿أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ﴾ یان ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردو
تاوانی لەوە بە خوارترو بچوکتریان ئەنجام دا وەکو تاوان و سەرپێچی و خراپەکان
﴿ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ
يَعْلَمُونَ﴾ مەبەستمان عێرەیە: کە یادی خوای گەورە دەکەنەوە ئینجا داوای لێبوردن
دەکەن بۆ گوناهەکانیان، ئایا کێ لە گوناهەکان دەبورێت جگە لە خوا؟ وە بەردەوام
نابن لەسەر ئەوەی کە کردویانە لە کاتێکدا بزانن گوناهە، ﴿ذَكَرُوا اللَّهَ﴾ گەورەیی
خوایان هێنایەوە یادی خۆیان و لێی ترسان و دڵنیا بوون لەوەی کە شایەت و
چاودێرە بەسەریانەوە ﴿فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ﴾ ئەهلی بەهەشت ئیستیغفار دەکەن و داوای
لێخۆشبوون لە خوای بە بەزەیی دەکەن دەربارەی ئەو گوناه و تاوان و سەرپێچیانەی
ئەنجامیان داوە، ئیتر لە کوێن ئەو جۆرە کەسانەی دەڵێن: گوناه و تاوان و سەرپێچی
کردن زیانی نییە.

## بەر پەرچدانەوەی ئەو کەسانەی کە قەدەری خوا دەکەنە بەهانەی تاوانەکانیان

وە هەر کەسێك لەو بڕوایەدا بێت کە قەدەر بەهانەیەکە بۆ خەڵکانی تاوانکار ئەوە قسەکەی وەك و قسەی ئەو هاوەڵپەرستانەیە[1]

---

(١)_ قەزاو قەدەر لەلایەن خوای گەورەوەیە، بڕوا پێهێنانی پایەیەکە لە شەش پایەکانی ئیمان وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((الإيمان أنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ)) واتە: ((ئیمان بریتیە لەوەی بڕوا بەخواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و بڕوا بەقەدەر خێرو شەڕی بێنیت))، هەر کەسێك بڕوای بە قەزاو قەدەر نەبێت با دڵنیا بێت نکۆڵیی لە پایەیەك لە پایەکانی ئیمان کردووە، پێویستە باوەڕ بوون بە قەدەریش بەو جۆرەبێت کە خوای گەورە تەقدیری شتەکانی کردووە پێش ڕوودانی، یەکەم جار خوای گەورە زانیویەتی بەزانینە ئەزەلیەکەی کە وەسف کراوە بەو زانینە ئەزەلیە ئەبەدیە، زانیویەتی ئەوەی کە بوەو ئەوەشی کە دەبێت، پاشان ئەوەی لە(اللوح المحفوظ)دا نووسیوە، کاتێ قەڵەمی خوڵقاند پێی فەرموو بنووسە ئیتر ئەوەی دەبێت و ڕوو دەدات تاوەکو ڕۆژی قیامەت لە(اللوح المحفوظ)دا نووسیەوە، کەوا بوو هیچ شتێك نەماوە لە(اللوح المحفوظ)دا نە نووسرا بێت، هەموو شتێك لەوێدا نووسراوە، پاشان خوای گەورە ئەو شتانە لە کاتە دانراوەکانی خۆیدا دەخوڵقێنێت، ویستی دەکات و پاشان لە کاتە دانراوەکانی خۆیدا دەیخوڵقێنێت، کەوا بوو هەر کەسێك ئیمانی بە قەزاو قەدەر نەبێت ئەوە ئیماندار نییە بە خوای گەورە، وە هەڕەشە لێکراوە بە ئاگر، هەرگیز چێژی ئیمان ناکات تا نەزانێت و باوەڕی بەوە نەبێت کە ئەوەی تووشی بووە هەرگیز لێی بەهەڵەدا نە دەچوو، ئەوەشی لێی بە هەڵە داچووە هەرگیز تووشی نا بێت، با بێئارام نەبێت لە کاتی موسیبەت و کارەساتدا، وەبا فریونەخوات و دڵخۆشیش نەبێت لەکاتی نیعمەتدا، بەڵکو با سوپاس گوزار بێت

له كاتی نیعمه‌تدا و با ئارام گریش بێت له‌كاتی سزادان و تۆڵه لێ سه‌ندنه‌وه‌دا، ئه‌م بوخته‌ی بڕوا بوون بوو به قه‌زاو قه‌ده‌ر، خوای گه‌وره‌ش له قورئانی پیرۆزدا هه‌واڵی ئه‌وه‌ی پێداوین و، ده‌فه‌رموێ: ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢)﴾[الحديد: ٢٢] واته: هیچ زیان و به‌لایه‌ك ڕوونه‌داوه نه‌له زه‌وی و نه له خودی خۆتاندا ئیللا له (اللوح المحفوظ)دا نووسراوه پێش ئه‌وه‌ی به‌دیبهێنین بێگومان ئه‌وه بۆ خوا زۆر ئاسانه، پاشان خوای گه‌وره حیكمه‌تی ئه‌و كاره‌شمان پێده‌ڵێت و ده‌فه‌رموێ: ﴿لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾[الحديد: ٢٣] تا خه‌فه‌ت نه‌خۆن بۆ ئه‌وه‌ی له ده‌ستتان چووه وه دڵخۆش و غه‌ڕانه‌به‌ن به‌وه‌ی كه پێی داوون وه‌خوا هیچ خۆ به‌زلزانێكی شانازی كه‌ری خۆش ناوێت. پێویسته ئاده‌میزاد بڕوای به‌مه هه‌بێت.

دوو تایه‌فه‌ی گومڕاهه‌ن، تایه‌فه‌یه‌كیان نكوڵیی له‌قه‌ده‌ر ده‌كه‌ن و، ده‌ڵێن: شته‌كان نوێن و ته‌قدیرێكی پێشتریان نییه و خوای گه‌وره ته‌قدیری نه‌كردوون و، نه‌ینوسیون و، له‌ڕاستیدا كاتێك ده‌یزانێت كه ڕووده‌دات (إن الأمر مستأنف وليس له تقدير سابق، لم يقدّره الله ولن يكتبه وإنما يعلمه إذا وقع) ئه‌مه باوه‌ڕی موعته‌زیله‌كانه كه به‌تایه‌فه‌ی قه‌ده‌ریه ناسراون چونكه نكوڵیان له قه‌ده‌ر كردووه، هه‌روه‌ها به‌مه‌جوسی ئه‌م ئوممه‌ته‌ش ناسراون چونكه ده‌ڵێن: به‌نده كرده‌وه‌كانی خودی خۆی ده‌خوڵقێنێت (العبد يخلق فعل نفسه) ئه‌وان دوو خوڵقێنه‌ری دیكه‌یان له‌گه‌ڵ خوای گه‌وره‌دا داناوه وه‌كو چۆن مه‌جوسه ئاگر په‌رسته‌كان خوڵقێنه‌رێكیان بۆ خه‌یر داناوه‌و، خوڵقێنه‌رێكیشیان بۆ شه‌ڕ داناوه، به‌ڵام ئه‌مان له مه‌جوسه ئاگر په‌رسته‌كانیش زیاده‌ڕۆتر بوون، چونكه ده‌ڵێن: هه‌موو مرۆڤێك كرده‌وه‌كانی خودی خۆی ده‌خوڵقێنێت، تایه‌فه‌ی دووه‌م: ئه‌وانه بوون كه له جێگیر كردنی (إثبات)ی

........................................................................

........................................................................

...ڕه‌وه‌ی ڕه‌وه‌دار کرد، تا ئه‌و ئاسته‌ی گوتیان: به‌نده‌کان ناچارن له‌سه‌رکردنی ... و بۆ خۆیان هیچ ده‌سه‌ڵاتێکیان نییه (نعبد محور على لعنه) هیچ ویستێ و ... و په‌سه‌ند کردنێکی نییه، مرۆڤ وه‌کو ئامێرێکه به ده‌ست ...ێکه‌وه، هیچ ویستێ و هه‌ڵبژاردنێکی نییه، ئه‌مانه پێیان ده‌گوترێت: ... جه‌هه‌میه‌کان و غه‌یری ئه‌وانیش، له‌و باره‌وه موشریك و هاوه‌ڵپه‌رستانیش ... ئه‌وان که‌وتوون، له‌م باره‌وه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿سيقول الذين أشركوا لو ... ما أشركنا ولا آباؤنا ولا حرمنا من شيء كذلك كذب الذين من قبلهم حتى ذاقوا ... قل هل عندكم من علم فتخرجوه لنا إن تتبعون إلا الظن وإن أنتم إلا ...﴾ [الأنعام: ١٤٨] واته: ئه‌وانه‌ی که هاوبه‌شیان بۆ خوا دانا بوو له‌مه‌ودوا ...ڵێن: ئه‌گه‌ر بیویستایه ئێمه‌و باوو باپیرانمان هاوبه‌شمان (بۆخوا) دانه‌ده‌نا، ئێمه هیچ هه‌ڵبژاردنێك و په‌سه‌ند کردنێکمان به ده‌ست نییه، خوا ویستی ئه‌مه‌ی بۆ کردووین، بۆیه ئێمه هیچ هه‌ڵبژاردنێکمان نییه، به‌م جۆره قسانه دڵنه‌وایی خۆیان ده‌ده‌نه‌وه، سه‌رزه‌نشت له‌سه‌ر خۆیان هه‌ڵده‌گرن، ده‌ڵێن: سه‌رزه‌نشت ناکرێین، چونکه ناچاری ئه‌م شتانه‌کراوین وه هیچ شتێکمان حه‌رام نه‌ده‌کرد، چونکه شتانێك حه‌رام ده‌که‌ن خوای گه‌وره حه‌رامی نه‌کردوون وه‌کو (السائبة) و (البحيرة) و (الموصولة) شتانێك حه‌رام ده‌که‌ن که خوای گه‌وره حه‌رامی نه‌کردوون، شتانێکیش حه‌ڵاڵ ده‌که‌ن که خوای گه‌وره حه‌رامی کردوون وه‌کو مرداره‌وه بوو، به‌و جۆره لۆمه‌و سه‌رزه‌نشت له خۆیان دوور ده‌خه‌نه‌وه هه‌ر به‌و شێوه‌یه ئه‌وانه‌ی پێش ئه‌مانیش درۆیان کرد هه‌تا سزاو تۆڵه‌ی ئێمه‌یان چه‌شت (ئه‌ی موحه‌ممه‌د ﷺ) بڵێ: ئایا هیچ زانیاریه‌کتان لایه تا ده‌ری بخه‌ن بۆمان و ده‌ریبڕن، ئه‌م قسانه‌ی ئێوه ئایا هیچ به‌ڵگه‌یه‌کی له‌سه‌ره گوایه خوای گه‌وره به‌کوفرو شیرك و هاوه‌ڵپه‌رستی و حه‌رام کردنی شته‌کانی ئێوه ڕازی بووه، ئایا هیچ به‌ڵگه‌یه‌کتان پێیه که خوای گه‌وره به‌وانه

ڕازی بووەو ناچاری ئەنجام دانی ئەو شتانەی کردوون، ئێوە شوێنی هیچ شتێك ناکەون بێجگە لە گومان وە ئێوە هەر لە خۆتانەوە بەگۆترە شت دەڵێن، خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوین کە ئەوان ئەو شتانە دەڵێن، وە گوتیشیان، خوای گەورە لەسورەتی (النحل) دا بەیادی هێناوینەتەوە کە ئەوان ئەوەیان گوتووە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلا آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ كَذَلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلاَّ الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾ [النحل: ٣٥] واتە: وە ئەوانەی هاوبەشیان داناوە بۆ خوا دەڵێن ئەگەر خوا بیویستایە بێجگە ئەو (خوا) هیچ شتێکمان نەدەپەرست نە ئێمەو نە باو باپیرانمان وە حەراممان نەدەکرد هیچ شتێ بەبێ فەرمانی ئەو پێشینانی ئەمانیش هەر بەو جۆرەیان دەکرد ﴿فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلاَّ الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾ دەی ئایا پێغەمبەران هیچیان لەسەرە بێجگە لە ڕاگەیاندنێکی ئاشکرا، ئەگەر خوای گەورە بە وانە ڕازی بوبێت و ئەوان هیچ هەڵبژاردن و پەسەند کردنێکیان بە دەست نەبێت ئیتر ناردنی پێغەمبەران چ سوودێکی هەیە؟ ناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێبەکان هیچ سوودێکی نابێت، چونکە کاتێ خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردوە کە قەدەغەی شیرك و هاوەڵپەرستی و کوفرو حەرام دەکات ئەمە مانای وایە خوای گەورە بەو شتانە ڕازی نەبووەو، بە شەرعیشی دانەناوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[النحل: ٣٦] واتە: سوێند بە خوا لە ناو هەموو گەلێ و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دووركەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بە کوفر ڕازی نابێت، پێی ڕازی نابێت و خۆشی ناوێت، بۆیە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی ڕێگریی لەو شتانە بکات، جەبریەکان لەسەر هەمان ڕێباوەڕی هاوەڵپەرستە پێشینەکانن ئەوانەی خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی کردوون.

ئ خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ﴾[1] [الأنعام: ١٤٨].

هەروەها خوای گەورە بەرپەرچیان دەداتەوەو، دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ حَتَّى ذَاقُوا بَأْسَنَا[2] قُلْ هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا[3]

---

(١)_ لە سورەتی (النحل) دا خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوین کە ئەو جۆرە قسانە دەڵێن، بۆیە خوای گەورە لە ئایەتەکەی سەرەوەدا دەفەرموێت: ﴿سَيَقُولُ﴾ واتە: لە داهاتووی نزیکدا دەڵێن، چونکە لەزمانی عەرەبیدا هەرکات پیتی (س) چووە سەر (فعل) کردار ئیتر ئەو مانایە دەبەخشێت کە لە داهاتووی نزیکدا شتەکە ڕوودەدات، وە ئەوە بوو کە گوتیشیان.

(٢)_ ﴿كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمانیش درۆیان کرد، پێغەمبەران و کتێبەکانیان بە درۆ خستەوەو، بە قەزاو قەدەر بەهانەیان دەهێنایەوەو، گوایە هیچ لۆمەو سەرزەنشتێکیان لەسەر نابێت، ﴿حَتَّى ذَاقُوا بَأْسَنَا﴾ هەتا سزاو تۆڵەی ئێمەیان چەشت، تا خوای گەورە سزای دان و تیاچوون، ئەگەر خوای گەورە بە قسەکانی ئەوان ڕازی بوایە سزای نەدەدان، ئەگەر خوای گەورە _وەکو ئەوان دەڵێن_ ناچاری ئەو شتەی کردنایەو، ئەوانیش هیچیان بە دەست نەبوایە ئەوە سزای نەدەدان، چونکە خوای گەورە ستەم لە هیچ کەسێك ناکات، چۆن سزای کەسێك بدات کە هیچ هەڵبژاردن و پەسەند کردن و ویستێکی بە دەست نەبێت و ناچارکرابێت.

(٣)_ واتە ئایا هیچ بەڵگەیەکتان پێیە لەسەر ئەو شتانەی کە لەسەر خوای گەورە دەیلێن.

إن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُونَ(١٤٨)[1] قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ فَلَوْ شَاء لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ﴾[2] [الأنعام: ١٤٨_ ١٤٩].

ئەگەر قەدەرو چارەنووس بۆ کەسێك بەهانەو بیانوو بوایە ئەوا خوای گەورە سزای ئەوانەی نەدەدا کە پێغەمبەرانیان بە درۆ دەخستەوە[3]،

---

(١)_ ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ﴾ ئێوە شوێنی هیچ شتێك ناکەون بێجگە لەگومان، بە ڕاستی بەد گومانی زۆربەی درۆیە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الأَنفُسُ﴾[النجم: ٢٣] واتە: تەنها شوێنی گومان و ئەو شتە دەکەون کە نەفسی خۆیان حەزی لێیەتی. شیاو نییە مرۆڤ شوێنی گومان بکەوێت، مەسەلەکانی بیر و باوەڕو بنەڕەتەکانی ئیمان پێویستە لەسەر یەقین و دڵنیا بوونی تەواو بینا بکرێت، نەك لەسەر گومان، ﴿وَإِنْ أَنتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُونَ﴾ وە ئێوە هەر لە خۆتانەوە بە گۆترە شت دەڵێن، نەك لەسەر خەمڵاندن و بۆچوون.

(٢)_ خوای گەورە دەسەڵاتی تەواوی بەسەرتان دا هەیە، چۆن ئێوە بەهانەی بۆ دێننەوەو، دەڵێن: خوای گەورە ناچاری کردوین، خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردوەو، کتێبەکانی دابەزاندووە قەدەغەی ئەو شتەتان لێ دەکات، ئێوە تواناشتان هەیە، خوای گەورە توانای پێداون دەتوانن وازی لێبێنن، توانای ئەنجام دانی ئەوانەتان هەیە کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوون، تواناو ویستتان هەیە، کەوا بوو خوای گەورە دەسەڵاتی تەواوی هەیە، بەڵگەی بەسەرتانەوە دامەزراندووە، پێغەمبەرانی بۆ ناردوون و، کتێبەکانی بۆ دابەزاندوون.

(٣)_ ﴿حَتَّى ذَاقُواْ بَأْسَنَا﴾[الأنعام: ١٤٨] هەتا سزاو تۆڵەی ئێمەیان چەشت، ئەگەر قەزاو قەدەر بەهانەو بیانوو بوایە بۆ کەسێك ئەوا خوای گەورە سزای نەدەدان، چونکە لەو کاتەدا بەهانەدار دەبوون، وەکو ئەوەی خۆیان دەڵێن: بەهانەدار دەبوون.

وەکو قەومەکانی نووح و، عادو، ثمودو، مؤتفکات و، قەومی فیرعەون، وە فەرمانیشی پەیدا بە سزادانی دەست درێژکاران[1]،

---

(۱)_ بەڵێ، ئەگەر مەزهەب و ڕێباوەڕیان ڕاست بوایە، ئەوا خوای گەورە پێغەمبەرانی نەدەناردو، کتێبەکانی دانەدەبەزاند کە قەدەغەی گوناه و تاوان و بەرپێچی و کوفرو شیرك و هاوەڵپەرستی بکەن، ئەگەر ئەوان ناچاری کردنی ئەو شتانە بکرایەن و، لە توانایاندا نەبوایە وازی لێبێنن، ئیتر سوودی ناردنی پێغەمبەران و، دابەزینی کتێبەکان چ بوو؟ بەدڵنیایی ئەوکاتە کارێکی بێ سوودو بێ مەبەست دەبوو، بەڵام ناردنی پێغەمبەران و، دابەزینی کتێبەکان بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ویستیان هەیەو هەڵبژاردن و پەسەندکردنیان بەدەستەو، بەویست و خواست و هەڵبژاردنی خۆیان تووشی ئەو شتانەبوون، بۆیە خوای گەورە ئومەتانی کافری وەکو قەومەکانی (نووح و، عادو، ثمودو، مؤتفکات کە قەومی لوط) بوون سزای دان، خوای گەورە لە بارەی مؤتفکاتەوە دەفەرموێ: ﴿وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَى(٥٣) فَغَشَّاهَا مَا غَشَّى(٥٤)﴾[النجم: ٥٣_٥٤] واتە: وە دێهاتە سەرو ژێرکراوەکانی (بەزەویدا) بردە خوارەوە(کە دێهاتەکانی گەلی لوط بوون) ﴿فَغَشَّاهَا مَا غَشَّى﴾ ئینجا ئەو دێهاتانەی داپۆشی ئەوەی کە داپۆشی، خوای گەورە لە ناوی بردن، ئەگەر ناچاری کردنی ئەو شتەیان خراپانە کە ئەوان دەیانکردو، تووشی بوبون، ئەوا خوای گەورە سزای نەدەدان، چونکە ئەو کاتە ستەمی لێدەکردن و، خوای گەورەش پاکە و بێگەردەو هەرگیز ستەم ناکات، خوای گەورە دادوەری دادپەروەرە. ئەگەر ئەوان ناچار کرایەن ئەوا خوای گەورە هەرگیز سزای داوێن پیسان و، دزان و، مەی خۆران و،

مەلکەرلوەکانی نەدەدا، چونکە لەو کاتەدا ناچار بوون و، هیچ توانایەکیان نەبوو، نیتر خوای گەورە هیچ سزایەکی بۆ دانەدەنان، داوێن پیسانی جەلدە لێدان نەدەکرد، ڕەجمی نەدەکردن، دەستی دزانی نەدەبڕی، مەی خۆرانی جەلدلێدانی نەدەکرد، چونکە سزایان دەدا ئەگەر خوای گەورە خۆی ئەوەی لەسەر تەقدیر کرد بێتن و، لە چارەی نووسیبێتن و، ناچاری کردبێتن، بەلام خوای گەورە ناچاری کردوون، ئادەمیزاد ویست و خواست و هەلبژاردن و پەسەندکردنیان هەیە، ئادەمیزاد ئەگەر بیەوێ گوێڕایەلی خواکەی دەبێت و، ئەگەریش بیەوێ سەرپێچی دەکات بە ئارەزوو و هەلبژاردنی خودی خۆی. بەلام ئەگەر هەلبژاردن و پەسەند کردن و ویست و خواست و توانایان نەبوایە ئەو کاتە بەهانەدار دەبوون، بۆیە شێت بەهانە دارە تا حەوە لە هەندێ، مندالْ پێش بالغبوون بەهانە دارە، کەسی نووستوو بەهانە دارە، کەسی ناچارکراو و زۆر لێ کراو بەهانەدارە، چونکە هیچ هەلبژاردن و پەسەند کردنێکیان بە دەست نییە، ناچار کراون، یاخود عەقلی نییە بۆ ئەوەی هەق و باتلْ لێکجیابکاتەوە.

نیا بن هیچ كەسێك قەدەرو چارەنووس ناكاتە بە هانەو بیانوو مەگەر ئەوانەی كە
ـوێنی هەواو ئارەزوواتی خۆیان كەوتوون، بە بێ ئەوەی هیچ بەلگەیەكیان بە
ەستەوە بێت[1].

---

(١)_ هیچ كەسێك قەدەرو چارەنووس ناكاتە بەهانەو بیانوو، بۆیە ئەوانەی قەدەرو چارەنووس دەكەنە بەهانەو، دەڵێن گوایە ناچاری كردنی ئەو شتانە كراون كە دەیكەن، لە ڕاستیدا تەنها شوێنی هەوا و ئارەزوواتی خۆیان كەوتوون و، هیچ بەلگەیەكی ڕاست و دروستیان بە دەستەوە نییە، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا﴾[الأنعام: ١٤٨] (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا هیچ زانیاریەكتان لایە تا دەری بخەن بۆمان و دەریبڕن، ئەو كەسەی هیچ بەلگەو زانیاریەكی بە دەستەوە نەبێت ئەوا تەنها شوێنی ئارەزوواتی دەكەوێت، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُونَ﴾[الأنعام: ١٤٨] ئێوە شوێنی هیچ شتێك ناكەون بێجگە لە گومان و ئێوە هەر لە خۆتانەوە بە گزترە شت دەڵێن. ئەو كەسەی داوێن پیسی دەكات لە ڕاستی دا تەنها شوێنی هەواو ئارەزوواتی خۆی دەكەوێت، ئەو كەسەی دزی دەكات لە ڕاستی دا تەنها شوێنی هەواو ئارەزوواتی خۆی دەكەوێت كە حەزلێكردنی دزییە، ئەوەی مەی دەخواتەوە تەنها شوێنی ئارەزوواتی خۆی دەكەوێت.

وە هەر کەسێك لەو باوەڕە دابێت کە قەدەرو چارەنووس بەهانەو
تاوانباران سزایان لەسەر هەڵدەگرێت، با چیتر زەمی هیچ کەسێك نەکات
نەدات ئەگەر دەست درێژی کردەسەر[1]،

---

(١)_ ئەمە بەڵگەو بەهانەیەکی یەکلاکەرەوەیە، بەهانەیەکی
بەرامبەر بە وان، ئەگەر ئێوە دەڵێن: لۆمەو سەرزەنشت نەکراوین چونکە
کردنی ئەو شتانە کراوین کە دەیکەین، کەوابوو هەرکات کەسێك دەست
سەر ئێوە بە دوای سزادانیدا مەگەڕێن، ئەگەر کەسێکتان کوژرا ئێوە
کەسی بکوژ مەدەن، بڵێن: ئەمە قەزاو قەدەرو چارەنووسە، ئەگەر
تۆڵەی خۆتی لێمەکەرەوە، چونکە قەزاو قەدەرەو، بە ویست و خواست
خۆی نەبووە، ناچاری کردنی ئەو شتانەکراوە، ئەگەر ماڵ و سەروەت
بردیت ئەوا ناکۆکی لەگەڵدا بەرپا مەکە، چونکە قەزاو قەدەرەو، بە ویست
هەڵبژاردنی خۆی نەبووە، ئایا کەسێکی ژیری عاقڵ ئەم شتانە دەڵێت، ئەی بۆچی
ناکۆکی بەرپا دەکەیت و داوای تۆڵە دەکرێت و تۆڵە دەکەیتەوە، ئەمە بەڵگەیە بۆ
ئەوەی کەسی دەست درێژکار و شەڕ فرۆش ناچاری ئەو شتانە نەکراوە، چونکە تۆ
داوای سزادان دەکەیت. ئەمە مانای وایە کە تۆ بەهانەو بیانوو بۆ نەفسی خۆت
دێنیتەوە لە کاتێکدا ئەو بەهانەو بیانووە بە کەسانی تر نادەیت، کەسانی ژیرو عاقڵ
ئەم شتانە ناڵێن وبەم جۆرە بیر ناکەنەوە. ئەگەر قەزاو قەدەر بەهانەو بیانوو بێت بۆ
تۆ وەکو ئەوەی خۆت دەیلێیت ئەوا عوزرو بەهانەو بیانووش بدە بەو کەسەی دەست
درێژیت دەکاتەسەر، چونکە ناچار کراوە ئیتر بۆ تۆڵەی لێدەکەیتەوە. ئەگەر بەم
جۆرە بوایە ئەوا دونیا خراپ دەبوو، خەڵکی وەکو ئاژەڵیان لێدەهات، بەم مەزهەبە
ڕێبازە پیسە دونیا خراپ دەبێت.

بەلکو باهەموو شتێکی بەلایەوە یەکسانبێت ئەوانەی کە لەزەت و خۆشی بۆ دەستەبەر دەکەن و، ئەوانەش دەبنە مایەی ئازاردانی، باچیتر جیاوازی نەکات لە نێوان ئەو کەسانەدا کە کاری خەیری لەگەڵ دەکەن و ئەو کەسانەدا کە شەڕی بە دەمرزێنن[1]، دڵنیا بن ئەمە لە ڕووی سرووشت و شەرع و عەقڵیشەوە مەحاڵە[2].

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾[3] [ص: ٢٨] واتە. ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە لەگەڵ خراپەکاران لە زەویدا وەك یەکیان دانێین (لە دوا ڕۆژدا، نەخێر وانییە) یا پارێزکاران وەك بەدکاران لێدەکەین.

---

(١)_ واتە: هەر هەموویان ناچارکراون، ئەو کەسەی کاری خەیرو چاکەت لەگەڵ دەکات هیچ چاکەیەکی نییە چونکە ناچار کراوە، وە ئەو کەسەش کاری شەڕی لەگەڵ کردووی لۆمەو سەرزەنشت ناکرێت چونکە ناچاری ئەو شتەکراوە، ئایا کەسی عاقڵ بەو جۆرە بیردەکاتەوە؟

(٢)_ ئەمە لە ڕووی سرووشت و عەقڵ و شەرعیشەوە مەحاڵە، تەنانەت ئاژەڵەکانیش ئەگەر دەست درێژیان کرایە سەر تۆڵەی بۆ خۆی دەکاتەوە، ئەی وانییە؟ ئاژەڵان ئەگەر دەست درێژیان کرایە سەر بەر گریی لە خۆیان دەکەن، ئەمە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە کە شتەکان بە ویست و خواست و هەڵبژاردنە نەك بە ناچار کردن.

(٣)_ خوای گەورە لە نێوان ئەوانەدا کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوەو لە نێوان خراپەکاران لە زەویدا جیاکاری کردووە، ئەگەر ناچار بوایەن ئەوا خوای گەورە لە نێوانیاندا جیاکاری نە دەکرد، ئەگەر ئادەمیزاد ناچار بوایە ئەوا هیچ جیاکارییەك لە نێوان نوێژ خوێن و داوێن پیسدا نە دەبوو، بەڵام خوای گەورە جیاکاریی لە نێواندا کردوون، چاکەکاران پاداشت دەدرێنەوەو خراپەکارانیش سزا دەدرێن، ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئەوان ناچار نەکراون، بەڵکو ویست و خواست و هەڵبژاردنیان هەیە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ﴾(١) [القلم: ٣٥]

چۆن ئێمە موسڵمانان و بەدکاران وەکو یەک دادەنێین.

---

(١) ئایا خوای گەورە موسڵمانان و تاوانباران لەگەڵ کافران و هاوەڵبڕیاران وەک یەک لێ دەکات، خوای گەورە نکوڵی لەوە دەکات کە موسڵمانان وەکو تاوانباران لێبکات، چونکە ئەو شتە لە حیکمەت و دانایی خوای گەورە ناوەشێتەوە، خوای گەورە بەزەیی بەموسڵماناندا دێتەوەو خۆشی گوزەرانیان پێدەبەخشێت لە دوا ڕۆژدا، تاوانبارانیش سزا دەدات، ئەی بۆچی جیاکاریان لە نێواندا دەکات؟ چونکە ئەو شتانەیان بەویست و خواست و هەڵبژاردنی خۆیان ئەنجام داوە، ئەو کەسەی کاری خەیری ئەنجام داوە بە ئارەزوو ویست و خواستی خۆی بووە، ئەو کەسەی کاری شەڕی ئەنجام داوە دیسان بەویست و خواست و ئارەزووی خۆی بووە، پاداشتیش بە گوێرەی کردەوەیە، ئەمە ئەوپەڕی دادپەروەرییە لە لایەن خوای گەورەوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ(٣٦) أَمْ لَكُمْ كِتَابٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ(٣٧) إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ(٣٨) أَمْ لَكُمْ أَيْمَانٌ عَلَيْنَا بَالِغَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ(٣٩) سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَلِكَ زَعِيمٌ(٤٠)﴾[القلم: ٣٦ـ ٤٠] واتە: ئەوە چیتان چۆن بڕیارێک دەدەن، خوای گەورە ئەوەی بۆ ناڕازیی بوون بەکارهێناوە نەخێر ئایا کتێبێکی (ئاسمانی)تان هەیە ئەمەی تیا دەخوێننەوە وە لەو کتێبەدا ڕێتان پێدراوە چیتان بوێ ئەوە هەڵدەبژێرن بۆ خۆتان یا پەیمانی بەهێزتان هەیە لەگەڵمان تا ڕۆژی دوایی کە هەر چی ئێوە بڕیار بدەن بتاندرێتێ بپرسە لێیان (بزانە) کامیان زامنی ئەو کارەن، کێ دەستەبەرێتی ئەو کارەی بۆکردوون، ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە کە لە نێوان ئیمانداران و کافراندا، گوێڕایەڵ کاران و سەرپێچی کاراندا جیاوازی هەیە، وە ئەوان ئەو شتانەیان بە ویست و خواست و هەڵبژاردنی خۆیان ئەنجام داوە، زۆرییان لێنەکراوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾[1] [الجاثية: ٢١].

---

(١)_ هەموو ئەم ئایەتانە دەربارەی یەك ڕێبازن، هەمووشیان یەكتری پشتڕاست دەكەنەوە، ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ﴾ ئایا ئەوانەی كە خراپەكانیان كردووە وا گومان دەبەن، ﴿أَمْ حَسِبَ﴾ لە زمانی عەرەبیدا بۆ ئیستیفهامی ئینكاری واتە بۆ پرسیاركردنی ناڕازیبوون بەكاردێت، ﴿الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ﴾ ئەوانەی كردەوە خراپەكانیان ئەنجام داوە، ئێمە ئەوانە وەكو كەسانێ دادەنێین كە بڕوایان هێناوەو چاكەكانیان كردووە، ئەمە ئیستیفهامێكی ئینكارییە، واتە پرسیار كردنێكی ناڕازی بوونە، واتە: وەكو ئەوانیان لێناكەین، چونكە خوای گەورە بە دانایی و حیكمەت و دادپەروەریی خۆی ئەوانەو ئەوانە وەك یەك لێناكات، چونكە ئەگەر ئەوان و ئەمان وەكو یەك بن ئیتر ئەنجام دانی كردەوەی چاك و، هێنانە كایەی شەریعەت و، ناردنی پێغەمبەران سوودیان چییە؟ لەوانەیە لە دونیادا كافر خۆشگوزەران بێت و ماڵ و سامان و منداڵ و هێزی هەبێت، ئیمانداریش هەژارو نەخۆش بێت و پاداشتی كردەوەكانی خۆی وەرنەگرت بێت لەبەر ئەوەی خوای گەورە بۆ ڕۆژی قیامەت

پاشـەکەوتی کـردووە، کـافریش خـوای گـەورە پێـی دەداو لـە ڕۆژی قیامەتـدا سزای دەدات، دانایی و حیکمەتی خوای گەورەیە، لە ژیاندا یەکسان نابن، خـوای گـەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لە نێوان ئەوان و ئەواندا جیاکاریی دەکات، دەستەیەکیان لە بەهەشتدا دەبێت و دەستەیەکیش لـە دۆزەخـدا، وەکـو دونیـا نابێـت، لـە ڕۆژی دواییـدا کاروبار دەگۆڕدرێن، نەخێر، خوای گەورە جیاکاریـان لـە نێوانـدا دەکـات، لـەو بـارەوە خـوای گـــەورە دەفـــەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ (١٤) فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ (١٥) وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الْآخِرَةِ فَأُولَٰئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ (١٦)﴾[الروم: ١٤_١٦] واتـە: وە ئـەو ڕۆژەی قیامـەت هەڵدەستێ (خـەڵك) لـەو ڕۆژەدا جیـا دەبنـەوە لـە یـەکتر ئینجا کەسـانێ کـە باوەڕیـان هێنـاوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە ئەوان لـە بەهەشـتدا دڵخـۆش دەکـرێن ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا﴾ بەڵام ئەوانەی بێباوەڕ بوون و دانیان نە دەنا بە نیشـانەکانی ئێمـەو گەیشتن بە ڕۆژی دوایی ئا ئەوانە لە سزا(ی دۆزەخ) دا ئامادە دەکرێن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾[1] [المؤمنون: ١١٥] واتە: ئایا ئێوە گومانتان وا بوو کە بێگومان ئێوەمان بەبێ هوودە دروست کردووە وە بێگومان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾[2] [القيامة: ٣٦] واتە: ئایا مرۆڤ وادادەنێ کە هەروا بەرەڵا دەکرێ (وپشتگوێ دەخرێ).

---

(١)_ هەروەها ئەگەر بەو جۆرە بێت کە ئەوان دەڵێن گوایە ناچاری کردنی ئەو شتانە کراون کە دەیکەن، کەوا بوو خوای گەورە بەبێ هوودە دروستی کردوون، نەپاداشت هەیە لەسەر تاعەت و گوێڕایەڵیەکان و نەسزاش هەیە لەسەر گوناه و تاوانەکان، خوڵقاندنی ئادامیزاد بێهوودەیە ئەگەر زیندو بونەوەو، حیساب و، پاداشت نەبێت و، هەر کەسێك بە ئارەزووی خۆی کردەوە بکات و، هیچ دەرەنجامێك نەبێت ئەوە خوڵقاندنیان بێهوودە دەبێت، خوای گەورەش پاك و بێگەردەو دوورە لەو شتانەوە.

(٢)_ واتە نە فەرمانی پێی بکرێت و نە قەدەغەی شتێکیشی لێبکرێت، ئەگەر شتەکە بەو جۆرە بوایە کە ئەوان دەیڵێن گوایە ناچارکراون ئیتر خوای گەورە نەفەرمانی دەداو نەقەدەغەشی دەکرد، چونکە فەرماندان و قەدەغە کردن سوودی نەدەبوو، ئەمە ڕەخنەگرتنە لەخوای گەورە کەوا فەرماندان و قەدەغەکانی بێسوودە، چۆن فەرمانیان پێدەداو قەدەغەی شتانێکیان لێدەکات ئەگەر ناچاری کردنی ئەو شتانە کرابن کە دەیکەن، ئەوکاتە نەفەرماندان نرخی دەبێت و نە قەدەغە کردنیش نرخی دەبێت.

واتە: نە فەرمانی پێی بکرێت و نەڕێگریشی لێبکرێت[١].

---

(١)_ ئەگەر کار بە قسەکەی ئەوان بکرێت گوایە ناچاری کردنی کردەوەکانی خۆیان کراون، ئیتر فەرماندان و ڕێگری کردن لە ئادەمیزاد هیچ سوودێکی نابێت و بێهوودە دەبێت، مرۆڤ وا دەزانێت پشتگوێ دەخرێت نەحیسابی لەگەڵ دەکرێت و نەپاداشات و سزاش وەردەگرێت؟ ئەگەر بە گوێرەی ئەو قسانەی ئەوان بوایە ئادەمیزاد بەهانەدار دەبوو چونکە ناچارکرابوو، هیچ ویست و هەڵبژاردنێکی نەبوو.

هەروەها لە فەرموودەی (صحيح) ی پێغەمبەر خوا ﷺ دەفەرموێ: ((احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى، قَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ أَبُوالْبَشَرِ، الَّذِي خَلَقَكَ اللهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَسْجَدَ لَكَ مَلاَئِكَتَهُ، أَخْرَجْتَنَا وَنَفْسَكَ مِن الجَنَّةِ، فَقَالَ لَه آدَمُ: أَنْتَ مُوسى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللهُ بِكَلاَمِهِ، وَكَتَبَ لَكَ التَّوْرَاةَ بِيَدِهِ، فَبِكَمْ وَجَدْتَ مَكْتُوباً علي قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ: ﴿وَعَصَى ءَادَمُ رَبَّهُ فَغَوَى﴾ [طه: ١٢١]، فَقَالَ: بِأَرْبَعِينَ سنة، قَالَ: فَلِمَ تَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَه عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ بِأَرْبَعِينَ سَنَةً ؟ قَالَ: فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٣٤٠٩)، و(٤٧٣٦)، و(٤٨٣٨)، و(٦٦١٤)، و(٧٥١٥)، ومسلم (٢٦٥٢)، من حديث أبي هُريرة ﷺ مرفوعاً.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئادەم و موسا لەنێوان خۆیاندا کەوتنە گفتوگۆ، موسا فەرمووی: تۆ ئادەمیت باوکی ئادەمیزاد، کە خوای گەورە بە دەستی خۆی تۆی خوڵقاندووە و، لە ڕووحی خۆی فوی کردە بەرتاو، فەرمانی بە فریشتەکان کرد کڕنووشی برد بۆت، خۆت و ئێمەشت لە بەهەشت کردە دەرەوە، ئادەمیش پێی فەرموو: تۆ موسایت کە خوای گەورە بەهۆی وشەکانی خۆیەوە هەڵی بژاردویت و، بەدەستەکانی خۆی تەوراتی بۆ نووسیت، باشە پێش چەند ساڵ بینیوتە خوای گەورە ئەمەی لەسەرم نووسیبێ خوای گەورە ﴿وە ئادەم سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد ئیتر لە ڕێگای ڕاست لایدا﴾، مووسا فەرمووی: بە چل ساڵ، ئادەمیش پێی فەرموو: کەوا بوو بۆ لەسەر شتێك سەرزەنشتم دەکەیت کە چل ساڵ پێش خوڵقاندنم خوای گەورە لەسەری تەقدیر کردووم؟ دەڵێت: ئەوە بوو ئادەم بەسەر موسادا سەرکەوت)). واتە: بەڵگەو سەلماندنەوە بەسەریدا سەرکەوت.

---

(١)_ ئەم فەرموودە فەرموودەیەکی زۆر گەورەو بەڕێزە، بەڵام زۆربەی خەڵکی لێی تێناگەن و، لە ماناکەیدا هەڵە دەکەن، وا ڕادەگەیەنن گوایە موسا بەرامبەر بەبابی ناڕەزایی دەربڕیوە، گوایە ناڕەزایی دەربڕیوە لەو مەعصیەت و سەرپێچیەی کە بابی

ئەنجام بداوە، بۆ سەرپێچی پەروەردگاری خۆت کرد؟ وا دەزانن مووسا سەرزەنشتی باکرد لەسەر ئەنجام دانی مەعصیەت و سەرپێچیەکە، کە چی ڕاست ئەوەیە موسەرزەنشتی بابی کرد لەسەر ئەو موسیبەت و کارەساتەی کە ڕویدا، ئەو موسیبەتکارەساتەی کە بەهۆی مەعصیەت و سەرپێچیەکەوە ڕوویدا، ئادەمیش بەهانەی هێنایەوەکە دەرکردن لە بەهەشت موسیبەت و کارەساتە، قەدەرو چارەنوسیش دەکرێتە بەهانەو بیانوو بۆ ئەو موسیبەت و کارەساتانەی کە تووشی مرۆڤ دەبێت، بۆیە ئادەم قەدەرو چارەنووسی کردە بەهانەو بیانوو بۆ موسیبەت و کارەساتەکە، ئادەم قەدەرو چارەنووسی نەکردە بەهانەو بیانوو بۆ ئەو مەعصیەت و سەرپێچیەی کە ئەنجامیدا بۆچی؟ چونکە سەرپێچیەکەی بەهەڵبژاردن و ویستی خۆی ئەنجام داو، ناچار نەکرا بوو زۆریشی لێنەکرا بوو، موساش ئەمەی دەزانی، هەروەها شیاو نییە مووسا سەرزەنشتی بابی بکات لەسەر مەعصیەت و سەرپێچیەك کە لێی پەشیمان بویەوەو تەوبەی کردبوو خوای گەورەش تەوبەکەی وەرگرت، چونکە ئەو کەسەی لە تاوان پەشیمان دەبێتەوەو تەوبە دەکات وەکو ئەوەیە کە هیچ تاوانێکی ئەنجام نەدابێت. کەوا بوو فەرموودەکە نابێتە بەهانەو بەڵگە بۆ کۆمەڵی جەبریەکان لە دوو ڕووەوە:

ڕووی یەکەم: لە ڕاستیدا موسا سەرزەنشتی بابی کرد لەسەر ئەو موصیبەت و کارەساتەی کە ڕوویداو لە کردنە دەرەوە لە بەهەشت، مووسا سەرزەنشتی بابی نەکرد لەسەر مەعصیەت و سەرپێچیەکە، چونکە تەوبەی لێکردو، ئەو کەسەش تەوبە بکات وەکو ئەوەیە کە هیچ تاوانێکی نەبێت.

ڕووی دووەم: کە قەدەرو چارەنووس دەکرێتە بەهانەو بیانوو بۆ ئەو موصیبەت و کارەساتانەی تووشی ئادەمیزاد دەبێت شتێکی ئاساییەو شتێکە لەئیمان و باوەڕبوونەوە چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ﴾[البقرة: ١٥٥] واتە: ئەوانەی کە لەگەڵ دووچاری سەختییەك بوون دەڵێن

-----------------------------------------------------------

-----------------------------------------------------------

-----------------------------------------------------

ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. ئیتر لەسەر ئەو موسیبەت و کارەسات و سەختییە ئارام دەگرێت و، دڵگیر نابێت و پەستی و بێ ئۆقرەیی نانوێنێت، بەڵکو پێویستە بزانیت ئەوەی کە تووشت بووە بە قەزاو قەدەری خوای گەورەیە. بەڵام بۆ هیچ کەسێك نییە قەدەرو چارەنووس بکاتە بەهانەو بیانوو بۆ ئەو گوناه و تاوان و سەرپێچیانەی کە ئەنجامی دەدات، بەڵکو پێویستە تەوبە بکات و، ئیستیغفار بکات و، دوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکات و، لۆمەکە بۆ خودی خۆی بگەڕێنێتەوە، تەوبەبکات و ئیستیغفار بکات. ئەمە زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

وە ئەم فەرموودەیە دوو تایەفەی تێدا گوومڕا بوون[١]: تایەفەیەك بە

چونکە وایا نزانی ناچاری هەلگرتنی زەم و سزا دەبن لەسەر ئەو کەسانەی

سەرپێچی خوای گەورە دەکەن لە پێناوی قەدەردا[٢].

تایەفەیەکیش لەوان خراپترو شەڕ تر بوون[٣] کردیان بەبەلگەو بەهانە بۆ

مەعصیەت و سەرپێچی کردن، لەوانەشە بلێن: قەدەر بەلگەو بەهانەو بیانووە بۆ

ئەهلی حەقیقەت ئەوانەی بینیویانە[٤]،

---

(١)_ دوو تایەفە کە بریتیبوون لە موعتەزیلە و جەبریەکان، موعتەزیلە

نکوڵی لەقەدەر دەکەن، لەکاتێکدا ئادەم قەدەری کردە بەهانەو بیانوو و بەلگە

مووسا، بەلام ئەوان لەقەدەر نکوڵی دەکەن، جەبریەکانیش دەلێن: بەندەکان

کراون، بە گوێرەی قسەکەی ئەوان بێت خوای گەورە ئادەمی ناچار کرد

خواردن لە درەختەکە، ئەگەر وابێت ئیتر بۆ سەرزەنشتی دەکات، لە کاتێکدا

ناچار کرا بوو بە پێی بانگەشەکانی ئێوە.

(٢)_ ئەمانە بریتین لەکۆمەلی موعتەزیلە ئەوانەی دەلێن: خوای

مەعصیەت و سەرپێچی نەویستووە بەلکو بەندە خۆی ئەنجامی دەدات. ئەم

لەو باوەڕەدا بوون کە ئەگەر بەڕاستی دابنێین و زەم و سزا لەسەر

هەلگیرێت ئیتر شەریعەتەکان پووچ دەبنەوە بۆیە گوتیان: ئاسانترین ڕێگا

بلێین: فەرموودەکە ڕاستنییە.

(٣)_ ئەم تایەفە بریتی بوون لە جەبریەکان.

(٤)_ ئەهلی حەقیقەت: واتە ئەهلی تەصەوف، زێدەڕۆی یکارانی

ئەوانەی لەو باوەڕودان کە مرۆڤ تەکلیف و سەپاندنە شەرعیەکانی لەسەر

هەر کات بگاتە پلەیەکی تەصەوف، چونکە دەبێ بە وەلی و دۆستێکی

تەکلیف و سەپاندنە شەرعیەکانی لەسەر نامێنێت، چونکە زانی و تەواو بوو،

ئەمەیە حەقیقەت.

یاخود ئەوانەی لەو باوەڕە دانین کە کردەوەیان هەبێت[١].

وە کەسانێکیش هەن دەڵێن[٢]: لە ڕاستیدا ئادەم بەبەڵگەوە بەسەر موسادا سەرکەوت، چونکە بابی بوو[٣]، یان چونکە تەوبەی کرد بوو[٤].

---

(١)_ کە بریتین لە جەبریەکان ئەوانەی لەو باوەڕەدان کە ناچاری ئەو شتانە کراون کە دەیکەن.

(٢)_ لێرەدا شێخولئیسلام _ رحمه الله _ وەڵامی تایەفەیەکی سێیەم دەداتەوە ئەوانەی هەوڵی کۆکردنەوەو گونجاندنی نێوان ئەم فەرموودەو دەقانێکی تریان داوە، ئەم بەشی سێیەمە لە ڕووی بنەڕەت و مەبەستەوە ئەهلی هەقن، ئەم بەشە قەدەر جێگیر دەکەن و دانی پێدا دەنێن و، ناشیکەن بەبەڵگەو بەهانەو بیانوویەك بۆ ئەنجامدانی مەعصیەت و سەرپێچیی و تاوانەکان، نکوڵیشی لێناکەن، ئەمانە لە ڕووی بنەڕەت و مەبەستەوە لەسەر ڕێڕەوەی ڕاست بوون، بەڵام ئەو کەسەی لە ڕووی بنەڕەت و مەبەستیەوە لەسەر ڕێڕەوی ڕاستبێت مەرج نییە لە وەڵامەکانیدا پێکابێتی، لەوانەیە هەڵە بکات. بڕوانە: الشيخ الدكتور خالد المصلح، شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان، وەرگێڕ.

(٣)_ گوایە بۆ کوڕ نییە ناڕەزایی بەرامبەر بەبابی دەربڕێت، ئەمە گوفتارێکی پووچە.

(٤)_ واتە ئادەم قەدەری کرد بە بەهانەو بیانوو، چونکە لە تاوانەکە تەوبەی کرد بوو، تاوانیش پاش تەوبە کردن دەچێتە پلەی موسیبەت و کارەساتەوە، کەوا بوو ئابێت قەدەر وەکو بەهانەو بیانوو بۆ تاوان کردن بەکار بێت مەگەر پاش تەوبە کردن، چونکە ئەگەر تەوبە بکات ئەوە دەکات کە لەسەریەتی، کە بریتیە لە ڕا کردن لە قەدەری مەکروهەوە بۆ قەدەری خۆشویستراو، ئیتر دەبێتە ئیماندار بە قەدەر، چونکە لەوە زیاتری پێی ناکرێت، بەڵام ئەمەش دیسان هیچ ڕوویەکی ڕاستی نییە، چونکە موسا بە هیچ شێوەیەك باسی تاوانەکەی نەکرد، پێی نەفەرموو: بۆچی لە درەختەکەت خوارد؟ بەڵکو پێی فەرموو: بۆچی ئێمەو خۆشت لە بەهەشت دەرهێنا؟

یان چونکە تاوانەکە لە سەردەمی ئادەم دا بوو، سەرزەنشتەکەش لەسەردەمی موسادا بوو، یان چونکە ئەمە لە دونیادا دەبێت نەك قیامەت، هەر هەموو ئەمانە پووچن.

بەڵام ڕووی ڕاستی فەرموودەکە: بریتیە لەوەی مووسا علیه السلام سەرزەنشتی بابیکرد تەنها لەسەر ئەو موصیبەت و کارەساتەی تووشیانبوو کاتێ بابەئادەم لەدەرختەکەی خوارد[1]، پێی فەرموو: بۆچی ئێمەو خۆشت لەبەهەشت دەرهێنا؟ مووسا سەرزەنشتی بابی نەکرد تەنها لەسەر ئەوەی تاوانێکی کردبوو تەوبەی لێکرد، چونکە مووسا دەیزانی ئەو کەسەی لە تاوان تەوبە بکات سەرزەنشت ناکرێت، لە کاتێکدا تەوبەشی کرد بوو، وە ئەگەر ئادەم لەو باوەڕەدا بوایە ی سەرزەنشتیی لەسەر هەڵدەگیرێت بەهۆی قەدەرەوە نەیدەفەرموو: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[2] [الأعراف: ٢٣] واتە: ئەی پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد جا ئەگەر لێمان نەبووری و میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەیت سوێند بە خوا بێگومان لە زیانباران دەبین.

---

(١)_ مووسا بە بابی نەگوت: بۆچی لەدەرختەکەت خوارد، بەڵکو پێی فەرموو: بۆچی ئێمەو خۆشت لەبەهەشت دەرهێنا، ئەمەبوو موصیبەت و کارەساتەکە.

(٢)_ ئەگەر ئادەم لەو باوەڕەدا بوایە کە هیچ سەرزەنشتێکی لەسەر نابێت، وە قەدەریشی بکردایە بە بەڵگەو بەهانە بۆ گوناه و تاوان و سەرپێچی کردن ئەوا تەوبەی نەدەکردو نەیدەفەرموو: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ [الأعراف: ٢٣] ئادەم درکاندی و دانی پێدانا چونکە بەو تاوان و سەرپێچیە ستەمی لە نەفسی خۆی کرد، دانی بەتاوان و سەرپێچی کردنەکە دانا و بەویستی خۆی ئەنجامی دابوو، بۆیە تەوبەی کرد، چونکە ئەگەر ئادەم لەو باوەڕەدا بوایە کە ناچاری کردنی ئەو مەعصیەت و سەرپێچی کردنە کرابوو تەوبەی نەدەکرد.

## هاندان بۆ ئارام گرتن و، داوای لێخۆشبوون و، ڕازیبوون بەقەزا

ئیماندار فەرمان پێکراوە لە کاتی موسیبەت و کارەساتدا ئارام بگرێت و ڕازیبێت، لە کاتی تاوانیشدا داوای لێخۆشبوون بکات و تەوبە بکات(١).

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ﴾(٢) [غافر: ٥٥].

لێرەدا خوای گەورە فەرمانی پێداوە ئارام گرو خۆ گر بێت بەرامبەر بە موسیبەت و کارەساتەکان، وە ئیستیغفارو داوای لێبوردنیش لە خوای گەورە بکات لە گوناه و تاوانەکان.

---

(١)_ ئەمەیە یاساکە، ئیماندار لەکاتی موسیبەت و کارەساتدا ئارام دەگرێت و، لە کاتی تاوان کردنیشدا تەوبە دەکات و، داوای لێخۆشبوون دەکات، قەدەر ناکاتە بەهانەو بیانوو. ئەمەیە کە قورئان و سووننەت و یەك دەنگی زانایان ئاماژەی بۆ دەکەن کەوا ئیماندار لەکاتی موسیبەت و کارەساتدا ئارام دەگرێ و بێزاری و بێ تۆقرەیی نانوێنێت، لەبەر قەزاو قەدەری خوای گەورە، بەڵام لە کاتی تاوان کردندا تەوبە دەکات و داوای لێخۆشبوون دەکات و قەدەر ناکاتە بەهانە و بیانوو.

(٢)_ ئایەتەکە ڕوونە، لەسەر چ ئارام دەگریت؟ لەسەر ئەزیەتی ئازار بە دەستی هاوەڵپەرستان، چونکە ئەمەش موسیبەت و کارەساتە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوو بە ڕووی ئازارێکی زۆرو ناڕەحتیەکی زۆر بویەوە لە لایەن هاوەڵپەرستانەوە، خوای گەورە

پێی فەرموو: ﴿فَاصْبِرْ﴾ ئارام بگرەو خۆ گر بە، ئەمە قەزاو قەدەرە، ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ﴾ وە داوای لێبوردنی گوناهت بکە، تەماشاکەن خوای گەورە پێی نە فەرموو ئارام بگرەو خۆگربە لەسەر گوناە و تاوانەکانت بەلگو پێی فەرموو، داوای لێبوردنی گوناە و تاوانەکانت بکە، چونکە لە ڕاستیدا مرۆڤ گوناە و تاوان بە ویست و هەڵبژاردنی خۆی ئەنجام دەدات، بۆیە پێویستی بەئیستیغفارو تەوبە و داوای لێبوردنە. خوای گەورە لە نێوان موسیبەت و تاواندا جیاوازی کردووە، لەکاتی موسیبەت و کارەساتدا دەفەرموێت: ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ بێزاری و بێئۆقرەیی دەرمەبڕە، بەجۆرێك ئیتر واز لە بانگەوازی کردن بێنیت ، ئارام بگرە، بۆ گوناە و تاوانیش دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ﴾ وە داوای لێبوردنی گوناهت بکە، ئەگەر تاوانێکتکرد داوای لێخۆشبوونی بۆ بکە، ئایەتەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾[1].

ئیبنو مەسعودیش لە بارەی ئەو ئایەتەوە فەرموویەتی: ((بریتیە لە پیاوێك تووشی موسیبەت و كارەساتێك دەبێت، دەزانێت لە لایەن خوای گەورەوەیە بۆیە رازی دەبێت و ملكەچ دەبێت))[2] عزاه السيوطي في ((الدر المنثور)) (٦/٢٢٧) الى سعيد بن منصور موقوفاً على ابن مسعود رضي الله عنه.

---

(١)_ ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ موسیبەت و كارەسات بەمۆڵەت و ئەدەری خوای گەورەیە، پێویست ناكات بێزاریی و بێ ئۆقرەیی دەربڕێت بەرامبەر بەقەزاو قەدەری خوای گەورە، ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ﴾ هەركەسێك باوەڕ بەخوا بێنێت و، بزانێت ئەو موسیبەت و كارەساتانە بەئیزنی خوای گەورەیە، ﴿يَهْدِ قَلْبَهُ﴾ خوا ڕێنموونیی دڵی دەكات بۆ ئیمان و باوەڕێكی زیاتر.

(٢)_ ئایەتەكەی پێشەوە ئەو مانایە دەگەیەنێت كەوا ئەگەر پیاو تووشی موسیبەت و كارەساتێك بێت دەزانێت لەلایەن خوای گەورەوەیەو توانای دەرباز بوونی لێ نابێت بۆیە ئارام دەگرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ)) رواه الامام احمد وابو داود وغيرهما واتە: ئەو خێرو نیعمەتە یان ئەو موسیبەت و كارەساتەی كە خوای گەورە بۆی تەقدیر كردووی هەرگیز بۆ غەیری خۆت تێپەڕ نابێت، وە ئەوەش كە لە تۆ تێپەڕ بووە هەرگیز تووشت نابێت. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلَا تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللَّهِ، وَمَا شَاءَ فَعَلَ)) رواه مسلم واتە: ((ئەگەر شتێكت تووش بوو، مەڵێ: ئەگەر وام بكردایە ئاوەهاو ئاوەها دەبوو، بەڵكو بڵێ: ئەمە قەدەری خوایەو ئەوەی ویستی كردی)).

ئیمانداران هەر کات تووشی موسیبەت و کارەساتێکی _ وەکو نەخۆشی و هەژاری و داماویی بوون _ لەسەر حوکمی خوای گەورە ئارام دەگرن[١] ئەگەرچی ئەوەیان بە هۆی تاوانی غەیری خۆشیانەوە تووش بوبێت، وەکو ئەوەی کەسێك بابی ماڵ و سامانەکەی خۆی لە گوناه وتاوان و سەرپێچیدا بە فیڕۆداو، بە هۆی ئەوەشەوە منداڵەکانی دەست کورت و هەژار کەوتن، لێرەدا پێویستە ئارام بگرن لەسەر ئەوەی کە تووشیان بووە، وە ئەگەر لەسەر بەش و بەختەکانیان سەرزەنشتی بابیان کرد، زۆر بە ئاسایی قەدەرو چارەنوس دەکاتە بەهانەو بیانوو.

صەبرو ئارام گرتنیش بە کۆ دەنگی زانایان واجیبە[٢]، لەوەش بەرزتر ڕازیبوونە بەحوکمی خوای گەورە[٣]،

---

(١)_ ئارام دەگرن و بێزاریی و بێئۆقرەیی دەرنابڕن، بەڵام هۆکارەکان بەکاردێنن، نەك نەخۆش بکەوێت ئارام بگرێت و چارەسەری خۆی نەکات، بەڵکو ئارام دەگرێت و بێزار نابێت و هەموو هۆکارێکی بەردەست بەکاردێنێت بۆ دەرباز بوون لەو تەنگانەیە و لەو ناڕەحەتییە.

(٢)_ صەبرو ئارام گرتن واجیبەو لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، ئارام گرتن لوتکەی ئیمانە، ئەو کەسەی صەبرو ئارام گرتنی نەبێت ئیمانیشی نابێت، لە ئاییندا ئارام گرتن وەکو سەرە بۆ جەستە، ئەوەی صەبرو ئارام گرتنی نەبێت ئایینیشی نامێنێت، وەکو چۆن ئەگەر سەر نەما جەستە ژیانی تێدا نامێنێت، پایەی ئارام گرتن زۆر گەورەیە، خوای گەورە چەندین جار لە قورئاندا دووبارەی کردۆتەوەو، فەرمانی پێداوەو، سوود و ئەنجامەکانی باس کردووە، لە ڕاستیدا صەبرو ئارام گرتنی تەواو لەکاتی موسیبەت و کارەسات و ناڕەحەتیەکاندا ڕۆڵی گەورەی خۆی دەبینێت.

(٣)_ ئارام گرتن واجیبە، ڕازی دەبێت و ملکەچ دەبێت، پیاو موسیبەت و کارەسات و ناڕەحەتیەکی تووش دەبێت ڕازی دەبێت و ملکەچ دەبێت و، ئەمەش لە تەواوێتی و کەماڵی ئیمانە، ڕازی بوون لە تەواوێتی و کەماڵی ئیمانە، بەڵام واجیب نییە، وەکو چۆن مرۆڤ ئازار دەچێژێت و بێزارو پەست و وەڕس دەبێت.

...ووتراوه: رازی بوون واجیبه، وه گوتراویشه: خۆشخواز (مستحب)ە ئەمەش ڕاست و دروستە⁽¹⁾، لەوەش بەرزتر ئەوەیە سوپاسی خوای گەورە بکات لەسەر موسیبەت و کارەسات و ناڕەحەتیەکان⁽²⁾،

---

(١)_ ڕازی بوون واجیب نییە، بەڵام صەبرو ئارام گرتن واجیبە کە پێویستە مرۆڤ بێئارامی و بێئۆقرەیی دەرنەبڕێت، ڕازیبونیش پلەیەکی بەرزەو هەموو کەسێك دەستی ناکەوێت، بەڵام ئەگەر مرۆڤ ڕازیبێت ئەوە شتێکی زۆر چاکە.

(٢)_ لەوەش بەرزتر و بڵندتر ئەوەیە ئادەمیزاد سوپاسی خوای گەورە بکات لەسەر ئەو موسیبەت و کارەسات و ناڕەحەتیانەی کە تووشی دەبێت، چونکە هەر هەمووی خێرە بۆ ئەو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((عَجَبًا لأمرِ المؤمنِ، إنَّ أمْرَه كُلَّهُ لهُ خيرٌ، وليسَ ذلكَ لأحَدٍ إلا للمُؤْمنِ: إنْ أصَابتهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فكانتْ خيرًا لهُ، وإنْ أصَابتهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فكانتْ خيرًا لهُ )) واتە: ((کاروباری ئیماندار جێی سەرسوڕمانە، هەموو کارو فەرمانێکی هەر مایەی خێرە بۆی، ئەمەش بۆ هیچ کەسێك نییە جگە لە ئیماندار، هەر کات تووشی خۆش گوزەرانیەك بێت سوپاسی خوای گەورە دەکات دەبێتە مایەی خێر بۆی، خۆ هەر کاتیش تووشی زیان مەندی بێت ئارام دەگرێت هەر دەبێتە مایەی خێر بۆی)). بەڵام کافر بەپێچەوانەوە هەرکات زیان مەندیەکی تووش بوو بێئارام دەبێت و، ئۆقرەی لێدەبڕێت و، پەست دەبێت، خۆ ئەگەر تووشی خۆش گوزەرانیەکیش بوو لوت بەرز دەبێت و، نا سوپاسی دەکات و، لە خۆبایی دەبێت.

چونکە پێویستە لەو باوەڕە دابێت خوای گەورە لەو ڕێگەیەوە ئیمەت و بەهرەکانی خۆی بەسەریدا دەڕژێنێت و(١)

---

(١)_ چونکە بۆ تەوبە کردن ڕاکێشتیدەکات، وە لەبەر ئەوەی هەموو لێقەوماوێتی و لە خۆبای بوونێکی نەفس دادەمرکێنێتەوە، لەهەموو ئەوانەش گەورەتر ئەوەیە کە خوای گەورە تاوانەکانی ئادەمیزادی پێی دەسڕێتەوە، موسیبەت و کارەسات و ناڕەحەتیەکان تاوانی موسڵمانان دەسڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ما يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَ هَمٍّ وَلاَ حُزْنٍ وَلاَ أَذًى وَلاَ غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إِلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ)) بەهۆیەوە، واتە: ((هەر ماندوویەتی و نەخۆشی و خەم و خەفەت و ئازار و پەژارەیەك تووشی موسڵمان دەبێت، تەنانەت دڕکیش کە پێیدا دەچەقێت مەگەر خوای گەورە لە تاوانەکانی پێی دەسڕێتەوە)). وە کاتێك پێشەوامان ئەبوبەکری صیددیق ﷺ چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا بەشتانێکی گەورە تاقیکراینەوە ئارامیمان گرت، بەڵام خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ﴾ [النساء: ١٢٣] واتە: هەر کەسێك خراپەیەك بکات پاداشتی دەدرێتەوە، بەڵام ئەو بە جۆرێکی تر لێی تێگەیشت بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون کردەوەو پێی فەرموو: ئایا ئەمەو ئەوەو ئەوەت تووش نابێت؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: بە هۆی ئەوانەوە پاداشتت دەدرێتەوە، تەنانەت ئەگەر دڕکێکیشت لە پێدا بچەقێت خوای گەورە لە تاوانەکانتی پێی دەسڕێتەوە. کەوا بوو موسیبەت و کارەسات و ناڕەحەتیەکان بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدایەو خوای گەورە تاوانەکانیانی پێی دەسڕێتەوە، موسیبەت و کارەسات و ناڕەحەتی پاڵ بە موسڵمانانەوە دەنێت بۆ تەوبە کردن و ئیستیغفار و هەست کردن بە تاوان.

کردبوبەتی بە هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانی و، بەرز کردنەوەی پلەکانی و، گەڕانەوەو پەروەی گریمی بۆ خوالو[١]، ملکەچ کردن و ئەنجام دانی ئەو کردەوانەی لە خوای نزیک دەکاتەوەو، خۆ یەکلاکردنەوەی بۆ خوا بەپشت پێی بەستنی و، ئومێد بوون و پاڕانەوەی لە خوای گەورە نەك مەخلوقات.

بەڵام ئەهلی ستەم و گومڕایی دەیانبینیت هەر کات تاوانیان ئەنجام داو شوێنی هەوو ئارەزووانیان کەوتن قەدەرو چارە نووس دەکەنە بەهانەو بیانوو[٢]،

---

(١)_ ئەگەر مرۆڤ کردەوەی خراپی نەبێت و موسیبەت و کارەسات و نارەحەتی تووش بوو، ئەوا خوای گەورە بەو هۆیەوە پلەکانی لە بەهەشتدا بەرز دەکاتەوە، چونکە پێدەچێت خوای گەورە بۆ بەندەی خۆی پلە لە بەهەشتدا بنووسێت کە بەکردەوەی چاك ئەنجام دان پێی ناگات، بەڵام خوای گەورە تەقدیری موسیبەت و کارەسات و نارەحەتی بۆ دەکات بۆ ئەوەی پلەکەی پێی بەرز بکاتەوە. بەندەش تاوانەکانی خۆی بیردێتەوە تەوبە دەکات و بۆ لای خوای گەورە دەگەڕێتەوە.

(٢)_ بە پێچەوانەوە ئەهلی کوفرو شیرك و هاوەڵپەرستی ئەگەر موسیبەت و کارەسات و نارەحەتیەکیان تووش بێت بێزار دەبن و بێ ئارامی و بێ ئۆقرەیی دەردەبڕن، بۆچی؟ چونکە باوەڕیان بە قەزاو قەدەری خوای گەورە نییە. وە هەر کات نیعمەت و بەهرەیەکیان پێی بەخشرا لەڕێی ڕاست لادەدەن و لوت بەرزی دەنوێنن و لە خۆیان بایی دەبن و سپڵە دەبن، ئەمەیە ڕێبازی ئەهلی کوفرو شیرك.

وە هەر کات نیعمەت و بەهرەیەکیان پێی بەخشرا چاکەکە دەدەنە پاڵ خودی خۆیان[١] وەکو ئەوەی هێندێ لە زانایان گوتوویانە: تۆ لە کاتی تاعەت و گوێڕایەڵیدا قەدەریت و لە کاتی گوناه و تاوان سەرپێچیشدا جەبرو ناچارکراویت[٢]،

---

(١)_ وە ئەگەر چاکەو نیعمەت و بەهرەیەکیان پێبەخشرا ناڵێن ئەمە لەلایەن خوای گەورەوەیە، دەڵێن: ئەمەمان بە کردەوەو دەستکەوت و ماندوبون و زانین و زیرەکی خۆمان بەدەست هێناوە، وەکو ئەوەی قاروون دەیگوت: ﴿إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِي﴾[القصص: ٧٨] واتە: (قاروون) گوتی بێگومان ئەم سامانەم پێدراوە بە هۆی زانیارییەکەوە کە هەمە، واتە ئەم ماڵ و سامانە لە لایەن خوای گەورەوە نییە، بەڵکو دەرەنجامی ماندویەتی و ڕەنج و دەستکەوتنی خۆمە، تەماشاکەن ئەم جۆرە کەسانە بەو شێوەیە شتەکە دەدەنە پاڵ خودی خۆیان و نکوڵی لە فەزڵی خوای گەورە دەکەن.

(٢)_ (لە کاتی تاعەت و گوێڕایەڵی دا قەدەریت)، چونکە کەسانێك هەن هەر کات پێیان گوترا: نوێژ بکە، تاعەتەکان ئەنجامبدە، دەڵێت: ئەگەر خوای گەورە بۆی تەقدیر کردبێتم و لە چارەی نوسیبێتم نوێژ بکەم، نوێژ دەکەم، ئەگەر لە چارەشی نەنوسیبێتم نوێژ بکەم نوێژ ناکەم، ئەم جۆرە قسانە هەتا وەکو ئێستاش لەسەر زمانی هێندێ کەسانی شکست خواردودا هەر ماون، هەرکات پێی بگوترێت: تەوبە بکە، دەڵێت: ئەگەر خوای گەورە تەوبەی بۆ تەقدیر کردبێتم و لە چارەی نوسیبێتم ئەوە تەوبە دەکەم، وە ئەگەر لە چارەشی نەنوسیبێتم تەوبە ناکەم، چ بکەم شتەکە بە دەستی من نییە، دەڵێت: ئەگەر خوای گەورە لە چارەی نوسیبێتم صدەقە بکەم و نوێژ بکەم دەیکەم، ئەگەر لەچارەشی نەنوسیبێتم ئەوە هیچ شتێك ناکەم، زۆرێك لە نەفامان ئەم جۆرە قسانە دەڵێنەوە. سەرزەنشتی خودی خۆی ناکات و تەوبە بکات، بەڵکو دەڵێت: چ بکەم ناچاری کردنی ئەو شتە کراوم، من هیچم بەدەست نییە، عوزرو بەهانەو بیانوو بۆ خودی خۆی دێنێتەوە، چونکە بە گوتەی خۆی ناچار کراوە. لە کاتی تاعەت و گوێڕایەڵیدا قەدەریت: ئەمە لەسەر بیروباوەڕی موعتەزیلەکانە، لەکاتی گوناه و تاوان و سەرپێچیشدا ناچارکراویت: ئەمە لەسەر بیروباوەڕی جەبریەکانە.

هەر مەزهەب و ڕێبازێك ڕێكەوتی هەواو ئارەزووەكانت بوو بیكەرە ڕێبازی خۆت[1]!.
بەڵام ئەهلی ڕێگەی ڕاست و ڕێنومایی هەر كات كردەوەیەكی چاكیان ئەنجام دا سوپاس گوزار دەبن و دانی پێدادەنێن كە ئەوە فەزڵی خوای گەورەیە بۆ ئەوان، وە تەنها ئەو زانەیە كە نیعمەت و بەهرەی خۆی بەسەردا ڕژاندوون، كردوونی بە موسڵمان، وایلێكردوون نوێژ بكەن، پارێزگاری و تەقواكاری خستۆتە دڵیانەوە، چونكە لە توانای هیچ كەسێكدا نییە لەبارێكەوە بۆ بارێكی تر بگۆڕێت مەگەر بەهێزو توانای خوای گەورە، بەگەڕانەوەی ئەوانەش بۆ قەدەرو چارەنووس ئیتر هەموو خۆ بە زل زانین و منەت و زانێكیان لەسەر لاچوو[2]، وە هەر كات خراپەیەكیش ئەنجام بدەن ئیستیغفارو داوای لێبوردن دەكەن و تەوبە دەكەن و بۆ لای خوای گەورە دەگەڕێنەوە[3].

---

(١)_ ئەمەیە موسیبەت و كارەسات، چونكە كەسانێك لەمەزهەب و ڕێباوەڕو گوتەكاندا بە ئارەزووی خۆیان هەڵ دەبژێرن، تەنانەت لە عەقیدەو بیروباوەڕیش دا، ئەو فەتوایانە هەڵ دەبژێرن كە گونجاویانە، ئەو گوفتارانە هەڵ دەبژێرن كە گونجاویانە ئەگەرچی هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نەبێت، با هەڵەو نادروستیش بێت، ئەوەشی كە گونجاوی ئەوان نییە ئەگەرچی بەڵگەی ڕاست و سەلماندنیشی لەسەربێت قبوڵیناكەن، چونكە شوێنی هەواو ئارەزوواتی خۆیان كەوتوون.

(٢)_ بەڵێ، بە پەرستن و تاعەت و گوێڕایەڵیەكانیان تووشی عوجب ناین، چونكە بەفەزڵ و چاكەیەكی خوای گەورەی دادەنێن كە پێی بەخشیون، وە تەنها خوای گەورەیە بۆ ئەو شتانە ڕێنوموییی كردوون، خوای گەورەیە فەزڵی خۆی پێی بەخشیون، بۆیە لەسەر تاعەت و گوێڕایەڵیەكان سوپاس گوزار دەبن، لە كاتی تاوان و سەرپێچیشدا ئیستیغفارو داوای لێبوردن دەكەن، لە كاتی نیعمەت و بەهرەدا سوپاسی خوای گەورە دەكەن، تاعەت و گوێڕایەڵیش هەرە گەورەترینی هەموو نیعمەتەكانە.

(٣)_ تەماشاكە، بەخش و نیعمەتەكان بۆ خوای گەورەی دەگەڕێننەوە، بەڵام تاوان و سەرپێچیەكانیان بۆ خودی خۆیانی دەگەڕێننەوە، ئیتر تەوبە دەكەن و ئیستیغفارو داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەكەن.

هەروەها بوخاری لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی لە شەددادی کوڕی ئەوس دەڵێ: پێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سَيِّدُ الاِسْتِغْفَارِ أَنْ يَقُولَ الْعَبْدُ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ خَلَقْتَنِي، وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، مَنْ قَالَهَا إِذَا أَصْبَحَ مُوقِنًا بِهَا فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ قَالَهَا إِذَا أَمْسَى مُوقِنًا بِهَا فَمَاتَ مِنْ لَيْلَتِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ))[1]. واتە: لە شەددادی کوڕی ئاوسەوە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((گەورەترین ئیستیغفارو داوای لێبوردن ئەوەیە بەندە بڵێت: خوایە تۆ پەروەردگارمی، هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ، بەدیتهێناوم و من بەندەی تۆم، وە من لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەمم کە بە تۆم داوە تا بتوانم، پەنات پێدەگرم لە شەڕو خراپەی ئەوەی دروستت کردووە، دان ئەنێم بە نیعمەت و بەهرەکانتدا کە پێتداوم، دانیش ئەنێم بە گوناه و تاوانەکانمدا سالێم خۆشبە، بە ڕاستی کەس لە گوناه و تاوان خۆش نابێت جگە لە تۆ، هەر کەس سەر لە بەیان بە بڕوایەکی تەواوەوە بیڵێت و لە ڕۆژەکەیدا بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە، وە هەر کەسیش سەر لە ئێواران بە بڕوایەکی تەواوەوە بیڵێت و لە شەوەکەیدا بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە)).

---

(١)_ ئەم فەرموودە فەرموودەیەکی گەورەیە، دانیپێدادەنێت کە خوای گەورە پەروەردگارە، خولقێنەرو بەدیهێنەرە، ((أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ)) دانی پێی دادەنێت کە خوای گەورە نیعمەت و بەهرە بەخشەرە، ((وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ)) وە دانیشی پێی دادەنێت کە گوناه و تاوان تەنها لە لایەن خودی بەندەکەوەیە، لێرەدا تەماشا دەکەین نیعمەت و بەهرەکانی بۆ خوای گەورە گەڕاندۆتەوە بەڵام گوناه و تاوانی بۆ نەفسی خۆی گەڕاندۆتەوە، بۆیە ئیستیغفارو داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکات.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرمووێ: ((يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلاَ تَظَالَمُوا، يَا عِبَادِي، إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا وَلاَ أُبَالِي، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ، يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ، يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ، يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ، يَا عِبَادِي، إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي، يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا، يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا، يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْبَحْرُ إِذَا غُمِسَ فِيهِ الْمِخْيَطُ غَمْسَةً وَاحِدَةً، يَا عِبَادِي، إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدْ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلا يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ))[1] صحيح: أخرجه مسلم (٢٥٧٧)، من حديث أبي ذرّ ﷺ عن النبي ﷺ فيما يرويه عن ربه تبارك وتعالى.

---

(١)_ ئەم فەرموودە فەرموودەکەی ئەبی زەڕە ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پەروەردگاریەوە دەیگێڕێتەوەو، بە فەرموودەی قودسی ناسراوە، بۆ جیاوازی کردن لە نێوان ئەم و فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ، فەرموودەی قودوسی هەر فەرموودایەکە کە گوفتاری خوای گەورە بێت، بەلأم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ گوفتاری خۆیەتی، فەرموودە قودوسیەکان زۆرن، هێندێکیان (صحیح)ن و هێندێکیشیان لە خوار (صحیح) ەوەیە، فەرموودە قودوسیەکان چەندین جار کۆ کراونەتەوەو کتێبیان لە بارەوە دانراوە، ئەم فەرموودەیەش بە ناو بانگترینیانە، چونکە چەندین شت لە خۆ دەگرێت، یەکەمی ئەو شتانەش پاک ڕاگرتن و بە دور

ولە لەئەبو ذەڕەوە ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسیدا لە خوای گەورەوە کە فەرموویەتی: ((ئەی بەندەکانم، من ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردوەو، لە نێوانی ئێوەشدا حەرامم کردووە، بۆیە ستەم لە یەکتر مەکەن، ئەی بەندەکانم، ئێوە بەشەو ڕۆژ هەڵە دەکەن، منیش لە هەموو تاوانەکان خۆش دەبم و گوێی پێنادەم، بۆیە داوای لێخۆشبونم لێبکەن لێتان خۆش دەبم، ئەی بەندەکانم، هەمووتان برسین مەگەر ئەوانەی کەمن خواردنم پێداون، بۆیە داوای خواردنم لێبکەن خواردنتان دەدەمێ، ئەی بەندەکانم، هەمووتان ڕووتن مەگەر ئەوانەتان کەمن پۆشتەم کردوون، بۆیە داوای پۆشاکم لێبکەن پۆشتەتان دەکەم، ئەی بەندەکانم، هەمووتان گومڕان مەگەر ئەوانەتان کەمن ڕێنموویم کردوون، بۆیە داوای ڕێنموییم لێبکەن ڕێنموویتان دەکەم، ئەی بەندەکانم، بە ڕاستی ئێوە ناتوانن بگەن بەو ئاستەی زیان بەمن بگەیەنن، هەروەها ناتوانن بگەن بەو ئاستەی کە سوودم پێ ببەخشن، ئەی بەندەکانم، ئەگەر سەرەتا و کۆتاتان، بە مرۆڤ و جنۆکەوە دڵیان وەکو دڵی لە خواترسترین کەستان بێت، ئەوە هیچ لەموڵکی من زیاد ناکات، ئەی بەندەکانم ئەگەر سەرەتاو کۆتاتان، بەمرۆڤ و جنۆکەوە دڵیان وەکو دڵی خراپترین کەستان بێت، ئەوە هیچ لەموڵکی من کەم ناکات، ئەی بەندەکانم ئەگەر سەرەتاو کۆتاتان، بە مرۆڤ و جنۆکەتانەوە تێکڕا لە گۆڕەپانێکدا بوەستن و داوام لێبکەن، هەموو مرۆڤێك ئەوەی کە داوای دەکات پێی ببەخشم، ئەوە هیچ موڵکی من کەم ناکات مەگەر ئەوەندەی کە ئاوی دەریا کەم دەکات ئەگەر یەکجار دەرزیەکی تێدا نقوم بکرێت و دەرهێنرێتەوە، ئەی بەندەکانم، لە ڕاستیدا تەنها کردەوەکانی خۆتانەو بۆتانی دەژمێرم و تۆماری دەکەم و، پاشان پاداشتتان دەدەمەوە، بۆیە هەر کەس چاکەی دەستکەوت با سوپاسی خوای گەورە بکات، هەر کەسیش شتی تری دەستکەوت با تەنها سەرزەنشتی خودی خۆی بکات)).

---

گرتنی خوای گەورەیە لە ستەم، ستەمیش بریتیە لە دانەنانی شت لە جێگە شیاو خۆیدا، خوای گەورەش لە ستەم بەدورە، وەکو ئەوەی سزا لە جێگەی خۆیدا

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

دانەنێت، یان نیعمەت و بەهرەکان لە جێگەی خۆیدا دانەنێت، خوای گەورە دانایە حەکیمە، سزای هەر کەسێك دەدات کە بیەوێت، بەزەیی بە هەر کەسێکیشدا دێتەوە کە بیەوێت، بەڵام هیچ کەسێك بەبێ هۆ سزا نادات، وە نیعمەتی خۆشی نابەخشێت بەبێ هۆ، بەڵکو خوای گەورە پاداشتی هەموو کەسێك دەداتەوە بە پێی کردەوەکانی خۆی، وەکو ئەوەی لە کۆتایی فەرموودەکەدا هاتووە: ((إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدْ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلا يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ)) واتە: لە ڕاستیدا تەنها کردەوەکانی خۆتانەو بۆتانی دەژمێرم و تۆماری دەکەم و، پاشان پاداشتتان دەدەمەوە، بۆیە هەر کەس چاکەی دەستکەوت با سوپاسی خوای گەورە بکات، چونکە ئەو چاکەی بە یارمەتی خوای گەورەوە دەست کەوتووە، نەك بە هەوڵ و توانای خودی خۆی، بەڵکو خوای گەورە یارمەتی داوەو ڕێنوێنی کردووە، ئەمەش بەر پەرچ دانەوەی موعتەزیلەکانە ئەوانەی نکۆڵی لەوە دەکەن کە خوای گەورە کردەوەی بەندەکانی خولقاندبێت. لە ڕاستیدا هیدایەتدان تەنها بە فەزڵی خوای گەورەیەو، بشیەوێ هەر بەندەیەکی خۆی دەخاتە سەر ڕێی ڕاست و ڕێنوێنیدەکات، وە بشیەوێ هەر بەندەیەکی خۆی گومڕا دەکات، بەڵام هیدایەتدان هۆکاری هەیە لە لایەن بەندەوە، بەندە ئەنجامی دەدات، گومڕایکردنیش هۆکاری هەیە لە لایەن بەندەوە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى(٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى(٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى(٧)﴾ [الليل: ٥_٧] واتە: ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ) ببەخشێ و لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت وە بڕوای ببێت بەوەی زۆر چاکە (لا إله إلا الله یان بەهەشت) ئەوە بێگومان یارمەتی دەدەین بۆ ڕێی ئاسان (کە چاکەیە)، ماڵ بەخشین و، لە خوا ترسان و بڕوا هێنان بە چاکە کردەوەی بەندەن، هۆکار گەلێکن خوای گەورە لەو دەروازانەوە ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات. هەروەها

خــوای گــەورە دەفــەرموێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى(٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى(٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى(١٠)﴾ [الليل: ٨_١٠] واتە: وە ئەو کەسەی ڕژدی بکات خۆی بێنیاز بزانێت وە بڕوای نەبێ بەچاکە (کە لا إله إلا الله یان بەهەشتە) ئـەوە بێگومـان ڕێـی سەختی بۆ ئاسان دەکەین، بەندە خۆی بۆ خۆی ناڕەحەتی و سەختی یان کامەرانی دروست دەکات، خوای گەورە پاکەو بێگەردەو لەوە بەدورە بەبێ هیچ هۆکارێك ستەمی لێبکات، یان کامەرانی بداتێ بەبێ هیچ هۆکارێك، ئەمەیە شاهێدی قسەکانمان لەم فەرموودەیە، بەوەی کە پاداشت لەسەر کردەوەیە، هەر کەسێك لەسەر کردەوەکانی خۆی پاداشت دەدرێتەوە، پاداشت و سزا نادرێتەوە بەهۆی کردەوەی کەسانی ترەوە، ئا ئەمەیە دادپەروەری خوای گەورە، چونکە ئەگەر کەسێك بەبێ هیچ هۆیەك سزا بدات، یان سزای کەسێك بدات بە هۆی تاوان و کردەوەی کەسێکی ترەوە، یان نیعمەتی خۆی بەسەر کەسێکدا بڕژێنێت بە هۆی چاکەو کردەوەی کەسانی ترەوە، بێگومان ئەوە دەبووە ستەم، خوای گەورەش پاك و بێگەردەو لەو شتانەوە بە دوورە.

لێرەدا خوای گەورە فەرمانی داوە سوپاس و ستایش بکرێت لەسەر ئەو خەیرەی کە بەندە دەیبینێت پێی بەخشراوە، وە ئەگەر تووشی شەڕو خراپەش بوو با تەنها سەرزەنشتی خودی خۆی بکات[1].

---

(١)_ خەیر فەزلێکە لە لایەن خوای گەورەوە، خوای گەورە یارمەتی بەندەکانی داوە بۆ ئەنجام دانی تاعەت و خواپەرستی و گوێڕایەڵی و کردەوەی چاك بۆیە ئەوانەی کاتێ دەچنە بەهەشتەوە، دەڵێن: ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَآ أَنْ هَدَانَا اللَّهُ﴾ [الأعراف: ٤٣] واتە: وە دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنموونیی کردین بۆ ئەم ڕێگایە کە ئێمە هەرگیز ڕێبازی ڕاست شارەزا نەدەبوین ئەگەر خوا ڕێنموونیی نەکردینایە. دانیان پێدانا چونکە بەهەشت فەزلێکە لە لایەن خوای گەورەوە، وەکو ئەوەی پێشتریش ئاماژەمان پێدا بەهەشت بەو جۆرە نییە کە مرۆڤ کردەوەو تاعەتەکان ئەنجام بدات و لە جیاتی ئەوە بخرێتە بەهەشتەوە، بەهەشت زۆر لەوە گرانبەهاتر کە لە بیری ئێمە دایە، بەڵکو چوونە بەهەشت بە تەنها فەزڵ و ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی خۆی، ئەگەر فەزڵی خوای لەگەڵدا نەبێت چوونە بەهەشت مەحاڵە، ئەنجامدانی کردەوە چاکەکانیش تەنها هۆکارێکەو هیچی تر کە پێویستە ڕەحمەت و بەزەیی خوای لەگەڵدا بێت بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بخرێتە بەهەشتەوە. بەڵام ئەگەر مرۆڤ شتێکی دیکەی جگە لە خەیری دەستگیر بوو، با تەنها لۆمەو سەرزەنشتی خودی خۆی بکات، چونکە خەتاکە هی خودی خۆی بوو کاتێ ئەو کردەوە خراپانەی ئەنجام دا، بۆیە با تەنها لۆمەو سەرزەنشتی خودی خۆی بکات، لۆمەو سەرزەنشتی قەزاو قەدەر نەکات، چونکە وەکو پێشتریش ئاماژەی پێدرا قەزاو قەدەر دەکرێتە بەهانەو بیانوو بۆ ئەو موسیبەت

---

---

---

و کارەسات و نارەحەتیانەی کە مرۆڤـ تووشی دەبێت، کە پێویستە ئادەمیزاد صەبرو ئارامی لەسەر بگرێت، بەڵام مرۆڤـ گوناه و تاوان ئەنجام بدات و بڵێت: چ بکەم قەزاو قەدەرە کە تاوان دەکەم خوا بۆی نووسیوم، کەسی عاقڵ و ژیر ئەم قسانە بەزاریدا نایەت، قەزاو قەدەر ناکرێتە بەهانەو بیانوو بۆ ئەنجامدانی تاوان و کوفرو شیرك و هاوەڵپەرستی و سەرپێچیەکان، پێویستە مرۆڤـ سەرزەنشتی خودی خۆی بکات، چونکە تەنها خۆی ئەو شتانەی بەسەر خۆیدا هێناوە. بۆیە کاتێ ئەهلی دۆزەخ دەچنە دۆزەخەوە داوادەکەن جارێکی تر بگەڕێنرێنەوە بۆ دونیا تا ئەمجارە کردەوەی چاك ئەنجام بدەن، بۆ ئەمە دەڵێن؟ چونکە دەزانن چوونەتە دۆزەخەوە بەهۆی کردەوە خراپەکان و کوفرەکانی خۆیانەوە بۆیە داوای دوبارە گەڕانەوە بۆ دونیا دەکەن بۆ ئەوەی کردەوەکانیان چاك بکەنەوە.

## حەقیقەتی قەدەری (کۆن)ی حەقیقەتی شەرعی

کەسانێکی زۆر بە زمانی حەقیقەت دەدوێن، بەڵام جیاوازی ناکەن لە نێوان حەقیقەتی کەونی قەدەری کە پەیوەندی دارە بە خولقاندن و ویستی خوای گەورەوە(بخلقه و مشیئته) وە لە نێوان حەقیقەتی شەرعی کە پەیوەندیدارە بەڕازیبوون و خۆشویستنیەوە (برضاه و محبته)(١)

---

(١)_ دوو حەقیقەت لە ئارادایە: حەقیقەتێکی کەونی کە پەیوەندیدارە بەویستی خوای گەورەوەو مرۆڤ هیچ ویستێکی بەسەرەوە نییە، ئەمە قەزاو قەدەری خوای گەورەیە، وە حەقیقەتێکی شەرعیش کە پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەیەو ویستی تێدا هەیە، چونکە لێرەدا مرۆڤ ئەو کردەوە چاك و تاعەت و خێرانە ئەنجام دەدات کە خوای گەورە بە شەرعی داناون، یان پشتگوێیان دەخات، بەڵام لە حەقیقەتی کەونیدا هەندێ شت هەن مەرج نییە خوای گەورە خۆشی بوێ و پێی ڕازیبێت، بۆ نموونە کوفر حەقیقەتێکی کەونییە خوای گەورە تەقدیری کردوەو قەزای کردووە، بەڵام خۆشیشی ناوێت، بەڵام لەبەر حیکمەت و داناییەك تەقدیری کردووە، بەڵام حەقیقەتی شەرعی بریتیە لەو فەرمانانەی کە خوای گەورە فەرمانی پێداوین، خوای گەورە ئەو فەرمانانەی خۆش دەوێت و پێی ڕازییە بۆیە وەکو شەرع بۆ بەندەکانی خۆی دایناون، بۆ نموونە خوای گەورە ئیماندارانی خۆش دەوێت، کردەوە چاکەکانی خۆش دەوێت، بۆیە فەرمانیداوە بەندەکانی ئەو کردەوە چاکانە ئەنجام بدەن، وە ڕقی لە گوناهـ و

ئـاوان و سەرپێچـی و کـوفرو شـیرك و هاوەڵپەرسـتی دەبێتـەوە بۆیـە فەرمانیداوە بەندەکانی لەوانە خۆیان بە دوور بگرن، ئا ئەمانەیـە حەقیقـەتی شـەرعی. کەسانێکی زۆر خۆیان تەنها بە حەقیقەتی کەونیەوە پابەند دەکەن، وەکو کۆمـەڵی جەبریـەکان و کۆمەڵی صۆفیەکان و غەیری ئەوانیش کە خۆیان تەنها بە قـەزاو قـەدەرەوە پەیوەند دەکەن، بـەڵام ئەمـە هەڵەیـەو گومڕاییـە، چـونکە حەقیقـەتێکی شـەرعی هەیە خوای گەورە فەرمانی پێداوە، فەرمانـەکان و قەدەغـەکان و حوکمـەکان ئەمانـە حەقیقـەتی شەرعین و ئەوان پشتگوێیان خستوون و، خۆیان تەنها بە حەقیقەتی کەونیەوە پابەند کردووە، ئەمە هەڵەیەو پێویستە مرۆڤ جیاوازی بکـات لـە نێـوان قـەزاو قـەدەرو و لە نێوان فەرمانە شەرعیەکاندا وەکـو ئـەوەی دواتـر شێخولئیسـلام _ ڕەحمـەتی خوای لێ بێت _ باسی دەکـات، پێویسـتە ئـادەمیزاد جیاوازیـان لـە نێوانـدا بکـات. حەقیقەتی کەونی مەرج نییە خوای گەورە خۆشی بوێن و پێی ڕازی بن، بەڵام حەقیقەتی شەرعی مەرجە خوای گەورە خۆشی بوێت و پێی ڕازیبێت.

هەروەها جیاوازی ناکەن لە نێوان ئەو کەسەدا کە قەدەری شەرعی پیادە دەکات وەکو قایل بونێك بۆ ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێداوە لەسەر زمانی پێغەمبەرانی وە لە نێوان ئەوکەسەدا کە هەواو هەوەس و ئارەزووی خۆی کار دەکات بە بێ هیچ گرنگی دانێك بە قورئان و سوونەت[1].

---

(١)_ کەسانێکی زۆر هەن بە هەواو هەوەسی تایبەتی خۆیان، ئەوەی کە نەفسیان فەرمانیان پێدەکات کار دەکەن، بەڵام ئەمە گومڕاییەکی ئاشکرایە، چونکە واجیب ئەوەیە ئادەمیزاد بەپێی شەرعەکەی خوای گەورە کار بکات، بەڵام حەزو ئارەزووی تایبەت هیچ پەیوەندیەکی بەکردەوە شەرعیەکانەوە نییە، ئەگەر عەقڵ و حەزو ئارەزووت بەس بوایە ئەوا خوای گەورە کتێبەکانی دانەدەبەزاندو پێغەمبەرانی نەدەناردو، بەندەکانی خۆی دەدایە دەست عەقڵی خۆیان، کە مرۆڤ شتێکی پێی خۆشە، یان چێژی لێدەبینێت ئەوە بەڵگەنییە بۆ ئەوەی شتەکە ویستراو و بە چاك دانراو بێت، پێدەچێ جار بە جار مرۆڤ شتە ناشیرین و خراپەکانیش بە چاك دابنێت، لەوانەیە حەزی بەشتە ڕاست و دروستەکان نەبێت، حەزی بە تاعەت و گوێڕایەڵی و کردەوەی چاك نەبێت، یان لەوانەیە حەزی بە شەڕو لە ڕێی لادان و یاخی بوونبێت، بۆیە ئەوەی مرۆڤ حەزی لێیەتی و چێژی لێ وەردەگرێت بەڵگەنییە بۆ ئەوەی ئەو شتە بە چاك بزانرێت و ویستراو بێت، پێدەچێ مرۆڤ شەڕ بەچاکدابنێت و حەزی بەخەیر نەبێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ [البقرة: ٢١٦] واتە: وە دەگونجێ شتێکتان پێناخۆشبێت و باشبێ بۆتان وە دەگونجێ شتێکتان پێی خۆشبێت و خراپبێ بۆتان وە خوا (چاك و خراپی ئێوە) دەزانێ و ئێوە نایزانن. کەوا بوو پێوەرەکە بریتی نییە لەوەی مرۆڤ ئەو شتەی بە دڵ بێت یان مەیلی بکات یان عەقڵی ڕێنوێنی بۆ بکات، ئەمە پێوەرەکە نییە، بەڵکو پێوەر تەنها بریتیە لە شەرعە پاکەکە.

هەروەها لاسانێکی زۆر جیاوازی ناکەن لە بەکارهێنانی تێگەیشتن وشەی شەریعەت یان (شەرعی) لەنێوان شەرعی دابەزێنراو لەلایەن خوای گەورەوە[١] کە بریتیە لەو قورئان و سوونەتەی کە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەیدا ناردوویەتی خوارەوە[٢]

---

(١)_ هەروەها وەك چۆن لە مەسەلەی عەقڵ و حەزو ئارەزوودا بە هەڵە داچوون و کردتیان بە پێوەر، بەو جۆرە کەسانێکی زۆر بەتوندی خۆیان بەشەرعەوە پابەند دەکەن، بەڵام لە نێوان (الشرع المنزَّل) و (الشرع المبَدَّل) و (الشرع المؤَوَّل)دا جیاوازی ناکەن، (الشرع المنَزَّل): واتە: شەرعی دابەزێنراو بریتیە لەو شەرعەی کە خوای گەورە بەمانار حەقیقەت و مەبەست و ناوەڕۆکیەوە دایبەزاندووە، (الشرع المبَدَّل) واتە: شەرعی گۆڕاو: برییتە لەدرۆو دەلەسەی باتنیەکان و ئیسماعیلیەکان و ئەهلی گومڕایی، (الشرع المؤَوَّل): ئەو شەرعەیە کە ئیجتیهادی تێدا دەکرێت، هەڵەشی تێی دەکەوێت، چونکە کەسی موجتەهید هەڵە دەکات و دەشپێکێت، ئیتر ئەو ئیجتیهادەی کە سازیاری هەق بوو وەردەگرێت و، ئەوەشی هەڵە بوو وازی لێدەهێنرێت.

(٢)_ ئەمە (الشرع المنَزَّل)ە شەرعی دابەزێنراوە کە هەر هەموو پێغەمبەران و بەندە چاکەکانی خوای گەورەی لەسەرە.

_ بۆ هیچ کەسێك نییە لە چوار چێوەی ئەو شەرعە بچێتە دەرەوە، جگە لە کافریش هیچ کەسێکی دیکەی لێی ناچێتە دەرەوە[1] _ وە لە نێوان ئەو شەرعەدا کە بریتییە لە حوکمی دادوەرە، دادوەر جار بە جار دەیپێکێت و جار بە جاریش هەڵە دەکات[2]،

---

(١)_ هیچ کەسێك لە چوارچێوەی ئەم شەرعە ناچێتە دەرەوە جگە لە کافر، چونکە سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەی کردووە وەکو ئیبلیس، خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾ [الكهف: ٥٠] جگە لە ئیبلیس نەبێت کە لە پێڕی جنۆکەکان بوو بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، هەروەها خوای گەورە بەئیبلیس دەفەرموێت: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ﴾ [الأعراف: ١٢] (خوا) فەرمووی چی بەرگری کردی کە سوجدە نەبەیت کاتێ فەرمانم پێکردی. کاتێ سەرپێچی فەرمانەکەی کرد لە فەرمانی پەروەردگاری چووە دەرەوە، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پێویستە بەندە گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاری بێت، چونکە ئەگەر سەرپێچی بکات دەبێتە فاسیق واتە: دەرچوو لە فەرمانی پەروەردگاری.

(٢)_ حوکمی دادوەر دەچێتە چوارچێوەی (الشرع المؤَوَّل) ەوە، ئەم جۆرە شەرعەوە، لەوانەیە حەق بپێکێت، لەوانەشە هەڵە بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ)) واتە: ((هەر کات حاکم ئیجتیهادی کردو پێکای، دوو پاداشتی بۆ دەنوسرێت و، هەر کات ئیجتیهادی کردو نەیپێکا، یەك پاداشتی بۆ دەنوسرێت))، ئا ئەمە (الشرع المؤَوَّل)ە کە مەرج نییە ڕاست بێت، لەوانەیە هەڵە بکات، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((الْقُضَاةُ ثَلاَثَةٌ: قَاضِيَانِ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ فِي الْجَنَّةِ،

رَجُلٌ عَلِمَ الحَقَّ فَقَضَى بِهِ فَهُوَ فِي الْجَنَّةِ، وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ فَهُوَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ عَلِمَ الحَقَّ فَقَضَى بِغَيْرِهِ فَهُوَ فِي النَّارِ)) ڕاوی؟ واتـە: ((دادوەران سـیانن: دوو دادوەریسان لەدۆزەخدایەو، دادوەرێکیان لەبەهەشتدایە: پیاوێك هەق _ واتە حوکمەکانی قورئان و سوونەتی _ زانی و بەو دووانەش دادوەری کرد ئەم لە بەهەشت دایە، وە پیاوێك لە نێوان خەڵکدا دادوەری کرد بە نەفامی ئەو لە ئاگردایـە، وە پیـاوێکیش هـەقی زانی و بەغەیری ئەو دادوەری کرد ئەویش لە ئاگردایە))، ئەو دادوەرەی بـە نـەفامی دادوەری کردووە هەقی نەزانیوە، بۆیە نەفام بـوەو، بەنـەفامی دادوەری کـردووە، ئـیتر هەڵەی کردووە، ئەم پیاوە هەم نەفامی و هەم هەڵەی لە خۆی دا کۆکردۆتەوە، ئەم لە دۆزەخ دایە، چونکە ڕێگە نەدراوە نەفام نەدادوەری بکات، نەئیجتیهاد بکات لـە کاتێکدا ئەو نەفامە، بەڵام ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر ڕەفتاری خۆی، بێگومان دەچێتە ئاگرەوە.

ئەمە ئەگەر زاناو دادپەروەر بێت[١] ئەگینا لە کتێبەکانی ((السُنن))دا هاتووە: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ((القُضَاةُ ثَلاَثَةٌ: قَاضِيَانِ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ فِي الجَنَّةِ، رَجُلٌ عَلِمَ الحَقَّ فَقَضَى بِهِ فَهُوَ فِي الجَنَّةِ، وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ فَهُوَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ عَرَفَ الحَقَّ فَقَضَى بِغَيْرِهِ فَهُوَ فِي النَّارِ))[٢] واتە: ((دادوەران سیانن: دوو دادوەریان لە دۆزەخدایەو، دادوەرێکیان لە بەهەشت دایە: پیاوێک هەق زانی _ واتە حوکمەکانی قورئان و سوننەتی _ زانی و بەو پێیە دادوەری کرد ئەوە لە بەهەشت دایە، وە پیاوێک لە نێوان خەڵکدا دادوەری کرد بە نەفامی ئەوە لە ئاگردایە، وە پیاوێکیش هەقی زانی و بەغەیری ئەو حەقە دادوەری کرد ئەویش لە ئاگردایە))، وە چاکترین دادوەرە زانای دادپەروەرەکان گەورەی نەوەکانی ئادەم موحەممەدە ﷺ.

---

(١)_ ئەگەر زاناو دادپەروەر بێت دەیپێکێت و هەڵەش دەکات، بەڵام ئەگەر نەفام بوو ئەوە جایز نییە دادوەری بکات، هەروەها ئەگەر هەقی دەزانی جایز نییە پشتگوێی خات و بە هەواو ئارەزوای تایبەتی خۆی و بەبێ هەق دادوەری بکات، بەڵکو پێویستە دادوەریی بەوانە بکات کە خوای گەورە دایبەزاندوون، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيماً﴾ [النساء: ١٠٥] واتە: بۆ ئەوەی بڕیار بدەی لە نێوان خەڵکیدا بەو بڕیارەی کە خوا نیشانیداویت وە بۆ ناپاکان مەبە بە پارێزەرو داواچی. ئا ئەمەیە واجیب لەسەر زاناو، لەسەر دادوەر بە تایبەت، نابێت بە گوێرەی هەواو ئارەزوی تایبەتی خۆی دادوەری بکات، بەڵکو بەوانە دادوەری دەکات کە خوای گەورە دایبەزاندوون، جائیتر ئەگەر زانا بوو ئیجتیهادی کرد بەڵام هەڵەی کرد ئیتر ئەو خاوەن عوزرە بەهانەدارە، بەڵام ئەگەر هەقیشی پێکا ئەوە دوو پاداشتی بۆ دەنوسرێت، بەڵام ئەگەر هەر لە بنەڕەتەوە نەفام بوو ئەو شتە، بەڵکو لە ئاگردایە، چونکە بەبێ زانیاری دادوەری کردووە.

(٢)_ صحيح: أخرجه أبوداود (٣٥٧٣)، والترمذي(١٣٢٢)، وابن ماجة(٢٣١٥)، من حديث بريدة رضي الله عنه مرفوعاً.

هەروەها پێغەمبەر خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَأَقْضِي لَهُ عَلَى نَحْوٍ مِمَّا أَسْمَعُ مِنْهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا فَلَا يَأْخُذْهُ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنْ نَارٍ))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٢٦٨٠)، (٦٩٦٧)، (٧١٦٩)، ومسلم (١٧١٣)، من حديث أم سلمة رضي الله عنها مرفوعاً. واتە: ((ئێوە کێشەو ناکۆکیەکانتان بۆ لایمن بەرزدەکەنەوە، پێدەچێ هێندێکتان لە هێندێکی ترتان زەمان پاراوتر بن لە ڕوونکردنەوەی بەڵگەکانیدا، منیش بەگوێرەی ئەوەی کە لێوەی دەیبیستم ماف بدەم بەو، جا هەر کەس بڕیارم بۆ داو مافی برایەکیم دایە با نەیبات، چونکە با دڵنیا بێت کەمن پارچەیەك لە ئاگرم بۆ بڕیارداوە)).

لێرەدا گەورەی نەوەکانی ئادەم ﷺ هەواڵی پێداوین کە ئەگەر بڕیاری شتێکیدا بە گوێرەی ئەوەی گوێبیستی بووەو، واقیع و ناوەڕۆکیش پێچەوانەی ئەوە بوو، ئەوە جایز نییە بۆ ئەو کەسەی کە بڕیاری شتەکەی بۆ داوە بیبات، چونکە لە ڕاستیدا تەنها پارچەیەك لە ئاگری بۆ بڕیوەتەوە.

---

(١)_ ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە، بریتیە لەوەی دادوەر بەپێی ڕواڵەت و بڕیار دەدات، بەڵام لە ناوەڕۆکەوە خوای گەورە بە ڕاست و نا ڕاست زانایەو بڕیاری کۆتایی لای خۆیەتی، بۆیە ئەگەر دادوەر ئیجتیهادی کردوو بە پێی ڕواڵەتی دەرەوە بڕیاری داو لە ناوەڕۆکەوە بڕیارەکەی هەڵە بوو، لێرەدا زانایان جیاواز بوون، ئایا بڕیارەکەی دادوەر ئەوەی بۆ حەڵاڵ دەکات کە بۆی بڕیارداوە، یان بۆی حەڵاڵ ناکات،، ڕاست و دروست ئەوەیە کە بۆی حەڵاڵ ناکات، چونکە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بڕیاری دادوەر نە حەرام حەڵاڵ دەکات، نەحەڵاڵیش حەرام دەکات، بەڵکو لە ڕۆژی قیامەتدا کێشەو ناکۆکیەکان دووبارە دەکرێنەوە، دیسان لە نێوان خەڵکیدا دادوەری دەکرێت، خوای گەورە لە نێوان خەڵکیدا دادوەری دەکات، کەوا بوو هەر کەسێك بزانێت لە ناوەڕۆکەوە هەڵەیە، هەر کەسێك بزانێت دادوەر بەپێی ڕواڵەت و ڕووکاری دەرەوە بڕیاری بۆ داوە بەڵام لە ناوەڕۆك دا مافی ئەونییە، با تەوبە بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە، مافەکەش بۆ خاوەن

---

مەق بگەڕێنێتەوەو، نەیبات. بە واتایەکی تر دادوەر کە بڕیار دەدات غەیبزان نییە، دادوەر غەیب نازانێت، تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ غەیبزان نەبووە، دادوەر بەپێی ئەوەی کە گوێبیستی دەبێت بڕیار دەدات، بە بەڵگە، بەشایەت، وە پێدەچێ یەکێك لە خەصم و نەیارەکان ڕەوانبێژی و زمانپاراویەکی زۆری هەبێت بە ئاستێك بەڵگەکانی خۆی پێدەنەخشێنێت و ساختەیان دەکات، لەکاتێکدا نەیاری دووەم داماوەو قسەی ڕازاوەی پێی نییە و ئەمیش ڕاستەقینەیە خاوەن مافی، بەڵام زانپاراوی و هێزی ڕوون کردنەوەو ڕەوانبێژی نییە، ئیتر نەیارەکەی تر کە ڕەوانبێژی و نەخشاندنی پێیە بەسەریدا سەردەکەوێت و، دادوەریش هیچی لەسەر نییە، بە گوێرەی ئەوەی کە گوێبیستی دەبێت بڕیار دەدات، چونکە پەنهانەکان نازانێت، هیچ کەسیش شتە پەنهانەکان کەسێکی تر نازانێت مەگەر تەنها خوای گەورە، کەوا بوو هەر کەسێك بەستەم بڕیاری شتێکی بۆ درا بێت بۆی نییە بیبات، بەڵکو مافەکە بۆ خاوەنە ڕاستەقینەکەی دەگەڕێنێتەوە، ئا ئەمە باروحاڵی پێغەمبەری خوابوو ﷺ، ئیتر بۆ دادوەرانی تر پێویستە چۆن بێت؟ کەسانێکی نەفام دەڵێن: تەواو، لەبەر ئەوەی دادوەر بڕیاری لەسەر داوە ئیتر هەقە، لە کاتێکدا باش دەزانێت پیاوێکی درۆزنە پیاوێکی ساختەکارە پیاوێکی...، دەیەوێت بڕیاری دادوەرەکە شتەکەی بۆ حەڵاڵ بکات، ئەمە جایز نییە، بڕیاری دادوەر شتی پووچ و باتڵ ناگۆڕێت بۆ هەق، باطل هەر باطلە. کەوا بوو خەصم و نەیارەکان با ئاگادار بن و مافی خەڵکی بە بڕیاری دادوەر نەبەن، لە کاتێکدا دەزانن خۆیان هەڵەن، هەروەها با پارێزەرانیش ئاگاداری خۆیان بن کاتێ بەرگری لە نەیارەکان دەکەن، زۆرێك لە پارێزەران ئۆفیسی پارێزەریتی دەکەنەوە بۆ ئەوەی بەرگری لە باتڵ و پوچێتی بکەن، بۆ ئەوەی ساختەکاری بکەن، بۆ ئەوەی لە پێش چاوی دادوەردا حەقیقەتەکان بگۆڕن، با لەم شتانە ئاگاداری خۆیان بن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُن لِّلْخَائِنِينَ خَصِيمًا﴾ [النساء: ١٠٥] واتە: وە بۆ نا پاکان مەبە بەپارێزەرو داواچی. جایز نییە بۆ ئادەمیزاد پارێزەری لە کێشە و مەسەلەیەك دا بکات دڵنیا بێت لە بنەڕەتەوە پووچە.

ئەمەش ڕێککەوتنی زانایانی لەسەرە بە تایبەت لە(الأملاك المطلقة)دا _ واتە لەموڵکە ڕەهاکانی وەکو زەوی و خانو بەرەو بەو هاوشێوەکانیان_، ئەگەر دادوەر بڕیاریدا بە گوێرەی شتێك کە وایزانی بەڵگەیەکی شەرعیەو ڕاستە وەکو ڕوونکەرەوە (البَيِّنة) و دان پێدانان (الإقرار)، بەڵام واقیع و ناوەڕۆکیش پێچەوانەی ڕواڵەت دیار بوون ئەوا جایز نییە بۆ کەسی بڕیار بۆ دراو شتەکە بەرێت بە ڕێککەوتنی هەموو زانایان[1].

وە ئەگەر لە گرێبەستەکان(العقود) و هەڵوەشاندنەوەکاندا (الفسوخ) یشدا بە هەمان شێوە دادوەر بڕیارێکیدا ئەوا زۆربەی زانایان دەڵێن: شتەکە هەر بەو جۆرەیە[2]، ئەمە بۆ چوون پێشەوایان مالیك و، شافیعی و، ئەحمەدی کوڕی حەنبلە[3]، بەڵام پێشەوا ئەبو حەنیفە لە نێوان هەر دوو جۆرەکەدا جیاوازی کردووە[4].

---

(١)_ بە یەك دەنگی ئەهلی زانست ئەو شتەی بۆ حەڵاڵ نابێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فَأَقْضِي لَهُ عَلَى نَحْوِ مِمَّا أَسْمَعُ مِنْهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا فَلاَ يَأْخُذْهُ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنْ نَارٍ)) واتە: ((منیش بەگوێرەی ئەوەی کە لێوەی دەبیستم ماف بدەم بەو، جا هەر کەس بڕیارم بۆ داو ماف برایەکیم دایە با نەیبات، چونکە با دڵنیا بێت کەمن پارچەیەك لە ئاگرم بۆ بڕیارداوە)).

(٢)_ فەرموودەکە گشتیە لە گرێبەستەکان و هەڵوەشاندنەوەیان (العقود والفسوخ) وەکو تەڵاق و غەیری ئەویش.

(٣)_ لەبەر گشتێتی فەرموودەکە (لعموم الحديث).

(٤)_ وەکو گرێبەستەکان و هەڵوەشاندنەوەکاندا (العقود والفسوخ)، بڕیاری دادوەر لە گرێبەستەکاندا ئەگەر هەڵە بوو، دادوەر نەیدەزانی، بۆ ئەو کەسە نییە ئەو شتەبەرێت کە بڕیاری بۆدراوە، بەڵام لەهەڵوەشاندنەوەی وەکو تەڵاقدا جایز نییە دادوەر بڕیاربدات تا پاش دڵنیابوونەوەیەکی تەواو، دادوەر لێرەدا تەنها پشت بە بەڵگە ڕواڵەتیەکان نابەستێت، بەڵکو دڵنیا دەبێت و بەدوای ڕاستیەکدا دەگەرێت تا تەواو شتەکەی بۆ دەردەکەوێت.

ئەگەر مەبەست بە پەیڤ و واژەکانی شەرع و شەریعەت قورئان و سووننەت بێت ئەوا بۆ هیچ کەسێك نییە چ وەلی و دۆستی خوای گەورە بێت یان غەیری ئەوان بێت لێی بچێتەدەرەوە[1]، وە هەر کەسێك وایزانێ یەکێك لەوەلی و دۆستانی خوا ڕێگەیەکی هەیە بۆ بەخوا گەیشتن غەیری شوێنکەوتنی موحەممەد ﷺ لە ڕواڵەت و پەنهان دا ئەوە کافرە[2]

---

(١)_ ئێستا خەڵکی بەبەردەوامی پەیڤەکانی شەرع و شەریعەتیان لەسەر زمانە کەچی مەبەستیان بەوە بڕیارو حوکمی دادوەرە، بڕیاری دادوەر بە شەرع ناو دەبەن، کەچی شەرعی ڕاست ودروستی هەق بریتییە لەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە، بەڵام بڕیاری دادوەر ئیجتیهادە، هەڵەدەکات و دەشپێکێت، ئەو شەرعەی کە هەڵە ناکات بریتییە لەوەی کە خوای گەورە بۆی دابەزاندوین، بەڵام ئەو شەرعەی کە بڕیاری دادوەرە بەردەوام هەڵەو ڕاستی تێدا دەبێت، وە نابێ بڵێیت: من حوکمی شەرعیم وەرگرتووەو مەبەستت بڕیاری دادوەر بێت، چونکە دادوەر ئیجتیهاد دەکات، لەوانەیە هەڵە بکات و لەوانەشە بپێکێت.

(٢)_ ئەمە وەکو زێدەڕۆییکارانی تەصەوف ئەوانەی دەڵێن: ئێمە بەخوا گەیشتووین، هێندێکیشیان دەڵێن: من ڕاستەوخۆ شتەکان لە خواوە وەردەگرم و هیچ پێویستێکم بە پێغەمبەران نییە، پێغەمبەران تەنها بۆ خەڵکانی ئاساییە، بەڵام تایبەتمەندان پێویستیان بە پێغەمبەران نییە، ئەمە کوفرو ئیلحادە _پەنا بە خوا_ با هەموان دڵنیا بن هیچ کەسێك ڕێگەیەکی تایبەتی نییە بۆ بە خوا گەیشتن جگە لە ڕێگەی پێغەمبەران، ئەو کەسەی لەو باوەڕە دابێت پێویستی بە پێغەمبەران نەماوە مولحیدە با بانگەشەی ئەوەش بکات کە لە دۆستانی خوایە، ئەو تەنها دۆستی شەیتانەو هیچی تر، وەلی و دۆستی خوای گەورە نییە.

وە هەرکەسیش بۆ ئەو بۆچوونە باتیڵەی کە باسمان کرد چیرۆکی موسا لەگەڵ خەضیردا بکات بە بەڵگە ئەوا لە دوو ڕووەوە بە هەڵەدا چووە[1]:

---

(١)_ ناڕەزایی دەر دەبڕن و بانگەشەیەکی وا دەکەن کە شیاوە مرۆڤ لە شەریعەت بچێتەدەرەوە، ئەگەر زەوق و هەستی مەعنەوی تێدابێت بۆ تێڕوانین و بیرکردنەوە یان واڕاگەیەنێت وەلی و دۆستێکە لە دۆستەکانی خوای گەورە ئیتر پێویستی بەپێغەمبەر نابێت، چیرۆکەکەی موسا لەگەڵ خەضیردا دەکەنە بەهانەو بیانوو، خەضیر لە سەردەمی مووسا دا بوو _علیه السلام_ سەرەڕای ئەوەش لە شوێنکەوتوانی مووسا نەبوو، بۆچی؟ چونکە پەیامەکەی مووسا گشتی نەبوو وەکو پەیامی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ، لەو کاتەی کە مووسا بانگەوازی دەکرد لەوانە بوو چەند پێغەمبەرێك لە هەمان کات هەبوایەن، هەر یەکێکیشیان شەریعەتێکی هەبوایە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾[المائدة: ٤٨] واتە: دامان ناوە بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە شەریعەت و ڕێگەیەکی ڕوون. چونکە پەیامەکانی پێشتر گشتی نەبوون، بەڵام پەیامی پێغەمبەرەکەمان ﷺ گشتییە بۆ هەردوو جیهانی مرۆڤ و جنۆکە، بۆیە هیچ کەسێك ناتوانێت لە چوارچێوەی ئەم شەریعەتە بچێتە دەرەوە هەر چەند لە ویلایەت و دۆستایەتی و زانستیشدا بەرز بوبێتەوە بۆی نییە لێی بچێتەدەرەوە بە پێچەوانەی خەضیرەوە چونکە پەیامەکەی مووسا گشتی نەبوو بەڵکو تایبەت بوو بەبەنی ئیسرائیلەوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ﴾[الصف: ٥] واتە: (بیربکەرەوە) کاتێك کە مووسا بەگەلەکەی گوت ئەی گەلەکەم بۆچی ئازارم دەدەن لە کاتێکدا بەدڵنیایەوە دەزانن کە من نێردراوی خوام بۆ لای ئێوە. مەبەستی بەنی ئیسرائیل بوو، پێغەمبەر بوو بۆ بەنی ئیسرائیل، پەیامەکەی گشتی نەبوو بۆ هەر دوو جیهانی مرۆڤ و جنۆکە

-------------------------------------------

-------------------------------------------

-------------------------------------------

وەکو پەیامەکەی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ، بۆیە خەضیر توانی لە چوارچێوەی شەریعەتەکەی مووسا بچێتە دەرەوە، چونکە شەریعەتەکەی مووسا تایبەت بوو، هەموو خەڵکی سەر زەمینی نەدەگرتەوە. خەضیر بەندەیەکی چاك بوو، زانایان جیاواز بوون سەبارەت بەوەی کە ئایا پێغەمبەر بووە یان وەلی و دۆستێکی خوای گەورە بووە، زانستی هەبووە، خوای گەورە زانستی پێدا بوو، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَوَجَدَا عَبْداً مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْماً﴾[الكهف: ٦٥] واتە: جا بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان دی کە لە لایەن خۆمانەوە ڕەحمەتمان پێدا بوو شارەزاشمان کرد بوو لە زانیاری تایبەتی خۆمان، خەضیر خوای گەورە زانیاری پێدابوو، لە هەستی مەعنەوی تایبەتی خۆیەوە نەبوو، لە سۆزی تایبەتی خۆیەوە نەبوو، بەڵکو خوای گەورە پێیدابوو، وە گوتراوە: پێغەمبەر (نبي) بووە و سرووشی بۆ دابەزیووە، هێندێك لە زانیان ئەو ڕاوبۆچونەیان بلاوە پەسەند تر بووە کە پێغەمبەر (نبي) بووە، لەو زانایانەش شێخی پایە بەرزی ئیسلام (عبدالعزيز بن باز) بووە کە ئەو ڕاوبۆچونەی بە پەسەند تر داناوە کە خەضیر پێغەمبەر (نبي) بووە چونکە چەندەها موعجیزات لەسەر دەستی دەرکەوتووە کە تەنها بۆ پێغەمبەران دێتە دی، کۆمەڵێکی دیکەی زانایانیش دەڵێن: زاناو وەلی و دۆستێکی خوای گەورە بووە.

یەکەمیان: مووسا بۆ خەضیر نەنێردرا بوو[(١)]،

---

(١)_ چونکە پەیامەکەی مووسا _علیه السلام_ تایبەت بوو، گشتی نەبوو، خەضیری نەدەگرتەوە، هەموو ئەهلی سەرزەمینی نەدەگرتەوە وەکو پەیامەکەی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ باسی خاسیەتەکانی خۆی کردووە فەرموویەتی: ((أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي، نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِي الْمَغَانِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً)) واتە: ((پێنج شتم پێدراوە بە هیچ کەسێکی پێش من نەدراوە: لە دووری یەك مانگەوە بە ترس خستنە دڵی دوژمنانمەوە سەر خراوم، وە زەویم بۆ کراوە بە شوێنی سوژدە پاککراو _ چونکە لە جێی ئاو تەیەمومی پێدەکرێت _، بۆیە هەر کەسێك لە ئومەتەکەم لە هەر شوێنێکدا کاتی نوێژهات با نوێژ بکات، دەستکەوتەکانی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە لە کاتێکدا بۆ هیچ کەسێکی پێش من حەڵاڵ نەبوو، شەفاعەت و تکاکاریم پێداوە، پێغەمبەرانی تر بە تایبەت بۆ گەلەکانی خۆیان دەنێردران، بەلام من بۆ هەرهەموو خەڵکی نێردراوم)). خوای گەورەش لەچەندین ئایەتدا باسی ئەوەدەکات کە پێغەمبەر بۆ هەموو خەڵك نێردراوە تاوەکو ڕۆژی قیامەت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[الأنبياء: ١٠٧] واتە (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کەڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾[السبأ: ٢٨] واتە: وەئێمە تۆمان نەناردووە مەگەر بۆ هەموو ئادەمی بەمژدەدەرو ترسێنەر. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً﴾[الأعراف: ١٥٨] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەی خەڵکینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان.

ئەگەر بۆ ئەو بنێردرایە پێویست بوو شوێنی بکەوێت، مووسا بۆ بەنی ئیسرائیل نێردرا بوو، بەڵام پەیامەکەی موحەممەد ﷺ گشتییە بۆ هەر دوو جیهانی مرۆڤ و جنۆکە، ئەگەر کەسانێکی لە خەضیر چاکتریش _ وەکو ئیبراهیم و مووسا و عیسا _ بەم پەیامە بگەیشتنایە لەسەریان پێویست بوو شوێنی بکەون(1)

---

(1)_ خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ﴾[آل عمران: ٨١] واتە: (بهێنەرەوە یادیان) کاتێك کە خوا پەیمانی وەرگرت لە پێغەمبەران کە هەرچیم دانی لە نامەو حیکمەت (شەریعەت) لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات بە بڕوا هێنەر بەو نامەی کە لە لاتانە دەبێ بڕوای پێ بهێنن وە یارمەتی بدەن خوا فەرمووی: ئایا دانتان نا بەم پەیمانەدا؟ وە لەسەر ئەوە پەیمانی منتان وەرگرت پێغەمبەران گوتیان: بەڵێ دانمان پیا ناو پەیمانمان بەست خوا فەرمووی کەواتە ئێوە بە شاهێد بن وە منیش لە گەڵ ئێوە یەکێکم لە شاهێدان، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ﴾ لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات، مەبەستی موحەممەدە ﷺ، لەم ئایەتەدا ئەوە ئاشکرا دەبێت کە خوای گەورە پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرتووە، ئیتر بۆ کەسانی غەیری ئەوان دەبێ چۆن بێت؟ خوای گەورە ئەو پەیمانەی لە پێغەمبەران وەرگرتووە کە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نێردراو، یەکێك لەوان مووسا یان عیسا یان هەر یەکێك لەوان زیندوو بوو پێویستە شوێنی ئەم پێغەمبەرە ﷺ بکەوێت، چونکە پەیامەکە بە ئەو درا ﷺ، کە کۆتا پێغەمبەرانە، هەموو کەسێك پێویستە شوێنی کەوێت ﷺ، چونکە پەیامەکەی گشتیەو بۆ ئادەمیزادو جنۆکە و پێغەمبەران و غەیری ئەوانیشە، هیچ کەسێك ناتوانێت لە چوارچێوەی گوێڕایەڵیی ئەو بچێتە دەرەوە ﷺ.

ج جا خەضیر ئەگەر پێغەمبەر(نبي) بێت یان وەلی[1]، بۆیە خەضر بە مووسای گووت: ((إِنِّي عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ، عَلَّمَنِيهِ اللهُ لاَ تَعْلَمُهُ، وَأَنْتَ عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ عَلَّمَكَهُ اللَّهُ لاَ أَعْلَمُهُ))[2] صحيح: أخرجه البخاري (٣٤٠٠) و (٣٤٠١) و (٤٧٢٥) و (٤٧٢٦) و (٤٧٢٧)، ومسلم (٢٣٨٠) من حديث أبي بن كعب رضي الله عنه مرفوعاً. واتە: ((وتی بەراستی من زانستیکم لایە خوا فێری کردووم تۆ نایزانیت تۆش زانستیکت لایە خوا فێری کردوویت من نایزانم)). بەڵام بۆ هیچ یەکێك لە هەر دوو جیهانی مرۆڤ و جنۆکە نییە ئەوانەی پەیامەکەی موحەممەدیان ﷺ پێگەیشتووە ئەو جۆرە قسەیە بڵێن کە خضر بە مووسای گووت[3].

---

(١)_ ئەگەر پێغەمبەر (نبي) بێت یان وەلی و دۆست بێت پێویست نەبوو لەسەری شوێنی مووسا بکەوێت، چونکە بۆ ئەو نەنێر درا بوو، بەمەش یەکلا دەبێتەوە کە خەضیر مردووە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسانەی دەڵێن: زیندووە، چونکە ئەگەر زیندوو بوایە بەدڵنیایی دەهاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و شوێنی دەکەوت، چونکە پەیامەکەی گشتیەو پێویستە هەمووان شوێنی بکەون.

(٢)_ ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی خەضیر زانستی لایە وەکو چۆن مووسا زانستی لایە.

(٣)_ بۆ هیچ کەسێك نییە لە چوار چێوەی شەریعەتی موحەممەد ﷺ بچێتە دەرەوەو، بڵێت: من زانستێکم پێیە بەلای موحەممەدەوە ﷺ نییە، وەکو ئەوەی خەضیر بە مووسای گوت، بۆ هیچ کەسێك نییە ئەو شتانە بڵێت، چونکە خوای گەورە لەسەر بەندەکانی خۆی واجیب کردووە شوێنی بکەون ﷺ. ئەمە وەڵامی یەکەم بوو.

دووەم: ئەوانەی کە خەضیر ئەنجامیدا پێچەوانەی شەریعەت نەبوون، بەڵکو سازیاری شەریعەت بوون، بەڵام مووسا _علیه السلام_ ئەو هۆکارانەی نەزانیبوو دەبنە هۆی ڕێگەپێدانی ئەنجام دانی ئەو کارانەی کە خضر ئەنجامی دا، بەڵام کاتێ خەضیر هۆکاری ئەو کارانەی بۆ ڕوون کردەوە قایل بوونی خۆی بۆ ئەوانە نیشاندا[1]، کونکردنی کەشتیەکەو چاککردنی بە پینەکردن لەبەر بەرژەوەندی خەڵکەکە لە ترسی ئەوەی ئەوەکا ستەم کارەکە بیبات چاکە کردنێك بوو بەرامبەریان، ئەوەش جائیزە[2]

---

(١)_ وەڵامی دووەم: خەضیر شتانێکی پێچەوانەی شەریعەتی مووسای _علیه السلام_ ئەنجام نەدا، بۆیە بۆ هیچ کەسێك نییە لەشەریعەت بچێتەدەرەوەو، بەهانە بەکردەوەکانی خەضیر بێنێتەوە، چونکە خەضیر شتانێکی دژ بەشەریعەتی مووسای ئەنجام نەدا بوو، بەڵکو کردەوانێکی ئەنجامدا بەلای مووساوە هۆکاری نادیارو پەنهان بوو، وە کاتێکیش بۆی ڕوون کردەوە پێی قایل بوو، پێی ڕازیبوو. چیرۆکی کونکردنی کەشتیەکە، چیرۆکی کوشتنی لاوەکە، چیرۆکی بیناکردنی دیوارەکە لەو شارەدا کە میوانداریان نەکردن هۆکاری ئەنجام دانی ئەمانە بەلای مووساوە نادیار بوو، خەضیر بۆی ڕوون کردەوە، خەضیر بە مووسای گوت: ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا﴾[الكهف: ٧٨] واتە: ئاگادارت دەکەم لە حیکمەتی ئەو شتانەی کە تۆ ناتوانی خۆت بگری لەسەر (ڕوودان)یان.

(٢)_ خەضیر کەشتیەکەی کونتێکرد، مووسا _علیه السلام_ پێی فەرموو: ﴿قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا﴾[الكهف: ٧١] واتە (مووسا) گوتی کەشتیەکەت کون تێکرد بۆ ئەوەی سەرنشینەکانی (لەدەریادا) نقوم بکەیت. ئەمە لە ڕواڵەت دا، بەڵام مووسا لە واقیع و ناوەڕۆکەوە مەبەستی خەضیری نەدەزانی، خەضیر دەیزانی پاشایەکی زۆرداری داگیرکار هەیە هەموو کەشتیەکی چاك بۆ خۆی دەبات، بۆیە کونی تێکرد بۆ ئەوەی عەیبداری کات و ئەو پاشا زۆردارە نەیبات، کونی تێکردو بە پینەکردن چاکی کردەوە، بۆ ئەوەی هەر کاتێك پاشاکە کەشتیە پینەکراوەکەی بینی نەیبات.

کوشتنی کەسی پەلاماردەری دەست درێژکار (الصائل) جائیزە با بچوکیش بێت

---

(١)_ کوشتنی منداڵەکە: خەضیر ڕوونی کردەوە کە لەوە ترساوە کاتێ گەورە بێت دایك و بابی گومڕا کات، چونکە خوای گەورە لەوە ئاگاداری کردبوو کە ئەگەر گەورەبێت دایك و بابی گومڕا دەکات، بۆیە کوشتی چونکە حوکمی کەسی پەلاماردەری دەست درێژکار (الصائل) دەیگرێتەوە، کەسی پەلاماردەری دەست درێژکاریش کوشتنی جایزە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا(٨٠) فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا(٨١)﴾ [الكهف: ٨٠_٨١] واتە: وە تازە لاوەکەش (کە کوشتم) ئەوە باوك و دایکی ئیماندار بوون جا ئێمەش ترساین (خۆشەویستی ئەو لاوە) پاڵیان پێوەبنێت بۆ سەرکەشی و بێباوەڕی جا (بەو کارە) ویستمان پەروەردگاریان (لە بری ئەوا) بۆیان بگۆڕێت (بە منداڵێکی) چاکتر لەو پاکتر لە گوناح بە سۆزو بە زەیی تربێ بۆیان. کوشتنی لاوەکە لە ڕووی کوشتنی کەسی پەلاماردەری دەست درێژکارەوە بوو، چونکە ئەگەر گەورە بوایە دەست درێژی دەکردە سەر دایك و بابی و گومڕای دەکردن، خوای گەورە ئەوەی پێ ڕاگەیاندبوو. بە واتایەکی تر ئەگەر کەسێك هات بتکوژێت ئەگەرچی منداڵیشبێت و تەمەنی حەوت ساڵان بێت و بەکوشتنیش نەبێت نەتوانرێت شەڕو ئاژاوەی دوور خرێتەوە، دەکوژرێت، ئەو لاوەش کەسێکی دەست درێژکار بوو بۆ سەر دایك و بابی، خوای گەورە خەضیری لەو لاوە ئاگادار کردبۆوە کە ئەگەر گەورە بێت دەست درێژی دەکاتە سەر دایك وبابی و بۆ کوفرو سەرپێچی کردن پاڵیان پێوەدەنێت.

بەمشێوە ئەگەر نەتوانرا کەسێك لەوە دور خرێتەوە کە چیتر پاڵ بە دایك و باببەوە بنێت بۆ کوفر کردن مەگەر بەکوشتنی ئەوە جایزە بکوژرێت، بۆیە ئیبن و عەباس بڕێ بە نەجدەتول حەروری فەرموو: کاتێ سەبارەت بەکوشتنی تازەلاوان لێی پرسی ((إن كنت تعلم منهمْ ما عَلِمَهُ الخَضِرُ فاقْتُلهُمْ، وإلا فلا تقتلهمْ))[1] صحيح: أخرجه مسلم (١٨١٢)، وأبوداود (٢٧٢٧)، والترمذي (١٥٥٦)، وأحمد (١/٢٢٤،٣٤٩،٣٥٢). واتە: ((ئەگەر ئەوەت لە بارەیانەوە زانی کە خەضیر زانیبووی بیانکوژە، ئەگینا مەیانکوژە)).

بەڵام چاکە کردن بەرامبەر بەهەتیوو بەبێ هیچ بەرامبەرێك و صەبرو ئارام گرتن بەرامبەر برسێتی، ئەمە لە کردەوە چاکەکانە، لەوەدا هیچ شتێکی پێچەوانەی شەرعی خوای گەورەی تێدا نەبوو[2].

---

(١)_ نەجدەتول حەروری لە خەواریجەکان بوو، یەکێك بوو لە سەرانی خەواریج، سەبارەت بەکوشتنی تازەلاو لەپێشەوا ئیبن وعەبباسی ﷺ پرسی جایزە یان جایز نییە، ئەویش وەلامی دایەوە. چونکە خەواریجەکان خوو نەریتیان کوشتن بوو، خوێن ڕشتن بوو، منداڵ و گەورەیان دەکوژی، کوشتنی منداڵان و تازەلاوان جایزنییە مەگەر مرۆڤ ئەو زانستەی پێدرابێت کە بەخەضیر درا بوو، ئەگەر ئاکام و دەرەنجامیان بزانێت و، بزانێت لە داهاتوودا کاروباریان چی بەسەردێت و، بزانێت خراپەکاری لەسەر زەمیندا بڵاو دەکەنەوە ئەوە شیاوە بیانکوژێت، بەڵام ئەگەر خوای گەورە ئەو زانینەی پێ نەدابوو ئیتر چۆن بیانکوژێت؟ جایز نییە بیانکوژێت.

(٢)_ ئەمە کاری سێیەم بوو، بریتی بوو لە دوو هەتیوەکە، کاتێ دیوارەکەی بیناکردو، خەڵکی دێیەکەش میوانداریان نەکردن، مووسا بە خەضیری فەرموو: ئایا دیوارەکەیان بۆ بینا دەکەی لە کاتێکدا ئەوان میوانداریان نەکردین؟ هەروەها پێی فەرموو: ﴿قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾[الكهف: ٧٧] واتە: (مووسا) گوتی

----------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------------

ئەگەر بتویستایە کرێیەکت لەسەری وەردەگرت، ئەویش وەڵامی دایەوەو، پێی گوت: ﴿وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ [الكهف: ٨٢] واتە: وە هۆی (چاککردنەوەی) دیوارەکەش چونکە هی دوو منداڵی هەتیوو بوو لە شارەکەدا لە ژێری دا گەنجینەیەك هەبوو کەهی ئەو دوو منداڵە بوو وە باوکی ئەودوو منداڵە چاك و خواناس بوو لەبەر ئەوە پەروەردگارت ویستی هەردووکیان گەورەو بەهێز ببن گەنجینەکەیان دەربێنن ئەمە ڕەحمەتێك بوو لە لایەن پەروەردگارتەوە (لەبەر باوکیان) ئەو (شتان)ەی کردم لە خۆمەوە نەبوو ئەوە نهێنی و هۆی ئەو کردەوانە بوو کە تۆ توانای خۆگرتنت نەبوو لەسەر (کردن) یان.

چونکە ئەگەر وازی لە دیوارەکە بێنایە گەنجینەکە دەکەوتە دەر، بۆیە دیوارەکەی بیناکرد بۆ ئەوەی گەنجینەکە بشارێتەوە، ئەمەش چاکەکردنێك بوو، بەرامبەر بە هەتیووان، چاکەکردن نەبوو بە خەڵکی دێیەکە، چاکە کردن بوو بەرامبەر بە هەتیووان، ئەوە تەنها فەرمانی خوای گەورەبوو، بەبێ هیچ بەرامبەرێك بینای کرد، خەضیر لەگەڵ مووسادا لەسەر برسێتی ئارامی گرت چونکە میوانداریان نەکردن. ئەوە بوو بەرامبەر بە هەتیوەکان چاکەی کردو لەسەر برسێتیش ئارامی گرت، خەضیر بە ئەنجامدانی ئەو کارە پێچەوانەی شەریعەت نەبوو، بۆیە بە مووسای گوت: ﴿وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾ ئەو (شتان)ەی کردم لە خۆمەوە نەبوو.

بەلام ئەگەر مەبەست بە بەکارهێنانی زاراوەی (شەرع) بڕیاری دادوەر بوو (حکم حاکم)[1]، پێدەچێ دادوەر ستەمکار بێت، پێدەچێ دادپەروەر بێت، پێدەچێ ڕاست و دروست بێت، وە پێدەچێ هەڵە بێت[2]،

---

(١)_ مەبەستی لە بەکارهێنانی زاراوەی شەرع دوو مەبەست هەیە یەکەم: مەبەستی بریتیە لەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە، دووەم مەبەست بە شەرع: بریتیە لە بڕیاری دادوەر، وەکو ئەوەی ئێستا لەسەر زمانی خەڵکی باوەو دەڵێن: شەرع بڕیاری بۆ دام، وە چەندین دەستەواژەی دیکەش کە ئێستا لەسەر زمانی خەڵکیە، ئەمە جێگەی تێڕوانینی زیاترە چونکە بڕیاری دادوەر بریتی نییە لەشەرع، بەڵکو دادوەر ئیجتیهاد دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ بەهێندێ لە فەرماندەکانی فەرموو: ((وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ فَلاَ تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ وَلَكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ، فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ اللَّهِ فِيهِمْ أَمْ لاَ)) واتە: ((ئەگەر ئابلۆقەی خەڵکی نێو قەڵایەکتداو ویستیان بەحوکمی خوا بڕیاریان بۆ بدەی ئەوا تۆ بە حوکمی خوا بڕیاریان بۆ مەدە بەڵکو بە ئیجتیهادی خۆت بڕیاریان بۆ بدە، چونکە تۆ نازانی ئایا حوکمی خوایان بۆ دەپێکیت یان نەء))، مەڵێ: ئەمە شەرعە، بەڵکو بڵێ: ئەوە بڕیاری دادوەرە، واتە ئجتیهاد، لەوانەیە پێکابێتی و لەوانەشە هەڵەبێت، ئەگەر پێکابێتی دوو پاداشتی بۆ دەنوسرێت و ئەگەر نەشی پێکا بێت یەك پاداشتی بۆ دەنوسرێت.

(٢)_ بڕیاری دادوەر ئەم شتانە هەڵدەگرێت، لەوانەیە ستەمکاربێت، لەوانەیە دادپەروەر بێت، لەوانەیە هەڵە بکات، لەوانەشە بڕیاری ڕاست بپێکێت، بەلام شەرعی خوای گەورە ئەم شتانەی تێدانییە، شەرعی خوا لەو شتانە مەعصوم و پارێزراوە.

وە لەوانەیە مەبەست لە بەکارهێنانی زاراوەی شەرع گوفتاری پێشەواو فیقها زانەکان بێت[١] وەکو ئەبی حەنیفەو، ئەلثەوری و، مالیکی کوڕی ئەنەس و، ئەللئەوزاعی و، ئەلەیثی کوڕی سەعدو، شافیعی و، ئەحمەدو، ئیسحاق و، داودو کەسانی دیکەی غەیری ئەوانیش گوفتاری ئەمانە دەخرێتە ڕووی قورئان و سووننەت[٢]

---

(١)_ پێدەچێ مەبەست بە زاروەی شەرع گوفتاری پێشەوا فیقهزانە موجتەهیدەکان بێت، بۆیە تەماشا دەکەیت کەسانێك کاتێ لە پێشەوایەك دەپرسن، دەڵێن: مامۆستا شەرعی خوام بدەرێ لەم مەسەلەیەدا، مامۆستا حوکمی خوام بدەرێ لەم مەسەلەیەدا، یان دەڵێت: مامۆستا لێت دەپرسم سەبارەت بەحوکمی خوا، ئەم شێوازی پرسیار کردنانە جایز نییە، شەرعی خوا یان حوکمی خوا، بەڵکو شێوازی ڕاست و دروستی پرسیارکردن بەم جۆرەیە: مامۆستا ڕای تۆ چییە بەگوێرەی ئەوەی بۆت دەرکەوتووە لە شەرعەکەی خوای گەورە؟.

(٢)_ ئەبی حەنیفە ناسراوە، ئەلثەوری: سوفیانی سەورییە پێشەوای بەڕێز، ئەلئەوزاعی: پێشەوای خەڵکی شامە، لەیثی کوڕی سەعد: لە میصر بوو، پێشەوای خەڵکی میصر بوو، ئیسحاق: ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەی بوو، داود: داود ئەلظاهیریە. گوفتاری ئەمانە بەلگەیان بۆ دەهێنرێتەوە، ناکرێن بەبەلگە، لە ڕاستیدا تەنها قورئان و سووننەت بەلگەن، بەلام حوکمی فیقهزانان بەلگەیان بۆ دەهێنرێتەوە، ئەوەی سازیاری بەلگەکان بن حەقەو ئەوەشی پێچەوانەی بەلگەکانبن هەڵەیە، ئێستا زایەڵەی جیاوازی دەکەن و، گوایە خەڵکی دەتوانن ئەوەی بیانەوێ بیکەن، چونکە هەموو شتێك جیاوازی و خیلافی تێدایە لەنێوان فیقهزانانداو دەڵێن: ئەمە لەفراوانی و ڕێدانی شەریعەتەوەیە، خیلاف و جیاوازی فیقهزانان بەشەریعەت ناو دەبەن، ئەمەش لە نەفامی یان گومڕایی خەڵکەوەیە، شەریعەت حوکمی خوای گەورەیە، حوکمی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەلام گوفتاری فیقهزانان قابیلی هەڵەو ڕاستیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾[النساء: ٥٩] واتە: جا ئەگەر دووبەرەکێتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ﷺ. گوفتارەکان بۆ خواو پێغەمبەری خوا دەگەڕێنرێنەوە، بۆ قورئان و سووننەت.

ر، ئەگەر لاسایی یەکێك لەوانەی کردەوە هەر کات ئەوەی بۆ شیاو بوو ئەوە جایزە[1]

---

(١)_ ئەگەر لاسایی یەکێکیان کرایەوە، لە هەر شوێنێکدا شیاوی لاسای کردنەوە بێت جایزە، ئەو کەسەی لاسایی دەکاتەوە کێیە؟ کەسی ئاسایی و کەسێکی سەرەتایی یە لە فێر بوونی زانستدا، ئەمە واجیبە چاولێکاری بکات، چونکە جایز نییە ئیجتیهاد بکات لە کاتێکدا هیچ لێهاتوویی‌یەکی تێدا نییە، واجیبە لاسایی یەکێك لە پێشەوایان بکاتەوە، بەڵام خوێندکاری زانست کە بەڵگەکان دەزانێت پێویستە تەرجیح بکات، ئەگەر لاسایی یەکێك لە پێشەوایانی کردەوە با لاساییەکی کوێرانە نەکاتەوە بەڵکو گوفتارەکانیان دەخاتە ڕووی قورئان و سووننەت ئەگەر بەڵگەکان ئاماژەیان بۆ مەسەلەیەك کرد وەری دەگرێت، ئەگەر چی پێشەواکەی خۆی هەمان بەڵگەی وەرگرتبێت یان هی دیکەی وەرگرتبێت، چونکە بەڵگە تەوەرەی سەرەکیە، بۆیە حەنبەلی مەزهەب ئەگەر تەماشای کرد گوفتاری حەنەفی مەزهەب بەڵگەی ڕاستی لەسەرە واجیبە لەسەری گوفتاری حەنەفیەکە وەرگرێت، ئەمە ئەگەر لێهاتوویی تێدا بوو بۆ زانینی ڕاجیح و مەرجوح، نابێ پێداگرێت و، بڵێت: من حەنەفیم یان من حەنبەلیم، من... من...، پێویستە گوفتاری پێشەواکەی بخاتە ڕووی قورئان و سووننەت، ئەوەی سازیاری بوون وەریدەگرێت و، ئەوەشی پێچەوانەی بوو وازی لێدێنێت، ئەوەی بەڵگەی ڕاستی لەسەرە وەری دەگرێت. کەوا بوو لەم بارەوە جەماوەری خەڵك سێ چینن، چینی یەکەم: چینی خەڵکی ئاسایی و تازە لە فێر بوونی زانستدا ئەمانە لاسایی و چاولێکاریدەکەن چونکە لێهاتوویی تەرجیح کردنیان تێدا

نییە، لاسایی دەکەنەوە، چینی دووەم: خوێندەوارو ڕۆشنبیرو بە تواناکانن لە تەرجیح کردندا، ئەمانە تەرجیح دەکەن و بە (مجتهد المذهب) ناو دەبرێن، چینی سێیەم: موجتەهیدە ڕەهاکانن، وەکو پێشەوایان ئەحمەدو، شافیعی و، مالیك و، ئەبی حەنیفە و، ئەلـثەوری، ئەمانە موجتەهیدی ڕەهان، لەسەریانە حوکمەکان لە قورئان و سوونەتەوە وەربگرن، لاسایی هیچ کەسێك ناکەنەوە، حەرامە بۆیان. شێخولئیسلام سەبارەت بە لاسایی کردنەوەدەڵێ: (هەر کات ئەوەی بۆ شیاو بێت) تەماشای زیرەکی شێخ بکە نەیفەرمووە لاسایی یەکێك بکەرەوەو هیچیتر، بەڵکو فەرموویەتی: (هەر کات ئەوەی بۆ شیاو بێت) واتە: هەر کات بۆی شیاو بێت چاولێکاریی بکات، بۆچی؟ چونکە کەسانێك هەن جایز نییە لاسایی بکەنەوە.

واجب نییه هەموو ئوممەت شوێنی یەکێکیان بکەوێت(١) وەکو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ وە حەرام نییە لاسایی یەکێکیان بکرێتەوە وەکو چۆن شوێنکەوتنی کەسێك حەرامە کە بەبێ زانست و زانین قسە دەکات.

---

(١) لاسای کردنەوە بۆ کەسێك پێویستی پێی بێت و، بۆ کەسی ناچار جائیزە، لاسای کردنەوە واجیب نییە تەنها بۆ کەسانی ئاسایی نەبێت، زانایان دەفەرمون: مەزهەبی کەسی ئاسایی مەزهەبی ئەو کەسەیە کە فەتوای بۆ دەدات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾[النحل: ٤٣] واتە: دەی پرسیار بکەن لە زانایان ئەگەر ئێوە نازانن. کەسی ئاسایی دەپرسێت ئەگەر زانایەك فەتوای بۆدا وەریدەگرێت و هیچیشی تووش نابێت، چونکە ئەوەندە توانای هەیە، بەڵام لە هەموو کەسێك ناپرسێت، بەڵکو لە یەکێك دەپرسێت متمانەی بە زانست و ئیمان و ئایینەکەی هەبێت، نەك تەنها متمانەی بە زانستەکەی هەبێت یان تەنها متمانەی بە ئایین و ئیمانەکەی هەبێت بەڵکو پێویستە متمانەی بەزانست و ئیمانەکەشی هەبێت ئیتر لەو کەسانە دەپرسێت کە متمانەی بەزانست و ئیمان و زانستەکەی هەبێت و گوفتارەکەی وەردەگرێت. شوێنکەوتنی تەنها یەکێك بە تایبەت واجیب نییە مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام کەسانی دیکەی جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو زانایان ئەمانە شوێنکەوتنیان جایزە مەگەر موخالەفەو سەرپێچی بەڵگە ڕاستەکان بکەن ئەو کاتە جایز نییە شوێنیان بکەویت لە کاتێکدا موخالەفەی بەڵگە ڕاستەکانی کردووە، بۆیە شێخولئیسلام لە هێندێ کتێبەکانیدا فەرموویەتی: هەرکەس بانگەشەیەکی وا بکات کە شوێنکەوتنی کەسێك جایزە جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە واجیبە داوای تەوبەی لێکرێت ئەگەر تەوبەی کرد باشەو ئەگەر نەشی کرد دەکوژرێت، شوێنکەوتنی هیچ کەسێك بە تایبەت واجیب نییە جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەڵام کەسێك شتانێك بخاتە سەر شەریعەت ئەو شتانە لە شەریعەتدا نەبێت وەکو فەرموودە هەڵبەستراوەکان یان دەقەکان بەپێچەوانەی مەبەستی خوای گەورەوە لێك بداتەوەو تەئویل بکات و بەو شێوانە ئەمە جۆرێکە لە تەبدیل و گۆڕین[1].

کەواتە پێویستە جیاوازی لە نێوان (الشرع المنَزَّل) و (الشرع المؤَوَّل) و (الشرع المبَدَّل)دا بکرێت[2]

---

(١)_ ئەمە لە(الشرع المبَدَّل)ە شەرعی گۆڕاو، کەسانێك فەرموودە هەڵبەستراوەکان دەکەنە بەڵگە کە لەگەڵ هەواو ئارەزووەکانیدا دەگونجێت، ئەم جۆرە کەسانە شەرعی دابەزێنراو دەگۆڕن، بەڵگەکانی قورئان و سووننەت بەبەڵگەگەلێکی درۆ و هەڵبەستراو دەگۆڕنەوە، ئەم جۆرە کەسانە شەرعی خوای گەورە دەگۆڕن.

(یان دەقەکان بەپێچەوانەی مەبەستی خوای گەورەوە لێکبداتەوەو تەئویل بکات) وەکو ئەو لێکدانەوەو تەوئیلانەی کە کۆمەڵی باطنیەکان دەیکەن و، دەڵێن: دەقەکان مەبەست و ڕووی پەنهانیان هەیە، گوایە ئەوان مەبەستە پەنهانیەکەی وەردەگرن و، خەڵکانیش مەبەستە ڕواڵەتیەکان وەردەگرن، ئەمەش کوفرە _پەنا بە خوا_. گۆڕینی شەرعی خوای گەورەیە.

(٢)_ (الشرع المنَزَّل): بریتیە لە قورئان و سووننەت، (الشرع المؤَوَّل) جێی ئیجتیهادە لە نێوان زانایاندا، هێندێکی ڕاست و دروست دەبێت و، هێندێکیش هەڵە دەبێت، ناگوترێت: باتڵ و پووچە بەڵکو دەگوترێت: هەڵەیە، (الشرع المبَدَّل): پشت بە فەرموودە درۆو هەڵبەستراوەکان دەبەسترێت، یاخود تەفسیرێکی بۆ دەکەن بە پێچەوانەی مەبەستی خوای گەورەوە، دەڵێن: ئەمە مەبەستی ڕواڵەتیەکەیە کە ئێوە دەیزانن، بەڵام ڕووە پەنهانیەکە ئێمە دەیزانین، ئیتر بۆ دەقەکان مەبەستی ڕواڵەتی پەنهانی دادەنێن، کۆمەڵی باطنیەکان گومراترین کۆمەڵن لەم مەسەلەیەدا _پەنا بە خوا_.

هەروەها لە نێوان حەقیقەتی کەونی و حەقیقەتی شەرعی جیاوازی دەکرێت[1]، هەروەها لە نێوان ئەوانەدا کە قورئان و سوونەتیان بۆ دەکرێت بەڵگەو، لە نێوان ئەوانەدا کە تەنها حەزو ئارەزووی خاوەنەکەی بۆ دەکرێت یە بەبەڵگە[2].

---

(١)_ وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا دوو حەقیقەت لە ئارادایە، حەقیقەتێکی کەونی کە بریتیە لە قەزاو قەدەر، وە حەقیقەتێکی دینی کە بریتیە لە شەرعەکەی خوای گەورە کە بریتیە لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

(٢)_ کەسانێك حەزو ئارەزوو و عەقڵیان دەکەنە بەڵگە، قورئان و سوونەت پشت گوێ دەخەن.

## بەشێك

### سەبارەت بەوەی خوای گەورە لەقورئانە پیرۆزەکەیدا باسی جیاوازی نێوان ئیرادەی کەونی ئیرادەی شەرعی کردووە غەیری ئەوانەشی کردووە

خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا جیاوازی نێوان ئیرادەو ئەمر و[1] قەزاو ئیزن و تەحریم و بەعث و ئیرسال و کەلام و جەعلی ڕوون کردۆتەوە.

---

(١)_ پێشتر شێخولئیسلام _رحمه الله_ بەر پەرچی ئەو کەسانەی دایەوە ی قەدەرو چارەنووس دەکەن بەهانەو بیانوو، بۆی ڕوون کردنەوە کە قەدەر نابێت ب بەهانەیەك بۆ ئەوان بۆ ئەنجامدانی کوفرو گوناه و تاوان و سەرپێچیەکان و هاوەڵپەرستی، ئەوان دەڵێن: خوای گەورەیە کە کوفرو ئیمان و شیرك و هاوەڵپەرستی و گوناه و تاوانی تەقدیر کردوە، کەوا بوو خوای گەورە بەکوفر ڕازییە وەکو چۆن بەئیمان ڕازییە، بەگوناه و تاوان ڕازییە وەکو چۆن بە تاعەت و خواپەرستی و ملکەچی ڕازییە، چونکە خوای گەورەیە کە هەر هەموویانی تەقدیر کردوەو، لەسەر هەموو خەڵکی نووسیونی، بەلای ئەوانەوە تاعەت و گوێڕایەڵی بریتیە لەوەی مرۆڤ سازیانی قەدەربێت و ئەوەی کە خوای گەورە لەسەری تەقدیر کرد بێت ئەنجامی بدات. لێرەدا شێخولئیسلام _رحمه الله_ دەیەوێت وەڵامیان بداتەوە، پێیان بڵێت: لە نێوان قەدەرو لە نێوان شەرعدا جیاوازی هەیە، خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا

---

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

جیاوازی لە نێواندا کردوون، بە پێچەوانەی قسەکانی ئەوانەوە تاعەت و گوێڕایەڵی مرۆڤ بریتیە لەوەی مرۆڤ سازیاری شەرع بێت و ئەوەی خوای گەورە لە شەرعدا فەرمانی پێکرد بێت ئەنجامی بدات و هەر شتێکی قەدەغە کرد بێت خۆی لێبەدور بگرێت. چونکە قەدەر لەوانەیە تاعەت و گوێڕایەڵی بێت، وە لەوانەشە مەعصیەت و گوناه و تاوان بێت. بەڵام شەرع تەنها ملکەچ بوونە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لەنێوانی هەردوکیاندا جیاوازی کردووە، لە نێوان قەزای کەونی و قەزای شەرعیدا، لە نێوان ئیرادەی کەونی و ئیرادەی شەرعیدا، لە نێوان ئیزنی کەونی و ئیزنی شەرعیدا جیاوازی کردووە. شێخولئیسلام _رحمە اللە_ چەند نموونەیەک لە قورئانی پیرۆزەوە باس دەکات وەکو جیاوازیەک لە نێوان هەر دوو شتەکاندا وەکو بەر پەچدانەوەیەک بۆ ئەوانەی قەدەر دەکەن بە بەهانەو بیانوو.

لە نێوان کەونیدا کە خولقاندویەتی و، تەقدیری کردوەو، قەزای کردووە ئەگەرچی فەرمانی پێنە کردوەو، خۆشی ناوێن و، پاداشتی ئەنجام دەرانیشی نەداوەتەوە، وە ناشیان کات بە ئەولیاو دۆستە تەقواکارەکانی خۆی، وە لە نێوان فەرمانی دینیدا کە فەرمانی پێکردوەو، بە شەرعی داناوەو، خۆشی ویستوەو، پێی ڕازی بوەو، ئەنجام دەرانیشی خۆش ویستووەو، پاداشتی لەسەر داونەتەوەو، ڕێزی گرتوون و[1]، کردوونی بە ئەولیاو دۆستە تەقواکارەکانی خۆی و، کۆمەڵە براوەکانی خۆی و، سەربازە سەرکەوتوەکانی خۆی.

وە ئەمەش لە گەورەترین ئەو جیاوازیانەیە کە نێوان دۆستانی خواو دوژمنانی خوای پێی جیادەکرێتەوە، بۆیە ئەگەر خوای گەورە هەر کەسێك لەو کارانەدا بەکاری بێنێت کە خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە و لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارانە مرد، ئەوە لەدۆستانی خوایە، وە هەر کەسیش کردەوەکانی لەو بوارانەدا بێت کە پەروەردگار ڕقی لێیەتی و حەزی پێنییەو و لەسەر ئەنجامدانی ئەوانە مرد، ئەوە لە دوژمنانی خوایە[2].

---

(١)_ خوای گەورە لە نێوان ئەم شتە کەونی و شەرعیانەدا جیاکاری کردووە، وە لە نێوان دۆستانیداو دۆستانی شەیتاندا ئەوانەی شوێنی فەرمانەکانی ئەو دەکەون جیا کاری کردووە، ئەوانەی تەنها شوێنی قەدەر دەکەون و، شەرعەکەی پشتگوێ دەخەن و، دەڵێن: جیاوازیان لە نێواندا نییە ئەوانە دۆستانی شەیتانن.

(٢)_ خوای گەورە لە نێوان ئیمانداران و کافراندا، گوێڕایەڵکاران و سەرپێچی کاراندا جیاوازی کردووە، یەکسانی نەکردوون، ئەگەرچی تاعەت و گوێڕایەڵی و، سەرپێچی و مەعصیەت و، کوفرو ئیمانی لەسەر هەرهەموویان تەقدیر کردووە، خوای گەورە لەڕووی پاداشتەوە جیاوازی لە نێوان دا کردوون، ئیمانداران لە بەهەشتداو

کافرانیش لە دۆزەخدا، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ (٣٥) مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ(٣٦)﴾[القلم: ٣٥_٣٦] واتە: چۆن ئێمە موسڵمانان و بەدکاران وەك یەك لێدەکەین؟ ئەوە چیتانە چۆن بڕیارێك دەدەن. ئەگەر موسڵمانان و بەدکاران وەك یەکبن ئەوە پێچەوانەی دادپەروەری دەبێت، خوای گەورەش دادوەرێکی عەداڵەتی خوا، ماقوڵ نییە نێوان ئیماندارو کافرو، گوێڕایەڵ و سەرپێچی کارو، بڕوادارو دوو ڕوو یەکسان بکات، هەرگیز نێوانی ئەوانە یەکسان ناکات، بۆچی؟ چونکە کەسی گوێڕایەڵ شوێنی فەرمان و شەرعی خوای گەورە کەوتووە، بەڵام کەسی سەرپێچی کار شوێنی سەرپێچی و کوفرو شیرك و هاوەڵپەرستی کەوتووە، کەواتە جیاوازی لە نێوان هەردوو کارەکەدا هەیە، جیاوازی لە نێوان هەر دوو بەندەکەدا هەیە، کەواتە بەلای خوای گەورەوە جیاوازی لە نێوان هەردوو پاداشتەکەش دا دەبێت. ئەوانەی لە نێوان ئەوانەدا جیاوازی ناکەن بێ باوەڕن بە ئایەتەکانی خوای گەورە. لەم سەردەمەدا بیرۆکەیەکی پیس هەیە بریتیە لە ئازادی، گوایە خەڵك ئازادن و هیچ قەدەغە کردنێکیان لەسەر نییەو لە دەربڕینی بیرو ڕاکانیاندا ئازادن، خۆیان بەشەرعەوە پەیوەند ناکەن، هەموو مرۆڤێك بە ئارەزووی خۆی دەنوسێت ئەگەرچی کوفرو ئیلحادیش بێت، ئەمە بە ئازادی، ئازادی وشە دەربڕین ناو دەبەن، بەڵام ئەمە دەرچوونە لە شەرعی خوای گەورە، ئەوانە لە کۆمەڵی شەیتانن چونکە لە نێوان شەرع و قەدەردا جیاوازی ناکەن.

## ئیرادەی کەونی و ئیرادەی شەرعی

ئیرادەی کەونی: بریتیە لەخواستی خوای گەورە بۆ هەموو ئەو شتانەی کی خولقاندویەتی (هي مشیئته لما خلقه)[1]، هەموو مەخلوقاتیش دەچنە چوارچێوەی خواست و مەشیئەت و ئیرادەی کەونی خوای گەورەوە[2].

ئیرادەی شەرعی: خۆشەویستی و ڕازی بوونی خوای گەورە لە خۆ دەگرێت هەموو ئەو فەرمانانەی کە خوا تەعالا لە شەریعەتەکەی دا ئاماژەی پێ کردووە پێی ڕازی یە و خۆشی دەوێ.[3]

---

(١)_ ئیرادەو مەشیئەت (خواست و ویست)، ئەم مەشیئەتە دابەش نابێت و تەنها کەونیشە، مەشیئەت تەنها کەونییە، موڕادیف و هاو واتای ئیرادەی کەونییە.

(٢)_ هەموو مەخلوقات لە ئیمانداران و، کافران و، جنۆکەو، مرۆڤ و، شەیتانەکان دەچنە چوار چێوەی ئیرادەی کەونی خوای گەورەوە، هەر هەموو ئەمانە مەخلوقاتی خوای گەورەن، خوای گەورە ئیبلیس و، کافرانی خولقاندووە، پێغەمبەران و ئیماندارانی خولقاندووە، ئەوان و ئەمانیشی خولقاندووە، لەڕووی خولقاندنەوە هیچ جیاوازیەك نییە، بەڵام لەڕووی شەرع و، پاداشتەوە جیاوازی لە ئارادایە.

(٣)_ ئیرادەو خواستی کەونی خۆشویستن و ڕازی بوونی تێدا نییە، لەوانەیە خوای گەورە خواستی شتانێك بکات بەکەونی و قەدەری کە خۆشی ناوێن وەکو دینێك بۆ بەندەکانی، بۆ نموونە خوای گەورە کوفری وەکو کەونی و قەدەری ویستووە لە کاتێکدا خۆشی ناوێت، بەڵام تەقدیری کردوەو قەزاشی کردووە بۆ ئەوەی بەندەکانی تاقی بکاتەوە، بۆ ئەوەی گوێڕایەڵ و سەرپێچی کار لێك جیا بکرێتەوە، بۆ ئەوەی دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان لێك جیا بکرێتەوە، ئەگینا خوای گەورە کوفری خۆش ناوێت. بەڵام خواست و ئیرادەی دینی خوای گەورە خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە.

بوونە دەکۆڵنەوە کە فەرمانی پێداوە، کردویەتی بە شەرع و دین، ئەمەش تایبەتە بە ئیمان و کردەوەی چاکەوە[1].

لە بارەی خواست و ئیرادەی کەونیەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾[2] [الأنعام: ١٢٥].

نوح _ عليه السلام _ بەقەومەکەی خۆی فەرموو: ﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ اللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[3] [هود: ٣٤] واتە: ئامۆژگاری من سوودتان پێناگەیەنێ گەر بمەوێ ئامۆژگاریتان بکەم ئەگەر خوا بیەوێ گومڕاتان بکات ئەو پەروەردگارتانە وە هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە.

---

(١)_ ئیرادەو خواستی شەرعی تەنها بەئیمان و کردەوەی چاکەوە تایبەتە، بەڵام ئیرادەو خواستی کەونی تەنها بەئیمان و کردەوەی چاکەوە تایبەت نییە بەڵکو کوفرو ئیمان، کردەوەی خراپ و کردەوەی چاکیش لە خۆ دەگرێت، چونکە ئەمە قەزاو قەدەری خوای گەورەیە.

(٢)_ ئەم ئایەتە هەر دوو ئیرادەکە لە خۆ دەگرێت ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ﴾ جا هەر کەسێ خوا بیەوێت ڕێنموونی بکات سینگی فراوان دەکات بۆ ئیسلام و بروا هێنان، ئەمە ئیرادەو خواستی شەرعیە، ﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ وە هەرکەس خوا بیەوێت گومڕای کات (لەبەر نەشیاوی خۆی) سنگی زۆر تەنگ دەکات، ئەمە ئیرادەو خواستی کەونییە، ڕێنموونی کردن هۆکار گەلێکی هەیە لەوانە کردەوەی چاکە، گومڕابونیش هۆکار گەلێکی هەیە وەکو گوناه و تاوان و سەرپێچی کردن و کوفر.

(٣)_ شاهێدی قسەکانمان لە گوفتارەکەی خوای گەورەدا ﴿إِن كَانَ اللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ﴾ ئەگەر خوا بیەوێ گومڕاتان بکات، ئەمە ئیرادەو خواستی کەونییە کە مرۆڤ لە بەرامبەریدا هیچی پێناکرێت.

هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿وَإِذَا أَرَادَ اللّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ﴾[1] [الرعد: ١١].

وە لەبارەی ئیرادەو خواستی شەرعیشەوە خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[2].

وە لە ئایەتی (الطهارة)دا خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَكِن يُرِيدُ لِيُطَهَّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[3] [المائدة: ٦].

---

(١)_ ئەمە ئیرادەو خواستی کەونییە ﴿وَإِذَا أَرَادَ اللّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ﴾ وە کاتێك خوا بیەویٚ هۆزێك تووشی بەلاَبن هیچ بەرگرێکی بۆی نییە و جگە لەو خوا هیچ یارمەتیدەرو پشتیوانێکیان نییە، خوای گەورە خواستی بەلاَ و موصیبەت دەکات بۆ کەسانێك کە پێی شایستەن وەکو ستەمکاران و زۆرداران و هاوەڵپەرستان و کافران، خوای گەورە خواستی بەلاَیان بۆ دەکات، چونکە هیدایەت و ڕێنموونی خوای گەورەیان قبولّ نەبوو.

(٢)_ ئەمە ئیرادەو خواستی شەرعی، خوای گەورەیە، ڕێگەی بە نەخۆش داوە لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو نەبێت، هەروەها ڕێگەیداوە بە موسافیریش لەڕەمەزاندا بەڕۆژوو نەبێت و، پاشان لە ڕۆژانێکی تردا قەزای بکەنەوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ﴾ خوا ئاسانی دەویٚ بۆ ئێوە، ئەمە ئیرادەو خواستی شەرعیە، ﴿وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ وە گرانی ناوێت بۆتان، ئەمە نموونەیەك بوو بۆ ئیرادەو خواستی شەرعی کە خوای گەورە پێی ڕازیەو خۆشی دەوێت.

(٣)_ خوای گەورە لەئایەتی (الطهارة)دا دەفەرمویٚ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مَّنكُم مِّنَ

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [المائدة: ٦٤٩] واته: ئەی ئەوانەی باوەڕدارن ئەگەر هەستان بۆ نوێژکردن ئەوە دەم و چاوتان بشۆن هەروەها دەستەکانتان تا ئانیشکەکانتان وە دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتاندا وە پێکانتان (بشۆن) تا هەردوو قولە پێتان وە ئەگەر لەش گران بوون ئەوە خۆتان خاوێن بکەنەوە (خۆتان بشۆن) وە ئەگەر نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یان کەسێکتان هاتەوە لە شوێنی پێویستی سەر ئاو یان جووت بوون لە گەڵ خێزانەکانتاندا و ئاوتان دەست نەکەوت ئەوە تەمموم بکەن بە خۆڵێکی پاك جا دەست بهێنن بە دەم و چاوو دەستەکانتاندا بەو تۆزو خۆڵە پاکە خوا نایەوێ هیچ جۆرە تەنگی و ناڕەحەتیەك لەسەرتان دابنێ بەڵکو دەیەوێ پاکتان بکاتەوە و چاکەو بەهرەی خۆی تەواو بکات بەسەرتانەوە بەڵکو سوپاس بکەن. لەم ئایەتەدا خوای گەورە فەمانی داوە بە خۆ پاککردنەوە لەبێنوێژی گەورەو بچووك (الحدث الأكبر والأصغر)، بەچ شتێك مرۆڤ خۆی پاك دەکاتەوە؟ بە ئاو، هەر کات ئاو دەستنەکەوت ئەوا بەخاك تەیەمموم دەکات، دەستەکانی بەزەویدا دەدات و پاشان دەم و چاو و هەردوو دەستی پێی پاك دەکاتەوە، خاك هۆکارێکی پاکەرەوەیە لە کاتی نەبوونی ئاودا یان لە کاتێکدا بەکارهێنانی ئاو لە تواناادا نەبوو، ئەمە نموونەیەکە بۆ ئیرادەو خواستی شەرعی.

وه كاتێ خوای گه‌وره باسی ئه‌و هاوسه‌رگیریانه ده‌كات كه

كردوون، ده‌فه‌رموێ: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ
وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٢٦) وَاللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن
عَظِيمًا (٢٧) يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفًا (٢٨)﴾[1] [النساء: ٢٦_٢٨]

---

(١)_ خوای گه‌وره له‌م ئایه‌تانه‌دا ئه‌و ژنانه‌مان بۆ باس ده‌كات كه
هاوسه‌رگیریان حه‌رامه، ئه‌وانه‌ی له‌نه‌سب و خزمایه‌تیه‌وه حه‌رامه، ئه‌وه‌ی به
حه‌رام ده‌بێت، ئه‌وه‌شی به‌هۆی شیر خواردنه‌وه حه‌رام ده‌بێت، خوای
ده‌فه‌رموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ
وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ
اللَّاتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ
وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللَّهَ
غَفُورًا رَّحِيمًا (٢٣) وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ
مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ
أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ
حَكِيمًا (٢٤) وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا
أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ
وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ فَإِذَا أُحْصِنَّ
أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ
وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢٥)﴾[النساء: ٢٣_٢٥] واته: قه‌ده‌غه كراوه
له‌سه‌رتان (ماره‌كردنی) دایكانتان و كچه‌كانتان و خوشكه‌كانتان و پوره‌كانتان (كه
خوشكی باوكتانن) وه پووره‌كانتان

---

(كە خوشکی دایکتانن) و کچانی براو کچانی خوشك ئەو دایکانەتان کەشیریان پێداون و خوشکەکانتان لە شیرەوە وە دایکی ژنەکانتان (خەسوو) و کچانی ژنانتـان کـە لـە مێردی تریان بن ئەوانەی کە لە ماڵی ئێوەدا دەژین لەو ژنانەتانن کە چوونەتە لایان جا ئەگەر نەچوونەتە لایان (دایکی کۆڵە بەسەکان) ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە (لـە مارەکردنی کچەکانیاندا) وە (حەرامە بۆتان) هاوسـەری کورەکانتـان (بـووك) ئەوانـەی کەلە پشتی خۆتـانن وە (قەدەغـە کـراوە لەسـەرتان) کۆکردنـەوەتان لـە نێـوان دوو خووشك (لـە مارەکردنـدا) مەگـەر ئـەوەی پـێش ئـەم (حوکمـە لـە نەفامیـدا) کـرا بـێ بێگومان خوا هەمیشە لێبووردەی میهرەبانە (هەروەها حەرام کراوە لێتان) ئەوانەی کە مێردیان هەیـە لـە ئافرەتـان جگـە لەوانـەی کـە بوونەتـە موڵکتـان (کـەنیزەك) (ئـەو حوکمانە باسکران) پێویستکراوو نوسراوی خوایە لەسـەرتان وە بۆتـان حـەڵاڵ کـراوە بێجگە لەوانە (کە باسکران هەمووی حەڵاڵە بۆتان تا چوار) کە بەماڵەکانتان خـوازبێنی (ئافرەتان) بکەن (بە مەرجێ) کە داوێن پاك بـن و داوێـن پـیس نـەبن جـا ئـەوەی کـە لەزەتتان لێ وەرگرت لەو ئافرەتانـە(ی حـەڵاڵن) ئـەوا مارەیيـەکانیان پێـی بـدەن کـە ئەرزکراوە لەسـەرتان تاوانتـان لەسـەر نییـە لـەوەی کـە لەسـەری پێکهـاتن (لـە گـەڵ ژنەکانتاندا لە کەم کردنەوەی مارەیی) لەپاش دیاری کردنـی مـارەیی بەڕاسـتی خـودا هەمیشە زانای کار دروستە وە ئەوەی لە ئێوە نەیتوانی لەبەر هـەژاری کـە ئافرەتـانی ئازادی ئیماندار مارە بکات ئەوە با لەوانە مارەبکات کە بوونەتە موڵکتان لە کەنیزەکە ئیمانـدارەکانتان وە خـوا زانـاترە بەباوەڕەکـەتان هەنـدێکتان لـە هەنـدێکی ترتـانن (هەمووتان نەوەی ئادەمن) لەبەر ئەوە مارەیان بکەن بە ڕەزامەندی خاوەنەکانیان وە مارەییەکەیان پێی بدەن بە شێوازێکی چاك لە کاتێکدا ئەو کەنیزەکانە پاك داوێـن بـن داوێن پیس (و زینا کاری بە ئاشکرا) نەبن و دۆستیان نەبێ (بە نهێنی بۆ زیناکردن)

جا ئەگەر ئەو (کەنیزەکانە) شوویان کرد پاشان خراپەیەکی ئاشکرایان کرد (زینا) ئەوە نیوەی سزای ئافرەتە ئازادەکانیان لەسەرە (لێیان دریێ کە ٥. جەلدە) ئەو (مارە کردنی کەنیزەکە) بۆ کەسێکە لە ئێوە لە تاوانکردن (زینا) بەلاّم ئەگەر ئارام بگرن (و کەنیزەك مارەنەکەن) چاکترە بۆتان وە خوا زانای کار دروستە. پاشان خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٢٦) وَاللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُوا مَيْلًا عَظِيمًا (٢٧) يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا(٢٨)﴾[النساء: ٢٦_٢٨] خوا دەیەوێت بۆتان روون بکاتەوە وە رێنموونیتان بکات بۆ رێوشوێنی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون (لە خوا ناسان) ولێتان خۆش ببێت وە خوا زانای کار دروستە وە خوا دەیەوێت کە لێتان ببورێت بەلاّم دەیانەوێ ئەوانەش کە شوێن ئارەزووات کەوتوون کەلاتان بدەن بە لادانێکی گەورە خوا دەیەوێت کە ئەرکتان لەسەر سووك بکات چونکە ئادەمی بە لاواز دروستکراوە. ئەو ئیرادەو خواستەی لەم ئایەتانەدایە ئیرادەو خواستێکی شەرعی دینیە.

وە خوای گەورە کاتێ باسی ئەوە شتانە دەکات کە فەرمانی ئەنجامدانی داوە بە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەو شتانەی کە قەدەغەی لێکردوون، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا (٣٣)﴾(١) [الأحزاب: ٣٣].

---

(١)_ خوای گەورە ئامۆژگاری خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات بۆ ئەوەی ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ پاك بکاتەوە، ئەمە ئیرادەو خواستێکی شەرعی و دینیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا نِسَاء النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاء إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلاَ تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا(٣٢) وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلاَ تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلاَةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا (٣٣) وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا(٣٤)﴾ [الأحزاب: ٣٣] واتە: ئەی ژنانی پێغەمبەر ﷺ ئێوە وەك هیچ یەك لە ئافرەتانی دیکە نین ئەگەر خۆتان بپارێزن و لە خوا بترسن کەواتە بەخەمزەو نازەوە قسە مەکەن (وەك ئافرەتانی ڕەوشت نزم) نەوەکو ئەوەی کەدڵی نەخۆشە (دەروون نزمە) نیازی خراپ بکات وە قسەی چاك و بەجێبکەن وە لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە وە زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن (لە ناو خەڵکی نامەحرەمدا) وەکو خۆدەرخستنی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی یەکەم (پێش ئیسلام) نوێژ بکەن و زەکات بدەن وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن بە ڕاستی خوا دەیەوێ ئەی ئالوبەیتی (پێغەمبەر ﷺ) هەر جۆرە پیسی و گوناهێك لەئێوە دور بخاتەوە و پاك و خاوێنتان بکاتەوە بە تەواوی وە بیر بکەنەوە لەوەی دەخوێنرێت لە ماڵەکانتاندا لە ئایەتەکانی خواو دانایی (فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ) بەڕاستی خوا وردبینی ئاگادارە. شاهێدی قسەکانمان لەم ئایەتانە ئەوەیە کە خوای

گەورە لەو فەرمانانەی کە داویەتی بە خێزانەکانی پێغەمبەرەکەی ﷺ دایکانی ئیمانداران دەیەوێت خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕەوشتی خراپ و سەرپێچی شەرعیەکان پاك بکاتەوە، وە لەو شتانە بە تەواوی پاکیان بکاتەوە، ئەمە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بالاپۆشی و، داوێن پاکی و، مانەوە لە ماڵداو، ئابڕو و شەرم و، خۆ دوور خستنەوە لە دەرخستنی زینەت و سفوری و، بە نازەو قسەکردن کە ژنان بۆ شەڕ ڕادەکێشێت، هەموو ئەوانە دڵەکان پاك دەکەمەوەو، ماڵەکان پاك دەکەنەوە.

کەچی مولیحدانی ئەمڕۆ دەڵێن: نەخێر، ئەمە سەرکوت کردنی ئازادی ژنانە، پێشێلکردنی ماڵی ژنانە، واز لە ژنان بێنن با ئارەزووی خۆیان کردار بکەن، ڕێگریان لێمەکەن، بەم جۆرە قسەدەکەن، خوای گەورە سەر شۆڕیان بکات، لە ڕاستیدا ئەوان پاکییان بۆ ئەم ئوممەتە ناوێت، بەڵکو تەنها خراپە کارییان بۆ ئەم ئوممەتە دەوێت، خوای گەورە سەر شۆڕیان بکات، پەروەردگارا شەڕیان لەم ئوممەتە دورخەرەوە.

ژنانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەنگی ئەم ئوممەتەن، ژنانی پێغەمبەری خوا ﷺ پاکترین ژنانی ئەم ئوممەتەن سەرەڕای ئەوەش خوای گەورە بەم جۆرە ئامۆژگارییان دەکات، ئیتر ژنانی تری غەیری ئەوان پێویستە چۆن بن؟

[...]ازی ئەم ئایەتەش ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمانی شتانێکی پێداون کە پیسی و خراپەکاریتان لێ دوردەخاتەوەو، بە تەواوی پاکتان دەکاتەوە، بۆیە هەر کەس گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بێت پاک کراوەیەو پیسی و خراپەی لێ دورخستۆتەوە بە پێچەوانەی ئەوەوە کە سەرپێچی کردووە[1].

---

(١)_ هەر کەس گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە بێت ئەوا لەپیسی و خراپەکاری ڕەوشتی و جەستەیی پاکی دەکاتەوە، هەر کەسیش سەرپێچی بکات ئەوا پیس دەبێت بە پیسیەکی هەستی و مەعنەوی، کەوا بوو پاکی نییە تەنها بە ئیمان و، ڕەوشتی جوان و، داوێن پاکی و، ئابڕوداری نەبێت.

## ئەمری کەونی و ئەمری شەرعی

بەلام ئەمرو فەرمان: سەبارەت بەئەمرو فەرمانی کەونی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾[1] [النحل: ٤٠] واتە: بێگومان وتەی ئێمە بۆ هەر کارێك کاتێ بمانەوێ (ئەمەیە) کە پێی دەڵێین ببە ئەویش یەکسەر دەبێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلاَّ وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾[2] [القمر: ٥٠] واتە: وە فەرمانی ئێمە تەنها یەکجارە وەك چاوتروکاندنێك (وایە لە خێراییدا).

---

(١)_ ئەمە ئەمرو فەرمانی کەونییە، لە فەرمانی خوای گەورە دوا ناکەوێت، پێك نەهاتنی بۆ نییە، بەڵکو دەبێت و مەوجود دەبێت بەتەنها ئەوەی خوای گەورە پێی دەفەرموێ: ﴿كُن﴾ ببە، ئەمە ئەمری کەونییە کە دەرەنجامەکانی بەهیچ شێوەیەك دواناکەوێت. بەلام ئەمرو فەرمانی شەرعی لەوانەیە دەرەنجامەکانی دواکەوێت، وە لەوانەشە بەدی بێت، بەلام کەونی هەرگیز دواناکەوێت، لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا﴾[الإسراء: ١٦] واتە: وە کاتێ بمانەوێ (دانیشتوانی) شارو وەلاتێ لە ناو ببەین فەرمان دەدەین (بەگوێڕایەڵی و کردەوەی چاك) بە دەوڵەمەندە خراپە کار و زۆردارەکانی کەچی ئەوان یاخی دەبن و لە فەرمان دەردەچن. ئەمە ئەمرو فەرمانی کەونیە چونکە خوای گەورە هەرگیز وەکو شەرع و دین فەرمان بە یاخیبوون و لە فەرمان دەرچوون ناکات، بەلام وەکو کەونی فەرمانی پێدەکات و خواستیدەکات، ئەوەش بۆ حیکمەت و دانایی خوای گەورە دەگەڕێتەوە.

(٢)_ ئەمە لە ڕۆژی قیامەتدایە، هەر کات فەرمانی بە ڕوودانی قیامەت کرد، ساتێکە ﴿كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾ ئایا شتێکی تر هەیە لە چاو تروکاندن خێراتر بێت، هیچ شتێکی تر لەو خێراتر نابێت، هەر کات خوای گەورە فەرمانی بەشتێ کرد، خوڵقاندنی شتێك یەکسەر وەکو چاو تروکاندنێك بە دیدێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَاهَا حَصِيدًا كَأَنْ لَمْ تَغْنَ بِالْأَمْسِ﴾(١) [يونس: ٢٤].

بەڵام لە بارەی ئەمرو فەرمانی شەرعیەوە: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾(٢) [النحل: ٩٠].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنْزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَامُ حَتَّى إِذَا أَخَذَتِ الْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَاهَا حَصِيدًا كَأَنْ لَمْ تَغْنَ بِالْأَمْسِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[يونس: ٢٤] واتە: بێگومان وێنەی ژیانی دونیا وەك بارانێك وایە لە ئاسمانەوە باراندوومانە جا بە هۆی ئەو (بارانەوە ڕووەکی زەوی تێکەڵ بووەو بە یەکدا چووە سەوزی و ڕووەکی زەوی لەوەی کە خەڵکی و ئاژەڵیش دەیخۆن هەتا کاتێ زەوی (بەسەوزی و ڕووەك) ڕەونەق و جوانی خۆی وەردەگرێ و خۆی دەڕازێنێتەوە دڵنیشتوان و خەڵکی ئەو (زەویە) وا دەزانن کەبەڕاستی ئەوان بەتوانان بەسەر (درووێنەکردن)یدا (لە ناکاوێکدا) فەرمانی ئێمە بێت بۆ ئەو (زەوی و کشتوکاڵە) لەشەو یان ڕۆژدا: خوای گەورە شتێکی بەسەردا زاڵ دەکات کە خراپی بکات و لە ناوی بەرێت ئینجا وەك درووێنەکراوی لێ بکەین ئەوەی وەك لەوەو پێش هەر نەبوبێت. ئیتر هەموو ڕووەك و گوڵ و بەرەکانی لە ناو دەچێت: بەسانێك: بە چاو تروکاندنێك: شەو بێت یان ڕۆژ: وای لێدێت وەکو ئەوەی لەوەو پێش هەر نەبوبێت. کەوا بوو ئەمرو فەرمانی کەونی دەرەنجامەکانی هەرگیز دوا ناکەوێت. دەست بەجێ بەدیدێت: ئەمە ئەمرو فەرمانی کەونییە.

(٢)_ ئەمە ئەمرو فەرمانێکی دینی و شەرعییە: خوای گەورە وەکو دین و شەرع فەرمان دەدات بە (العدل) دادگەری کردن: دادگەری لە گوفتاردا: دادگەری لە بڕیاردا:

دادگەری لە هەموو شتێکدا، کە بریتیە گوناهـ و تاوان نەکردن، دادگەری پێچەوانەی ستەم کردنە، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾[الأنعام: ١٥٢] واتە: وە کاتێ (بۆ شایەتیدان و شتی تر) قسەتان کرد دادوەرو ڕاست بن ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾ با (لە دژی) خزمی نزیکی خۆشتان بێت. هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾[الشعراء: ١٨٢] واتە وە بە تەرازوویەکی ڕاست و ڕێك کێشانە بکەن.

دادگەری لە هەموو شتێکدا، لە کێشانەو پێوانەو لە هەموو شتێکدا، خوای گەورە فەرمانیداوە بەدادگەری لە هەموو شتێکدا، وە ڕێگریی لە جەورو ستەم کردووە، ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ﴾ بە ڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادگەری، تۆڵەسەندنەوەش (القصاص) دادگەرییەکە لە خوای گەورەوە، هەموو جۆرەکانی تۆڵەسەندنەوە (القصاص) دادپەروەریەکە لە لایەن خوای گەورەوە، چاکە کردن فەزڵە، کەوا بوو ئەو ﴿الْعَدْلِ﴾و دادگەریەی لەم ئایەتەدا باسکراوە بریتیە لە تۆڵە سەندنەوە لە ستەمکار بەگوێرەی ستەم کردنەکەی خۆی، ئیتر تۆڵە لە بکوژ دەسێنرێتەوە، تۆڵە لە ستەمکارو زۆردار دەسێنرێتەوە بە گوێرەی ستەم کردنەکەی خۆی، وەکو چۆن دەستدرێژی کردۆتە سەرتان بەبێ هیچ زیادەیەك، لە تۆڵەسەندنەوەو، وەرگرتنەوەی هەق لەکەسی دەست درێژکار، بەڵام لە هەموو ئەمانە چاکتر﴿وَالْإِحْسَانِ﴾ە کە بریتیە لەلێبوردن، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾[الشورى: ٤٠] واتە: وە تۆڵەی هەر خراپەیەك خراپەیەکە بەوێنەی خۆی، ئەمە قەساس و تۆڵەسەندنەوەو دادگەرییە جا هەر کەسێ ببورێ و ئاشتی بکات، قەساس و تۆڵەسەندنەوە دادگەرییە، لێبوردنیش فەزڵ و چاکەیە، چاکەکردن و فەزڵیش لە دادگەری باشترە ئەوە پاداشتی ئەو لەلای خوایە.

بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بەدادگەری، کە بریتیە لە قەساس و تۆڵەسەندنەوە لە دەست درێژکار، ﴿وَالْإِحْسَانِ﴾ بریتیە لە لێبوردن و بەخشین و چاوپۆشین لەدەستدرێژکار، چونکە ئەم کارە خۆشەویستی بەرپادەکات، وەکو ئەوەی خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾[فصلت: ٣٤] واتە: چاکەو خراپە چوونیەك نین بە چاکترین شێوە وەڵامی (خراپە) بدەرەوە ئەوسا کەسێ کە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتی هەیە وەك دۆستێکی دڵسۆزو گیانی بە گیانی لێدێت. و بەبەخشین و بەخزم و خوێش، خزم و خوێش هەموو ئەوانەن کە پەیوەندی خزمایەتیت لەگەڵیاندا هەیە ئەگەر لە لایەن بابەوە بێت یان دایك، هەموو ئەوانە هەقیان بەسەرتەوەیە، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ﴾[الإسراء: ٢٦] واتە: مافی خزمانت بدە. خزمان هەقیان بەسەرتەوەیە پاش هەقی دایك وباب، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى﴾[النساء: ٣٦] واتە: هەروەها لە گەڵ دایك و باوکتاندا چاك بن و لەگەڵ خزم و نزیکان. پاش دایك و بابیش خزمان دێن لە هەر دوو لایەنی باب و دایکیشەوە، هەقی بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتیان بەسەرتەوەیە، ﴿وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ﴾ وە خوای گەورە رێگری دەکات لە داوێن پیسی، وە لە هەر مەعصیەت و گوناه و تاوانێکی زۆر قێزەون، چونکە مانای ﴿الْفَحْشَاءِ﴾ بریتیە لە هەر مەعصیەت و گوناه و تاوانێکی ناشیرینی قێزەون، بریتیە لەهەموو مەعصیەت و گوناه و تاوانێکی ناشیرین، رێگری دەکات لە تاوانەکان گەورەو بچوك، ﴿وَالْبَغْيِ﴾ دەست درێژی کردنە بۆ سەر خەڵکی وەکو خوێنڕشتن و، بە تالان بردنی ماڵ و سامانیان، دەست درێژی کردنە سەر ئابڕویان. ئەم ئایەتە ئەمرو فەرمانی شەرعی تێدایە.

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾(١) [النساء: ٥٨].

---

(١)_ لەو ئەمرو فەرمانە شەرعيانەش دانەوەی ئەمانەت و سپاردەكانە بەخاوەنەكانی خۆيان، ئايەتەكە ماناكەی بەم شێوەيە بە ڕاستی خوا فەرمانتان پێی دەكات، بە دانەوەی گشت سپاردەكان بەخاوەنەكانيان، هەموو ئەو سپاردانەيە كە بەتۆ سپێردراوە، ئەوانەش هەقی خوای گەورەو، هەقی خەڵكن بەسەرتەوە، ئەوانە ئەمانەت و سپاردەن پێويستە بۆ خاوەنەكانيانی بگەڕێنيتەوە، هيچ شتێكی لێكەم مەكەرەوە، ناپاكی لێمەكە، شاهێدی قسەكانمان لە ئايەتەكە ئەوەيە كە خوای گەورە باسی دانەوەی ئەمانەت و سپاردەكان دەكات بە خاوەنەكانيان، ئەمەش ئەمرو فەرمانێكی شەرعی و دينيە.

## ئیزنی کەونی و ئیزنی شەرعی

لە بارەی ئیزنەوە: لە ئیزن و ویستی کەونیدا خوای گەورە کاتێ باسی جادوو دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾[1] [البقرة: ١٠٢].

---

(١)_ واتە: ئەوان، واتە جادووگەرەکان بەم جادووە ناتوانن زیان بە کەس بگەیەنن، جادوو زیان بەخشە بە کوشتن یا بە نەخۆشخستن زیان بەخشە، کاری شەیتانەکانە، بەڵام زیان بەکەس ناگەیەنن مەگەر بە ویست و مۆڵەتی خوای گەورە، ئیزن و مۆڵەتی کەونی قەدەری خوای گەورە، لە توانای جادووگەراندا نییە زاڵ بن بەسەر یەکێکدا مەگەر بەقەزاو قەدەری خوای گەورە، بۆیە پێویستە موسڵمان پشت بە خوای گەورە ببەستێت و، پەنا بەخوای گەورە بگرێت لە شەڕو زیانی جادووگەران و غەیری ئەوانیش. شاهێدی قسەکانمان لەئایەتەکە بریتیە لە ﴿إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ مەگەر بە ویستی خوای گەورە، واتە بە ئیزن و مۆڵەت و ویستی کەونی، ئەگینا خوای گەورە وەکو شەرع و دین ئیزن و مۆڵەت بەجادوو نادات، بەڵکو نکوڵی لێ دەکات، ئەنجامدەرانیشی بەکافر داناوە، چونکە لە ڕاستیدا جادوو ویستی کەونی قەدەری خوای گەورەیە، ئەگەر خوای گەورە تەقدیری ئەوە بکات جادوو زیان بگەیەنێت ئەوا زیان دەگەیەنێت، کەوا بوو پێویستە بەندە پەنا بە خوای گەورە بگرێت لە جادووگەران و غەیری ئەوانیش.

واتە: بەویست و توانای خوای گەورە، ئەگینا خوای گەورە ڕێی بەجادوو نەداوە[1].

لە ئیزن و ڕێدان و فەرمانی شەرعیش خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾[2] [الشورى: ٢١] واتە: ئاخۆ ئەو (بێباوەڕ)انە هاوبەشانێکیان هەیە ئایینێکیان بۆ داناون کەخوا ڕێگەی پێنەداوە.

---

(١)_ بەڵام خودی جادووگەران ناتوانن زیان بە کەسێك بگەیەنن ئەگەر خوای گەورە زیانی تەقدیر نەکردبێت، تەنها خوای گەورەیە کە جادووگەران و غەیری ئەوانیش زاڵ دەکات، لەبەر حیکمەت و داناییەك بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانی خۆی یان وەکو سزایەك بۆ کردەوە خراپەکانی خۆیان، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾[الشورى: ٣٠] واتە: وە هەر ناخۆشیەکتان تووش بوو بێ ئەوە بە هۆی کردەوەی (خراپی) خۆتانەوەیە. لەوانەیە خوای گەورە جادوو گەران زاڵ بکات بەسەر مرۆڤدا بەهۆی ستەم و مەعصیەت و گوناه و تاوانی خۆیانەوە. بەڵام خوای گەورە ڕێی بە جادوو نەداوە، چونکە کوفرە و خوای گەورەش بە کوفر ڕازی نابێت، جادوو کردەوەی شەیتانەکانە و، بۆ هەر هەموو خەڵکی زیان بەخشە، بۆیە خوای گەورە ڕێی پێنەداوە.

(٢)_ ﴿مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾ کە خوا ڕێگەی پێنەداوە، واتە ئەوەی خوای گەورە بە شەرعی دانەناوە، ئیزنی شەرعی لەسەر نیە. ئایەتەکەش سەبارەت بەو کەسانەیە کە حەڵاڵ دەکەن و حەڵاڵەکان حەرام دەکەن بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك لە قورئان و سوونەت، ئەوانە شەرعێکیان بۆ خەڵکی داناوە کە خوای گەورە داینەناوە، خوای گەورە ئیزن و ڕێی پێنەداوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا (٤٥) وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُنِيرًا (٤٦)﴾[1] [الأحزاب: ٤٥_٤٦].

---

(١)_ خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ دەفەرموێ: خوای گەورە شایەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەدات کە پەیامی پێداوە، شایەتی دانێکە لە لایەن خوای گەورەوە کە خوای گەورە ناردویەتی، دەفەرموێ ئەی موحەممەد ﷺ تۆ شایەتیت بەسەر ئەم ئوممەتەوە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾[النساء: ٤١] واتە: ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك هێنامان لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێك (کە پێغەمبەرەکەیانە) ﴿وَجِئْنَا بِكَ﴾ تۆیشمان هێنا (ئەی موحەممەد ﷺ) بەشایەتێك بەسەر ئا ئەوانەوە. لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو ئوممەتێك پێغەمبەرەکەیان بەسەریانەوە کە پەیامی خوای گەورەی پێ ڕاگەیاندون، ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ مژدەی بەهەشت بە ئیمانداران دەدات و، کافرانیش لە ئاگر دەترسێنێت، کافران بۆ ئیسلام بانگ دەکەی، یاخی بوان و تاوانباران بۆ تەوبەو پەشیمان بونەوە بانگدەکەی، بانگخوای بۆ ڕێگەی خوای گەورە دەکەیت، ﴿بِإِذْنِهِ﴾ واتە بەشەرعەکەی ئەمەیە مەحەلی شاهێدی قسەکانمان، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەرمانی خوای گەورە نێردراوە، واتە بەشەرعێك کە خوای گەورە بۆی دابەزاندوەو سرووشی بۆ کردووە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئیزنی شەرعی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللّهِ﴾(١) [النساء: ٦٤].

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ﴾(٢) [الحشر: ٥].

---

(١)_ واتە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، لە یەکەمیانەوە تا وەکو کۆتاهەمینیان خوای گەورە ناردوونی تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵیان بکرێت، چونکە هەرکەسێك گوێڕایەڵیان بوو بێگومان گوێڕایەڵی خوای گەورە بووە، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾[النساء: ٨٠] واتە: هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکات ئەوە بە ڕاستی گوێڕایەڵی خوای کردووە. خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکرێن، واتە: بە شەرعەکەی خوای گەورە، ئەمەیە شوێنی شاهێدی قسەکانمان، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئیزنی شەرعی (دینی) هەیە، هەروەها کەونی (قەدەریش) هەیە.

(٢)_ ئەم ڕووداوە لە غەزای جوولەکەکانی بەنی نەضیردا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی بەڕێزیدا لە شوێن وماڵی خۆیاندا غەزای کردن و، ئابلۆقەیان دان و ژمارەیەك دارە خورماشیان بڕیۆ، بۆ ئابڕو و بردن و سووك کردنیان، بۆیە خوای گەورەش فەرمووی: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ﴾ ئەو دارەخورمایەتان کەبڕی، ﴿فَبِإِذْنِ اللَّهِ﴾ ئەوە بەفەرمانی خوا بووە، واتە بە شەرعەکەی، خوای گەورە فەرمانی ئەوەی پێدان و ڕێی پێدان ئابڕووی جوولەکەکان بەرن.

## قەزای كەونی و قەزای شەرعی

هەروەها خوای زانا و شاران جیاوازی نێوان قەزای كەونی و قەزای شەرعیشی كردووە لە قورئانی بەر و رێزدا ئەوەتا سەبارەت بە قەزای كەونی دەفەرموێ: ﴿فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ﴾[فصلت: ١٢] واتە ئەوسا حەوت ئاسمانی لە دوو رۆژدا دروست كرد.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾[1] [آل عمران: ٤٧].

لە قەزای دینیشدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ﴾[2] [الإسراء: ٢٣] واتە: وە پەروەردگارت بڕیاریداوە كە هیچ شتێ نەپەرستن بێجگە لە ئەو.

---

(١)_ ﴿إِذَا قَضَى أَمْرًا﴾ واتە: كاتێك كە بڕیاری شتێكیدا، تەقدیری كردو ویستی كرد، ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ هەر ئەوەندەی دەوێت پێی بڵێت: ببە ئیتر دەبێت، دەست بەجێ، دوا ناكەوێت، هەر كات خوای گەورە پێی فەرموو: ببە دەسبەجێ دەبێت، شاهێد قسەكانمان بریتیە لە گوفتاری خوای گەورە: ﴿إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ ئەمە قەزای كەونییە.

(٢)_ ئەمە قەزای دینی شەرعیە، ﴿وَقَضَى﴾ واتە: خوای گەورە فەرمانیداو ڕاسپاردەی كردووە (أَمَرَ وَوَصَّى)، بەلام ئەهلی گومرایی دەڵێن: واتە بڕیاریداوەو تەقدیری كردووە (حَكَمَ وقدَّرَ). فەرمانیداوەو ڕایسپاردوون تەنها خوای گەورە بپەرستن.

﴿وَقَضى﴾ واتە: فەرمانیداوە، مەبەست بە وشەی ﴿وَقَضى﴾ لێرەدا قەدەر نییە، چونکە شتانێکی دیکەی غەیری خوای گەورە پەرستراوە، وەکو ئەوەی خوای گەورە لە چەند شوێنێکدا باسی دەکات[1]، وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ﴾[2] [یونس: ١٨] واتە: ئەوانە بێجگە لە خوا شتانێك دەپەرستن کە نەزیانیان پێی دەگەیەنن نەسوودو قازانج وە دەڵێن ئەو بتانە تکا کارمانن لای خوا.

---

(١)_ قەزای شەرعی پێدەچێ جێبەجێ بکرێت و لەوانەشە جێبەجێ نەکرێت، بەڵام قەزای کەونی دوا ناکەوێت، ئەگەر مانای ئایەتەکە ﴿وَقَضَى رَبُّكَ﴾ بەو مانایە بوایە کەوا خوای گەورە تەقدیری کردووە کە هیچ شتێ نەپەرستن بێجگە لە ئەو ئیتر هیچ کەسێك کوفری نەدەکردو، هیچ کەسێك لە قەزای کەونی دوا نەدەکەوت، بەڵام خەڵکی لە نێوان دوو کۆمەڵی ئیماندارو کافردا دابەش بوونە، لە نێوان دوو کۆمەڵی هاوەڵپەرست و یەك خواپەرستدا دابەش بوونە، کەواتە ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە مەبەست لە ئایەتەکە قەزای شەرعییە کە هەرکەس بیەوێ بە دەنگیەوە دەچێت و هەر کەسیش بیەوێ سەرپێچی دەکات، پاداشت و سزاش بۆ هەر دوو لایە لە داهاتوو دایە.
بە واتایەکی تر بەڵگە بۆ ئەوەی مەبەست بە ئایەتەکە قەزای کەونییە ئەوەیە کە لە زۆرێك خەڵکدا دەرەنجام و ئاکامی دواکەوتووە، تەماشا دەکەین زۆرێك لە خەڵکی هاوەڵپەرستن، لە کاتێکدا خوای گەورە قەزای کردووە جگە لە ئەو هیچی تر نەپەرسترێت.

(٢)_ ئەگەر مەبەست قەزای کەونی بوایە ئەو شتانەیان نەدەپەرست، بەڵکو تەنها سەرپێچی قەزای شەرعی دەکرێت.

وە خوای تەعالا لەسەر زمانی ئیبراهیم (علیه السلام) کە گفتوگۆ لەگەڵ قەومەکەی دەکات دەفەرمووێ: ﴿قَالَ أَفَرَأَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ (٧٥) أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ (٧٦) فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ(٧٧)﴾[1] [الشعراء: ٧٥_٧٧] واتە: گووتی ئایا ئێوە دەزانن چی دەپەرستن ئێوەو باوو باپیرە پێشووەکانتان جا بە ڕاستی ئەوانە دوژمنی منن جگە لە پەروەردگاری جیهانیان.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾[2] [الممتحنة: ٤] واتە: بە ڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان گووت بە ڕاستی ئێمە بێزارو بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیانپەرستن لە جیاتی خوا ئێمە باوەڕمان نییە بە (ئایینی) ئێوە وە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە پەیدا بوو بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوای تەواو بە خوای تەنیا دەهێنن.

---

(١)_ چونکە قەومەکەی ئیبراهیم _علیه السلام_ هاوەڵیان بۆ خوای گەورە بڕیار دا، کەواتە ئەگەر مەبەست بەو قەزایە قەزای کەونی بوایە سەرپێچییان نەدەکردو هاوەڵپەرستیان نەدەکرد.

(٢)_ ﴿مِن دُونِ اللَّهِ﴾ لە جیاتی خوا، ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئەوان شتانێکی دیکەی جگە لە خوای گەورەیان پەرستووە، ئەگەر قەزای کەونی بوایە شتی دیکەی جگە لە خوای گەورەیان نەدەپەرست، کەوا بوو ئەمە قەزای شەرعیە، چونکە

.......................................................................

.......................................................................

.......................................................................

.......................................................................

ئەگەر قەزای کەونی قەدەری بوایە شتی دیکەیان نەدەپەرست، بەڵکو هەر هەموویان ئیمانیان دەهێنا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾ [يونس:٩٩] واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە بڕوای دەهێنا ئەو (خەڵکەی) وا لە زەویدا هەموو تێکڕا. ئەگەر بیویستایە ویستێکی کەونی قەدەری ئەوا هیچ کەس لەئیمانهێنان دوانەدەکەوت، بەڵام قەزای کردوەو ویستویەتی وەکو شەرع و دین بۆیە کەسانێك گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگار بوون و کەسانێکیش سەرپێچیان کرد.

بۆ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ (١) لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ (٢) وَلاَ أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ (٣) وَلاَ أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ (٤) وَلاَ أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ (٥) لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ(٦)﴾(١) [الكافرون: ١ـ٦] واتە: بلێ: ئەی بێبڕواینە من ئەو (بتان)ەناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن وە ئێوەش ئەو (خوای)ە ناپەرستن کەمن دەیپەرستم وە من ئەو خواپەرستیە ناکەم کە ئێوە دەیکەن وە ئێوەش ئەو خواپەرستییە ناکەن کەمن دەیکەم ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خۆم.

---

(١)ـ ﴿لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ من ئەو بتانە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن، ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە کە کەسانێك هەن شتی تری جگە لە خوای گەورە دەپەرستن، کەسانێکی زۆریش هەن بە تەنها خوای گەورە دەپەرستن، پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە دەپەرستێت وەکو ملکەچ بونێك بۆ فەرمانی شەرعی خوای گەورە، بەڵام کافران شتی تری جگە لە خوای گەورە دەپەرستن، ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە مەبەست بەوشەی ﴿وَقَضَى﴾[الإسراء: ٢٣] قەزای شەرعییە. مانای ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خۆم، ئەوە نییە کە هەموویان هەق بن، من و ئێوەش، وەکو ئەوەی هەندێك لەنووسەران دەیڵێن، ئەوان دەڵێن: هەموو خەڵکی خوا دەپەرستن، هەر یەکێك بە ڕێگەیەکی تایبەتی خۆی، ئەمە لەسەر ڕێگەی جوولەکە خوا پەرستی دەکات و، ئەمە لەسەر ڕێگەی گاوران و، ئەمە لەسەر ڕێگەی فلان...، موسڵمانانیش خوای گەورە دەپەرستن، ئەم جۆرە قسانە دەکەن، قسەکانیشیان لە وەك و قسەی مولحیدەکانە کە دەیانگوت: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ نَحْنُ وَلاَ آبَاؤُنَا﴾[النحل: ٣٥] واتە: وە ئەوانەی هاوبەشیان داناوە بۆ خوا دەڵێن ئەگەر خوا بیویستایە بێجگە ئەو (خوا) هیچ شتێکمان نەدەپەرست نە ئێمە و نە باو و باپیرانمان. لە نێوان ئایینی موسڵمانان و ئایینی کافراندا جیاوازیەکی زۆر هەیە، ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خۆم، ئەم مانایە نابەخشێت: من لە دینەکەتان ڕازیم و، دان بەو دینەدا دەنێم بۆ ئەوەی بکەن بە دینی خۆتان، بەڵام مانای بەریبوونی خۆی لەو دینە بە دەر دەخات، ئەمەیە ماناکەی، خۆشی لێبەری کرد چونکە ئایینێکی پووچ و باتڵ و کوفرە.

ئەمە گوفتارێکە بەریبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دینەکەیان پێویست دەکات و ئاشکرا دەکات، وە ڕازی نەبوونیی بەدینەکەیان ڕوون دەکاتەوە[1]، چونکە خوای گەورە لەئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَذَّبُوكَ فَقُلْ لِي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنْتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ﴾[2] [يونس: ٤١] واتە: ئەگەر بڕوایان پێی نەهێنای ئەوە پێیان بڵێ (پاداشتی) کردەوەی خۆم بۆ خۆم و(پاداشتی) کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان ئێوە بەرین (بەرپرسیار نین) لەوەی من دەیکەم منیش بەریم (بەرپرسیارنیم) لەوەی ئێوە دەیکەن.

---

(١)_ ڕازیبوونی بەئایینەکەیان بریتیە لەوەی بڵێت: هەموومان خوا دەپەرستین ئەگەرچی چەندین ئایینیشمان هەبێت، ئەوان دەڵێن: ئەگەرچی ڕێبازەکانیش جۆر بە جۆرو زۆر بن بەڵام هەمووان خواپەرستی دەکەن، بەڵام دڵنیابن خواپەرستی ناکرێت تەنها بەوەنەبێت کە خوای گەورە بەشەرعی داناوە، نەك بەو جۆرە خواپەرستیەی کە خەڵك بە هەوا و ئارەزوواتی خۆیان دەیکەن، بەڵکو خواپەرستی بەو جۆرە دەکرێت کە خوای گەورە بەشەرعی داناوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، دڵنیابن هیچ ڕێگەیەکی تر نییە بۆ بەخوا گەیشتن جگە لە ڕێگەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٢)_ ئەم ئایەتە تەفسیرە بۆ ئایەتی ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾[الكافرون: ٦] واتە: ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خۆم، کەواتە مانای ئایەتەکەی سورەتی (الكافرون) بەریبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەر دەخات لە ئایینی کافران نەك دان بەئایینەکەیاندا بنێت و، گوایە ئایینێکی هەقەو، هەموومان خواپەرستی دەکەین ئەگەر چی ڕێگەکانیشمان جیاواز بێت، ئەمە قسەیەکی پووچە.

وە هەر کەسێك لە مولحیدەکان وابزانێت ئەم ئایەتە ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ واتـە: ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خـۆم. ڕازیبونێکە لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ بە ئایینی کافران، بێگومان درۆزنترین و کافرترین کەسی نێو خەڵکە[1]، ئـەویش وەکو ئەو کەسەیە کـە لـەو باوەڕەدایـە فەرمایشـتی خـوای گـەورە کـە دەفـەرموێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ﴾[الإسراء: ٢٣] مانای قەدەر دەگەیەنێت و، خوای گـەورە قـەزاو بڕیـاری هەر شتێکی دابێت بەدڵنیایی ڕوودەدات، بەو پێیەش بتپەرستانی وادانـاوە کـە تـەنها خوایـان پەرستووە، بێگومـان ئـەم جـۆرە کەسـە کـافرترین کەسـی نێـو خەڵکـە بـە کتێبەکانی خوای گەورە .

---

(١)_ هەر کەس لەو باوەڕە دابێت ئەوە ڕازیبونێکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بـە دینی کافران بێگومان یەکێکە لـە درۆزنتریـن کـەس بـە دەم خـواو پێغەمبـەرەوە ﷺ چونکە هـەرگیز پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە دینـی کـافران ڕازی نـەبووە. تەنانـەت هـیچ کەسێك لە موسڵمانانیش بە دینی کافران ڕازی نابێت.

## ناردنی (بەعثی) کەونی و بەعثی شەرعی

بە نسبەت لەفزی بەعث: خوای گەورە لە بەعثی کەونیدا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ أُولاهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَا أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُواْ خِلاَلَ الدِّيَارِ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولاً﴾(1) [الإسراء: ٥].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوّاً كَبِيراً﴾[الإسراء: ٤] واتە: بەنی ئیسرائیلیەکانمان ئاگادار کردو هەواڵمان پێدان لە نامەکەیاندا کە سوێند بەخوا ئێوە خراپە کاری دەکەن لە زەویدا دوو جار و بێگومان بەرز دەبنەوە و زاڵ دەبن (بەسەر خەڵکیدا) بە بەرز بونەوەیەکی زۆر گەورە. ﴿وَقَضَيْنَا﴾ واتە هەواڵمان پێدان، چونکە وشەی (القَضاء) جار بە جارێ بەکاردێت مانای هەواڵ پێدان دەبەخشێت، ﴿وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرائِيلَ﴾ واتە: هەواڵمان بەئیسرائیلیەکاندا، ﴿لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ﴾ کە سوێند بەخوا ئێوە لە زەویدا دوو جار خراپەکاری دەکەن، خراپەکاریش لە زەویدا واتە: خراپ کردن بەهۆی بە کوفرو گوناە و تاوان و هاوەڵپەرستی. بەڵام بە چ شتێك چاك دەکرێتەوە؟ بە تاعەت و گوێڕایەڵی و خواپەرستی، چونکە سەر زەمین بۆ هیچ شتێك ناشێت مەگەر بۆ گوێڕایەڵی و خواپەرستی. بەڵام کوفر کردن بە خوای گەورە بریتیە لە خراپ کردنی سەر زەمین، بۆیە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلا تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاحِها﴾[الأعراف: ٥٦] واتە: خراپەکاری مەکەن لە زەویدا پاش ئەوەی کە خوا چاکی کردووە. هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾[البقرة: ١١] واتە: وە کاتێك پێیان بووترایە ئاشوب مەنێنەوە لە زەویدا _ ئاژاوە بەرپا مەکەن تیایدا دەیانگوت: ئێمە هەر چاکە کارین (ڕێکخەرین). خراپە کاری لەسەر زەمیندا بریتیە لە دوو ڕووی و کوفرو گوناە و تاوان. بەڵام گوێڕایەڵی و خواپەرستی بریتیە لە چاکە کاریی لەسەر زەمیندا.

--------------------------------

--------------------------------

--------------------------------

﴿لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ﴾ كە سوێند بەخوا ئێوە لە زەویدا دوو جار خراپەکاری دەکەن، بە کوفر کردن و گوناه و تاوانکردن، ﴿مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوّاً كَبِيراً﴾ بێگومان بەرزدەبنەوەو بەسەر خەڵکیداو زاڵ دەبن بە بەرزبونەوەیەکی زۆر گەورە، لوت بەرزی و خۆ بەزل زانین و لە خۆبای بوون دەنوێنن، ئەو کاتە خوای گەورە لە هەر دوو جارەکەدا سزایان دەدات، خوای گەورە لە هەر جارێکیاندا لەسەر خراپەکاریەکانیان و لەسەر خۆبەزلزانین و لەسنوور دەرچونەکەیان سزایان دەدات. پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاء وَعْدُ أُولاهُمَا﴾ جا کاتێ یەکەمین بەڵێن لەو دوو بەڵێنانە هات کە بەڵێنتان پێدراوە، جاری یەکەم کە خراپەکاریتان کرد، ﴿بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ﴾ دەینێرینە سەرتان، ئەمەیە شوێنی مەبەستی قسەکانمان ﴿عِبَاداً لَّنَا أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾ چەند بەندەیەکی خۆمان کە خاوەنی دەست وەشاندنێکی بەتینن لە کاتی جەنگدا، بەارمبەر کافران، چونکە پێشتر ئاماژەی پێدرا کە هەموان بەندەی خوان، ئیمانداران و کافران، بەندایەتیەکی گشتی، هەمووان بەندەی خوان، لە چوار چێوەی قەدەرو چارەنووس و چارەسازیی خوای گەورە ناچنە دەرەوە، هەمووان بەندەن، بەندایە یەتێکی ناچاری کە بۆ هەموو ئیمانداران و کافران گشتییە. بەڵام بەندایەتی کردنێك و بە ئیختیار و بە ئارەزووی خۆی تەنها تایبەت بە ئیماندارانەوە، بەڵام بەندایەتی ناچاری بۆ هەمووان گشتییە ئیمانداران و کافران، لەو بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ إِلاَّ آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً﴾ [مریم: ٩٣] واتە: هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان بە بەندەیی دێنە لای خوای میهرەبان (هیچ کەسێ لەوانە نیە بەندەی خوای میهرەبان نەبێ). کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عِبَاداً لَّنَا﴾ بەندەیەکی خۆمان، واتە لەکافران، خوای گەورە کافران بەسەر ئیمانداراندا زاڵ دەکات، تەماشاکەن خوای گەورە کافران

بەسەر ئیمانداراندا زاڵ دەکات بەهۆی ئەو تاوان و سەرپێچیانەوە کە ئەنجامی دەدەن، ﴿بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَا﴾ دەینێرینە سەرتان چەند بەندەیەکی خۆمان، واتە: لە کافران،﴿أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾ کە خاوەنی دەست وەشاندنێکی بەتینن لە جەنگدا ئەو کافرانە خاوەن هێزو کەرەستەو زەبرو زەنگ نواندنێکی زۆرن، ﴿فَجَاسُواْ خِلاَلَ الدِّيَارِ﴾ ئینجا ئەوانە بەنێو وڵاتەکەتاندا دەگەڕێن، خراپەکاری لە وڵاتەکەتاندا دەنێنەوە، دەچنە نێو ماڵەکانتانەوە، ماڵ و سەروەت و سامانتان بە تاڵای دەبەن، ﴿فَجَاسُواْ خِلاَلَ الدِّيَارِ﴾ ئینجا ئەوانە بەنێو وڵاتەکەتاندا دەگەڕێن، بەهۆی ئەو خراپەکاریەی کە خۆتان هۆکاری بوون، ﴿وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولاً﴾ وە ئەوە بەڵێنێکی بەدیهێنراوبوو، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ الْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَاكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا (٦) إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الْآخِرَةِ لِيَسُوؤُواْ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُواْ الْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا مَا عَلَوْا تَتْبِيرًا (٧) عَسَى رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا(٨)﴾ [الإسراء: ٦ـ٨]واتە: لە پاشان جارێکی تر ئێوە بەسەریاندا زاڵ دەکەینەوە، دوای ئەوە ئەگەر ئیسرائیلیەکان تەوبەیان کردو، لەسەر ڕێی ڕاست سەقامگیر بوون پاش ئەو بەڵاو نسکۆیەو، هەڵەکانی خۆیان زانی و کاروباری خۆیان چاککردەوە، خوای گەورەش ڕێزیان بۆ دەگەڕێنێتەوەو، کافران لە وڵاتی خۆیان دەکەنە دەرەوەو، خوای گەورە جارێکی تر بەسەر ئەو کافرانەدا کە لە بەیتولمەقدیسدا غەزایان کردن زاڵیان دەکاتەوە، ئەگەر تەوبەتان کردو، خۆتان چاک کردەوە، خوای گەورە ڕێزەکەی خۆتانتان بۆ دەگەڕێنێتەوەو، بەسەر دوژمنەکانی خۆتاندا سەرتان دەخات و، لەوەڵاتی خۆتان دەیانکەنە دەرەوە. وە دارایی و کوڕی زۆرتان پێدەبەخشین ﴿وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا﴾ وە لەشکرو نەفەرتان (لە جاری پێشوو)

---------------------------------------------------

زۆرتر دەکەین ئەگەر ئێوە چاکەبکەن ئەوا چاکە بۆ خۆتان دەکەن وە ئەگەر خراپەش بکەن ئەوا (سزاکەی) هەر بۆ خۆتانە جا کاتێ بەڵێنی (سزاو تۆڵەی) دووهەم هات، چونکە پێشتر خوای گەورە فەرمووی: کە سوێند بەخوا ئێوە لە زەویدا دوو جار خراپەکاری دەکەن، جاری یەکەم ڕابوردو، ئەمەش جاری دووەمە، ئەگەر جاری دووەم سەرپێچیتان کردو، لەسەر زەویدا خراپەکاریتان کرد، ئەوا خوای گەورە سزاکەتان بۆ دووبارە دەکاتەوە، جارێکی تر دوژمنتان بۆ دەگەڕێنێتەوە، بۆ ئەوەی پەژارە و خەفەت بە ڕوخسارتانەوە دەرکەوێ، ئەو دوژمنانە بەشکستی ناخۆش و خراپ ڕووتان ڕەش دەکەن وە بۆ ئەوەی بچنەوە ناو مزگەوتی قودس، مزگەوتی ئەقصا هەرچۆنێ لە جاری یەکەمدا چوونە ناویەوە، وە بۆ ئەوەی وێرانی بکەن بەوێرانکردنێکی گەورە، هەڵدەستن بە لە ناوبردن و خراپ کردنی هەر شتێکی ئیسرائیلیەکان کە توانایان بەسەریدا هەبێت لە ماڵ و سامان و خانوو بەروبومیان، بە تەواوی لە ناوی دەبەن بە هۆی خراپەکاریەکانی خۆتانەوە ئومێد وایە پەروەردگارتان ڕەحمتان پێبکات (ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا) ئەگەر بگەڕێنەوە (بۆ سەر تاوان) ئێمەش دەگەڕێینەوە (بۆ سزادانتان)، بەڵام جارێکی تریش بۆ تاوان و خراپەکاری گەڕانەوە، بۆیە خوای گەورە ئەمجارەیان پێغەمبەری خوای ﷺ بەسەردا زاڵ کردن، خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی بەسەریاندا سەرخست و، لە غەزاکانی بەنو قەینوقاع و، بەنی نەضیرو، بەنی قورەیضەدا کوشتنی و، لە نیمچە دورگەی عەرەب کرانە دەرەوە، جیابونەوەو تەفرو تونا بوون. هەر کات ئیسرائیلیەکان خراپەیان بەرپا کرد بێت خوای گەورە دوژمنی بەسەردا زاڵ کردوون.

وێنەی بەعثی شەرعیش لە قورئاندا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ [الجمعة: ٢] واتە: خوا ئەو زاتەیە کە لە ناو نەخوێندەوارانـدا (عەرەبەکانـدا) ناردوویـەتی پێغەمبـەرێك لـە خۆیـان خـوا دەخوێنێتـەوە بەسـەریاندا نیشانەکانی پاکیان دەکاتەوە وە قورئان و فەرموودەی (پڕسوود)یان فێر دەکات هەر چەند ئەوان لە پێشدا لە گومڕایەکی ئاشکرا دا بوون.

هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[1] [النحل: ٣٦] واتە: سوێند بەخوا لەناو هەموو گەل و ئومەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خواپەرستن و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر.

---

(١)_ ناردنی پێغەمبـەران نـاردنێکی خـەیری دینیـە، بـەڵام نـاردن و زاڵ کردنـی زۆرداران و لە سنور دەرچووان ناردنێکی کەونییە وەکو سزایەك، بەڵام ناردن و بەعثی دینی نیعمەت و بەهرەو ڕەحمەتێکە لە لایەن خـوای گـەورەوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا)) واتـە: ((بەڕاستی خوای گەورە لە سـەرەتای هـەر سـەد ساڵێکدا بـۆ ئـەم ئوممەتـە کەسێك دەنێرێت کە ئایینەکـەیان بـۆ نوێبکاتـەوە _ بـەکارپێکردنی سـووننەت و سەرخستنی کارپێکارانی و نەهێشتنی بیدعەو سەرشۆڕکردنی شوێنکەوتوانی)) نـاردنی ئـەو کەسـە بەعـث و ناردنی دینی شەرعیە.

## (الإرسال)ی كەونی و (الإرسال)ی شەرعی

بەلام واژەی (الإرسال)و ناردن: خوای گەورە لە بارەی (الإرسال)ی كەونیەوە دەفەرمویت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾[1] [مريم: ٨٣] واتە: ئایا نەتدیوە (سەرنجت نەداوە) كە بێگومان ئێمە شەیتانەكانمان زاڵ كردووە بەسەر بێباوەڕاندا چاك هانیان دەدەن (بۆ كوفرو تاوان).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ﴾[2] [الفرقان: ٤٨].

---

(١)_ ﴿أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ﴾ ئەمە (الإرسال)ی كەونیە، (الإرسال)و ناردنێكی شەرعی نیە، ناردنی شەرعی (الإرسال)و ناردنی پێغەمبەرانە، بەلام ناردنی شەیتانەكان كەونی قەدەریە، خوای گەورە شەیتانەكان بەسەر كافراندا زاڵ دەكات، ﴿تَؤُزُّهُمْ﴾ پاڵیان پێوە دەنێت بۆ كوفرو شیرك ﴿أَزًّا﴾ وەكو سزایەك بۆ ئەوان.

(٢)_ ئەمە (الإرسال) و ناردنێكی كەونی قەدەرییە كە خوای گەورە بایەكان دەنێرێت لە نێوان هەورەكاندا چونكە با هەیە هەورەكان دەورووژێنێت، با هەیە هەورەكان كۆدەكاتەوەو پێكیان دەهێنێت، با هەیە هەورەكان بڵاوە پێ دەكات، با هەیە هەورەكان چاك دەكات، با هەیە هەورەكان هەڵ دەگرێت و دەیانجوڵێنێت، بۆیە خوای گەورە وشەی (رياح) واتە: بایەكانی بەكارهێناوە، چونكە چەندەها با هەیە نەك یەك با. هەروەها بای فەوتێنەر هەیە، بای ڕەحمەت و بای سزاش ﴿وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ﴾ وە خوا ئەو زاتەیە كە بایەكان دەنێرێت، بەناردن و (الإرسال)ێكی كەونی قەدەری.

وە لەبارەی (الإرسال)و ناردنی شەرعی (دینی)یەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾[1] [الأحزاب: ٤٥] واتە ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بێگومان ئێمە تۆمان ناردووە (بۆ خەڵکی) بەشایەت و مژدەدەرو ترسێنەر.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ﴾[2] [نوح: ١] واتە: بێگومان ئێمە نووحمان نارد بۆ لای هۆزەکەی.

---

(١)_ (الإرسال)و ناردنی دینی بریتیە لە(الإرسال)و ناردنی پێغەمبەران لەوانەش پێغەمبەرمان موحەممەدە ﷺ، ئەمە (الإرسال)و ناردنێکی دینیە کە ڕەحمەت و بەزەییەکە بۆ هەموو ئوممەت و جیهان. بەڵام (الإرسال)و ناردنی کەونی تۆڵە سەندنەوەیە.

(٢)_ ئەمە (الإرسال)و ناردنێکی دینیە، چونکە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلاَّ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ﴾[الأنعام: ٤٨] واتە: وە نێرراوەکانمان نەناردووە مەگەر بەمژدەدەرو ترسێنەر.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا﴾[1] [المزمل: ١٥] واتە: بێگومان ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن کە شایەتە لەسەرتان هەر وەك پێغەمبەرێکمان نارد بۆ فیرعەون.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ﴾[2] [الحج: ٧٥] واتە: خوا لە فریشتەکان نێردراو هەڵدەبژێرێت هەروەها لە خەڵکیشدا.

---

(١)_ خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردین کە موحەممەدە ﷺ وەکو چۆن بۆ فیرعەونیش پێغەمبەرێکی نارد کە مووسا بوو _علیه السلام_ پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا﴾[المزمل: ١٦] واتە: ئینجا فیرعەون سەرپێچی ئەو پێغەمبەرەی کرد ئێمەش تۆڵەمان لێسەند بە تۆڵە سەندنێکی سەخت. خوای گەورە بەو ئایەتە ئێمەش ئاگادار دەکاتەوە کە سەرپێچی پێغەمبەرەکەمان ﷺ نەکەین ئەگینا خوای گەورە وەکو ئەوان تۆڵەمان لێدەسێنێت.

(٢)_ نێرراوان دوو بەشن، نێرراوانێك لە فریشتە کە نێرراوێکی فریشتەییە، وە نێرراوانێك لە ئادەمیزاد، کەوا بوو خوای گەورە نێرراوان لە فریشتە و لە خەڵکیش هەڵ دەبژێرێت.

# پێ سپاردنی(الجَعْل)ی کەونی و شەرعی

خـوای گـەورە سـەبارەت بـە لـە (الجَعْل) ی کەونیـدا دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ﴾[1] [القصص: ٤١] واتە: ئەوانمان کردە پێشەوایانێك کە (خەڵك) بانگ دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ.

وە لە (الجَعْل)ی شەرعیدا دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾[المائدة: ٤٨] واتە: دامان ناوە بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە شەریعەت و ڕێگەیەکی ڕوون.

هەروەها خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿مَا جَعَلَ اللّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ﴾[2] [المائدة: ١٠٣] واتە ﴿مَا جَعَلَ اللّهُ﴾ خـوا دانەنـاوە و بڕیـاری نـەداوە (لێرە (ئـەجعل)ە مەبەسـتی (جعـل)ی شـەرعیی یـە (سـوود وەرنـەگرتن لـەم چـوار جـۆرە وشترە):ـ لە بەحیرە (ووشترێك بوو پێنج سکی بکردایەو پێنجەم نێر بوایە، ئەو کاتە گوێیچکەیان لەت دەکردو بەرەڵڵایان دەکرد) ﴿وَلاَ سَآئِبَةٍ﴾ و سائیبە (ووشترێك بوو کە (دە) تـا (دوانـزە) سـکی بکردایـە و هـەموو مێینـە بوایـە) ﴿وَلاَ وَصِيلَةٍ﴾ وە وەصیلە: (ووشترێك بوو یەکەم و دووەم سکی مێیینە بوایە) ﴿وَلاَ حَامٍ﴾ و حام: (ووشترێکی نێر بوو کە لە پشتی ئەو (دە) سك پەیدا ببوایە).

---

(١)_ کافرانی قەومی فیرعەونمان کردە پێشەوایانێك کە خەڵکی بـۆ ئـاگری دۆزەخ بـانگ دەکـەن، پاشـان خـوای گـەورە لەهـەمان ئایەتـدا دەفـەرموێ: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَ يُنصَرُونَ﴾ وە لـە ڕۆژی دوایيشـدا یارمـەتی نـادرێن. ﴿وَجَعَلْنَا﴾ ئەمـە (الجَعْل)ی کـەونی قەدەرییە، واتای: کردومانن دەگەیەنێت.

(٢)_ خوای گـەورە بڕیـاری لـە سـەر بـەحیرەو سـائیبەو وەصـیلەو حـام نـەداوە، ئەمانە چەند جۆرێك بوون هاوەڵپەرستان لە ئاژەڵە وشترەکانی خۆیاندا بـۆ بتـەکانیان دادەنا، بەحیرە: بریتیی بوو لەو ئاژەڵەی کە گوێکانیان دەبڕی وەکو نیشانەیەك کە بۆ

بتەکانیان تایبەت کرا بوو، سائیبە: بریتی بوو لەو وشترەی کە باری لێ نەدەنرا ئەگەر بگەشتایە بە تەمەنێکی دیاری کراو و چەند سکێکی دیاری کراوی بکرد با، ئیتر سواری نەدەبوون و نەدەدۆشرا و بۆ بتەکان دادەنرا، وصیلە: ئەگەر بەردەوام چەند سکێکی دیاری بکراوی بکردایە تایبەت دەکرا بەبتەکانەوە، حام: نێرەی وشترێك بوو ئەگەر ژمارەیەك وشتری مێینەی کەڵب دایە ئیتر وازی لێدەهێنرا بۆ بتەکانیان، ئەمە جۆرە هاوەڵپەرستان بوو کە فەرمانی خوای گەورەی لەسەر نەبوو، خۆیان ئەو شتانەیان دانا بوو، حەلاڵەکانیان لە خۆیان حەرام کرد بوو، شاهێدی قسەکانمان ئەو وشەیە لە رستە قورئانیەکە کەوفەرموێ: گوفتاری خوای گەورەیە ﴿مَا جَعَلَ﴾ واتە ئەوانەی بە شەرع دانەناوە بەڵکو لە ڕاستیدا تایبەت بوو بە کافرەکان خۆیانەوە.

## (التحريم)ی كەونی و (التحريم)ی دینی

سەبارەت بە دەستەواژەی (التحريم): لە بارەی (التحريم)ی کەونیەوە خوا عزوجل دەفەرمویّ: ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ﴾[1] [القصص: ١٢] واتـە: وە ئێمە پێشتر (شیری) شیردەرەکانمان حەرام کرد لە مووسا (مەمکی کەسیانی نەدەمژی).

هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرمویّ: ﴿قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الأَرْضِ﴾[2] [المائدة: ٢٦] واتە: (خوا) فەرمووی بە ڕاستی ئەو (خاکە پیرۆزە) قەدەغە کراوە لەسەریان ماوەی چل ساڵ بەسەرگەردانی دەخولێنەوە بەسەر زەویدا.

---

(١)_ ﴿وَحَرَّمْنَا﴾ واتە: قەدەغەمان کرد، خوای گەورە لـەوەی قەدەغـەی کرد بوو مووسا شیری هیچ ژنێك بخوات، بۆ؟ بۆ ئەوەی بۆ دایکی بیگەڕێنیتـەوە، مـەمکی هیچ ژنێکی نەمژی و ترسان لەوەی بفەوتێت چونکە خوای گەورە ئەوەی لـیّ قەدەغە کرد بوو بۆ ئەوەی بۆ دایکی بیگەڕێنێتەوەو، تا چاوی پێی ڕوون بێتەوەو خەفەت نەخوات، ئەم قەدەغە کردنە (کەونییە) ئەگینا شیردان بە منداڵ لە شەرعدا حەڵاڵە بەڵام خوای گەورە قەدەغەی کرد قەدەغەکردنێکی (کەونی) قەدەری.

(٢)_ کـاتیّ بـەنی ئیسـرائیل قایـل نـەبوون بچـنە نێـو بەیتولمەقدیسـەوە چونکە خـەڵکێکی زۆرداری سـتەمکاری تێـدا بـوو، ئـەوانیش ترسـنۆك بـوون و توانـای ڕوو بەڕووبونەوەی ئەوانیان نەبوو، بە مووسایان گوت: ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾[المائدة: ٢٤] واتە: کەواتە برۆ خۆت و پەروەردگارت لـە دژیـان جـەنگ بکەن بێگومان ئێمە لێرە دانیشتووین. ئەویش وەڵامی دانـەوەو، فـەرمووی: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي لا أَمْلِكُ إِلاَّ نَفْسِي وَأَخِي فَافْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾[المائدة: ٢٥] واتـە: (مووسـا) گوتی ئەی پەروەردگارم بە ڕاستی من خاوەنی هیچ کەس نیم بێجگە لە خۆم و براکەم نەبێت کەواتە جیایی بخەرە نێوان ئێمەو ئەو گەلەی کە لە سنووری تۆ

دەرچوون. خوای گەورەش سزای خۆی بۆ دابەزاندن و، فەرمووی: ﴿فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ﴾ بە ڕاستی ئەو خاکە پیرۆزە قەدەغە کراوە لەسەریان، واتە: لە چوونە نێوی ﴿أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الأَرْضِ﴾ ماوەی چل ساڵ بەسەرگەردانی دەخولێنەوە بەسەر زەویدا، ناچنە ماڵ و ئاوەدانی بەڵکو لە دەشتەکاندا دەمێننەوە، سەرگەردان دەبن و، دێن و دەچن وەکو سزایەك بۆ ئەوان تاوەکو خوای گەورە نەوەیەکی نوێی لەئەوان خولقاند، ئازاو چاو نەترس، چوونە نێو بەیتولمەقدیسەوەو هاوەڵپەرستانیان دەرکردو و دووریان خستنەوە، شاهێد قسەکانمان لێرەدا ئەو گوفتارەی خوای گەورەیە ﴿فَإِنَّهَا﴾ واتە: بەیتولمەقدیس ﴿مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ﴾ چل ساڵ قەدەغەیان لێکرا بوو بچنە نێوی کاتێك قایل نەبوون لە گەڵ پێغەمبەرەکەیاندا بچنە بەیتولمەقدیسەوە، خوای گەورە سزای دان، بەڵام پاشان ڕەحمی پێکردن و گەزۆو شێلاقەی پێدان و، پەڵە هەورێکی بۆ ناردن کە سێبەری بۆ دەکردن و، لە تیشکی هەتاو دەیپاراستن، ئەوەش ڕەحمەت و بەزەییەك بوو لە خوای گەورەوە بۆ ئەوان.

له(التحريم)ی شهرعیدا دینیشدا خوای گهوره دهفهرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ﴾[1] [المائدة: ٣].

ههروهها خوای گهوره دهفهرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ﴾[2] واته: قهدهغه کراوه لهسهرتان (ماره کردنی) دایکانتان و کچهکانتان و خوشکهکانتان و پورهکانتان (که خوشکی باوکتانن) و پورهکانتان (که خوشکی دیکتانن) و کچانی برا و کچانی خوشك.

---

(١)_ ئهمه (التحريم)ێکی دینی شهرعیه، نهوهك قهدهری کهونی، ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ﴾ گۆشتی مردارهوهبووتان لهسهر یاساغ کراوه، واته خواردنی گۆشتی مردارهوه بوو، ﴿وَالْدَّمُ﴾ وه خوێنی ڕژاو ﴿وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ﴾ گۆشتی بهراز که ئهو ئاژهڵه پیسه ناسراوهیه، ﴿وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ﴾ وه ئهو ئاژهڵهی له کاتی سهر بڕیندا ناوی غهیری خوای لێ بڕا بێ.

(٢)_ حڕام کراوه وهکو شهرع و دین که ئهو کهسه نزیکانه ماره بکرێت.

## (الكلمات)ی کەونی و (الكلمات)ی دینی

سەبارەت بە واژەی (الكلمات): خوای گەورە لەکەونیدا دەفەرموێت: ﴿وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ﴾[1] [التحريم: ١٢].

وە سەبارەت بە (الكلمات)ی شەرعی لە فەرموودەی ((صحيح))[2] داهاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، وَمِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ، وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَنْ يَحْضُرُونِ)) داود(٣٨٩٣)، والترمذي(٣٥٢٨)، وأحمد(١٨١/٢)، واتە: ((پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە لە شەڕو خراپەی دروست کراوەکانی، وە خەشم و سزای، وە لە خراپەی بەندەکانی، وە لە پێنی شەیتانەکان، وە لەو کاتانەی کە لە ژیاندام دێنە لام بۆ گومڕاکردنم یان کاتێ لە سەرە مەرگدا دێنە لام)).

---

(١)_ (الكلمات)ی خوای گەورە دوو بەشە، (الكلمات)ی کەونی کە خوای گەورە چارەسازیی شتەکانی پێدەکات و، فەرمانی پێدەکات، (الكلمات)ی شەرعی: خوای گەورە بۆ بەندەکانی ئەوانەی پێدەکاتە شەرع کە چاکیان بکاتەوە، ئەوانەی کە لە خۆی زیاتر نزیکیان دەکاتەوە، ئەوە لە قورئان و سوونەتیشدا هاتووە، لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ئایەتە هاتووە کە خوای گەورە باسی مەریەمی کچی عیمران دەکات کە باوەڕی هێنابوو بە فەرمان کەونیەکانی خوای گەورە، ئیمانی بە قەزاو قەدەر هێنا بوو، ئیمانی بەکتێبە شەرعیەکانی خوای گەورە هێنابوو کە (الكلمات)ی شەرعی خوای گەورەیە، مەریەم ئیمانی بە _ (الكلمات)ی کەونی و (الكلمات)ی شەرعی خوای گەورە هێنا بوو، ئیماندارێش پێویستە بەو جۆرە بێت کە بڕوا بە (الكلمات)ی کەونی و بڕوا بە (الكلمات)ی شەرعیش بێنێت، نەک تەنها (الكلمات)ی کەونی وەرگرێت و، شەرعیەکە پشتگوێ بخات یان تەنها (الكلمات)ی شەرعی وەرگرێت و کەونی پشتگوێ بخات.

(٢)_ قوله: ((وثبت في الصحيح)) وهم من الشيخ رحمه الله تعالى فليس هذا الحديث في الصحيح، وإنما هو في سنن أبي من طريق محمد بن إسحاق، عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده مرفوعاً.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمووێ: ((مَنْ نَزَلَ مَنزِلاً ثُمَّ قالَ: أَعُوذُ بِكَلِماتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنزِلِهِ ذَلِكَ))[1] صحيح: أخرجه مسلم(٢٧٠٨)، واتە ((ئەگەر کەسێك لە جێگەیەکدا مایەوەو، پاشان گووتی: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە خراپەی دروست کراوەکانی، ئیتر هیچ شتێك زیانی پێی ناگەیەنێت تاوەکو ئەو جێگەیە بەجێدێڵێت)).

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((أعوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التامَّاتِ، الَّتي لا يُجاوِزُهُنَّ بَرٌّ ولا فاجِرٌ، مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ وذَرَأَ وبَرَأَ ومِنْ شَرِّ ما يَنزِلُ مِنَ السَّماءِ ومَا يَعْرُجُ فِيها، ومِنْ شَرِّ ما ذَرَأَ في الأرضِ، ومِنْ شَرِّ ما يَخْرُجُ مِنْها، ومِنْ شَرِّ فِتَنِ اللَّيْلِ والنَّهارِ، ومِنْ شَرِّ كُلِّ طارِقٍ، إلاَّ طارِقاً يَطْرُقُ بِخَيْرٍ يا رَحْمن))[2] واتە ((پەنادەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا، کە چاکەکارو خراپەکار ناتوانن بیبەزێنن، لەشەڕو خراپەی ئەوەی دروست کراوەو دێت و دەچێت، لە خراپەی ئەوەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێ و خراپەی ئەوەی سەر دەکەوێ بۆی، لە خراپەی ئەوەی کە لە زەویدا دەڕواو ئەوەی لێوەی دەردێت، لە خراپەی ئاشووبی شەوو ڕۆژ، لە خراپەی هەموو لێدەرێکی دەرگا بە شەوو مەگەر لێدەرێك کە بەخێر لێ بدات ئەی خوای بە بەزەیی)).

---

(١)_ من حديث خولة بنت حكيم السلمية رضي الله عنها عن النبي ﷺ.

(٢)_ فەرموودەکانی یەکەم و دووەم: ((أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)) و ((أَعُوذُ بِكَلِماتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)) ئەمە (الكلمات)ی شەرعی خوای گەورەیە، بەلام فەرموودەی سێیەم: ((أعوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التامَّاتِ، الَّتِي لا يُجاوِزُهُنَّ بَرٌّ ولا فاجِرٌ، مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ)) ئەمە مەبەست تێیدا (الكلمات)ی کەونی خوای گەورەیە، چونکە (الكلمات)ی کەونی هەر هەموو مەخلوقات دەگرێتەوە ئیماندار بێت یان کافر، (الكلمات)ی کەونی خوای گەورەی بەسەر هەمواندا جێبەجێ دەبێت، هیچ یەکێك لەوە قوتاری نابێت، قەزاو قەدەرە، بەلام (الكلمات)ی شەرعی خوای گەورە تەنها ئیمانداران پێوەی پەیوەند دەبن، بەلام ئەهلی کوفر پشتگوێی دەخەن و، کاری پێناکەن، ئەم فەرموودانە پێغەمبەرانی خوا ﷺ (الكلمات)ی کەونی و (الكلمات)ی شەرعی خوای گەورە لە خۆ دەگرێت.

ئەوە ئەو ڕشتە تەواوەکانی خوای گەورە کە چاکە کار و خراپە کار ناتوانن بیبەزێنن بریتیە لەوەی کە هەر هەموو بوونەوەری پێی خولقاندووە، ئیتر هیچ چاکە کارێك و خراپەکارێك لە بەدی هێنان و ویست و تواناو قودرەتی خوای گەورە بەدەر نابێت .

بەلام (الكلمات)ە دینیەکانی خوای گەورە، بریتین لە کتێبە دابەزێنراوەکانی، فەرمان و قەدەغە کردنەکانی خوای گەورەی تێدایە، ئەوەبوو چاکە کاران گوێڕایەڵی بوون و، خراپەکارانیش سەرپێچیان کرد[1].

وە ئەولیاو دۆستە تەقواکارو پارێزکارەکانی خوای گەورە بریتین لەوانەی کە گوێڕایەڵی (الكلمات)[2]، (جَعْلْ)، (الإذن)، (الإرادة)ە دینیە شەرعیەکانی خوای گەورە دەبن.

---

(١)_ ئا ئەمە بوو جیاوازی نێوان (الكلمات)ی کەونی و (الكلمات)ی شەرعی خوای گەورە، (الكلمات)ی کەونی هیچ یەکێکی لێبەدەر نابێت، هەمووان دەگرێتەوە کافرو ئیماندار، بەلام (الكلمات)ی شەرعی خراپەکاران و کافران سەرپێچی دەکەن و ئیماندارانیش گوێڕایەڵی دەبن.

(٢)_ هەروەها ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە گوێڕایەڵی (الكلمات)ە دینیە شەرعیەکانی خوای گەورە دەبن، بەلام دوژمنانی خوای گەورە سەرپێچی (الكلمات)ە دینیە شەرعیەکانی خوای گەورە دەکەن، بۆیە کاتێ ئیبلیس فەرمانی سوجدەبردنی پێدرا سەرپێچی کرد، ئا بەم جۆرەیە فەرمانی دینی شەرعی، بەلام ئەگەر فەرمانێکی کەونی قەدەری بوایە توانای سەرپێچی کردنی نەبوو.

وه (الكلمات)ه كەونیەكانی خوای گەورە كە چاكەكاران و خراپەكاران ناتوانن بیبەزێنن، بریتین لەوەی كە هەر هەموو مەخلوقات تەنانەت ئیبلیس و سەربازانی، وە هەر هەموو كافران، وە تێكڕای ئەوانەش كە دەچنە ئاگرەوە لەژێریدا كۆدەبنەوە.

وه ئەگەرچی خەڵكی لەبەر بەركەوتنی خوڵقاندن و ویست و تواناو قەدەری خوای گەورەدا یەكن، بەڵام لە فەرمان و قەدەغە كردن و خۆشویستن و ڕازیبوون و تووڕەییدا جیابوونەتەوەو دابەش بوون[1].

وه ئەولیاو دۆستە تەقواكارو لە خوا ترسەكانی خوای گەورە بریتین لەوانەی كە فەرمان پێكراوەكانیان بەجێهێناوە، قەدەغە كراوەكانیان واز لێهێناوە[2]،

---

(١)_ جیابونەوەو دابەش بوون لە ڕاستیدا لە بواری (الكلمات)ە دینیە شەرعیەكانی خوای گەورەدایە، بەڵام بۆ (الكلمات)ە كەونییەكانی خوای گەورە جیابونەوەو دابەش بوونی تێدا نییە، هەمووان گوێڕایەڵی دەبن، چونكە خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾ [آل عمران: ٨٣] واتە: لە كاتێكدا كە هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە فەرمانبەری خوان بیانەوێ (بە ویستی خۆیان) یا نەیانەوێ (بەنا چاری). ملكەچی فەرمانی خوای گەورە دەبن بە ویستی خۆیان بێت یان بە ناچاری، هیچ كەسێك توانای ئەوەی نییە لە (الكلمات) ە كەونییەكانی خوای گەورە بچێتە دەرەوە، مەشیئەت و ویستیش: مەشیئەت و ویستی قەدەری خوای گەورەیە.

(٢)_ بریتین لەوانەی كە ملكەچی (الكلمات)ە دینیە شەرعیەكانی خوای گەورە بوون، ئەوانە بەجێ دێنن كە فەرمانیان پێكراوە، واز لەوانە دێنن كە لێیان قەدەغە كراوە.

لەسەر قەدەرو ویستی (کەونی) ش ئارامیان گرت[١]، ئیتر خوای گەورە خۆشی ویستن و خۆشیان ویست، لێیان ڕازیبوو و لێی ڕازی بوون[٢].

وە دوژمنەکانی خوای گەورە دۆستانی شەیتانن، ئەگەرچی ئەمانە لە ژێر تواناو قودرەتی خوای گەورەدان بەڵام ڕقی لێیانەو، لێیان بێزارەو، لێیان تووڕە دەبێت و[٣]، نەفرینیان لێدەکات و، دوژمنایەتیان دەکات[٤].

---

(١)_ وە لەسەر قەزاو قەدەریش ئارامیان گرت، بێتاقەتی و بێئۆقرەییان نەنواند، وەڕسبوون و بێزاریان دەرنەبڕی، بۆیە قەزاو قەدەری خوایان بەسەردا جێبەجێکرا کە بریتیە لە (الکلمات)ە کەونییەکان، بەوە ڕازیبوون و هەروەها ملکەچی (الکلمات)ە دینیە شەرعیەکانیش بوون و، کاریان پێکرد، نێوان هەر دوو شتەکەیان کۆکردەوە.

(٢)_ دەرەنجام و ئاکامی ئەوەش بریتی بوو لەوەی کە خوای گەورە لێیان ڕازی بوو و ئەوانیش لێی ڕازی بوون، خۆشیویستن و خۆشیان ویست، چونکە گوێڕایەڵی بوون و، ملکەچی فەرمانەکانی بوون و، خۆیان لە قەدەغە کراوەکانی بە دور گرت. بەڵام کافران سەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورەیان کرد بۆیە لێیان تووڕە بوو و، نەفرەتی لێکردن.

(٣)_ چونکە سەرپێچی فەرمانیان کردو، موخالەفەی قەدەغە کراوەکانی خوای گەورەیان کرد، بۆیە ڕقی لێیانە.

(٤)_ چونکە سەرپێچی شەرع و ئایینەکەی خوای گەورەیان کرد، شوێنکەوتن و سازیار بوونی تەنها قەزاو قەدەرو وشەو کەلامە کەونیەکانی خوای گەورە سوودی پێی نەگەیاندن.

زیاتر باسکردنی ئەم ڕستانەش لە شوێنێکی تردایە، بەڵام ئەمانەم لێرەدا نووسی بۆ ئاگادارکردنەوە لەسەر کۆی جیاوازیەکانی نێوان دۆستانی ڕەحمان و دۆستانی شەیتان[1].

وە پوختەی جیاوازیەکانی نێوانیان بە شوێنکەوتن و سازیاربوونیانە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خوابوو ﷺ کە خوای گەورە کردی بەهۆکاری جیابونەوە لەنێوان دۆستان و دوژمنانی خۆیدا، لەنێوان دۆستن بەختیارەکانی و دوژمنە بەدبەختەکانیدا[2]،

---

(١)_ بۆیە ناوی ئەم کتێبە (الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان)ە واتە: جیاوازیەکانی نێوان دۆستانی ڕەحمان و دۆستانی شەیتان.

(٢)_ کاتێ خوای گەورە موحەممەدی ﷺ بۆ هەموو مرۆڤایەتی نارد، بەشێکیان گوێڕایەڵی بوون و ئیمانیان پێهێنا، بەوەش ڕەزامەندی و ڕێزی خوای گەورەیان بۆ خۆیان بە دەست هێنا، بەشێکیشیان سەرپێچی ئەم پێغەمبەرەیان کردو، کوفریان پێکرد بەوەش تووڕەیی و خەشم و نەفرینی خوای گەورەیان بۆ خۆیان دەستەبەر کرد، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَى فِرْعَوْنَ رَسُولًا(١٥) فَعَصَى فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا(١٦)﴾[المزمل:١٥_١٦] واتە: بێگومان ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن کە شایەتە لەسەرتان هەروەك پێغەمبەرێکمان نارد بۆ فیرعەون ئینجا فیرعەون سەرپێچی ئەو پێغەمبەرەی کرد ئێمەش تۆڵەمان لێسەند بە تۆڵە سەندنێکی سەخت. بۆیە هەرکەس گوێڕایەڵی ئەم پێغەمبەرەی کردو، شوێنی فەرمانەکانی کەوت و، خۆی لە

--------------------------------------------

--------------------------------------------

--------------------------------------------

قه‌ده‌غه‌ کراوه‌کانی به‌ دوور گرت و، به‌ ته‌واوی په‌یڕه‌وی کرد ئه‌وا ڕه‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌ به‌ده‌ست ده‌هێنێت، هه‌ر که‌سیش سه‌رپێچی فه‌رمانه‌کانی کردو کوفری پێکرد ئه‌وا توڕه‌یی خوای گه‌وره‌ بۆ خۆی ده‌سته‌به‌ر ده‌کات، ئا ئه‌مه‌یه‌ جیاکاری نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شه‌یتان، دۆستانی ڕه‌حمان گوێڕایه‌ڵی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بوون، به‌ڵام دۆستانی شه‌یتان سه‌رپێچی پێغه‌مبه‌ریان کرد ﷺ. ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره‌ رازی لێبهێنان و، پێغه‌مبه‌رێکی بۆ نه‌ناردنایه‌ ئه‌وا جیاکاری دروست نه‌ده‌بوو، هه‌ر دوو لای له‌ یه‌کدی جیا نه‌ده‌بوونه‌وه‌، له‌ ڕاستیدا ئه‌وانه‌ به‌ ته‌واوی ئاشکرا بوون و په‌یدا بوونه‌وه‌ به‌ ناردنی پێغه‌مبه‌ران و، دابه‌زاندنی فه‌رمان و قه‌ده‌غه‌کان.

لەنێوان دۆستانیدا کە ئەهلی بەهەشتن و دوژمنانیدا کە ئەهلی دۆزەخن[1]، لە نێوان دۆستانیدا ئەهلی ڕێنموونی و ڕاستی و سەرکەوتن و دوژمنانی کە ئەهلی سەرلێشێواو و گومڕایی و خراپەکارین، لە نێوان دۆستانیدا سەربازانی ڕەحمان و دوژمنانیدا حیزبی شەیتان .

وە دۆستانی خوای گەورە بریتین لەوانەی کە خوای گەورە باوەڕی لەدڵیا چەسپاندوون و بەهێزی کردوون و سەری خستوون بە قورئان و ئیمان لە لایەن خۆیەوە، ئەوانە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دەیان خاتە بەهەشتانێکەوە کە جۆگەی ئاوی زۆریان بەژێردا دەڕووات.

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ(١٣) وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ(١٤)﴾[الأنفطار: ١٣_ ١٤] واتە ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ بە ڕاستی چاکان لە ناو نازو نیعمەت دان، لەبەر چاکەکانی خۆیان بێگومان بەدکاران لە دۆزەخدان، لەبەر خراپەکاری و سەرپێچیەکانی خۆیان.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لاَ تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلاَ إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾(1) [المجادلة: ٢٢] واتە: کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە خوا و بە ڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و براو خزمیان بن ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە بەهێزی کردوون و سەری خستوون بە قورئان و ئیمان لە لایەن خۆیەوە وە دەیان خاتە بەهەشتانێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بە ژێر درەختەکانیاندا بەهەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە خوا لێیان ڕازیبووە ئەوانیش لە خوا ڕازیبوون ئەوانە حیزبی خوان ئاگادار بن کە تەنها حیزبی خوان ڕزگارو سەرفەرازن.

---

(١)_ ئەمە بوو کە خوای گەورە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانی لە یەکدی پێی جیاکردەوە، دۆستانی ڕەحمان لە پێناو خوای گەورەدا دۆستایەتی و دوژمنایەتی دەکەن، دۆستایەتی ئەوانە دەکەن کە گوێڕایەڵی خوای گەورە دەکەن، دوژمنایەتی ئەوانە دەکەن کە سەرپێچی خوای گەورە دەکەن، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لاَ تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت کە دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانە دا بکەن کە دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن، کوفر بەخواو سەرپێچی خوا دەکەن، بۆیە خوای تەعالا لە ئایەتەکەی سەرەوە وای فەرموو: ﴿وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ﴾ هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و براو خزمیان بن ﴿أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ

--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------

الْإِيمَانَ﴾ ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە، دەرەنجامیش ئەوە بوو کە لە پێناو خوای گەورەدا خۆشیان ویست و لە پێناو خوای گەورەشدا دژایەتیان کرد، تەنانەت ئەگەر نزیکترین کەسانی خۆشیان بن﴿ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ﴾ ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە، واتە: بەهێزی کردن و کۆمەکی کردن ﴿بِرُوحٍ مِّنْهُ﴾ بەهێزی ئیمان لە لایەن خۆیەوە لەسەر دۆستایەتی و دوژمنایەتی جێگیری کردن.

بەڵام ئەوەی لە نێوان ئیماندارو کافردا، لە نێوان گوێڕایەڵکار و سەرپێچی کاردا جیاوازی ناکات ئەوە ئیماندار نییە، دەڵێت: هەموو خەڵك یەکسانن، ئازادی ئایینیە، ئازادی ڕادەربڕینە، لە هیچ کەس ڕێگری ناکرێت، ئەم جۆرە کەسە ئیماندار نییە، بۆ؟ چونکە لە نێوان ئیماندارو کافردا جیاوازی ناکات، بۆیە لەبەر ئەوەی جیاوازی ناکات و هەموو خەڵکی بە لاوە یەکسانە ئیماندار نییە، چونکە ئیمان جیاوازی کردن پێویست دەکات.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾(١) [الأنفال: ١٢]

---

(١)_ ئەمە لە غەزای بەدر دا بوو، کاتێ خوای گەورە فریشتەکانی دابەزاند بۆ قایم کردنی دڵی ئیمانداران و بۆ ڕوو بە ڕووبونەوەی دوژمن، ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ﴾ بینەوەبیر کاتێك کە پەروەردگارت بۆ فریشتەکان نیگای کرد، واتە: ئەو فریشتانەی دابەزاندنە بەدر، ﴿أَنِّي مَعَكُمْ﴾ کە بێگومان من (خوا) لەگەڵتانم، لەگەڵبونێکی تایبەت، لەگەڵ بونی سەرخستن و پشتگیری کردن، ﴿فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ دەی دڵی کەسانێك قایم و دامەزراوکەن کە باوەڕیان هێناوە، قایم و دامەزراویان کەن بەرامبەر بە دوژمنەکەیان، لە ئەنجامیشدا ئیمانداران دامەزراو و خۆڕاگر بوون لە کاتێکدا ژمارەیان کەم بوو، بەڵام بێباوەڕان ژمارەیان زۆر بوو، فریشتەکان بەئیزنی خوای گەورە قایم و دامەزراویان کردن، بەڵام لە بارەی کافرانیشەوە دەفەرموێ: ﴿سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ﴾ بەزوویی ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەو کەسانەوە کە بێباوەڕ بوون، خوای گەورە دامەزراوی دەخاتە دڵی ئیماندارانەوە لە جەنگدا، بەڵام کافران سەرەڕای ژمارە زۆری و هێزیان خوای گەورە ترس و بیمی خستە دڵیانەوە، ﴿فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ﴾ جا ئێوەش لە سەرووی گەردنیان بدەن، چونکە کوشتن لە سەرووی گەردەندا دەبێت، شمشێر لە جێگەیەکی گەردەن دەدرێت کە ئێسکی تێدانییە، سەرووی گەردەنە، نەیفەرموو: لەگەردەن بدەن، بەڵکو فەرمووی: لە سەرووی گەردەنیان بدەن، ﴿وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾ وە لە هەموو سەر پەنجەکانیان بدەن، بۆ ئەوەی توانای هەڵگرتنی چەکیان نەبێت. ئا ئەمە دەرەنجام و ئاکامی کوفر کردنە بە خوای گەورە، خوای گەورە ئیمانداران و کافرانی لە یەکدی جیا کردەوە، لەم جەنگەدا دۆستان و دوژمنانی خۆی لە یەك دی جیاکردەوە.

هەروەها خوای گەورە لە بارەی دوژمنانیەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ﴾(1) [الأنعام: ١٢١] واتە: وە بێگومان شەیتانەکان بە نهێنی شت بە دۆستەکانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلەو دەمەدەمیتان لەگەڵ بکەن.

---

(١)_ لەبەر ئەوەی هاوەڵپەرستان گۆشتی ئاژەڵی مردارەوە بوو کە بە بێ سەربڕین مردار بووە بە حەڵاڵ دادەنێن، بۆیە خوای گەورە فەرمانی بە ئیمانداران کرد لە گۆشتی ئەو ئاژەڵانە بخۆن کە سەربڕاوەو ناوی خوای گەورەی لەسەر هێنراوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ﴾[الأنعام: ١٨] واتە: دەبخۆن لەو (سەربڕاو)ەی کە ناوی خوای لەسەر هێنراوە. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾[الأنعام: ١٢١] واتە: لەو (سەربڕاوە) مەخۆن کەناوی خوای لەسەر نەهێنراوە(کاتی سەر بڕین) بێگومان (خواردنی) ئەوە تاوان و لە سنوور دەرچوونە، واتە: خواردن لە گۆشتی مردارەوە بوو لە سنوور دەرچوونە مەگەر لە کاتی ناچاریدا، ئەگەر مرۆڤ ناچار بوو، ترسا بمرێت ئەوە خوای گەورە رێی پێداوە لە گۆشتی مردارەوە بوو بخوات، بۆ مانەوەی لە ژیاندا، ﴿وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾ واتە دەرچوونە لە سنووری گوێڕایەڵی خوای گەورە، ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا هاتووە کەوا فارسەکان بە کافرەکانی سەردەمی نەفامیان دەگوت : گۆشتی ئاژەڵی مردارەوە بوو حەڵاڵە، چونکە خوای گەورە خۆی سەری بڕیوە، بەڵام ئاژەڵی سەربڕاو ئێوە سەرتان بڕیوە، باشە چۆن لەوە ناخۆن کە خوای گەورە خۆی سەری بڕیوەو، لەوە دەخۆن کە بە دەستی خۆتان سەرتان بڕیوە، ئەمە دەمەدەمێیەکی پووچەو پێچەوانەی شەرعی خوای گەورەیە، ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ واتە: بێگومان شەیتانەکان، شەیتانەکانی مرۆڤ لە فارسەکان و هەروەها شەیتانەکانی جنۆکە، بە نهێنی شت بە دۆستەکانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلەو

دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن جا ئەگەر بە گوێیان بکەن ئەوە بێگومان لە هاوبەش دانەران دەبن، کەوا بوو هەر کەس گوێڕایەڵی یەکێکیکرد لە حەڵاڵ کردنی ئەوانەدا کە خوای گەورە حەرامی کردوون هاوەڵپەرستە، هاوەڵپەرستی گوێڕایەڵی(شرك الطاعة)، هاوەڵپەرستە بە هاوەڵپەرستی گوێڕایەڵی (مشرك شرك الطاعة)، بۆیە هەر کەس گوێڕایەڵی کەسێك بوو، هەر کەسێك بێت، لە حەڵاڵ کردنی ئەوانەدا کە خوای گەورە حەرامی کردوون، لە کاتێکدا بزانێت کە حەرام کراوەکانی خوای گەورەی بەحەڵاڵ داناوە، ئەوە موشریك و هاوەڵپەرستە چونکە گوێڕایەڵی ئەو کەسانە بووە لە بە حەڵاڵ دانانی مردارەوە بودا، لە کاتێکدا حەرام کردن و حەڵاڵ کردن بە تەنها مافی خوای گەورەیە جایز نییە هیچ کەسێك لە خۆیەوە شت حەرام و حەڵاڵ بکات، ئەوە تەنها مافی خوای گەورەویە، لەو بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾ [الشورى: ٢١] واتە: ئاخۆ ئەو (بێباوەڕانە) هاوبەشانێکیان هەیە ئایینێکیان بۆ داناوون کە خوا ڕێگەی پێنەداوە. بە تەنها خوای گەورە شەرع دادەنێت، حەرام و حەڵاڵ دەکات، هیچ کەسێك پەیوەندی بەو شتانەوە نییە، بۆیە هەر کەس حەرام بە حەڵاڵ دابنێت کوفری کردووە، ئەو حەرامانەی کە یەك دەنگی لەسەر حەرام بوونیان هەیە، هەروەها ئەو کەسەش کە گوێڕایەڵی بێت لە کاتێکدا ئەوەش بزانێت وەکو ئەو کافرە، بەڵام ئەو کەسەی گوێڕایەڵی بێت و نەیزانیبێت حەرامی حەڵاڵ کردووە ئەوا بە کەسێکی نەزان و گومڕا دادەنرێت، ناگاتە ئاستی کوفر.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا﴾[1] [الأنعام: ١١٢] واتە ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا﴾ هەر بەو شێوە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێكمان داناوە ﴿شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ﴾ لە شەیتانەكانی مرۆڤ و جنۆكە ﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ﴾ كە بەنهێنی بە یەكتری ڕادەگەیەنن ﴿زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا﴾ ووتەی ڕازاوەو بریقەدار بۆ فریودانیان.

---

(١)_ ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ﴾ واتـە: نـەك بـۆ تـۆ بـە تایبـەت بـەڵكو هـەموو پێغەمبەرێك دوژمنانی هەیە وەكو تاقیكردنەوەیەك، ﴿جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا﴾ بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنانێكمان داناوە، ئەوانە كێن؟ شەیتانەكانی مرۆڤ و جنۆكەن، ئەمە بەڵگەیەكی ڕوونە كـە مـرۆڤیش هێنـدێكیان شـەیتانن وەكـو چـۆن جنۆكـە هێنـدێكیان شەیتانن، شەیتانەكانی جنۆكە بەنهێنی شت بە شەیتانەكانی مرۆڤ دەڵێن و، لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ پیلانی مەعصیەت و سەرپێچی كردن دەگێڕن، خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ وَكَفَى بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا﴾[الفرقان: ٣١] واتە: ئابـەو جـۆرە (موحەممـەد ﷺ كـە دژایـەتی تـۆ دەكـرێ) دامـان نـاوە بـۆ هـەموو پێغەمبـەرێك دوژمنێـك لـە تاوانبـاران بەسـە پـەروەردگارت ڕێنموونیكارو یارمەتیدەرت بێ. پێغەمبەران دوژمنانیان هەیە وەكو تاقیكردنەوەیەك، ئەمە ووریاكردنەوەی تێدایە لـەوەی كـە گوێڕایـەڵی دوژمنـانی پێغەمبـەران نـەكرێت و، پەیڕەویان نەكرێت و، گوفتارەكانیان بـە چـاك دانـەنرێت. شـاهێدی قسـەكانمان لێرە ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ﴾ هـەر بـەو شـێوە بـۆ هـەموو پێغەمبـەرێك دوژمنێكمـان دانـاوە لەشـەیتانەكانی مرۆڤـ و جنۆكـە، ئەمـە بەڵگەیـەكی ڕوونە كە هێندێك لە ئادەمیزاد شەیتانن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ (٢٢١) تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ (٢٢٢) يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ (٢٢٣) وَالشُّعَرَاء يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ (٢٢٤) أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ (٢٢٥) وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ (٢٢٦) إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيراً وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ (٢٢٧)﴾[1] [الشعراء: ٢٢١_٢٢٧].

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ شاعیر نەبوو، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ (١٩٤) بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ (١٩٥) وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ (١٩٦) أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ آيَةً أَن يَعْلَمَهُ عُلَمَاء بَنِي إِسْرَائِيلَ(١٩٧)﴾ [الشعراء: ١٩٢_١٩٦] واتە: ئەم (قورئان)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی بەزمانێکی عەرەبی ڕوون و ڕەوان وە بە ڕاستی (باسی قورئان) لە کتێبی پێغەمبەرە پێشووەکاندا هەیە. پێشتر باسی قورئان کراوە کەوا خوای گەورە ئەم پێغەمبەرە دەنێرێت و، ئەم قورئانەی بەسەردا دادەبەزێنێت، پێشتر ئەم هەواڵەیان زانیووە، ئایا ئەمە بەڵگەیەکی ڕوون نەبوو بۆیان (بۆ کافرانی قورەیش) کە زانایانی بەنی ئیسرائیل ئەو (دەنگ و باسی قورئان)ە دەزانن. زانایانی بەنی ئیسرائیل هەواڵی ئەم قورئانەیان دەزانی، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ أُوتُواْ الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّداً (١٠٧) وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولاً (١٠٨)﴾ [الإسراء: ١٠٧_١٠٨] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی کە زانیاریان پێبەخشراوە لە پێش ئەم (قورئانە)دا کاتێ (قورئان) بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بە چەسپانی دەکەون بەڕودا بەسوژدە بردن وە دەڵێن پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگارمان بە ڕاستی هەمیشە

............................................................................

............................................................................

............................................................................

بەڵێنی پەروەردگارمان بەدی دێت. بڕوایان بە قورئان کرد. هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ﴾ [المائدة: ٨٣] واتە: هەر کاتێ گوێیان لێبوایە ئەو قورئانەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەبینی چاوەکانیان لە فرمێسك (پڕ دەبێ و) دەڕژێت لەبەر ئەو ڕاستییەی کە زانیویانەوە (و بۆیان دەرکەوتووە). ئەوان چاك ئەوە دەزانن. پاشان خوای گەورە لەبارەی قورئانەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّيَاطِينُ(٢١٠) وَمَا يَنبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ (٢١١) إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ(٢١٢)﴾ [الشعراء: ٢١٠] واتە: شەیتانەکان ئەو (قورئانە)یان نەهێناوەتە خوارەوە چونکە دەڵێن: ئەم قورئانە شیعرە، کیهانەیە _ بانگەشەی زانینی غەیب بەهۆی بەکارهێنانی جنۆکەوە _ داستان و بەسەرهاتی پێشووەکانە، ئەمەیە... ئەمەیە...، خوای گەورە هەموو ئەو گوفتارە پووچانەی لە قورئان بە دور گرت و نکۆڵی لێکردن، شەیتانەکان قورئانیان نەهێناوەتە خوارەوە، بەڵکو جبریل دەیهێنایە خوارەوە، شەیتانەکان ئەم قورئانە ناهێننە خوارەوە بەو هاوشێوەیەی کە دادەبەزنە سەر کاهینە خۆ بەغەیبزانەکان، پێغەمبەران شەیتانیان بەسەردا دانابەزێت، بەڵکو فریشتەیان لەلایەن خوای گەورەوە بەسەردا دادەبەزێت ﴿لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ نەشیاوی ئەوەن و نەدەشتوانن شەیتانەکان لە سرووش و وەحی نزیك نابنەوە، لە قورئان نزیك نابنەوە، قورئان پارێزراوە ﴿إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ بە ڕاستی شەیتانەکان لەگوێگرتن (ی هەواڵی ئاسمان) ڕێگری کراون. واتە لە زانینی سرووش و وەحی بەرگری کراون، ئەستێرەی کلکداریان تێدەتەقێنرێت و، دوریان دەخاتەوە، هەر کات بیانەوێ هەواڵی ئاسمان و سرووش بزانن ئەستێرەی ڕووناکی کلکداری پارێزەری ئاسمان دوریان دەخاتەوە، نەشیاوی ئەوەن و نەدەشتوانن، شەیتانەکان نزیکی قورئان نابنەوە،

لە کاتی دابەزیندا نزیکی ناکەونەوە، لە کاتی خوێندنیشیدا دیسان نزیکی ناکەونەوە،
لە قورئان هەڵدێن، لە قورئان دور دەکەونەوە، بە ڕاستی شەیتانەکان لە گوێگرتنی
هەواڵی ئاسمان بەرگری کراون. ئەوان دەڵێن: قورئان لەشەیتانەکانەوەیە بەڵام بە
درۆی خستونەتەوە، دەفەرموێ: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ﴾ هەواڵتان
بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەرکێ؟ هەرگیز شەیتانەکان دانابەزنە سەر
پێغەمبەران، بەڵکو دادەبەزنە سەر دوژمنانی پێغەمبەران، ﴿تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾
دادەبەزنە سەر هەموو (کەسێکی) زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار لە کاهینە
خۆبەغەیبزانەکان، ﴿يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ﴾ باش گوێدەگرن (بۆ شەیتانەکان)
وە زۆربەیان درۆزنن (لەو هەواڵانەدا دەیدەن بە خەڵکی) هەوڵ دەدەن بۆ بە نهێنیەوە
گوێبیستی هەواڵی ئاسمان بن، واتە: ئەو شتانەی کە خوای گەورە بۆ فریشتەکانی
خۆی سرووش دەکات، لە ئاسماندا زۆر بەرز دەبنەوە بۆ ئەوەی بەنهێنیەوە
گوێبیستی هەواڵی ئاسمان بن، بەڵام ئەستێرەی ڕووناکی کلکداریان تێدەتەقێنرێت،
بێدەچێ جار بە جاریش وشەیەك بقۆزنەوە، لەوەی کە لەئاسمانەوە گوێبیستی بوونەو
بەگوێی کاهینەکەیدا بدەن، کاهینەکەش صەد درۆی تێکەڵ دەکات، خەڵکیش بەهۆی
ئەو تەنها وشە ڕاستەوە کە لەئاسمانەوە بیستراوە باوەڕی پێی دەکەن، قبوڵی
نەوەدو نۆ درۆ دەکەن بە هۆی تەنها وشەیەکی ڕاستەوە کە لە ئاسمانەوە بیستراوە.
کاتێ خوای گەورە نکۆڵی لەوە کرد پێغەمبەر ﷺ کاهین بێت، یان شەیتانەکانی
بەسەردا دابەزێت، ئەمجارە گوتیان: پێغەمبەر ﷺ شاعیرێکە لە شاعیران،
ئەمجارەش خوای گەورە نکۆڵی لەوە کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ شاعیر بێت،
دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنْبَغِي﴾[یس: ٦٩] ئێمە ئەو (موحەممەد ﷺ)مان
فێری شیعر نەکردووەو شیعر گوتن شیاوی ئەو نییە. شیاو نییە پێغەمبەری

خوا ﷺ شاعیر بێت، چونکە شاعیران بەو جۆرەن کە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿وَالشُّعَرَاء يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ(٢٢٤) أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ (٢٢٥)﴾ پێغەمبەر ﷺ شاعیر نییە، شاعیرەکان تەنها گومڕاکان شوێنیان دەکەون، ئایا نابینی کە ئەوانە بەهەموو دۆڵ و شیوێکدا بەسەر لێشێواوی دەڕۆن و شیعر دەڵێن. شاعیر شتانێکی زۆر دور دەگێڕێتەوە، چونکە شەیتان یارمەتی دەدات، شاعیر شەیتان یارمەتی دەدات، بۆیە شتانێك باس دەکات کە نەچوّتە لای و نەشیبینوە، ﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ﴾ وە بە ڕاستی ئەوانە شتێ دەڵێن کە خۆیان نایکەن، بەزۆری شاعیر ترسنۆکە، دەربارەی ئازایەتی و نەبەردی جەربەزەیی دەدوێت لە کاتێکدا خۆی ترسنۆکترین کەسە. پاشان خوای گەورە بەشێکی لە شاعیران جیاکردۆتەوە، ئەوانەی بڕوایان بە خواو، سەرخستنی هەق هەیە وەکو حەسسانی کوڕی ثابت ﷺ وە شاعیرانی دیکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە شیعرەکانیان بۆ سەرخستنی هەق و بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەکارهێنا، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا﴾ جگە لەوانەیان بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە، وە یادو زیکری خوایان زۆر کردووە، وە تۆڵەیان سەندەوە لەپاش ئەوەی ستەمیان لێکراوە، خوای گەورە لە شاعیران ئەوانەی جیا کردۆتەوە کە باوەڕیان هێناوە، خوای گەورە لەو شاعیرانە جیای کردونەتەوە کە زەمیان دەکات.

هـــەروەها خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێ: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ(٣٨) وَمَا لَا تُبْصِرُونَ (٣٩) إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (٤٠) وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ (٤١) وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ (٤٢) تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ (٤٣) وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ (٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ (٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ (٤٧) وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ (٤٨) وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ (٤٩) وَإِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ (٥٠) وَإِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ (٥١)فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ(٥٢)﴾[1] [الحاقة: ٣٨_٥٢].

---

(١)_ ئەم ئایەتانە کۆتاییەکانی سوورەتی (الحاقة)یە بە هاوشێوەی ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (الشعراء) خوای گەورە نکۆڵی لەوە کردووە کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ کاهین بێت یان شاعیر بێت، خوای گەورە ئەو شتانەی لەم پێغەمبەرە ﷺ بە دور گرتووە، خوای گەورە سوێند لەسەر ئەوە دەخوات و، دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ﴾ لێرەدا پیتی (فاء: صلة للتأكيد)ە، (لا: نافية) یەو، ئەم مانایە دەگەیەنێت: نەخێر، شتەکە بەو جۆرە نییە کە ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن، بنەڕەتیش: (أُقْسِم)ە: واتە سوێند دەخۆم، مانا گشتیەکەشی ئەمەیە: نەخێر شتەکە بەو جۆرە نییە کە ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن سوێند دەخۆم بەو شتە دروستکراوانەی کە دەیانبینن، ﴿وَمَا لَا تُبْصِرُونَ﴾ وە ئەوەش کە نایانبینین، چونکە ئێمە شتە دروستکراوەکانی خوای گەورە نابینین مەگەر کەمێکی، چەندەها مەخلوقات هەن ئێمە نایانبینین، خوای گەورە سوێند بەو مەخلوقاتە گەورانە دەخوات کە ئێمە دەیانبینین و، ئەوەش کە نایانبینین، خوای گەورەش سوێند دەخوات بەهەر شتێك بە ویستی خۆی، بەڵام سوێند ناخوات تەنها بەو شتانە نەبێت کە پێگەیەکی گەورەیان هەیە. بەڵام ئێمەی ئادەمیزاد تەنها

بەخوای گەورە سوێند دەخۆین، وەکو ئەوەی زانراوە، باشە سوێند لەسەر خوراو چییە؟ بریتییە لە ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ بێگومان ئەم قورئانە فەرمودەی رەوانەکراوێکی بەرێزو گەورەیە لە خواوە بۆتان دێنێ، مەبەستی موحەممەدە ﷺ پێغەمبەری مرۆڤیی، پێغەمبەرێکی بەرێزە ﷺ، ئەو لە خۆیەوە ئەو شتانەی نەگوتووە بەڵکو گوفتاری خوای گەورەیەو بە مرۆڤایەتی ڕاگەیاندووەو، بۆی ڕوون کردونەتەوە. ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ﴾ ئەم قورئانە قسەی شاعیر نییە ئێوە زۆر کەم بە قورئان بڕوادەهێنن، چونکە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ شاعیرەو ئەم قورئانەش شیعرە. ﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ﴾ قسەی فاڵچی نییە ئێوە زۆرکەم بیر دەکەنەوە، ئەوان دەڵێن: پێغەمبەر کاهینە، پێغەمبەرو شاعیرو کاهین جیاوازییان لە نێواندایە. شاعیرو کاهین شەیتانیان بەسەردا دادەبەزێت، بەڵام پێغەمبەران فریشتەیان بەسەردا دادەبەزێت، ﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەم قورئانە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە نێردراوەتە خوارەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گوفتاری خودی پێغەمبەر ﷺ نییە بەڵکو گوفتاری خوای گەورەیەو پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکی ڕاگەیاندوەو، بۆی خوێندونەتەوە، ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ﴾ ئەگەر موحەممەد ﷺ بە دەم ئێمەوە هێندێ گوتەی هەڵبەستایە ئەوە بە توندترین سزا سزامان دەدا، وە سزانەدانی لە لایەن خوای گەورەوە بەڵگەیە بۆ ڕاستێتی پەیامەکەی کە لە لایەن خوای گەورەوەیە، ﴿لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ﴾ بێگومان ئێمە بە دەستی خۆمان تۆڵەمان لێدەسەند، بەهێز یان بە دەستی ڕاست، ﴿ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ﴾ لە پاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی، بە خراپترین شێوە دەمان کوشت، ﴿الْوَتِينَ﴾ ئەو ڕەگەیە کە لە گەردن دایە ئەگەر ببڕدرێت دەمرێت، کاتمان پێنەدەدا بۆ زیاتر درۆ کردن بە دەم خوای گەورەوە. ئێوە بیر بکەنەوە کە چۆن خوای گەورە ئەو کەسانەی لە ناو برد کە بە

دەم خوای گەورەوە درۆیان دەکرد، موسویلەمەی درۆزنی کوشت، ئەلئەسوەد ئالعەنسی و کەسانی تری خۆ بە پێغەمبەر زانی کوشت. ئایا خوای گەورە هەڵی پێدان؟ نەخێر. خوای گەورە کوشتنی و لە ناوی بردن و تەنانەت باسیشیان نەما. بەڵام ئەم پێغەمبەرە ﷺ پەیامبەری خوای گەورەیە، باسی هەر ماوەو هەر دەشمێنێت، ئەم قورئانەش هەر دەمێنێت و، دەخوێندرێتەوە، ئەمە بەڵگەیە کە لە لایەن خوای گەورەوەیە، ﴿فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾ وە کەس لە ئێوە نەیدەتوانی بەرگری لێ بکات، ئەگەر خوای گەورە بیەوێ پێغەمبەر لەناوبەرێت ئایا هیچ لە توانایدایە ڕێگری لەوە بکات، شوێن شاهێدی قسەکانمان ئەوەیە کە ئەم ئایەتانە دەیسەلمێنێت کە قورئان ڕاستەو لەلایەن خوای گەورەوە دابەزیووە، وە شیعرو کیهانەو درۆ نییە کە بەدەم خوای گەورەوە کرا بێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ (٢٩) أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ (٣٠) قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُتَرَبِّصِينَ (٣١) أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم بِهَذَا أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ (٣٢) أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ (٣٣) فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ (٣٤)﴾[1] [الطور: ٢٩_٣٤].

---

(١)_ ئەم ئایەتانە نکوڵی کردنە لەو وەسفانەی کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە، گوایە کاهینە، شاعیرە، درۆزنە، ئەم قسانە بەڵگەی شلەژانیانە، درۆدەکەن و جار بە جار دەڵێن: شاعیرە، جار بە جار دەڵێن: کاهینە، جار بە جار دەڵێن: درۆزنە، جاربەجار دەڵێن: فێر دەکرێت، مرۆڤ فێری دەکات، کەسانێکی ئەهلی کیتاب بۆی دەنووسنەوە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا﴾[الفرقان: ٥] واتە: وە (بێبڕوایان) دەیانگوت (ئەم قورئانە) بەسەرهاتی داستانی پێشووەکانە (موحەممەد ﷺ) داوایکردووە بۆی بنوسن. دەیانگوت: موحەممەد نانوسێت بەڵام لەو لاوە ئیسرائیلیەی گەنجە لە مەککەدا بوو داوای کردووە بۆی بنوسێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾ [النحل: ١٠٣] واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە دەزانین کە ئەوانە دەڵێن هەر ئادەمییە (ئەم قورئانەی) فێر دەکات کەچی زمانی ئەو کەسەی ئەوەی دەدەنە پاڵ عەجەمیە و ئەم (قورئانە)ش بەزمانی عەرەبی پاراو و ڕوونە. ئەو کەسە ئەعجەمیەو ئەم قورئانەش عەرەبیە باشە چۆن ئەعجەمیەك ئەم قورئانە پاراوە ڕوونەی هێناوە لە کاتێکدا ئەعجەمییە. ئایەتەکانیش لە سورەتی (الطور)ە ﴿فَذَكِّرْ﴾ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ یادو زیکری خوایان بهێنەرەوە یادو لەو تاوانبارکردن و قسانەی دەی دەنە پاڵت ئاوەڕ مەدەرەوە ﴿فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ﴾ چونکە بەهۆی بەهرەکانی

پەروەردگارتەوە تۆ نەفالچیت و نەشێتیت، وەکو ئەوەی ئەوان دەیلێن، ئەوان شلەژاون و لەسەر قسەیەك جێگیر نابن، ئایا شێت شیعر دەلێت؟ شێت توانای نسەکردن و نووسینی نییە، ئایا کەسێکی شێت دەتوانێت ئەم قورئانە پاراو و ڕوونە بهێنێت، شێت وڕێنە دەکات و بە چاکی قسە ناکات، بەڕاستی ئەوان شلەژاون، ئایا ئەم قورئانە شیعرە؟ بەراوردێکی نێوان قورئان و شیعر بکە جیاوازیەکە زۆر بە ڕوونی دەبینیت، ئایا قورئان کیهانەیە؟ بەراوردێکی نێوانیان بکە جیاوازیەکە زۆر بەڕوونی دەبینیت، چونکە قسە سەروا دارەکانی کاهینان مرۆڤ دێنێتە پێکەنین و، گوفتاری پەروەردگاری جیهانیان نییە، وەکو قسەی سەروا دارەکانی موسەیلەمەی درۆزن و سەجاح و غەیری ئەوان، ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ﴾ نەء بەڵکو دەڵێن موحەممەد ﷺ شاعیرە چاوەڕوانی مردنی دەکەین، پاشان دەحەوێنیەوە وەکو شاعیرەکانی سەردەمی نەفامی کە بە کەساسی و چەوساوەیی ژیان تاوەکو مردن و باس وخواسیان نەما، ئارام بگرن تا دەمرێت و پاشان ڕزگارمان دەبێت، باشە ئایا پاش مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ باس وخواسی بڕوا تەواو بوو؟ قورئان بڕوا تەوا بوو؟ نەخێر، نەبڕاو تەواو نەبوو، چونکە لە لایەن خوای گەورەوە بوو.

خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ پاك ڕاگرتوەو بە دوری گرتووە لەو جۆرە کەسان بێت کە هەمیشە شەیتانیان لەگەڵدایە و لێیان جیا نابنەوە وەکو کاهینەکان و هەندێ لە شاعیرەکان و شێتەکان، ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کەوا ئەوەی قورئانی بۆ هێناوە فریشتەیەکی بەڕێزەو خوای گەورە هەڵی بژاردووە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾[1] [الحج: ٧٥] واتە: خوا لە فریشتەکاندا نێردراو هەڵ دەبژێرێت هەروەها لە خەڵکیشدا بە ڕاستی خوا بیسەری بینایە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ (١٩٤) بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ (١٩٥)﴾ [الشعراء: ١٩٢_١٩٥] : ئەم (قورئان)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی بە زمانێکی عەرەبی ڕوون و ڕەوان.

---

(١)_ بەڵێ، پێغەمبەران دوو بەشن: نێردراوانێك لە فریشتە و نێرداراوانێکیش لە ئادەمیزاد، ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي﴾ خوای گەورە لەفریشتەکان و لەئادەمیزادیش نێردراوانێك هەڵدەبژێرێت، پەیامبەری هەڵبژاردنێکە لە لایەن خوای گەورەوە، بەو جۆرە نییە کە فەیلەسوفەکان بانگەشەی بۆ دەکەن گوایە مرۆڤ بەهۆی پاکێتی خۆی و فیترەت و زەین و فەلسەفەکەیەوە دەدۆزێتەوەو پێی دەگات، دەیانەوێت ببن بەپێغەمبەر و نێردراو، پێغەمبەرایەتی بە دەستی خوای گەورەیە و تەنها لەلایەن خوای گەورە پەیامبەر هەڵ دەبژێردرێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾[الأنعام: ١٢٤] واتە: خوا چاك دەزانێت پەیام و پێغەمبەری خۆی لەکوێ دادەنێ (و کێ شیاوترە بۆ ئەو کارە)؟.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾[1] [البقرة: ٩٧] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیل بێت (ئەوە دوژمنی خوایە) چونکە ئەو بە فەرمانی خوا قورئانی هێناوەتە خوارەوە بۆ سەردڵی تۆ بە پشتیوانیی نامەکانی پێش خۆی بە ڕێنموونی کارو مژدەدەر بۆ بڕواداران.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ (٩٨) إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٩٩) إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ (١٠٠) وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (١٠١) قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِنْ رَبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ (١٠٢)﴾[2] [ النحل: ٩٨ _ ١٠٢]

---

(١)_ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەبەستی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿الرُّوحُ الْأَمِينُ﴾[الشعراء: ١٩٣] جوبرەئیلە _علیه السلام_ کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نێردرا جوولەکەکان لە ڕووی گاڵتە پێکردن و کەشو فشەوە دەیانگوت: ئەگەر ئەوەی بەسەریدا دادەبەزێت جوبرەئیل نەبوایە ئیمانمان پێدەهێنا، بەڵام جوبرەئیل دوژمنی ئێمەیە بۆیە ئیمانی پێ ناهێنین، بۆیە خوای عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند.

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ﴾ ئەی موحەممەد ﷺ کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بەخوا لە شەیتان، بۆیە ئەگەر موسڵمان ویستی قورئان خوێندنی هەبوو با بە (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) دەست پێ بکات، بۆ ڕاونانی شەیتان بۆ ئەوەی خوێندنەکەی لێ تێکنەدات و، هەڵەی

------------------------------------------------
------------------------------------------------
------------------------------------------------

پێنەکات، ﴿الرَّجِيمِ﴾ دەرکراو لە بەزەیی خوا، پاشان خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کەوا ﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ بەڕاستی شەیتان دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەوانەدا کە باوەڕیان هێناوە و تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، خوای گەورە ئەمەی فەرمووە چونکە شەیتان دەیگوت: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الأَرْضِ وَلأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ(٣٩) إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ(٤٠)﴾ [الحجر: ٣٩_٤٠.] واتە: گوتی ئەی پەروەردگارم لەبەر ئەوەی گومڕات کردم بێگومان خۆشی دونیایان لە زەویدا بۆ دەڕازێنمەوە وەبەڕاستی هەموویان گومڕا دەکەم بەندە دڵسۆزەکانت نەبێت. بەندە دڵسۆزو ئیماندارەکان شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی بەسەریاندا نییە.

خوای تەعالا جوبرەئیلی بە (روح الأمین) و (روح القدس) ناوناوە[(١)].

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلاَ أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ (١٥) الْجَوَارِ الْكُنَّسِ (١٦)﴾[(٢)] [التكویر: ١٥_١٦] واتە: سوێند بەو ئەستێرانەی کە لە ئاسمان (خانِسة)ن، واتە: نادیارن پێش دەرکەوتنیان[(٣)]،

---

(١)_ خوای گەورە جوبرەئیلی بە(الروح الأمین) ناو ناوە، هەروەها بە (الروح القدس) یشی ناو ناوە واتە پاك، (القدس): واتە پاکی، پێغەمبەری خوا ﷺ پاکراوەتەوە، هەروەها خوای گەورە بە(جبریل)یش ناوی بردووە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ﴾[البقرة: ٩٧] ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیل بێت ئەوە دوژمنی خوایە چونکە ئەو بەفەرمانی خوا قورئانی هێناوەتە خوارەوە بۆ سەردڵی تۆ.

(٢)_ (لا: نافیة)یە واتە شتەکە بەو جۆرە نییە کە ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن یان (صِلة للتأکید)ە بۆ تەئکید کردنەوەی رستەکەیە، ﴿أُقْسِمُ﴾ واتە سوێند دەخۆم بە ﴿بِالْخُنَّسِ﴾ بریتیە لەو ئەستێرانەی کە بەرۆژ لە پێش چاو وون دەبن و، بەشەوانیش دەردەکەون، ئەو ئەستێرانەن لە ئاوابوندا بەدەرەوەنین و پاشان دەردەکەون و لە شوێنی هەڵهاتنیانەوە بۆ شوێنی ئاوابونیان دەچن، دەیانبینن رێدەکەن، تۆ لە شوێنێکدا دەیانبینیت بەڵام ماوەیەك رۆشتیت و جارێکی تر تەماشات کردەوە دەبینیت کە رێی کردوەو پێشکەوتوەو لە جێگەی یەکەمی دورکەوتۆتەوە، دوو ناوی هەیە: بە(الجواري) ناودەبرێت ئەگەر دەرکەوت و، بە(الْخُنَّسِ)یش ناودەبرێت ئەگەر ئاوا بوو.

(٣)_ وەکو ئەوەی خوای گەورە لە بارەی شەیتانی وەسوەسە پەیداکەری حەق بەنهانکەرەوە دەدوێت: (الخَنّاس) بریتیە لەوەی کە ئەگەر یادو زیکری خوای گەورە کرا خۆی پەنهان دەکات، وە ئەگەر یادو زیکری خوای گەورەی فەرامۆش کرد وەسوەسە دەکات، کەواتە مانای (الإخناس) دەرکەوتن و پەنهانە.

ئەگەر دەریشکەوتن خەڵکی دەیانبینن لە ئاسماندا ڕێدەکەن، ئەگەر ئاواشبوون بۆ پەناگەکانی خۆیان دەچنەوە کە دەیانشارنەوە(١)، ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ﴾(٢) [التكوير: ١٧] وە بەو شەو ئەگەر چوو و نەما یان ئەگەر هات و تاریک بوو، ﴿وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾(٣) [التكوير: ١٨] وە بە بەیان ئەگەر هات و دەستی پێکرد، ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ [التكوير: ١٩] بێگومان ئەم قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایە بەرزە ی جوبرەئیلــــە _ علیه السلام _، ﴿ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ (٢٠) مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ(٢١)﴾(٤) [التكوير: ٢٠_٢١] پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾(٥) [التكوير: ٢٢]

---

(١)_ واتە لە ئاسۆدا ئاوا دەبن و ئیتر خەڵکی نایانبینن.

(٢)_ ﴿عَسْعَسَ﴾ واتە چوو و نەما، تەواو بوو و سپێدە دەستی پێکرد.

(٣)_ هەموو ئەمانە سوێند خواردنە لە لایەن خوای گەورەوە کە بەو نیشانە گەورانە سوێندی خواردووە، بەڵام سوێند لەسەر خوراو چییە؟ پاشان باس دەکرێت.

(٤)_ ﴿عِندَ ذِي الْعَرْشِ﴾ واتە: لای خوای گەورە ﴿مَكِينٍ﴾ لای خاوەن عەرش واتە: لای خوای گەورە خاوەن پایەیەو لەخوای گەورەوە نزیکە، ﴿مُطَاعٍ﴾ واتە: لە ئاسمان فریشتەکان گوێڕایەڵی ئەون، جوبرەئیل گەورەترینی هەموو فریشتەکانەو سەرگەورەیانە ﴿ثَمَّ أَمِينٍ﴾ دەستپاکە لەسەر ئەو سرووش و وەحیانەی کە پاراستنیان خراوەتە ئەستۆی ئەو.

(٥)_ خوای گەورە پاش ئەوەی ستایشی جوبرەئیلی کرد، ئینجا ستایشی پێغەمبەری خواشی ﷺ کرد، چونکە ئەمە سەنەدی قورئانە: لە موحەممەدەوە لە جوبرەئیلەوە لە خوای گەورەوە. ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾ [التكوير: ٢٢] واتە هاوڕێکەتان کە موحەممەدە ﷺ شێت نییە وەکو ئەوەی کافران دەیڵێن، گوایە جنۆکە دەستی لێوەشاندووەو وەڕینە دەکات، ئایا کەسی شێت لە توانایدایە ئەم قورئانە بێنێت، بە ڕاستی بێ عەقڵن.

وان: هاوڕێکەتان (کە موحەممەدە ﷺ) شێت نییە (وەکو ئێوە دەڵێن)، واتە: هاوڕێکەتان کە خوای گەورە بەهۆیەوە چاکەو نیعمەتی خۆی بەسەرا ڕشاندن، کاتێ وەکو پێغەمبەرێك بۆی ناردن لە ڕەگەزی خۆتانەو هاوەڵێتیتان دەکات چونکە توانای بینینی فریشتەتان نەبوو[1]،

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾[آل عمران: ١٦٤] واتە: سوێندبێ بێگومان خوا چاکەو منەتی نا بەسەر بڕواداراندا کاتێ کە پێغەمبەرو نێرراوێکی ڕەوانە کرد لە ناویاندا لە خۆیان کە بەڵگەکانی دەخوێنێتەوە بەسەریاندا. یەکێك لە چاکەو بەخشندەکانی خوای گەورە بریتیە لەوەی کە ئەم پێغەمبەرە لە ڕەگەزی خۆمانە خەڵکی قسەیان لە گەڵ دەکردو ، لەگەڵیدا دادەنیشتن و، لەگەڵیدا ڕێیان دەکردو، لەگەڵیاندا دەیخواردو لەگەڵی دا دەیان خواردو، گوێبیستی گوفتارەکانی دەبوون. بەلام ئەگەر لەڕەگەزی فریشتەکان بوایە توانای بینینیان نەدەبوو، نەیاندەتوانی لەگەڵیدا بدوێن، ئەم پێغەمبەرە ﷺ لە هەموو شوێنێکدا هاوەڵێتی دەکردن، خەڵکی لەسەفەرو لە شاردا لە هەموو جێگەیەکدا، سرووش و شەریعەتی لێ وەردەگرن، ئەمە لە نیعمەتەکانی خوای گەورەیە، پاشان ئێوە باش دەیناسن، ناڵێن: نایناسین و نازانین لە چ شوێنێکەوە هاتووە، لەئێوەیە لە بەڕێزترین هۆزەکانتانە لەنێوانتاندا دەژی، شارەزای دەستپاکی و ڕاستگۆیەکەی بوونە، غەریبێکتان بۆ نەهاتووە. بەلام ئەوان دەیانگوت: ﴿لَوْلَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا الْمَلَائِكَةُ﴾ [الفرقان: ٢١] واتە ئەوە بۆ فریشتە نانێردرێتە خوارەوە بۆ سەرمان، دەڵێن: ئێمە بڕوامان بە موحەممەد ﷺ نییە پێویستە فریشتەمان بۆ بێت، ئەمە یەکێکە لە ناڕەوایی و ستەمکاریەکانیان، دەڵێن: پێویستە فریشتەیەکمان بۆ بێت قسەمان لەگەڵ بکات، ئێمە بڕوامان بە ئادەمیزادێکی

وەکو خۆمان نییە، خوای گەورەش پێی ڕاگەیاندن کەوا ئەوە فەزڵ و چاکەیەکی لە لایەن خوای گەورەوە چونکە ئەگەر فریشتەیان بۆ بنێردرایە نەیاندەتوانی سوودی لێ وەرگرن و، لەگەڵی دا بدوێن، چونکە لە ڕەگەزی خۆیان نەبوو. لە ڕاستیدا فریشتەکان لەکاتی سزادا دادەبەزن لە کاتی فەوتاندن و لە ناو بردندا، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلائِكَةَ لا بُشْرَى يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ﴾[الفرقان: ٢٢] واتە: ئەو ڕۆژەی فریشتەکان دەبینن (کاتی مردن یا قیامەت) لەو ڕۆژەدا هیچ مژدەیەك بۆ تاوانباران نییە. ئەگەر فریشتەکان دابەزین و، خەڵکی بینینیان ئەوا فەوتان و لە ناو چون ڕوودەدات، فریشتەکان دانابەزن تەنها لە کاتی مردن و سەرە مەرگ و دابەزینی سزادا دادەبەزن یا لە کاتی ڕوودانی قیامەتدا.

وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ وَلَوْ أَنْزَلْنَا مَلَكًا لَقُضِيَ الْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنْظَرُونَ (٨) وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكًا لَجَعَلْنَاهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِمْ مَا يَلْبِسُونَ (٩)﴾(١) [الأنعام: ٨_٩].

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ﴾(٢) [التكوير: ٢٣]

---

(١)_ بۆیە جوبرەئیل بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەچوو مەگەر لە شێوەی پیاوێکدا، لەگەڵی دا دادەنیشت و خەڵکیش تەماشایان دەکردن، قسەیان لەگەڵ دەکرد، وەکو ئەوەی لە فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتتاب دا هاتووە: ((بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ)) واتە: ((ڕۆژێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوین ﷺ پیاوێك دیدەنی کردین کە پۆشاکەکەی زۆر سپی بوو))، جوبرەئیل لە شێوەی پیاوێکدا دەهات کە بەلایانەوە ئاسایی بوو تەماشایان دەکرد، گوێبیستی گوفتارەکانی بوون، سوودیان لێدەبینی، ﴿وَلَوْ أَنْزَلْنَا مَلَكًا﴾ ئەگەر فریشتەیەکمان بناردایەتە خوارەوە ﴿لَقُضِيَ الْأَمْرُ﴾ بێگومان کار تەولو دەبوو لە ناو بردنیان جێبەجێ دەکرا، دەخران دەستبەجێ تۆڵەو سزایان بۆ دادەبەزی ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكًا لَجَعَلْنَاهُ رَجُلًا﴾ ئەگەر ئەو پێغەمبەرەمان بکردایە بە فریشتەیەك بێگومان دەمان گۆڕا بەوێنەی پیاوێك تا ببینن و قسەی لەگەڵ بکەن، پیاوێك لەڕەگەزی خۆیان بێت.

(٢)_ ﴿وَمَا صَاحِبُكُمْ بِمَجْنُونٍ﴾[التكوير: ٢٢] هاوڕێکەتان کە موحەممەدە ﷺ شێت نییە وەکو ئێوە دەڵێن، ﴿وَلَقَدْ رَآهُ﴾ واتە: جوبرەئیلی لەسەر شێوازی ڕاستەقینەی خۆی دیوە، ﴿بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ﴾ لەسەر زەمینی مەککەدا دیویەتی، کاتێ سەری بەرزکردەوە جوبرەئیلی لە نێوان ئاسمان و زەویدا بینی لەسەر ئەو شێوازەی کە خوای گەورە خوڵقاند بووی، (٦٠٠) باڵی هەبوو، هەر باڵێکی ئاسۆی داپۆشی بوو،

..........................................................
..........................................................
..........................................................
..........................................................

ئەمە بینینی یەكەم بوو، لە بارەی بینینی دووەمیشەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى(١٣) عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَى(١٤)﴾[النجم: ١٣_١٤] واتە ﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى﴾ سوێند بەخوا بێگومان جارێکی تر جوبرەئیلی بینیوە ﴿عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَى﴾ لای درەختی (سیدرەتولمونتەها)، ئەمە لەشەوی میعراجدا ڕوویدا، پێغەمبەری خوا ﷺ جوبرەئیلی لەسەر شێوازی ڕاستەقینەی خۆی نەبینیوە جگە لەدووجار: جاری یەكەم: لەسەر زەمینی مەككە، جاری دووەم: شەوی میعراج لای درەختی سیدرەتول مونتەها. جگە لەم دوو جارە جوبرەئیل _علیه السلام_ لەشێوەی پیاوێكدا دەچووە دیدەنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

...بِظَنِينٍ﴾(١) [التكوير: ٢٤] وە لە خوێندنەوەیەکی دیکەی قورئانیشدا:
﴿بِضَنِينٍ﴾ هاتووە: واتە: چرووك و دەست قوچاو نییە کە زانست نەدرکێنێت و
بیبەخشێت مەگەر بەرامبەر بەکرێ، وەکو ئەو کەسانەی کە زانست نادرکێنن مەگەر
بەرامبەر بەخەڵات و کرێیەك، ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَانٍ رَجِيمٍ﴾ [التكوير: ٢٥] وە ئەو
(قورئانە) قسەی شەیتانی دەرکراو لەبەزەیی خوا نییە (وەك ئێوە دەڵێن).

خوای گەورە جوبرەئیلی _ علیه السلام _ پاك ڕاگرتوەو بە دووری گرتووە لەوەی
کە شەیتانێك بێت هەروەها موحەممەدیشی ﷺ پاك ڕاگرتوەو بە دووری گرتووە
لەوەی کە شاعیرێك یان کاهینێك بێت.

بە ڕاستی ئەولیاو دۆستانی تەقواکارو لە خوا ترس بریتین لەوانەی کە
شوێنکەوتووی موحەممەدن ﷺ فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن و، لە قەدەغە
کراوەکانی دەست هەڵدەگرن(٢)

---

(١)_ ﴿وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِظَنِينٍ﴾[التكوير: ٢٤] ﴿بِظَنِينٍ﴾ بە(الظاد)ی خوشکی (ظاء): لە (الظَّنة)وە هاتووە واتە: گومانلێکراو نییە. لە خوێندنەوەیەکی دیکەی قورئانیشدا ﴿بِضَنِينٍ﴾ بە(الضاد)ی خوشکی (صاد) هاتووە: واتە چرووك و دەست قوچاو بێت و سرووش و وەحی خوای گەورە نەدرکێنێت، بەڵکو سرووشی خوای گەورە دەگەیەنێت و چرووکی نانوێنێت مەگەر بەرامبەر بەخەڵات و کرێ و ماڵ و سامان، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾[الشورى: ٢٣] واتە: بڵێ داوای هیچ پاداشتێکتان لێناکەم لەسەری. جوبرەئیل _علیه السلام_ سرووش و وەحی خوای گەورە ڕادەگەیەنێت و، چرووکی نانوێنێت و، هیچ کرێ بەخشێك لەخەڵکی وەرناگرێت.

(٢)_ خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە ئەوانەن کە لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢)

﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ (٦٣)﴾ [يونس: ٦٢ - ٦٣] ئەوانە دۆستانی ڕاستەقینەی خوای گەورەن کە باوەڕیان هێناوەو هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن. یەکێك لە بنچینەکانی باوەڕ بوون بەخواو تەقواکاری شوێنکەوتنی ڕاستی پێغەمبەری خوایە ﷺ، کەوا بوو ئەولیای خوای گەورە ئەوانەن کە شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەون، فەرمانەکانی جێبەجێی دەکەن و، ئەوەی ڕێگریی لێکردووە وازی لێدێنن، چونکە ئەمەیە مانای ڕاستی تەقوا، تەقوا بریتییە لەئەنجامدانی ئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوەو، وازهێنان لەوەی کە ڕێگریی لێکردووە، ئەمانەن ئەولیای ڕاستەقینەی خوای گەورە. بەڵام کەسانێك بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە بکەن و کەسانێکی ئیمانداری تەقواکاری گوێڕایەڵکاری پێغەمبەری خوا ﷺ نەبن ئەوە دۆستی شەیتانن و، دۆستانی خوای گەورە نیین. کەوا بوو مەسەلەکە بانگەشەو هاتوهوتی بەدەم نییە، بەڵکو مەسەلەکە بە حەقیقەت و کردەوەیە. بۆیە هەر کەسێك بڵێت: من وەلی و دۆستی خوام، تەماشای کردەوەکانی دەکەین، ئایا گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بووە؟ ئەگەر تەقواکارو لە خوا ترس بێت ئەوە وەلی و دۆستی خوای گەورەیە، وە ئەگەر کەسێکی یاخی بوو، ملکەچی خواو پێغەمبەرەکەی نەبوو، موخالەفەی شەریعەتی دەکرد، ئەمە دۆستی خوا نییە بەڵکو دۆستی شەیتانە.

لەوانەدا کە بۆی ڕوون کردونەتەوە شوێنی بکەون پەیڕەوی دەکەن، خوای گەورەش بەفریشتەکانی خۆی و بە قورئان و ئیمان لە لایەن خۆیەوە پشتگیریان دەکات[١] وە خوای گەورە لە نورو ڕووناکیەکانی خۆی دەخاتە دڵیانەوە، وە خوای گەورە کەرامەتیشی پێداون کە بەهۆیەوە ڕێز لە دۆستانی تەقوا کاری خۆی دەگرێت[٢].

---

(١)_ ئەمانە خوای گەورە بە قورئان و ئیمان و نورو ڕووناکی خۆی پشتگیریان دەکات، لەو بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لاَ تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ﴾[المجادلة: ٢٢] واتە: کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە خواو بەڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یاکوڕو براو خزمیان بن ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە بەهێزی کردوون و سەری خستوون بە قورئان و ئیمان لە لایەن خۆیەوە. ئا ئەمانە دۆستانی ڕاستەقینەی خوای گەورەن کە دۆستایەتی دەکەن لە پێناوی خوا داو، دوژمنایەتیش دەکەن لە پێناوی خوا دا، ئا ئەمانە دۆستانی خوای گەورەن، بەڵام ئەو کەسەی لە نێوان ئیماندارو کافردا جیاوازی نەکات و، هەموویانی بەلاوە یەکسانە، لەنێوان گوێڕایەڵکارو سەرپێچی کاردا جیاوازی نەکات، ئەمە دۆستی خوای گەورە نییە، بەڵکو دۆستی شەیتانە.

(٢)_ خوای گەورە دۆستانی خۆی بەهێزی ئیمان پشتگیری دەکات، لە نورو ڕووناکی خۆشی دەخاتە دڵیانەوە بۆ ئەوەی هەق و باتڵ لێك جیا بکەنەوە، بەنورو رووناکی خوای گەورە تەماشا دەکەن، ئەمانە کەڕامەتیان پێدراوە، بەڵام مەرج نییە هەموو وەلی و دۆستێکی خوای گەورە کەرامەتی پێدرێت، بەڵام پێدەچێ دۆستی خوای گەورە کەڕاماتی هەبێت، کەڕامەتیش: بریتیە لە کارو کردەوەیەکی نائاسایی لە سروشت بەدەر کە خوای گەورە لەسەر دەستی دۆستێکی خۆی بەدی دەهێنێت، بۆ دامەزراندنی بەڵگە لەسەر کەسی موخالیف و سەرپێچی کار، بۆ ئەوەی بەڵگەیەك بێت لەسەر ڕاستگۆیی دۆستەکەی

خۆی وه یا لەبەر پێویستێتی خەڵك، دواتریش باسی ئەمە دەكرێت. ئەگەر كردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر لەسەر دەستی پێغەمبەرێك بەدیهات ئەوە موعجیزەیە، ئەگەر لەسەر دەستی وەلیەك بەدیهات ئەوە كەرامەتە، ئەگەر لەسەر دەستی كافرێك بەدیهات ئەوە كردەوەیەكی لە سروشت بەدەری شەیتانیەو كەرامات نییە، چونكە كافران و، جادووگەران و، شوێنكەوتوانی شەیتانەكانیش كردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانیان هەیە، بە هەوادا دەفڕن، بەسەر ئاودا ڕێدەكەن، دەچنە نێو ئاگرەوەو، چەندەها شتی تر كە زیانیان پێ ناگەیەنێت، پێویستە فریویان پێنەخورێت لەبەر ئەوەی ئیمانداری تەقواكاری گوێڕایەڵكاری خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ نین، بەڵكو كردەوە گەلێكی نائاسایی شەیتانیە، شەیتانەكان خزمەتیان دەكەن و، دۆستی خوای گەورە نین، بۆیە فریو بەكردەوەكانیان ناخورێت، بەڵام ئەگەر لەسەر دەستی ئیماندارێكی تەقواكار بەدیهات ئەوە كەرامەتێكە خوای گەورە پێی بەخشیوەو، یارمەتی ئەنجامدانی داوە.

كەرامەتی ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە لە قورئان و سووننەتدا جێگیر بووە، لە قورئاندا چیرۆكی هاوەڵانی ئەشكەوت و بەسەرهاتەكەیان، هەروەها چیرۆكی مەریەم و ئەو ڕۆزیەی بۆی دەهات لە شوێنی خواپەرستیەكەیدا، هەر كات زەكەریا بڕۆشتایەتە دیدەنی مەریەم لەشوێنی خواپەرستیەكەیدا خواردەمەنی لەلا دەبینی، پێی وە گوت: ئەمەت لە كوێ بوو ئەی مەریەم؟ دەیگوت: ئەوە لەلایەن خواوەیە بە ڕاستی خوا ڕۆزی هەر كەسێك دەدات كە بیەوێ بە بێشومار. ئەمە كەرامەت بوو چونكە مەریەم (صِدیقَة) بوو، وەكو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ﴾[المائدة: ٧٥] واتە: مەسیحی كوڕی مەریەم هیچ نییە جگە لە پێغەمبەری خوا بێگومان لە پێش ئەوەوە چەندەها پێغەمبەر بوون دایكیشی ئافرەتێكی زۆر ڕاستگۆیە، مەریەم لە دۆستانی خوای گەورە بوو بۆیە لە شوێنی خواپەرستیەكەیدا ڕۆزی پێدەبەخشی.

وە چاکترین دۆستانی خوای گەورە: کەرامەتەکانیان بۆ دامەزراندنی بەڵگەیە لە ئاییندا یان بۆ پێویستیەکی موسڵمانانە[1] هەروەها موعجیزاتی پێغەمبەرەکەشیان ﷺ بەو شێوە بوو[2].

---

(١)_ مەرج نییە وەلی و دۆست کەرامەتی هەبێت، بەڵام پێدەچێت خوای گەورە کەرامەت لەسەر دۆستێکی خۆی بەجێبێنێت، بۆ دامەزراندنی بەڵگە لەسەر کەسی سەرپێچی کار یان لەبەر پێویستیەکی موسڵمانان. بەڵام شتەکە بۆ فیتنەو ئاژاوەنانەوە نییە، وەکو ئەو کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرانەی کە لەسەر دەستی جادووگەران و کاهینەکان و شوێنکەوتوانی جنۆکەو شەیتانەکان ئەنجام دەدرێت.

(٢)_ ئەگەر کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر لەسەر دەستی پێغەمبەرێك بەدی هات ئەوە موعجیزەیە، ئەگەر لەسەر دەستی وەلیەکیش بەدیهات ئەوە کەرامەتەو لە هەمان کاتیشدا موعجیزەیەکە بۆ پێغەمبەر، چونکە وەلی ئەوەی بەدەستهێنا بە هۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواوە ﷺ، کەوا بوو کەرامەتی ئەولیا موعجیزاتە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

# باسێك

## سەبارەت بەوەی کەوا (ڕێزی) کەرامەتی ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە لەڕاستیدا تەنها بەهۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە ﷺ بەدی دێت

کەرامەتی ئەولیای خوای گەورە لە ڕاستیدا تەنها بەبەرەکەتی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواوە ﷺ بەدی دێت، بۆیە _لە هەقیقەتدا_ دەچێتە چوارچێوەی موعجیزەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ وەکو لەت بوونی مانگ[1] أخرجه البخاري (٣٦٣٦)، و(٣٦٣٧)، و(٣٦٣٨)، ومسلم (٢٨٠٠) و (٢٨٠٢) و (٢٨٠٣) وە (سبحان الله)کردنی بەرد لە نێو لەپیدا[2]

---

(١)_ یەکێك لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەت بوونی مانگە، کاتێك هاوەڵپەرستان داوای لەت بوونی مانگیان لێکرد، خوای گەورە مانگی بۆ لەت کردن، لەتێکی لەسەر شاخی ئەبی قوبەیس بوو لەتەکەی دیکەشی لەسەر شاخی قەیقەعان بوو، خەڵکی تەماشایان دەکرد، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ (١) وَإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ (٢)﴾[القمر: ١_٢] واتە: ڕۆژیی دوایی نزیك بوویەوە وە مانگ لەتبوو وە ئەگەر بێبڕوایان موعجیزەیەك ببینن پشت هەڵدەکەن وە دەڵێن ئەمە جادوویەکی بەردەوامە (و موحەممەد لێیان دەکات). کاتێ مانگ بوو بە دوو لەتەوە گوتیان: موحەممەد جادووی لێکردین، بەڵام ئەوە تەنها موعجیزەیەکی ڕاست بوو.

(٢)_ بەرد لە نێو لەپی پێغەمبەری خوادا ﷺ (سبحان الله)ی کرد تاوەکو خەڵکیش گوێبیستی بوون، ئەمە موعجیزەیەك بوو لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

قال صاحب مجمع الزوائد (٨/٢٩٩): رواه البزار بإسنادين ورجال أحدهما ثقات وفي بعضهم ضعف، رواه الطبراني في الأوسط، وه هاتنی دارو درهختهكان بۆ لای[1] صحيح: أخرجه مسلم (٣٠١٢)، من حديث جابر بن عبدالله رضي الله عنه. وه بیرکردن و تامهزرۆ بوونی قهدی دارهخورماكه بۆی[2] صحيح: أخرجه البخاري (٢٠٩٥)، و(٣٥٨٥)، من حديث جابر رضي الله عنه. وه یهكێكی تر له موعجیزه گهورهكان ههواڵی به خهڵكی دا كه بیتول مهقدیس چۆنهو چۆی نییه له شهوی میعراجدا[3] صحيح: أخرجه البخاري(٣٨٨٦)، و(٤٧١٠)، من حديث جابر مرفوعاً، وأخرجه مسلم (١٧٢)، من حديث أبي هُريرة مرفوعاً.

---

(١)_ كاتێ پێغهمبهری خوا ﷺ چووه سهرئاو ویستی خۆی لهبهر چاوان به دور بگرێت و له پاڵ دار و درهختێكدا دانیشێت، بهڵام درهختێكی نهدۆزیهوه له پاڵی دا دانیشێت جگه له دارو درهخت گهڵێكی پهرش و بڵاو، پێغهمبهری خوا ﷺ بانگی كردن دهستبهجێ به فهرمانی خوای گهوره كۆبونهوه، ئهویش كردنی به پهناگهیهك بۆ دانیشتنی خۆی، ئهمه موعجیزهیهك بوو كه ههموو خهڵك تهماشایان دهكرد. ئهمه له فهرموودهكهی جابیردا رضي الله عنه هاتووه كه ئاوی بۆ پێغهمبهری خوا ﷺ ههڵگرتبوو، ئهمهی بینی بوو.

(٢)_ سهرهتا پێغهمبهری خوا ﷺ لهسهر قهدی دارخورمایهك وتاری دهخوێندهوه، دواتر مینبهرێكی بۆ دروست كراو وتارهكانی لهسهر مینبهرهكه دهخوێندهوه، بۆیه قهدی دارخورماكه بیری دهكردو تامهزرۆی پێغهمبهری خوا ﷺ بوو، هاواری دهكرد وهكو چۆن منداڵی بچوك هاوار دهكات، چونكه ئهو زیكرو یادهی له دهست چوو كه له پێغهمبهری خواوه ﷺ گوێبیستی دهبوو، ههموو خهڵكیش گوێبیستی تامهزرۆ بون و هاواری قهدی دارخورماكه بوون.

(٣)_ له موعجیزهكانی پێغهمبهری خوا ﷺ ئیسراو میعراج بوو له یهك شهودا، شهورهویهكهی بۆ بهیتول مهقدیس كه له نێوان ئهو و مزگهوتی حهرام دا ماوهیهكی

زۆر درێژه، ئینجا بەرزبونـەوەی بـۆ ئاسمـان و پاشـان دابـەزینی بـۆ بەیتولمەقدیس و گەڕانـەوەی بـۆ مەککـە لـە یـەك شـەودا، پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـەڕۆژی کردەوە ڕووداوەکەی بۆ خەڵکی گێڕایـەوە، فیتنـەو ئاشـوبێکی گـەورە ڕوویـدا، هاوەڵپەرستان دڵخـۆش بـوون و، دەسـتیان دایـە دورخسـتنەوەی خـەڵکی لەپێغەمبـەری خـوا ﷺ، گوتیان: درۆزنە، چۆن بەیەك شەو دەچێتە بەیتول مەقدیس؟ لە کاتێکدا ئێمە بە وشتر ئەوەنـدەو ئەوەنـدە ماوەمـان دەوێ بـۆ گەیشـتن بـەو شـوێنە، بـەڵام بـە ئیمامی ئەبوبەکریان گوت: قسەی هاوەڵەکەتت نەبیستووە؟ فـەرمووی: نـەخێر، پێیـان گوت: دەڵێت: چۆتە بەیتولمەقدیس و، بۆ ئاسمان بەرز بۆتەوەو، بۆ مەککـە گەڕاوەتـەوە لە یەك شەودا، ئەویش ﷺ فـەرمووی: ئەگـەر ئەمـەی فـەرموو بێـت بـە دڵنیـایی ڕاستی فەرمووە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز درۆینەکردووە، ئیمـامی ئەبوبـەکر ﷺ لە سرووش و وەحیا بڕوای پێدەکرد، ئیتر چۆن لەم ڕووداوە سەرسوڕمێنەدا بڕوای پێ ناکات، بەڕاسـتی ئـەوە بـەهێزی ئیمانـە، جـێگیر بـوونی ئیمانـە لـە دڵدا کـە بـە هیچ شێوەیەك لە کاتی فیتنەو ئاشوب دا لەق نابێت. هاوەڵپەرستان لە پێغەمبەری خوایان ﷺ داواکرد وەسفی بەیتول مەقدیسیان بـۆ بکـات، چـونکە پێشـتر خۆیـان چووبونە ئەوێ و نیشانەکانیان دەزانی، پێغەمبەری خـواش ﷺ دانیشـت و وەسـفێکی تـەواوی کرد، چـونکە خـوای گـەورە بـەیتول مەقدیسـی بـەرز کـردەوەو هێنایـە پـێش چاوی پێغەمبەر ﷺ ئیتر وەکو خۆی وەسفێکی جوانی بۆ کردن، ئـەوە بـوو هاوەڵپەرستان سەریان لەوە سوڕما، ئەمە یەکێك بوو لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

دە هەواڵدانی بە هەندێ لەو شتانەی کە بووەو بەوەش کە دەبێت[1] صحيح: أخرجه مسلم (٢٨٩٢)، هەروەها پەلێکی تر لە موعجیزانە کە گەورترینیانە قورئانی پیرۆز[2]،

---

(١)_ لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵدانی بوو بەو غەیبە ڕابڕدوو و داهاتووانەی کە خوای گەورە بۆی درکاند بوو، بەتەنها خوای گەورە غەیب دەزانێت، بەڵام هێندێك لەو غەیبیانەش بۆ پێغەمبەرانی خۆی دەدرکێنێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاءَ﴾[البقرة: ٢٥٥] واتە: وە کەس ئاگای نییە لە هیچ شتێك لە زانین و زانیاری ئەو (خوا) مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێ. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الغَيْبِ فَلاَ يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً(٢٦) إِلاَّ مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ(٢٧)﴾[الجن: ٢٦_٢٧] واتە: هەر خوایە زانا بە نهێنیەکان وە کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیدا مەگەر پێغەمبەرێکی کە لێی ڕازی بێ. خوای گەورە هێندێك غەیب و نهێنی بۆ پێغەمبەرانی خۆی دەدرکێنێت، بۆ ئەوەی بە خەڵکی ڕاگەیەنن و، دامەزراندنی بەڵگەیەکیش بێت بەسەریانەوە، ئەمە لە موعجیزاتە چونکە بەدەر لە خوای گەورە کەسی تر غەیب و نهێنی نازانێت. لەو غەیب و نهێنیانەش پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی نەتەوەکانی ڕابردوو و نەتەوەکانی داهاتووشی پێ ڕاگەیاندووین، وە ئەو هەواڵانەی کە سەبارەت بە نەتەوەکانی ڕابڕدوو و داهاتوو پێداوین وەکو خۆی بەدی دەهات. تەنانەت کاتێ مانگ لەت بوو و خەڵکی مەککە بڕوایان پێ نەکرد، خەڵکانی دەشتەکی کە هاتنە مەککە مانگیان بە لەت کراوی بینی بوو.

(٢)_ ئەمە گەورەترینی هەموو موعجیزەکانە، گەورەترین موعجیزەکان ئەم قورئانەیە کە هێنای لە کاتێکدا نەخوێندەوارە ناخوێنێتەوەو نانوسێت ﷺ ئەم قورئانە پیرۆزەی هێنا کە مرۆڤ و جنۆکە بەتێکڕا لە بەرامبەریدا بێتوانا بوون، لەم

بارەوە خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾[الإسراء: ٨٨] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ سوێند بە خوا ئەگەر ئادەمی و پەری هـەموو کۆببنـەوە بـۆ ئـەوەی وێنـەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن هەر چـەندە پشـتیوانی یـەکتریش بـن. ئەم ئایەتە لە مەککە دابەزی پێش کۆچکردن، تەحەدای کردن لە کاتێکدا لـە مەککە بوو فەرمووی وێنەی ئەم قورئانە بێنن، نـاتوانن وێنـەی ئـەم قورئانـە بێـنن، نەئێستاو نە لەداهاتووشـدا، هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ(٢٣)فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ(٢٤)﴾[البقرة: ٢٣_٢٤] واتە: وە ئەگـەر ئێـوە لـە گومانـدان لـەم (قورئانـەی) کـە ناردوومانەتـە خـوارەوە بۆ بەنـدەی خۆمـان (موحەممـەد ﷺ) دەسـورەتێك بێـنن بـە وێنـەی ئـەو وە بـانگی هاوکارەکانتان بکەن (لە ڕەوانبێژان و شاعیران) بێجگە لە خوا ئەگەر ڕاستدەکەن (بە فەرموودەی خوای نازانن) ئینجا ئەگـەر ئەمـەتان نـەکرد وە هـەرگیز ناشیکەن (ئێوە بێبڕوا مەبن)، (لَنْ): لـەزمانی عەرەبیـدا بـۆ داهـاتوو و ئاییندەیە، واتـە تـاوەکو ڕۆژی قیامەت ناتوانن دەی خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سووتەمەنیەکەی خەڵکی (بەکار) و بەردە بۆ بێبڕوایان سازکراوە (ئامادەکراوە). تەحەدای کردن کە وێنەی قورئان بێنن نەیانتوانی، تەحەدای کردن دە سوڕەت بێنن نـەیانتوانی، تەحـەدای کـردن سوڕەتێك بێنن نەیانتوانی، بێتوانا بوون بە وێنـەی سـوڕەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ یـان ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ یـان ﴿وَالْعَصْرِ﴾ بێـنن، ئەمـە گـەورەترین بەڵگەکانـە، ئائەمـە موعجیزەیەکە کە بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە، قورئان موعجیزەی بەردەوامـە تـاوەکو ڕۆژی قیامەت، گەورەترینی موعجیزەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

زۆرکردنی خواردن و خواردنەوە چەندین جار لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ[1]،
بۆ وێنە کاتێك خەڵکی کەندڕ (خندق)ەکەی لە مەنجەڵێکی خواردن تێر کردو کەمیشی
نەکرد، صحيح: أخرجه البخاري (٢و٤١٠١)، ومسلم (٢٠٣٩) من حديث جابر رضي الله عنه. لە
فەرمووده بە ناو بانگ (مشهور) ەکەی ئوم موسەلەمەدا[2]

---

(١)_ لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرکردنی خواردن و خواردنەوەی کەم بوو، ئەگەر دەستی بخستایەتە نێو خواردنی کەمەوە ئیتر ئەو خواردنە کەمە کۆمەڵێکی زۆری تێر دەکردو، لێشی دەمایەوە، ئەگەر خەڵکەکە تینوو بوایەن، دەستی موبارەکی دەخستە نێو ئاوەکەوە تا لەنێوان پەنجەکانیەوە ئاوەکە هەڵدەقوڵا ئیتر ئاوی دەدایە هەر هەموو ئەو خەڵکەی لەگەڵی دا بوون تا تێریان دەخواردەوە، دەیان خواردەوەو دەست نوێژیان دەشوشت لە ئاوێك کە بنەڕەتەکەی کەم بوو، ئەمەش موعجیزەیەکی تری پێغەمبەری خوا بوو ﷺ.

(٢)_ کەندڕ (خندق): بریتی بوو لەو چاڵەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەوری شاری مەدینەی پیرۆزدا هەڵیکەند بۆ ڕێگری کردن لە هاوەڵپەرستان بۆ ئەوەی توانای هاتنە ناوەوەی شاری مەدینەیان نەبێت، هاوەڵی بەڕێز سەلمانی فارسی رضي الله عنه پێشنیاری کرد پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەندڕ (خندق)ە هەڵکەنێت، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە یاوەری هاوەڵانی هەڵکەندنی کەندڕ (خندق) ەکەیان تەواو کرد، کاتێکیش هاوەڵپەرستان گەشتن توانای پەڕینەوەی کەندڕ (خندق) یان نەبوو، گوتیان: ئەمە پیلانێکە پێشتر عەرەب نەیزانیووە، خوای گەورە ئەو کەندڕ (خندق)ەی کرد بە هۆکاری بەرپەرچدانەوەی دوژمنان، هاوەڵانی بەڕێز کە کەندڕ (خندق)ەکەیان هەڵدەکەنی پێغەمبەری خوایان ﷺ لەگەڵ دابوو یارمەتی دەدان، ئوم موسەلەمەی

---

دایکی ئەنەس، ئەنەسی کوڕی مالیکی، خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ، برسێتی بە ڕووی پێغەمبەری خواوە ﷺ بەدی کرد، بەپەلە چوو شتێك خواردنی دروست کردو، بە ئەنەسی فەرموو: بچۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ بکە، ئەوە بوو ئەنەس چوو پێغەمبەری خوای ﷺ بانگ کرد، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ چوو تەماشایەکی خواردنەکەی کرد بینی شتێکی کەمی خواردنی دروست کردووە، ئەنەسی نارد بانگی هەموو خەڵکی کەندڕ (خندق)ەکە بکات، هەموو خەڵکی کەندڕ (خندق)ەکە لە هەزار زیاتر دەبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە نێو خواردنەکەوەو بەرەکەتی تێکەوت ئیتر تێکڕای خەڵکەکە تێر بوون، شتێکیشی لێمایەوە، ئەمەش یەکێك تر بوو لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

صحيح: أخرجه البخاري (٣٥٧٨)، ومسلم (٢٠٤٠)، من حديث أنس ﷺ. لە غەزای خەیبەردا سوپاکەی لە مەشکەیەك تێر ئاو کرد بەبێ ئەوەی کەم بکات[1] صحيح: أخرجه البخاري (٣٥٧١)، ومسلم (٦٨٢)، من حديث عمران بن حصين ﷺ، لە غەزای تەبوکدا کیسەی سەربازەکانی لە خواردنێکی کەم پڕکردو کەمیشی نەکرد لە کاتێکدا ژمارەیان نزیکەی سی هەزار دەبوون[2] صحيح: أخرجه مسلم (٧٠٦)، من حديث معاذ بن جبل ﷺ.

---

(١)_ ئەوان لە غەزادا بوون و زۆر زۆر بوون نەمەشکەیەك و نە چەندەها مەشکەش بەشی نەدەکردن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکی کرد خوای گەورە بەرەکەتی خستە مەشکە ئاوەکەیانەوە، ئاوەکە زۆربوو تاوەکو بەشی هەر هەموو سوپاکەی کرد.

(٢)_ لە غەزای تەبوکدا نزیکەی سی هەزار سەرباز دەبوون، خۆراکیان کەم بریەوەو، هەستیان بەبرسێتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن خۆراکەکانیان لەسەر ڕاخەرێك کۆکەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نزای کردو لە خوای گەورەی داواکرد بەرەکەتی تێخات، فەرمووی: ببەن، چەند لە توانایاندا بوو لەو خۆراکەیان برد تەنانەت بەشی ماڵەوەشیان برد، تێربوون و لێشیمایەوە.

چەندین جار لە نێوان پەنجەکانیەوە ئاو هەڵقوڵاوە تا بە تەواوی بەشی هەموو ئەو خەڵکانەی کردووە کە لەگەڵی دابوون، وەکو ئەوەی لە غەزای حودەیبیەدا ڕوویدا کە نزیکەی هەزارو چوارسەد یان هەزارو پێنجسەد کەس دەبوون[1] صحيح: أخرجه البخاري (٣٥٧٦)، وفي غير موضع، ومسلم مختصرا في طرق حديث (١٨٥٦) من حديث جابر، وە یەکێکی تر لە موعجیزەکان گەڕانەوەی چاوی قەتادە بۆ جێگەکەی خۆی کاتێ کەوتە سەر ڕوومەتی، ئیتر بو بە چاکترینی هەر دوو چاوی[2]

---

(١)_ هاوەڵانی بەڕێز ئاویان بەلاوە کەمبوو، بەشی دەستنوێژشتن و، خواردنەوەو، چێشت لێنانی نەدەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە نێویەوە ئاوەکە لەنێوان پەنجەکانیەوە هەڵقوڵا، خەڵکەکە مەشکەکانی خۆیان پڕ کرد، ئەمە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کە نەك جارێك بەڵکو بە چەندەها جار دووبارە بۆتەوە. لە غەزای حودەیبیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەمرە چووبوو، هاوەڵپەرستان ڕێگریان لێکردن، لە شوێنێك دابەزین ئاوی کەمبوو لە حودەیبیە کە دەکەوێتە سنووری حەرەمەوە لەبەری ڕۆژئاواوە بە تەنعیمەوە پەیوەندە، ئاویان کەم بویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نزایکردوو لە خوای گەورەی داواکرد بەرەکەت بخاتە نێو ئاوەکەیانەوە، ئاوەکەیان زۆربوو تا بەشی کردن.

(٢)_ ئەبوقەتادە یەکێك بوو لە هاوەڵە بەڕیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەغەزایەکدا لە چاویدرا، دەرچوو و کەوتەسەر ڕوومەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاندیەوە شوێنەکەی خۆی، تاوەکو خوای گەورە چاکیکردەوەو، بوبە چاکترینی هەردوو چاوەکانی.

ن الهيثمي في المجمع(٨/٢٩٧): رواه الطبراني وأبويعلى، وفي إسناد الطبراني من لم أعرفهم، وفي
إسناد ابويعلى يحيى بن عبدالحميد الحماني وهو هـــەروەها ضعيف، هـــەروەها كـــاتێ
موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی نارد بۆ کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف، کەوت و
ناچی شکا، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستە موبارەکەکانی خۆی دەستی پێداهێناو
چاك بویەوە[1] صحيح: لكنه ليس موحه مه د بن مسلمة بل هو عبدالله بن عتيك، فقد
أخرج البخاري (٤٠٣٩)، وە هەروەها لە ناو سکی مەڕێك صەدو سی پیاوی تێرکرد، بۆ
هەر یەکێکیان پارچەیەکی بڕی و، دوو لەگەنیشی لە ناو سکەکە پڕ کرد، هەر
هەموویان لێیان خوارد، پاشان شتێکیشی لێمایەوە[2]

---

(١)_ هەروەها کەعبی کوڕی ئەشرەفی جوولەکەی ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەداو، یارمەتی هاوەڵپەرستانی دەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ موحەممەدی کوڕی موسیلەمەی بۆ نارد، ئەویش فەرمانەکەی بەجێهێنا، بەڵام کە ویستی بگەڕێتەوە کەوت و قاچی شکا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی موبارەکی خۆی پێدا هێناو چاك بویەوە، وەکو ئەوەی هیچی تووش نەبوو بێت.

(٢)_ هەروەها گۆشتیش، گوشتێکی کەم، لە یەك مەڕ و ئەوانیش زۆر بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ یەکێکیان لەو گۆشتە پارچەیەکی بڕی تا هەر هەموویان تێربوون و، شتێکیشی لێمایەوە.

صحيح: أخرجه البخاري(٢٦١٨)، و(٥٣٨٢)، ومسلم(٢٠٥٧)، هەروەها عەبدوڵڵای بابی جابیری هاوەڵی بەڕێز قەرزی جوولەکەیەکی لابوو کە سێ (وسق) بوو جابیریش بەخاوەن قەرزەکەی فەرموو کە هەر هەموو خورماکە بەرێت بەرامبەر بە قەرزەکەی خۆی، بەڵام ڕازی نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بە نێویدا ڕێی کردو، پاشان بە جابیری فەرموو: ((جُدَّ له)) واتە: ((بۆی بکێشە))، ئەوە بوو هەر سێ (وسق)ەکەی دایەوەو، حەڤدە (وسق)یشی مایەوە[1] صحیح: أخرجه البخاري (٢٣٩٦)، من حديث جابر بن عبدالله رضي الله عنه. وەکو ئەمانەش زۆرن کە نزیکەی هەزار موعجیزەم کۆ کردۆتەوە[2].

---

(١)_ هەروەها چیرۆکی عبدوڵڵای بابی جابری هاوەڵی بەڕێز رضي الله عنه کە لە جەنگی ئوحودا شەهید بوو، قەرزی جوولەکەیەکی لابوو کە سێ (وسق)ی خورمابوو، (وسق)یش (٦٠صاع)ە بە کێشی ئەم ڕۆژگارەی خۆمان (١٣٠) کیلۆغەرام دەبێت _ ئەمەش شتێکی زۆرەو ئەویش بەری خورماکەی کەم بوو، لە پیاوە جوولەکەکەیان داواکرد هەموو خورماکەیان بەرێت و وازبێنێت بەڵام ڕازی نەبوو، داوای هەموو قەرزەکەی خۆی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هات و بە نێو باخەکەی عەبدوڵڵادا ڕێی کردو، پاشان پێی فەرموو: بۆی بکێشە، ئیتر بۆی کێشا تاوەکو هەر سێ (وسق)ەکەی دایەوەو، حەڤدە (وسق)ی زیادیشی مایەوە، ئەمە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ.

(٢)_ پێغەمبەری خوا ﷺ موعجیزەی زۆرە ئەمانەش تەنها چەند نموونەیەکن. نزیکەی هەزار موعجیزەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆ کراوەتەوە کە بە (دلائل النبوة) بەناوبانگە وەکو ئەوەی پێشەوایان ئەلبەیهەقی و ئەبی نوعەیم و غەیری ئەوانیش پێی هەستاون. ئەمە چەند نموونەیەکی موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا بوون ﷺ. کەرامەتی ئەولیاو دۆستان و هاوەڵانی بەڕێزیش دیسان زۆرن.

## باسێك

## سەبارەت بەیاد هێنانەوە و باسکردنی چەمکێك لە کەرامەتی هاوەڵانی بەڕێز و تابعین

وە کەرامەتی هاوەڵانی بەڕێزو تابعین و پیاوچاکانی تر زۆر زۆرن(١):

وەکو ئەوەی ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ﷺ سورەتی (الكهف) ی دەخوێند، لە ئاسمانەوە پەڵە هەورێك دابەزی وەکو چراخان و ڕووناکی تێدا بوو، ئەوانە فریشتەکان بوون دابەزین بۆ ئەوەی گوێبیستی خوێندنەوەکەی بن(٢) صحيح: أخرجه البخاري معلقاً (٥٠١٨)، (٥٠١١)، ومسلم (٧٩٥).

---

(١)_ کەرامەت تەنها لەسەر هاوەڵانی بەڕێز سنوردار نەکراوە، بەڵکو تابعین و شوێنکەوتوانی تابعین و ئیماندارانی تریش کەرامەتیان هەبووە.

(٢)_ ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ﷺ بەشەو هەڵدەستاو قورئانی دەخوێند، دەنگێکی خۆشی هەبوو، شەوێکیان هەستا نوێژی دەکردو، قورئانی دەخوێند، شتێك بەسەریدا دابەزی وەکو پەڵە هەورێك چراخان و ڕووناکی تێدا بوو، کە ئەسپەکەی ئەوەی بەدیکرد سمکۆڵانی کرد تا ئەوەندەی نەما بوو یەحیای کوڕی کە لە نزیکی نوستبوو پێی لێنێت، بۆ بەیانی چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((ئەوە فریشتەکان بوون دابەزین بۆ ئەوەی گوێبیستی خوێندنەوەکت بن، ئەگەر بەردەوام بوایەی ئەوانیش بەردەوام دەبوون تاوەکو خەڵکیش دەیانبینین))، ئەوە کەرامەتی ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ﷺ بوو.

فریشتەکان سڵاویان لە عیمرانی کوڕی حوصەین رضي الله عنه دەکرد عزاه الحافظ في ((الإصابة)) (٢٧/٣)، إلى الدارمي من طريق سليمان بن حرب، سەلمان و ئەبودەرداء پێکەوە لە قاپێکدا خواردنیان دەخوارد، قاپەکە یان خواردنەکە (سبحان الله)ی کرد[1]، عەببادی کوڕی بیشر و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر لە شەوێکی تاریکدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕانەوە، ڕووناکیەك وەکو سەری قامچیەك بۆیان کرایەوە، کاتێکیش جیا بوونەوە ڕووناکیەکە لەگەڵ هەردوکیاندا جیابویەوە.[2] صحيح: أخرجه البخاري (٣٨٠٥)، وانظر ((مستدرك الحاكم)) (٢٨٨/٣).

---

(١)_ لە کەرامەتی ئەولیا ئەوەبوو کە سەلمانی فارسی و ئەبی دەرداء رضي الله عنهما لە قاپێکدا خۆراکیان دەخوارد، ئەوە بوو هەر دوکیان گوێبیستی (سبحان الله)ی قاپەکە یان خۆراکی نێو قاپەکە بوون، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾[الإسراء: ٤٤] واتە: وە هیچ شتێك نییە کە بەسوپاسی ئەو ستایش نەکات بەڵام ئێوە تێناگەن لە تەسبیحاتەکەیان. بەڵام جار بە جار خوای گەورە ئەوە بە دەردەخات بۆ ئەوەی ببێتە کەرامەتێك بۆ وەلی و دۆستی خوا.

(٢)_ عەببادی کوڕی بیشر و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر سەرەتای شەو لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون، پاشان هاتنەدەرەوە دەیانویست بچنەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان، شەوەکەش زۆر تاریك بوو، خوای گەورە نورو ڕووناکیەکی بۆ کردنەوە وەکو قامچی لە پێشی هەر دوکیانەوە بوو، کاتێکیش جیابوونەوە ڕووناکیەکە بوو بە دوو بەشەوە بۆ هەر دوو کیان، ئەوە کەرامەتی ئەولیا بوو.

- ...بروزکی ئەبوبەکری صـدیق لـە((الصحیحین))دا[1] صحيح: أخرجه
البخاري (٦٠٢)، و(٥٣٨٥)، ومسلم(٢٠٥٧)، من حديث عبدالرحمن بن أبي بكر رضي الله عنه
کاتێ سێ میوانەکەی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ ماڵەوە، کە پارویەکی دەخوارد
زیاتر زیادی دەکرد، تێربوون و خواردنەکەش لە جاران زۆرتری لێهات، ئەبو
بەکر خێزانی تەماشای خواردنەکەیان کرد بۆیان دەرکەوت ئەمە لە جاران زۆرترە
بۆیە بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ بردو کەسانێکی زۆریش هاتنە خزمەتی هەموویان
لێیان خواردو، تێر بوون.

- خوبەیبی کوڕی عەدی رضي الله عنه لای هاوەڵپەرستەکان لەمەککە دیل بوو، ترێی بۆ
دەهێنراو دەیخـوارد لـە کاتێکـدا دەنکـە ترێیـەك لەمەککـەدا نـەبوو[2] أخرجه
البخاري(٣٠٤٥)، وفي غير موضع من صحيحه من حديث أبي هُريرة رضي الله عنه.

---

(١)_ پێشەوا ئەبی بەکری صیدیق رضي الله عنه سێ میوانی لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵەکەی خۆی بردەوە، هیچ شتێکیشیان نەبوو مەگەر خواردنێکی کەم، خوای گەورە بەرەکەتی خستە خواردنەکەیانەوە، کەمی نەدەکرد بەڵکو زیادی دەکرد، چەندیان لێبخواردایە زیادی دەکرد تاوەکو زیادەکەشیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ برد ئەویش لێی خواردو، کەسانێکی زۆریش لێیان خوارد، ئەمە زیاد بوونی خواردن بوو، کەرامەتێك بوو بۆ ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه.

(٢)_ خوبەیبی کوڕی عەدی هاوەڵپەرستەکانی مەککە بەدیل گرتیان و، بۆ مەککەیان بردەوە، دایەنە دەستی کەسانێك کە خوبەیب بابی کوشت بوون، ئەوانیش بەندیان کرد، هیچ خواردنێکی لانە بوو، لە بەندیخانەکەیدا ترێی بۆ دەهێنرا، لە کاتێکدا دەنکە ترێیەك لە مەککەدا نەبوو، زانراوە مەککە ترێی تێدا نییە، ئەمەش یەکێك بوو لە کەرامەتی ئەو هاوەڵە بەڕێزە.

– عامری کوڕی فوهەیرە ﷺ شەهید بوو[1] صحيح: أخرجه البخاري (٤٠٩٣)، بەدوای جەستەکەیدا گەڕان، نەیاندۆزیەوە، چونکە کاتێ کوژرا بوو بەرز کرا بۆوە، عامیری کوڕی طوفەیل بینیبووی، عوروەی کوڕی زوبێر دەڵێت: لەو باوەڕەدان کە فریشتەکان ناشتوویانە.

---

(١)_ عامیری کوڕی فوهەیرە ﷺ خزمەتکاری پێشەوا ئەبی بەکر ﷺ بوو، عامیر لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێشەوا ئەبی بەکردا ﷺ بوو لە ڕێگای کۆچکردنیاندا بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، عامیری کوڕی طوفەیلی پیس چوو بووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکردبوو کۆمەڵێ هاوەڵانی لەگەڵدا بنێرێت بۆ ئەوەی هۆزەکانی عەرەب فێر بکەن، بەڵام مەبەستە سەرەکیەکەی تەنها غەدرو ناپاکی کردن بوو، حەفتا هاوەڵ لە ئەهلی صوففەی لەگەڵدا چوو، فەرمانیشی دابووە هاوەڵپەرستان کە هەر هەموویان کوشتن ﷺ، یەکێك لەوانەش کە شەهید کرا عامیری کوڕی فوهەیرە بوو، عامیری کوڕی طوفەیلی پیس بینیبووی عامیری کوڕی فوهەیرە بۆ ئاسمان بەرزدەکرێتەوە، واتە: فریشتەکان بەرزیان دەکردەوە، دواتریش تەرمەکەیان نەدۆزیەوە، بە دوایدا گەڕان بۆ ئەوەی بینێژن بەڵام نەیاندۆزیەوە، فریشتەکان ناشتیان، ئەمەش لە کەرامەتی ئەولیا بوو.

- ئوممو ئەیمەن عزاه الحافظ في ((الإصابة)) (٤/٤٣٢) إلى ابن سعيد وابن السكن، عن عثمان بن القاسم، بە مەبەستی کۆچکردن چووە دەرەوە، خواردن و خواردنەوەی پێ نەبوو، هێندەی نەما بوو بەهۆی تینوبونەوە بمرێت، لە کاتی ڕۆژوو شکاندندا، چونکە بە ڕۆژو بوو، گوێبیستی جوولە و دەنگێکی نزم بوو، کە سەری بەرز کردەوە جاوەنەیەکی هەڵواسراوی بەدیکرد، ئاوی لێخواردەوە تاوەکو تێر بوو، ئیتر تاوەك و تەمەنی ما تینووی نەبوو[1].

---

(١)_ ئوممو ئەیمەنی حەبەشی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بابیەوە بۆی بەجێمابو، لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریـثەدا هاوسەرگیری کردو، ئوسامەی کوڕی زەیدیان بوو ﷺ، بە مەبەستی کۆچکردن چووە دەرەوەو، هیچ شتێکی پێ نەبوو، بە ڕۆژووش بوو، کاتی ڕۆژوو شکاندن هاتە پێشەوەو، خواردن و خواردنەوەی پێ نەبوو، جەونەیەکی ئاوی بەدی کرد کە لە نێوان ئاسمان و زەویدا هەڵواسرا بوو، بەسەر سەریەوە بوو، ئاوی لێخواردەوە تاوەکو تێر بوو، پاش ئەوە خوای گەورە تینویەتی نەهێشت و، ئیتر باقی تەمەنی تینووی نەبوو، ئەمە کەرامەتی ئەولیا بوو. لەوانەیە کەسانێك هەبن بپرسن: بەبێ مەحرەم چووە دەرەوە؟ ئێمەش دەڵێین (شێخ صالح الفوزان) ئەوە کاتی نا چاری بوو، ئەگەر ژن لە پێناوی پاراستنی ئاین و ئیمانەکەیدا کۆچی کرد ئەوە ناچاریەو بوونی مەحرەمی لەسەر هەڵدەگیرێت، چونکە لە پێناو پاراستنی دین و ئیمانەکەیدا بە تەنیا کۆچیکردووە.

– سەفینەی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێرێکی ڕاگەیاند کە ئەو نێردراوی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆیە شێرەکە لەگەڵیدا ڕێی کرد تا بە شوێنی مەبەستی گەیاند[1] أخرجه الحاكم (٣/٦٠٦)، من حديث سفينة، وفي إسناده محمد بن عبدالله بن عمرو بن عثمان، وقد تُكلمَ فيه.

– بەڕائی کوڕی مالیك هەر کات سوێندی بخوار دایە خوای گەورە سوێندەکەی بەجێ دەهێنا[2] حسن: أخرجه الترمذي (٣٨٥٤)، والحاكم (٤/٢٩١و٢٩٢)، من حديث أنس رضي الله عنه مرفوعاً، هەر کات جەنگەکە بەلای موسڵمانەوە سەخت بوایە دەیانگووت: ئەی بەڕاء سوێند بخۆ پەروەردگارت سەرمان بخات، دەیفەرموو: پەروەردگارا، سوێندەم خواردەوە کە شکست بە کافران بێنیت، ئیتر دوژمن دەشکا، لە ڕۆژی جەنگی توستوردا، فەرمووی: پەروەردگارا سوێندم خواردوە شکستیان پێبێنیت و، بشمکەیت بە یەکەم شەهید، ئەوە بوو خوای گەورە شکاندنی و، بەڕائیش شەهید بوو.

---

(١)_ سەفینە خزمەتکاری پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، پێغەمبەر ﷺ بەکارێك ناردی، سواری کەشتیەك بوو، کەشتیەکە شکا، خۆی بەتەختەیەکەوە هەڵواسی تا بەدورگەیەك گەیشت، کە لە دورگەکە دابەزی دەستبەجێ شێرێکی لە پێشی خۆیدا بەدی کرد، شێرێکی برسی، سەفینە ترسا لەوەی بیخوات، بەشێرەکەی گوت: من نێردراوی پێغەمبەری خوام ﷺ ئیتر شێرەکە سەری داخست، پاشان ڕێگەشی پێشاندا، تاوەکو لە دەریاکە چووە دەرەوە شێرەکەی لەگەڵدا بوو ڕێگەکەی پیشاندەدا، ئەمەش دیسان لە کەرامەتی ئەولیا بوو.

(٢)_ بە ڕائی کوڕی مالیك رضي الله عنه شڕۆڵ بوو، چونکە پیاوێکی زاهیدی تەقواکاری خواپەرست بوو، هەر کات سوێندی بخواردایە خوای گەورە سوێندەکەی جێبەجێ

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------

دەکرد، هەر کات لە غەزادا جەنگەکە سەخت بوایە داوایان لێدەکرد سوێند بخوات کە خوای گەورە سەریان بخات ئیتر سەر دەخران، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((رُبَّ أشْعَثَ أغْبَرَ مَدْفُوعٍ بالأبواب لو أقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ)). واتە: ((پێدەچێ کەسێکی قژ بژی زۆر تەپو تۆزاوی کە لە دەرگاکاندا پاڵی پێوە دەنرێت و دوردەخرێتەوە، ئەگەر سوێند بخوات خوای گەورە نزاکەی قبوڵ بکات، ئەوا قبوڵی دەکات))، بەڕاستیش یەکێك بوو لەوانە، لە کۆتا دا لە خوای گەورەی داواکرد موسڵمانان سەر بخات، ئیتر سەری خستن و، لە خوای گەورەشی داواکرد شەهید بوونی پێبەخشێت، ئەوە بوو شەهید بوو.

– خالیدی کوڕی وەلید کەمارۆی قەڵایەکی قایمیدا، گوتیان خۆمان بەدەستەوە نادەین تاوەکو ژەهر نەخۆیتەوە، ئەوەبوو خواردی و زیانی پێنەگەیاند[1] أخرجه الطبراني (٣٨٠٨)، و(٣٨٠٩) الحديث أخرجه أيضاً ابن حبان في الموارد(٢٢١٥)، وله شاهد أخرجه الطبراني رقم (٣١٨) (١٠٥/١) المعجم الكبير، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد (٣٥٠/٩).

– سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص ﷺ نزا و دوعا قبوڵ کراو بوو[2] أخرجه الترمذي (٣٧٥١)، هەرگیز نزای نەکردووە قبوڵ نەکرا بێت، هەر ئەو بوو کە سەربازانی کیسرای شکست پێهێناو، عێراقی ڕزگارکرد.

---

(١)_ خالیدی کوڕی وەلیدی شۆڕەسوار و فەرمانده‌ی سەرکەوتوو گەمارۆی قەڵایەك لە قەڵاکانی هاوەڵپەرستان دەدات، پێی دەڵێن: خۆمان بە دەستەوە نادەین تا ژەهر نەخۆیتەوە، تەحددایە، ئەویش دەیخوات و ئەوان تەماشا دەکەن، زیانی پێ ناگەیەنێت، لە کاتێکدا ژەهر خواردنی مرۆڤ دەکوژێت، ئەمە لە کەرامەتی ئەولیا بوو.

(٢)_ سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص ﷺ یەکێکە لەو (دە) کەسەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، نزاو دوعا قبوڵ کراو بوو، ئەوەش لە کەرامەتی ئەو پیاوە بوو کە نزاکانی قبوڵ کراوبێت، هەرشتێکی لە خوای گەورە داوا کرد بێت پێیداوە، سەعد فەرماندەیەکی سەرکەوتوو بوو کە لە جەنگی قادسیەدا فەرماندەی موسڵمانان بوو، عێراقی ڕزگار کردو، کیسرای تێکشکاند.

ـ عومەری کوڕی خەطاب رضي الله عنه سوپایەکی ناردو پیاوێکی کرد بە فەرماندەیان بە ناوی ساریە، لەکاتێکدا عومەر ووتاری دەخوێندەوە، لەپڕ لەسەر مینبەرەکەوە هاواری کرد: ئەی ساریە شاخەکە، ئەی ساریە شاخەکە شاخەکە، نێردراوی سوپاکە هاتەوەو، لێی پرسی: ئەویش گووتی: ئەی ئەمیری موسڵمانان لەگەڵ دوژمنەکەماندا جەنگاین شکستیان پێهێناین، دەستبەجێ گوێبیستی کەسێك بووین هاواری دەکرد: ئەی ساریە شاخەکە، ئەی ساریە شاخەکە، ئیتر پشتی خۆمان دایە شاخەکەوە تا خوای گەورە شکستی سەری خستن[1] أخرجه أحمد في فضائل الصحابة (٣٥٥) جـ (١/٢٦٩)، من حديث عبدالله بن عمر رضي الله عنهما، وفي إسناده يحيى بن أيوب الغافقي وثقه بعض أهل العلم وضعفه آخرون.

---

(١)_ ئەمە یەکێکە لە کەرامەتی ئەولیا کە لەسەر دەستی پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب رضي الله عنه بەدیهات، سوپایەکیان بەرەو ڕۆژهەڵات نارد بوو، ڕۆژی هەینی پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب رضي الله عنه وتاری دەخوێندەوە، لە پڕدا هاواری کردو، فەرمووی: ئەی ساریە شاخەکە، ئەی ساریە شاخەکە، بانگی فەرماندەی سوپاکەی کرد، ئەی ساریە شاخەکە، گوێبیستی دەنگی بوون لە کاتێکدا لە ڕۆژهەڵاتیش بوون، پشتیان دایە شاخەکەوەو جەنگان تاوەکو خوای گەورە دوژمنەکەیانی تێکشکاندا، ئەمە لە کەرامەتی ئەولیا بوو کە خوای گەورە دەنگی پێشەوا عومەری رضي الله عنه بۆ ماوەیەکی دوور ناردو، سوودی بە سوپاکە گەیاند. ئەمە کەرامەتە لە هەمان کاتیشدا موعجیزەیەکە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

– کاتێك زینیرە رضي الله عنها بەهۆی موسڵمانبوونیەوە سزادەدرا، بەڵام بە هیچی تر قایل نەبوو جگە لە موسڵمان بوون و، چاوەکانی کوێر بوون، هاوەڵپەرستان گوتیان: لات و عوززا چاویان کوێر کرد، فەرمووی: نەخێر بە خوا، ئەوە بوو خوای گەورە چاوەکانی چاك کردەوە[1] قصة الزنيرة موجودة في ترجمتها في ((الإصابة)) (٣١١/٤ و ٣١٢)، وعزاها الحافظ ابن حجر إلى الفاكهي وإلى ابن ابي شيبة في تاريخه.

– سەعیدی کوڕی زەید رضي الله عنه دوعای لە ئەروای کچی حەکەم کرد، کاتێك بەدرۆ تاوانباری کرد، فەرمووی: پەروەردگارا ئەگەر درۆزنە چاوەکانی کوێر بکەو، لەنێو زەویەکەی خۆیدا بیکوژە، ئەوە بوو کوێر بوو و لە زەویەکەی خۆیدا کەوتە چاڵێکەوەو مرد[2] صحيح: أخرجه مسلم عقب حديث (١٦١٠).

---

(١)_ ئەمەش دیسان کەرامەتی ئەولیایە، کاتێك ئەم ژنە چاکە دەستی بە ئایینەکەیەوە گرت و، لەسەر سزای هاوەڵپەرستان ئارامی گرت و، چاوەکانی کوێربوون، هاوەڵپەرستان گوتیان: لات و عوززا چاویان کوێر کرد، خوای لێ ڕازی بێت فەرمووی: نەخێر بە خوا، ئیتر خوای گەورە چاوەکانی بۆ چاك کردەوە.

(٢)_ ئەمە سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمرِی کوڕی نوفەیلی ئامۆزای عومەری کوڕی خەطابە رضي الله عنه، زەیدی کوڕی عەمری بابی یەکێك بوو لەوانەی کە خوای گەورە لەسەردەمی نەفامیدا بۆ یەکخواپەرستی ڕێنوێنی کرد، ئیتر خوای گەورەی بە تاك و تەنها داناو، لە بت پەرستی نکوڵی کرد، چەندەها شیعریشی هەیە سەبارەت بە یەکخواپەرستی و نکوڵێك ردن لە هاوەڵپەرستی، سەعیدی کوڕی یەکێکە لەو دەکەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، لەمەدینەی پیرۆزدا باخێکی هەبوو، باخی ژنێکیش بەتەنیشتیەوە بوو، ژنەکە وایڕاگەیاند گوایە سەعید شتێکی لە باخەکەی بردوە، بەڵام درۆزن بوو، بۆیە سەعید دوعای لێکرد، چونکە بە درۆ تاوانباری کرد، دوعای لێکرد کوێری بکات و لە نێو زەویەکەی خۆیدا بیکوژێت، خوای گەورەش دوعاکەی قبوڵ کردو، چاوەکانی کوێرکردو لەنێو زەویەکەی خۆیدا کوشتی، چونکە بەدرۆ تاوانباری کرد.

- عەلائی کوڕی ئەلحەضرەمی ﷺ کار بە دەستی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ بەسەر بەحرەینەوە، لە دوعاکانیدا دەیگووت: (یا علیم یا حلیم یا عظیم)، ئیتر خوای گەورە دوعاکانی قبولّ دەکرد، کاتێ ئاویان کەم بویەوە دوعای کرد خوای گەورە بارانیان بۆ ببارێنێت کە تێر ئاو بن و دەست نوێژی پێ بشۆن و، بۆ ئەوانەی دوای خۆشیان باران ببارێنێت، ئەوەبوو دوعاکەی قبولّ کرا، کاتێکیش کە دەریاکە ڕێی گرتن و نەیانتوانی بە ئەسپەکانیان بپەڕنەوە دیسان دوعای کرد، ئیتر خۆی و سەربازەکانی بەسەر ئاوەکەدا پەڕینەوە بەبێ ئەوەی زینی ئەسپەکانیان تەڕبو بێت، هەروەها لە خوای گەورەی داواکرد هەر کات مرد جەستەی نەبینن، ئیتر لە گۆڕەکەدا نەیانبینیەوە[1] انظر هذا الدعاء، وهذه القصة في ((الكامل في التاريخ)) لابن الأثير (٢/٢٤٩_٢٥٢)، وراجع أيضا ((الإصابة)) و ((أسد الغابة)) (ترجمة العلاء).

- هەمان شت بەسەر ئەبی موسلیمی خەولانیدا هات _ئەو پیاوەیە کە خرایە نێو ئاگرەوە_ خۆی و ئەو سەربازانەی کە لەگەڵیدا بوون بەسەر دیجلەدا پەڕینەوە، لە کاتێکدا ئاوەکە کە داری فڕێدەدایە دەرەوە لەبەر زۆر بەرزبونەوەی، پاشان بە لای هاوەڵەکانیدا ئاوڕێکی دایەوەو، گووتی: ئایا شتێکتان وون بووە تا لە خوای گەورە داوا بکەم بیگەڕێنێتەوە؟ کەسێکیان گووتی: تورەکەیەکی ئالیکم ونبووە، گووتی: شوێنم کەوە، شوێنی کەوت تەماشای کرد بەشتێکەوە نووساوە، هەڵیگرت و بردیەوە[2].

---

(١)_ عەلائی کوڕی ئەلحەضرەمی ﷺ کار بە دەستی پێغەمبەری خوابوو ﷺ بەسەر بەحرەینەوە، واتە لەحسە، چونکە لەو کاتەدا بەحرەین بە لەحسە ناو دەبرا، بەو جۆرە دوعای دەکرد ئیتر قبولّ دەکرا.

(٢)_ ئەبی موسلیمی خەولانی دۆستێك بوو لە دۆستەکانی خوای گەورە لە یەمەن، تابعی بوو، ئەسوەدی عەنسی کاتێ بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد بانگی

کردو، پێی گوت: ئایا شایەتومان دێنیت کە من پێغەمبەری خوام؟ ئەویش گوتی: نابیستم، پێی گوت: ئەی شایەتومان دێنیت کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ گوتی: بەڵێ، بۆیە فەرمانیدا ئاگرێکیان داگیرساندو، فڕێیان دایە نێوی، بەڵام ئاگرەکە زیانی پێنەگەیاند، ئەمە کەرامەتێك بوو بۆ ئەو پیاوە، هەر ئەم ڕووداوە بوو کەپێشتر بەسەر ئیبراهیمی خەلیلدا هات، ئەوە بۆ ئیبراهیمی خەلیل موعجیزە بوو، بەڵام بۆ ئەبو موسلیمی خەولانی کەرامەت بوو، پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ چووە مەدینەی پیرۆز ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ لەنێوان خۆی و ئەبوبەکری صیدیقدا ﷺ داینیشاندو، پێی فەرموو: سوپاست بۆ ئەو خوایەی کە نەیمراندم تا لە ئوممەتی موحەممەدیشدا کەسێکم بینی کە خوای گەورە لە ئاگر ڕزگاری کرد بێت وەکو ئەوەی ئیبراهیمی خەلیلی لە ئاگر ڕزگار کرد، کەرامەتی دووەمی پەڕینەوەیان بوو لە ڕووباری دیجلە بەسەر ئەسپەکانیانەوە تەنانەت بە هاوەڵانیشی گوت: ئایا کەسێکتان شتێکی ونبووە، پیاوێکیان گوتی: بەڵێ من تورەکەیەکی ئالیکم ون بووە، بە یەکەوە چوون تەماشای کرد بەشتێکەوە نووساوە، هەڵیگرت و بردیەوە.

هـەروەها أبـو مسـلمی خـولانی خزمەتکارەکـەی ژەهـری بـۆ خسـتە نێـو خواردنەکەیەوە خواردی و زیانی پێنەگەیاند[١]، هەروەها أبو مسلم ژنێکی خێزانەکەی مێردەکەی لێی هەڵگەڕایەوە، دوعای لێکرد کوێر بوو، دواتر ژنەکە هاتەوە بۆ لای تەوبەی کرد، ئەویش دوعای بۆکردو، خوای گەورە چاوەکانی چاك کردەوە[٢].

- عامیری کوڕی عەبدقەیس بەشەکەی خۆی لە بەیتول مال لـەنێو سـەرقوڵەکەیدا دەبرد، دوو هـەزار دیرهـەمی دەخستە نێـو سـەرقوڵەکەیەوەو هـەر داواکارو هـەژارێك بگەیشتایە پێیەکەیدا بوایـە مەگـەر دەیدایـە بـەبێ ژمـاردن، پاشـان کـە بـۆ ماڵەکـەی خـۆی دەگەڕایەوە نەژمارەو نەکێشی دیرهەمەکان کەمی نەدەکرد[٣].

---

(١)_ هەر چەندە ژەهـر سیفەتی کوشـتنە، بـەڵام ئـەو خوایـەی کـە لـە ئاگرەکـە ڕزگاری کرد بە توانایـە لـە ژەهرەکـەش ڕزگـاری کـات، خـوای گـەورە خاسـیەتی ئـەو ئاگرەیان نامێنێت، خاسیەتی سوتاندن لە ئاگرەکە دەسێنێتەوە، خاسیەتی کوشـتنیش لە ژەهرەکە دەسێنێتەوە.

(٢)_ چـیرۆکی سـێیەم کەرامـەتی سـێیەمە، وشـەی (خبب) واتـای فریـودان و هەڵگەڕانەوەی خێزان لە مێردەکەی دەبەخشێت، نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی خێزان لە مێردەکەی هەڵدەگەڕێنێتەوە.

(٣)_واتە بەشەکەی خۆی لە بەیتولمال دەبردو دەیخستنە نێو سەرقوڵەکەیەوە هـەر هەژارێکی پێگەیشتایە پێـی دەبەخشـی، بـەڵام ژمـارەی دیرهەمـەکانی کـەمی نـەدەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ)) واتە: ((خێرو صـەدەقە لـە سەروەت و سامان کەم ناکاتەوە)) بەڵکو زیادیشی دەکات، زیاد کردنەکەش دوو شێوەی هەیە، یەکەم: ژمارەکە کـەم دەکـات بـەڵام بەرەکـەتی زیـاد دەکـات، دووەم: پێدەچێت ژمارەشی کەم نەکات، وەکو ئەوەی لەم چیرۆکەدا هاتووە، ئەمەش کەرامەتێك بوو بۆ ئەو پیاوە. بەڵام خـەڵکی تـر هـەر کـات خێـرو صـەدەقە بکـەن ژمارەکـە کـەم دەکـات بـەڵام بەرەکەتەکەی زیاد دەکات، بەڵام ئەم وەلی خوایە ژمارەی دیرهەمەکانیشی کەمی نەکرد.

هەرم ئەم پیاوە بەڕێزە بە لای کاروانێکدا تێپەڕ بوو تەماشای کرد شێرێك ڕێگەکەی لێگرتوون، لێی چووە پێشەوە تا پۆشاکەکەی بەردەمی شێرەکە کەوت، پاشان پێی نا بە ملیداو، گووتی: لە ڕاستیدا تۆ تەنها سەگێکی لە سەگەکانی ڕەحمان، وە لە خوای گەورە شەرم دەکەم کە لە شتێکی تری غەیری ئەو زاتە بترسم، ئیتر کاروانەکە تێپەڕبوون[١].

وە لە خوای گەورە داواکرد ساردی ئاوی زستانی بۆ سووك بکاتەوە، ئیتر ئاوێکی بۆ دەهێنرا هەڵمی هەبوو[٢] وە لە خوای گەورەی داوا کرد لە نوێژدا شەیتان نەتوانێ بە دڵێ دا بچێ، ئیتر شەیتان توانای بەسەریدا نەبوو[٣].

---

(١)_ خوای گەورە شێرە دڕندەکەی بۆ ملکەچ کرد کە خەڵکەکەی تۆقاند بوو، ڕێگەکەی لێگرتبوون، لێی نزیك بۆیەوەو، پێی نابە ملی شێرەکەداو، گوتی: لە ڕاستیدا تۆ تەنها سەگێکی لە سەگەکانی ڕەحمان، مەبەستی ئەوە بوو کە خوای گەورە بەتوانایە ڕێگریت لێ بکات لە زیان گەیاندن بە خەڵك، گوتی: من لە خوای گەورە شەرم دەکەم لەشتێکی تری غەیری ئەو بترسم، ئیتر شێرەکە وازی لێهێنان و، بەسەلامەتی تێپەڕ بوون.

(٢)_ لە خوای گەورەی داوا کرد کە لە زستاندا ساردی ئاوەکەی بۆ سووك بکاتەوە، هەڵدەستا بە ئاوێکی سارد دەست نوێژی و شت، ئیتر ئاوی گەرمی بۆ دەهێنرا، خوای گەورە دوعاکەی قبوڵ کرد بوو، ئەمەش یەکێکی تر بوو لە کەرامەتەکانی.

(٣)_ شەیتان گومان و دوو دڵی و شتی خراپ و پیس بە بیری نوێژ خوێندا دەهێنێت، کەمن ئەو کەسانەی لەو شتە ڕزگاریان دەبێت، بەڵام ئەم دۆستە لە خوای گەورەی داوای کرد لە نوێژ دا شەیتانی لێ دور بخاتەوە، ئیتر شەیتان نەیدەتوانی لە نوێژدا بەد گومانیی و ڕاڕایی وبیرکردنەوەی بۆ دروست کات.

ـ حەسەنی بەصری نەچوو بۆ لای حەججاج، شەش جار چوونە ماڵەوە بۆی، ئەویش هەر شەش جار لەخوای گەورەی داواکرد نەیبینن ئیتر نەیانبینی[١]، هەروەها دوعای لە کەسێکی خەواریج کرد کە ئازاری دەدا ئیتر ئەو کەسە مرد[٢].

---

(١)ـ حەسەنی بەصری پێشەوای تابعینەکان و زانای بە ناو بانگ، حەججاج لێی نزیک دەبوو، چونکە حەسەنی بەصری بۆ خوای گەورە سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران کاری تێنەدەکردو، نکۆڵی لەحەجاج دەکرد، وەکو دەزانن حەجاج پیاوێکی خراپەکار بوو، خوێنرێژبوو، ترسناك بوو، حەججاج ناردی بەشوێن حەسەنی بەصریدا، سەربازانی حەججاج چوونە ماڵەوە بۆی، لەخوای گەورەی داواکرد نەیبینن، نەیانبینی، خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا توانادارە، وەکو چۆن چاوی هاوەڵپەرستانی بەست بەرامبەر بەعیسای کوڕی مەریەم تا لە نێوانیان بەرزی کردەوە، لە کاتێکدا کۆ بوبونەوە بۆ کوشتنی، هەروەها وەکو چۆن موحەممەدی ﷺ لە هاوەڵپەرستانی مەککە ڕزگار کردو، لە نێوانیانەوە چووە دەرەوە، دواتریش خۆی و ئەبوبەکری هاوەڵی بەڕێزی لە ئەشکەوتی ثەور ڕزگار کرد کاتێك لەسەر سەریان وەستا بوون، هەر بەو جۆرەش حەسەنی بەصری ڕزگار کرد، ڕزگار بوون موعجیزەیەك بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە کەرامەتێکیش بوو بۆ حەسەنی بەصری، کەرامەتیش کە ڕوو دەدات لەبەر پێویستیەکە یان بۆ ئەوەیە ببێتە بەڵگەیەك لە ئاییندا.

(٢)ـ کۆمەڵی خەواریج: کۆمەڵێکی گومڕان و ڕیزی موسڵمانان تێك دەدەن و، گوێڕایەڵی وەلی ئەمری موسڵمانان نابن و، موسڵمانان کافر دەکەن بەهۆی ئەو تاوانانەوە کە لە خوار شیرك و هاوەڵپەرستی بە پیاوێکی ئەو کۆمەڵە ئازاری حەسەنی بەصری دەدا، چونکە حەسەنی بەصری موخالیفی بیرو باوەڕی ئەوان بوو، گوفتارەکانیانی هەڵ دەوەشاندەوە، بۆیە لە حەسەنی بەصری بێزار بوون و، پیاوێکی خەوارج هەڕەشەی لێکرد، ئەویش دوعای لێکرد، دەست بەجێ لە شوێنەکەی خۆیدا مرد، قبوڵ بوونی دوعا دەستبەجێ کەرامەتی ئەولیایە.

- صیلەی کوڕی ئەشیەم: لەغەزادا ئەسپەکەی مرد، گووتی: پەروەردگارا هیچ کەسێك منەتم بەسەردا نەکات، دوعاشی کرد خوای گەورە ئەسپەکەی بۆ زیندوو کردەوە، کاتێکیش گەیشتەوە ماڵ، گووتی: کوڕم زینی ئەسپەکە داگرە چونکە ئەمانەت و دەست خوازە، کە زینەکەی داگرت ئەسپەکە مرد[(١)].

---

(١)_ هەروەها پێدەچێ خوای گەورە هێندێك چوار پێ پاش مردن زیندوو بکاتەوە وەکو کەرامەتێك بۆ دۆستەکانی خۆی، چونکە شتومەکەکانی لەسەر هەڵدەگرێت و، ماوەی ڕێگاکەی پێدەبڕێت، لەوانەیە بمرێت ئەویش لەخوای گەورە داوادەکات زیندووی بکاتەوە، بۆ ئەوەی بیگەیەنێت، ئەم شتە چەندین جار بۆ دۆستانی خوای گەورە دووبارە بۆتەوە، خوای گەورە کە مردووەکان زیندوو دەکاتەوە، یان بۆ ژیانێکی بەردەوامە، یان بۆ ژیانێکی کاتییە، وەکو پیاوە کوژراوەکەی بەنی ئیسرائیل کاتێ بە بەشێك لە ئێسکی لە مانگاکە لێیاندا دەستبەجێ خوای گەورە زیندووی کردەوەو، بە خەڵکەکەی ڕاگەیاند کە کێیە کەسەی کوشتویەتی، هەروەها چیرۆکی ئەوانەی کە لە ترسی مردندا چوونە دەرەوە کاتێ پەتاکە لە شارەکەیاندا بڵاو بویەوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَاهُمْ﴾ [البقرة: ٢٤٣] واتە: ئایا وورد نەبویتەوە لەوانەی کە لە وولاتی خۆیان دەرچوون لە کاتێکدا کە ئەوان هەزاران (کەس) بوون لە ترسی مردن ئینجا خوا پێی ووتن بمرن لەپاشان زیندووی کردنەوە. هەروەها چیرۆکی ئەوانەی کە بەمووسا پێغەمبەریان _ علیه السلام _ گوت: ﴿فَقَالُوا أَرِنَا اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ﴾[النساء: ١٥٣] واتە: گوتیان خوامان نیشان بدە بە ئاشکرا جا بروسکەیەك لێیدان و گرتنی بە هۆی ستەم کردنیانەوە،

-----------------------------------------------
-----------------------------------------------
-----------------------------------------

هەموویان لە ناو چوون بەڵام پاشان مووسا _علیه السلام_ لە خوای گەورەی داواکرد زیندویان بکاتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بگەڕێنەوە بۆ بەنی ئیسرائیل، ئەوەکا بڵێن: خاڵکە چاکەکەی کوشتین، بۆیە خوای گەورە زیندوی کردنەوەو لەگەڵیدا گەڕانەوە، چونکە خوای گەورە تواناداره بەسەر هەموو شتێکدا. یان چیرۆکی ئەو پیاوەی بە لای شارەکەدا تێپەڕ بوو، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ﴾[البقرة: ٢٥٩] واتە: یا وەك ئەو کەسەی (عوزەیر) کە ڕابورد بە لای شارێکدا (بيت المقدس) لە کاتێکدا ئەو (شارە) دیوارەکانی ڕۆخا بوو بەسەر سەربانەکانیدا (عوزێر) گوتی خوا چۆن ئەم شارە ئاوەدان دەکاتەوە پاش مردنی (واتە پاش وێران بوونی) یەکسەر خوای گەورە سەد ساڵ مراندی پاشان زیندووی کردەوە. خۆی و گوێدرێژەکەی سەد ساڵ مراند، پاشان خۆی و گوێدرێژەکەی زیندوو کردەوە، ئائەمە تواناو قودرەتی خوای گەورەبوو.

هەروەها هەر ئەم پیاوە بەڕێزە ڕۆژێك لە ئەهواز برسی بوو، لە خوای گەورەی داوا کرد خۆراکی پێببەخشێت، لە پشتەوە دەفەرێکی خورمای ڕوتابی تازە پێگەیو کە لە نێو پۆشاکێکی ئاوریشمدا بوو بۆی کەوتە خوارەوە، خورماکەی خوارد و پۆشاکەکەش ماوەیەك بەلای خێزانەکەیەوە مایەوە[1].

شەوێك لە بێشەو جەنگەڵێکدا نوێژی دەکرد شێرێکی بۆ هات، کاتێ سڵاوی دایەوە، پێی گووت: لە شوێنێکی دیکە بە دوای ڕۆزیەکەی خۆتدا بگەڕێ، شێرەکە بە ئەرە ئەر دورکەوتەوە.

– سەعیدی کوڕی موسەیب لە ڕۆژەکانی (الحرّة) دا دەنگی بانگی لە گۆڕەکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەبیست، لە کاتی نوێژەکاندا، لە کاتێکدا مزگەوتەکە هیچ کەسێکی تێدا نەبوو جگە لە خۆی[2].

---

(١)_ کاتێ ئەم دۆستەی خوای گەورە برسی بوو لە خوای گەورەی داواکرد خۆراکی بداتێ یەکسەر دەفرێك خورمای بۆ هات، خۆراکی تێدا بوو، لە نێو پۆشاکێکی ئاوریشمدا، خورماکەی خواردو، پۆشاکەکەشی دابە خێزانەکەی، چونکە ئاوریشم بۆ پیاو حەڵاڵ نییە، ماوەیەك ئەو پۆشاکە ئاوریشمە لای خێزانەکەی مایەوەو، دەیپۆشی، ئەمەش لە کەرامەتی ئەولیا بوو.

(٢)_ سەعیدی کوڕی موسەییبی مەخزومی پێشەوای تابعینەکان و یەکێکە لە حەوت فیقە زانەکە، بە زانستی زۆر بە ناو بانگ بوو، کاتێ (الحرّة) ڕوویدا، (الحرّة): ئەو کارەساتە بوو کە سوپاکەی یەزید غەزای خەڵکی شاری مەدینەی پیرۆزی کرد، چونکە ئەهلی مەدینە لە یەزیدی کوڕی موعاویە جیا بوونەوە، لەم بارەشەوە بە هەڵەدا چوو بوون، چونکە نابێت لە کار بە دەستی موسڵمانان جیا ببێتەوە،

--------------------------------

يزيد بەزيد بە سوپاكەيەوە غەزاى كردن و، بە خراپى كوشتنى و، زێدەڕۆ بوو لە تۆڵە سەندنەوەدا، ئيبن و عومەر ﷺ خۆى لەفيتنەو كارەساتەكە بە دور گرت و، نەشيهێلا كوڕەكانى بەشدارى تێدا بكەن، لەو باوەڕدا بوو كە بەيعەت دان بە يەزيد لە ئەستۆياندايە، ڕێگرى لێكردن لە ڕازينە بوون بە يەزيد بەڵام قبوڵيان نەكرد، دەرەنجامەكەش ئەوەبوو كە ڕوويدا، هەروەها سەعيدى كوڕى موسەيب خۆى لەو كارەساتە بە دورگرت، لە مزگەوتەكەدا مايەوە لەكاتێكدا هيچ كەسێكى ترى تێدا نەبوو، بانگيشى تێدا نەدەدرا لەو ماوەيەدا، بەڵام گوێبيستى بانگدان دەبوو لە ڕووى گۆڕەكەى پێغەمبەرى خواوە ﷺ، ئەمە كەڕامەتێك بوو لە كەڕامەتى ئەوليا.

- پیاوێك له هۆزی نەخع گوێ درێژێکی هەبوو، له ڕێگەدا تۆپی، هاوەڵەکانیشی پێیان گووت: وەره با شتومەکەکانت له نێوانماندا دابەش کەین، ئەویش پێی گووتن: ماوەیەك کاتم پێ بدەن، چوو دەستنوێژێکی پاکی شتوشت و، دوو ڕکاعات نوێژی کردو، نزای کرد، خوای گەوره گوێدرێژەکەی بۆ زیندوو کردەوەو، شتومەکەکانی پێهەلگرت[1].

کاتێ ئوەیسی قەرەنی کۆچی دوایی کرد، تەماشایان کرد له نێو پۆشاکەکانیدا چەند کەفەنێکی تێدایه که پێشتر پێی نەبوو، تەماشاشیان کرد له بەردێکدا گۆڕێکی بۆ هەڵکەندراوەو، گۆڕێچه (لَحْدْ) یەکیشی له نێودایه، بەو کەفەنانه کەفەنیان کردو له گۆڕەکەشدا ناشتیان[2].

---

(١)_ ئەم چیرۆکه هاوشێوەی چیرۆکەکەی صیلەی کوڕی ئەشیەمی پێشووه که خوای گەوره گوێدرێژەکەی بۆ زیندوو کردەوه، نەیهێڵا پێویستی به خەڵکی بێت، پیاوەکه له خوای گەورەی داوا کرد منەتی خەڵکی لەسەر هەلگرێت، بۆیه خوای گەوره نەیهێڵا پێویستی به خەڵك هەبێت و، گوێدرێژەکەشی بۆ زیندوو کردەوه، تا به شوێنی خۆی گەیشت.

(٢)_ ئوەیسی قەرەنی تابعیەکی بەڕێز بوو _تەنانەت کەسانێك له ئەهلی زانست بەچاکترینی تابعینەکانیان داناوه_ وەکو ئەوەی له (صحيح مسلم ٢٥٤٢) دا هاتووه کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ له فەرموودەیەکدا که ئیبن وعومەر رضي الله عنه دەیگێڕێتەوه فەرموویەتی: ((إنَّ رَجُلاً يَأْتِيكُمْ مِنَ اليَمَنْ يُقَالُ لَهُ أُوَيْسٌ: لا يدعُ باليمنِ غيرَ أمٍّ لَهُ قدْ كانَ بِهِ بياضٌ)) وفي روايةٍ: ((بَرَصٌ)) فدعا الله فأذهبهُ عنهُ، إلا مَوْضِعَ الدِّينارِ أوِ الدِّرْهَم، فَمَنْ لقيهُ مِنكمْ فَلْيَسْتَغْفِرْ لَكُمْ)) وفي رواية: ((إنَّ خيرَ التابعينَ رجلٌ يُقالُ لهُ أُوَيْسٌ، ولَهُ والِدَةٌ، وكانَ بِهِ بَيَاضٌ، فَمُرُوهُ فَلْيَسْتَغْفِرْ لَكُمْ)). واتە: ((پیاوێك دیدەنیتان دەکات ئوەیسی پێ دەگوترێت، هیچ کەس له یەمەن بەجێ ناهێڵێت جگه له دایکێك که سپێتی هەبوو))

---

لە ریوایەتێکدا: ((بەڵەکێتی)) دوعای کرد خوای گەورە چاکیکردەوە، جگە لە شوێنێکی بە ئەندازەی دینارێك یان دیرهەمێکە، هەر کەس پێی گەیشت با ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکات)) لە ریوایەتێکدا ((چاکترینی تابعینەکان پیاوێکە ئوەیسی پێدەگوترێت، دایکێکی هەیە نەخۆشی بەڵەکێتی هەبوو، داوای لێبکەن با ئیستیغفارو داوای لێ خۆشبوونتان بۆ بکات)).

پێشتر باسی ئوەیسی قەرەنی کرا، یەکێکە لە تابعینە بەرێزەکان و، دۆستێکی بەرێزی خوای گەورەیە، خەڵکی یەمەن بوو، دوعا قبوڵ کراو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەکانیدا باسی کردووە کەوا دێتە مەدینەی پیرۆز، هەر کەس دەتوانێت با خۆی پێگەیەنێت بۆ ئەوەی نزاو دوعای بۆ بکات، ئوەیسی قەرەنی پیاوێکی گوێڕایەڵ بوو بەرامبەر بە دایکی، کاتێ شاندی یەمەن بەمەدینەی پیرۆز گەیشتن ئوەیسیان لەگەڵدا بوو، پێشەوا عومەری خەطاب ﷺ پێی زانی و، بە دوایدا گەڕا تا پێی گەیشت داوای لێکرد ئیستیغفارو داوای لێ خۆشبوونی بۆ بکات. ئەمە ئوەیسی قەرەنی بوو، یەکێکە لەئەولیاکانی خوای گەورە، کاتێ مرد چەندین کەفەنیان لە نێو پۆشاکەکانیدا بینی کە پێشتر پێی نەبوو، کاتێکیش ویستیان بینێژن، تەماشایان کرد گۆڕەکەی ئامادەیەو، هیچ کەسێکیش هەڵی نەکەندووە، ئیتر لەوێدا ناشتیان، ئەمە لە کەرامەتی ئەولیایە کە خوای گەورە لەسەر دەستی کەسانێکیان بەدیدێنێت.

– ڕۆژێـك عـەمری كـوڕی عوقبـەی كـوڕی فەرقـەد لـە گەرمایـەكی بەتینـدا نوێژی دەكرد، پەڵە هەورێك سێبەری بۆكرد، ئاژەڵە دڕندەكان پاسەوانیان دەكرد لە كاتێكدا ووشترە سواریەكانی هاوەڵانی دەلەوەڕاند، چونكە مەرجی لەسەر هاوەڵانی دادەنا كە لە غەزادا خزمەتیان بكات[١].

– موطەڕەف كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی شیخخیر هـەر كـات بچوایەتە نێـو ماڵەكـەی خۆیەوە قاپەكانیش لەگەڵیدا (سبحان الله)یان دەكرد، هـەروەها خـۆی و هـاوەڵێكی لـە تاریكیدا ڕێیان دەكرد، سەری قامچیەك ڕووناكی بۆ كردن[٢].

---

(١)_ ئەم دۆستەی خوای گەورە عەمری كوڕی عوقبەی كـوڕی فەرقـەد، دۆستێك بوو لە دۆستانی خوای گەورە، بەشداری غەزاكانی دەكرد و لە پێناوی خوای گـەورەدا جیهادی دەكرد، ڕۆژێك لە گەرمایەكی بەتیندا، لە ڕۆژێكی هاویندا نوێژی دەكرد، پەڵە هەورێك لە ئاسماندا سێبەری بـۆ دەكـات، لـە غـەزادا ئـەو مەرجـەی لەسـەر هـاوەڵانی دادەنـا كـە خزمـەتیان بكـات، وشـتری هـاوەڵانی دەلەوەڕانـدو ئاژەڵـە دڕنـدەكانیش نەدەوێران لە سەربازگەكە نزیك بنەوە، هەموو ئەمانە لە كەرامەتی ئەولیایە.

(٢)_ موطەڕەف كوڕی عەبدوڵای كوڕی شـیخخیر بـەلای فەرموودەناسـانەوە بـە نـاو بانگە كە فەرموودە دەگێڕێتەوە، هەر كات بچوایەتە نێو ماڵەكەی خۆیـەوە (سبحان الله) ی قاپەكانی دەبیست، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لاَ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ [الإسراء: ٤٤] واتە: وە هیچ شتێك نییە كە بەسوپاسـی ئـەو ستایش نەكات بەڵام ئێوە تێ ناگەن لـە تەسبیحاتەكەیان، بـەڵام ئـەم دۆسـتەی خـوای گەورە تەسبیحاتی قاپەكانی دەبیست. هەروەها خـۆی هـاوەڵێكی ڕێیـان دەكـرد خـوای گەورە ڕێگەكەی بۆ ڕووناك كردنـەوە، ئـەم شـتە بـۆ هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـواش ﷺ ڕوویدا كاتێ هاتنە خزمەتی و پاشـان كـە هەسـتان پێغەمبـەری خـوا ﷺ داردەستێكی دانێ ڕێگەكەی بۆ ڕووناك دەكردنەوە تا گەشتنەوە بە ماڵەكانی خۆیان.

- کاتێ ئەحنەفی کوڕی قەیس مرد کڵاو قووچی پیاوێك کەوتە نێو گۆڕەکەیەوە، دەستی بۆ درێژ کرد بۆ ئەوەی بهێنێتەوە، تەماشای کرد تا چاو بڕ بکات گۆڕەکەی بۆ فراوان کراوەتەوە [١].

- ئیبراهیمی تەیمی مانگ و دوو مانگ دەمایەوەو هیچ شتێکی نەدەخوارد، وە چووە دەرەوە بۆ ئەوەی خۆراکێك بۆ خاو خێزانی پەیدا کات، بەڵام نەیتوانی، بەلای خاکێکی سووردا تێپەڕ بوو هێندێکی لێبرد، پاشان کە گەڕایەوە بۆ ماڵ و تورەکەیان کردەوە، تەماشایان کرد گەنمێکی سوورە [٢]،

---

(١)_ ئەحنەفی کوڕی قەیسی تەمیمی یەکێکە لە تابعین، بە میهرەبانی بە ناو بانگ بوو، تەنانەت لە میهرەبانیدا وەکو نموونە دەهێنرێتەوە، پیاوێکی موجاهید بوو، لە سەرکردەو ئەمیرەکان بوو، بە لای خەڵکەوە خۆشەویست بوو، کاتێ مردو ناشتیان، کڵاو قووچی پیاوێك کەوتە نێو گۆڕەکەوە، دەستی بۆ درێژکرد بۆ هێنانەوەی، تەماشای کرد تا چاو بڕکات گۆڕەکەی بۆ فراوان کراوەتەوە، لەم بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئیماندار تا چاو بڕکات گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێتەوە بەڵام دوو ڕوو گۆڕەکەی بۆ تەسك دەکرێتەوە تا پەراسووەکانی تێك دەوون)).

(٢)_ ئەحنەفی کوڕی قەیس پێشەوای بە ناو بانگ، زاهید، واعیزی نایاب بێژ، یەکێك لە کەرامەتەکانی ئەوە بوو کە بە مانگ و دوومانگ لەسەر نەخواردنی خۆراك ئارامی دەگرت و دەمایەوە چونکە لەزەت و چێژێکی زیاتری لە خواپەرستی وەردەگرت، ڕۆژێك چووە دەرەوە بۆ ئەوەی خۆراکێك بۆ خاو خێزانی پەیداکات بەڵام بژی نەکراو پارەشی پێ نەبوو، بە لای خاکێکی سوردا تێپەڕ بوو تورەکەکەی لێ پڕکرد، بۆ ئەوەی خەڵکی وابزانن شتێکی هێناوەتەوە، لەماڵەوە کە تورەکەکەیان کردەوە گەنمی سوریان تێدا بەدی کرد، خوای گەورە ئەو خاکەی گۆڕیبوو بەگەنم.

هەرکات ئەو گەنمەیان بچاندایە گوڵەکەی لەبنەڕەتەوە تاوەکو لقەکانی دانی لەسەریەك کەڵەکە بووی دەردەهێنا[(١)].

– عوتبەتولغولام سێ خەسڵەتی لە پەروەردگاری داوا کرد: دەنگێکی خۆش، فرمێسکێکی زۆر، خۆراکێك بەبێ ماندوو بوون، بۆیە ئەگەر قورئانی بخوێندایە دەگریاو خەڵکیشی، لەو ماوەیەدا بەردەوام فرمێسکی دەهاتە خوارەوە، کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی خۆراکی خۆی دەست دەکەوت و نەیدەزانی لەکوێوە بۆی دێت[(٢)].

– عەبدولواحیدی کوڕی زەید تووشی ئیفلیج بوون بوبوو، داوای لە پەروەردگاری کرد ئەندامەکانی لەکاتی دەستنوێژ شوشتندا بکاتەوە، بۆیە لە کاتی دەست نوێژ شوشتندا ئەندامەکانی بۆ دەکرایەوەو، دواتر بۆ دۆخی پێشری دەگەڕایەوە[(٣)].

---

(١)_ گەنمێکی بەرەکەتدار بوو، بە ئاستێك هەرکات لەو گەنمەیان بچاندایە لە بنەڕەتەوە تاوەکو سەرەوە دەنکە گەنمی لەسەر یەك کەڵەکەبووی دەردەهێنا.

(٢)_ عوتبەتول غولام خواپەرستی زاهیدی موجاهید بوو، ئەم شتانەی لە خوای گەورە داواکرد، یەکەم: دەنگێکی خۆشی بداتێ، بۆیە دەنگی زۆر خۆش بوو، هەرکات قورئانی بخوێندایە دەگریاو هەموو کەسانی دەورو بەریشی دەگریاند، دووەم: داوای کرد لە ترسی خوای گەورەدا خوای گەورە گریانی بداتێ بۆیە لە ترسی خوای عزوجل فرمێسك لە چاوەکانی نەدەبڕا، سێیەم: ڕۆزیەکی بێماند بوونی بداتێ بۆیە کە دەچۆوە بۆ ماڵەکەی خۆی خۆراکی تێدا دەبینی بەبێ ئەوەی بزانێت کێ هێناویەتی، هەمان ئەم شتە لەگەڵ مەریەمی کچی عیمران و هەروەها لەگەڵ خوبەیبی کوڕی عەدیدا ڕوویدا.

(٣)_ تووشی ئیفلیج بوون بوبو، ئیفلیجیش نەخۆشیەکە تووشی جەستە یان ئەندامەکان دەبێت و، ناجوڵێتەوە، تووشی ئەو نەخۆشیە بوبو، بۆیە لەخوای گەورەی داواکرد ئەندامەکانی بکاتەوە بۆ ئەوەی دەست نوێژ بشوات، بۆ خواپەرستی، خوای گەورە دوعاکەی قبوڵ کرد، ئەندامەکانی لە کاتی دەست نوێژ شوشتندا دەکرایەوە پاشانیش تووشی ئیفلیجیەکە دەبویەوە.

بەشی کەرامەت فراوانەو لە شوێنی تردا بە درێژی باس کراوە[(١)] بەلام ئەوەی ئێمە بەچاو بینیومانەو ئەوەی دەیزانین لەم زەمەنەدا _زەمەنی شێخولئیسلام _زۆر زۆرە[(٢)].

---

(١)_ شێخول ئیسلام شتێکی زۆری لەکەراماتی ئەولیا باسکرد، بۆ شارەزابوون و لێکۆڵینەوەی زیاتریش خەڵکی گەڕاندۆتەوە بۆ کتێبی تری تایبەت بەم بابەتە، وەکو کتێبەکانی خۆی، لە چەند جێگەیەکی ئەو کتێبانەدا کۆمەڵێك لەو کەرامەتانەی نووسیوە، بەشی کەرامەت بەلای ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە جێگیرەو هیچ کەسێك نکوڵیی لێ ناکات مەگەر بیدعە چیان نەنن، یەکێك لە بنچینەکانی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بڕوا بوونە بە موعجیزاتی پێغەمبەران و کەرامەتی ئەولیای، ئەمە شتێکی جێگیرە، لە دەرسی پێشوودا کەسێك پرسی: ئایا ئەو کەرامەتانە ئیسنادێکی (صحیح) یان هەیە؟ بۆ وەلامەکەی دەڵێین: بەسە ئەوە بزانین کە بڕوا بوون بە کەرامەتی ئەولیای بنچینەیەکە لە بنچینەکانی بیرو باوەڕ، بە گشتی گومانمان لێیان نییە، بەلام لە ڕووی تەفاصیل و وردەکاریەکانەوە پێویستیان بە ئیسناد نییە چونکە فەرمووده نین حوکمی شەرعی حەلاڵ و حەرامیان لەسەر بینا بکرێت، ئەمانە ڕووداون ئەگەر ڕاست بن ئەوا کەرامەتی ئەولیایەو ئەگەر ڕاستیش نەبن زیانیان نییە، هیچ کەم و کورپییەك بۆ ئاین دروست ناکات، بەلام ئەگەر ڕاست بێت ئەوا ئیمان زیاد دەکات، ئیمانی بەندە، خوای گەورەمان بیر دەخاتەوە.

(٢)_ شێخول ئیسلام پێی ڕاگەیاندووین کەوا شتێکی زۆری لەم کەرامەتانە بینیوە لە زەمەنی خۆیدا، بە چاوەکانی خۆی بینیونی، ئیتر هیچ بوارێك نییە بۆ ئەوەی گومانیان لێ بکرێت.

وە پێویستە بزانرێت کە پێدەچێ کەرامەت بەگوێرەی پێویستێتی کەسەکە بە دەرکەوێت، ئەگەر کەسێکی ئیمان لاواز، یان موحتاج و پێویستیار پێویستیان پێی بێت، کەرامەتێکیان بۆ دێت ئیمانیان بەهێز کات و، پێویستێتیان نەهێڵێت[1]،

---

(١)_ لە ڕاستیدا کەرامەت تەنها لەبەر دوو شت بەدی دێت، یەکەم: ئەو کەسەی کەرامەت لەسەر دەستی بەدی دێت پێویستی پێیەتی وەکو ئەوەی لەوانەیە ئەو کەسە ئیمانی لاواز بێت و بەو کەرامەتەی لەسەر دەستی بەدی دێت ئیمانی بەخوا بەهێزتر دەبێت، یان پێویستی بە خۆراکە، یان بەخواردنەوەیە وەکو ئەوەی پێشتر ئاماژەی پێدرا، یان پێویستی بە چوار پێیەکە، یان خوای گەورە بەو جۆرە هێزێکی زیاتری دەداتێ بۆ پەرستنی زیاتر، کەوا بوو کەرامەت لەبەر پێویستیەکە ئەو پێویستییە لەوانەیە ئیمانی بێت یان مرۆڤایەتی بێت، دووەم: بۆ ئەوەی ببێت بە بەڵگەیەك لە ئاییندا، چونکە ئەو کەرامەتە پشتگیری گوفتاری ئەو زانایە یان ئەو دۆستە دەکات و، بەسەر نەیارانیدا سەری دەخات، ئەم کەرامەتە بۆ خودی شێخول ئیسلامیش بەدی هاتووە، چونکە هەموو خەڵکی بێزاریان کرد، سوڵتان و کار بە دەستان بێزاریان کردو، خستیانە بەندیخانەوە بەڵام نەیانتوانی ڕێگری لێبکەن و نەهێڵن زانست بڵاو بکاتەوەو، بانگەوازی بۆ خوای گەورە بکات، تەنانەت پاش مردنیشی نەیانتوانی ئاسەوارەنی قەدەغە بکەن کە بە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بویەوە تاوەکو ئەم زەمەنەی خۆشمان، بێگومان ئەمە بەشێکە لە کەرامەتی ئەولیا، هەروەها ئەو لێدان و سووکایەتی پێکردن و بەندکردنەی کە بەسەر ئیمامی ئەحمەدا هات لە کاتی مەئمون و کار بەدەستانی دیکەی پاش ئەو، ئیمامی ئەحمەد لەسەر هەموو ئەو شتانە خۆ ڕاگر بوو تا دواتر خوای گەورە سەری خست و، دوژمنەکانی سەر شۆڕ کرد، ئەمە لە کەرامەتی ئەولیای بوو، ئەو سەرکەوتنانەی کە بۆ ئوممەتی دین بەسەر نەیارانیاندا بەدی دێت بە دەرخستن و سەر خستنی بەڵگەکانی ئایینە.

له كانێكدا كەسانی تر كە وەلایەت و دۆستایەتیەكەیان كامڵ ترو تەواوترە پێویستیان پەوە نییە[١]،

---

(١)_ پرسیارێك دێتە پێشەوە یان بە ڕاستی هاتۆتە پێشەوە ئایا پێویستە وەلی و دۆست كەڕامەتیان لەسەر دەست بەدی بێت؟ نەخێر، ئەو دۆستەی كەڕامەتی نییە بەڵگە نییە بۆ بوونی كەم و كورتی لە دۆستایەتیەكەیدا، دۆستانێكی بەرزی خوای گەورە هەن كەچی هیچ كەڕامەتێكیان لەسەر دەست بەدی نەهاتووە، چونكە ئیمانیان بەهێزە، وە لەبەر ئەوەی پێویستیان پێی نییە، كە چی كەڕامەت بۆ كەسانێكی تر بەدیهاتووە كە ئیمانیان لەوان بە خوار ترە، بۆیە نابێ بگوترێت هیچ كەسێك بە وەلی و دۆست دانا نرێت تاوەكو كەڕامەتێكی لەسەر دەست بەدی دێت، لە ڕاستیدا تەنها خەڵكانی خاوەن باوەڕی پڕو پووچ و بیدعە چیان ئەم قسانە دەكەن، بەلام ئەهلی سوننەت بڕوایان بەوەیە كە مەرج نییە وەلی كەڕامەتی هەبێت، پێویستە ئەم شتە هەر هەموو خەڵكی بیزانن، وەكو پێشتر ئاماژەی پێدرا كەرامەت كە بەدی دێت لەبەر دووشتە: یەكەم: لەبەر پێویستیەكی موسڵمانان، دووەم: بۆ ئەوەی بەڵگەیەكی پشتگیر بێت لە ئاییندا، بۆیە ئەگەر یەكێك لەم دوو شتە نەبوو ئەوا كەڕامەت بەدی نایەت، نەبوونی كەڕامەتیش ئاماژە بۆ كەم وكورتی لە دۆستایەتی و وەلایەتدا ناكات. پێشەوا ئیبن و لقەیم فەرموویەتی: دۆستانی خوای گەورە هیچ نیشانەیەكیان نییە بۆ ئەوەی بناسرێنەوە، پێدەچێ دۆستێكی خوای گەورە هەبێت كە لە دۆستە نایبەتەكانیش بێت و نەشناسرێت، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((رُبَّ أَشْعَثَ أَغْبَرَ مَدْفُوعٍ بالأبواب لو أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ)) واتە: ((پێدەچێ كەسیكی قژبڕژی تۆز تەپوتۆزاوی كە لە دەرگاكاندا پاڵی پێوە دەنرێت و دور دەخرێتەوە، ئەگەر سوێند بخوات خوای گەورە نزاكەی قبوڵ بكات، ئەوا قبوڵی دەكات))، پێویست ناكات

--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------

درۆستی خوای گەورە ڕووخسارێکی تایبەتی هەبێت یان کۆمەڵێك خەڵکی بە چواردەوردا هەبێت یان بانگەشەی بۆ بکرێت وەکو ئەوەی کەسە باوەڕپووچەکان دەیکەن، نەخێر دۆستی خوای گەورە نا ناسرێتەوە، نیشانەی نییە، جلێکی تایبەتی نییە، خەڵکی بەدەوردا نییە، بانگەشەی بۆ ناکرێت، شەرافەت و بەرێزی بە لای خەلکەوە نییە، لە دەرگاکان دور دەخرێتەوە، پێدەچێ شەرافەت و ڕێزی بە لای خەڵکەوە نەبێت، مەرج نییە وەلی خوا نیشانەیەکی هەبێت و پێی بناسرێتەوە، پێدەچێ دیار نەبێت شڕۆڵ بێت، قژ بژی تەپوتۆزاوی بێت، مەرج نییە جلی نایابی پۆشی بێت و، سەرقۆڵەکانی فراوان بێت، عیمامەیەکی گەورەی بە سەرەوە بێت، ئەمە مەرجی دۆستایەتی خوای گەورە نییە، پێویستە ئەم بنەڕەتە بزانرێت، بۆ ئەوەی کەسانی باوەڕ پڕو پووچ بۆ خوڕافاتەکانی خۆیان بەکاری نەهێنن. هەر یەکێکیان بانگەشەی ئەوە دەکات دۆستی خوایە، بە زیندووی و بە مردووی بانگەشەیان بۆ دەکرێت، بە خەڵك چواردەوریان دراوە، شتی زۆر، نەخێر، چەندەها دۆستی خوای گەورە هەن دەمرن کەچی هێشتا نەناسراونەتەوە، دۆستانی وا بووە ژیاوەو مردوەو کەس نەی ناسیون.

بۆیە کەراماتیان بۆ بەدی نایەت لەبەر بەرزی پلەکانیان و لەبەر ئەوەی پێویستیان پێی نییە، نەك لەبەر ئەوەی وەلایەت و دۆستایەتیەکەیان ناتەواوە[1]، بۆیە ئەم شتانە لەتابعیندا زۆرترە بە بەراورد بە هاوەڵانی بەڕێز[2] بە پێچەوانەی کەسانێکەوە کە کردەوەی نائاسایی لە سەروشت بەدەر ئەنجام دەدەن بۆ ڕێنموونیی کردنی خەڵك و پڕکردنەوەی پێویستیەکانیان ئا ئەمانە پلە بەرزترن.

---

(١)_ مەرج نییە هەر کەسێك کەرامەت لەسەر دەستی بەدی نەیت وەلایەت و دۆستایەتیەکەی بۆ خوای گەورە نا تەواو بێت، بە پێچەوانەوە پێدەچێ وەلایەت و دۆستایەتیەکەی کامڵ و تەواویش بێت و هیچ کەرامەتێکیش لەسەر دەستی بەدینایەت.

(٢)_ وە لەبەر ئەوەی بوونی کەرامەت بەمەرج دانەنراوە بۆ کەماڵی ئیمان و بەهێزی ئیمان، بۆیە کەرامەت لە تابعین و ئەوانەی لە دوای ئەوانیشەوە هاتوون زۆرتر بووە بەراورد بە هاوەڵانی بەڕێز، چونکە هاوەڵان پێویستیان پێی نەبوو، لەبەر فەزڵ و پلە و پایەیان.

# ئەهلی باروحاڵە شەیتانیەکان

ئەمە بارو حاڵە شەیتانیەکانە[(١)]

---

(١)_ ئێستا شێخول ئیسلام لە کەڕامەت بویەوەو، دەستی بەکردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرە شەیتانیەکان کرد کە خەڵکانێکی زۆری پێ فریو دەدات، پێشتر ئاماژەمان بەوەدا کە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر ئەگەر لەسەر دەستی پێغەمبەرێك بەدی بێت ئەوە موعجیزەیە، ئەگەر لەسەر دەستی دۆستێکی خوای گەورە بەدیهات ئەوە کەڕامەتە، وە ئەگەر لەسەر دەستی دوژمنێکی خوا ئەنجام درا ئەوە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانییە، شەیتانەکان بۆ دۆستەکانی خۆیان شتانێك ئەنجام دەدەن کە لە سروشت و هێزی ئادەمیزاد بەدەر بێت، بە هەوادا دەیانفڕێنن، بەسەر ئاودا ڕێیان پێدەکەن، شتە نادیارەکانیان بەخێرایی بۆ ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی گومڕایان بکەن و، خەڵکی تریشیان پێ گومڕا بکەن، بۆیە پێویستە لە نێوان کەڕامەتی وەلی و کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانی کە لەسەر دەستی دوژمنانی خوای گەورە ئەنجام دەدرێت جیاوازی بکرێت، ئەگەر کردەوەیەکی نائاسایی لە سروشت بەدەر لەسەر دەستی کەسێك بەدیهات تەماشا دەکرێت ئەگەر ئەو کەسە تەقواکارو پیاو چاك بوو ئەوە کەڕامەتە، وە ئەگەر لە لایەن کەسێکی خراپە کاری کافرەوە ئەنجام درا ئەوە شەیتانیەو بۆ گومڕاکردنی ئەو کەسانەیە کە فریوی پێدەخۆن، شەیتانەکان خزمەتی دۆستەکانی خۆیان دەکەن، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ قَدِ اسْتَكْثَرْتُم مِّنَ الْإِنسِ وَقَالَ أَوْلِيَاؤُهُم مِّنَ الْإِنسِ رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِي أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ (١٢٨) وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (١٢٩)﴾ واتە: وە ڕۆژێك (خوا) تێکڕا کۆیان دەکاتەوە (دەفەرموێ) ئەی دەستەو کۆمەڵی جنۆکە بێگومان ئێوە زۆر

کەستان لە ئادەمیەکان گومڕا کرد وە دۆستەکانیان لە ئادەمی دەڵێن ئەی پەروەردگارمان هەندێکمان سوودو کەڵکمان لە هەندێکمان وەرگرت، چۆن؟ جنۆکە سوودو کەڵك لە مرۆڤەکە وەردەگرێت بەو جۆرەی کە مرۆڤەکە ملکەچی دەبێت، وە سەرپێچی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەکات، بەم جۆرە شەیتان کەڵك لەمرۆڤەکە وەردەگرێت و، پێی دڵخۆش دەبێت، ئەی مرۆڤ چۆن سوودو کەڵك لە جنۆکە وەردەگرێت؟ بەوەی کە جنۆکەکان لە چوار چێوەی ئەو شتانەدا کە تواناییان بەسەریدا هەیە خزمەتی مرۆڤەکە دەکەن، بە هەوادا دەیفڕێنن، بەنێو ئاگردا ڕێی پێدەکەن، بەسەر ئاودا ڕێی پێ دەکەن، شتە دورەکانی بۆ ئامادە دەکەن، شتانێکی پێ دەڵێن کە تەنها جنۆکەکان دەیزانن و مرۆڤ نایزانێت، بەم جۆرە مرۆڤ سوودو کەڵك لە جنۆکە وەردەگرێت وە بەو کاتەو مۆڵەتە گەشتین کە بۆت دیاری کردبوین خوا نەرمووی ئاگر شوێنتانە بەهەمیشەیی و بێبڕانەوە دەمێننەوە تیایدا جگە لەو کاتەی کە خوا بیەوێ بەڕاستی پەروەردگارت کار دروستی زانایە ﴿وَكَذَلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا﴾ بەو شێوەیە هەندێ لە ستەم کاران دەکەین بە دۆست و پشتیوانی هێندێکی تریان ﴿بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ بە هۆی ئەو کردەوانەوەی ئەنجامیان دەدا. ئا ئەمەیە ئاکام و دەرەنجامیان لە ڕۆژی قیامەتدا، شەیتان و شوێنکەوتوانیان، ئەوانەی فریودراون و شوێنی شەیتان کەوتوون، چونکە لەدونیادا خزمەتی دەکەن و، وای بەخەیاڵدا دێنن کە دۆستێکە لە دۆستان، کەسانی خاوەن بیروباوەڕە پڕوپوچەکان پلەی وەلایەت و دۆستایەتی دەدەن بەکەسانێکی ناشایستە کە نوێژ ناکات و، واز لەکردەوەی خراپە ناهێنێت، لەو باوەڕەدان کە ئەو کەسە تەکلیف و سەپاندنە شەرعیەکانی لەسەر هەڵگیراوە، چونکە بەپلەی دۆستایەتی گەیشتوەو، لە خوای گەورە نزیك بۆتەوە بەو ئاستەی کە تەکلیف و سەپاندنە شەرعیەکانی لەسەر هەڵگیراوە،

حەرام و حەلاڵی لەسەر هەڵگێراوە، فەرزەکانی لەسەر هەڵگێراوە، بەخوای گەورە گەیشتوە، ئەمە قسەی شەیتان و شوێنکەوتوانی شەیتانە _پەنامان بەخوا_ پلەی دۆستایەتی بەکەسانێك دەدەن کە دەیانبینن نوێژ ناکەن، بە ڕۆژوو نابن، ئیمانیان بەخواو پێغەمبەران نییەو، دەڵێن: ئەمانە دۆستێکن لەدۆستانی خوای گەورە، گوایە پێویستیان بەپێغەمبەران نەماوە، پێویستیان بەکردەوە نییە، پێویستیان بەعیبادەت نەماوە، تەماشاکەن بەچ شێوازێك شەیتان ئادەمیزاد بەئەوپەڕی فریودان و خەڵەتاندن دەگەیەنێت بەڵام خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ(٦٣)﴾ [يونس: ٦٢ _ ٦٣] بەم دوو مەرجە: ئیمان و تەقواکاری، ئیتر کەسی خراپەکار کە نوێژ ناکات و، بەڕۆژوو نابێت و، نێربازی و، داوێنپیسی دەکات و، مەی دەخواتەوە چۆن دۆستی خوای گەورە بێت، نەخێر، بەڵکو ئەم جۆرە کەسە گەورەترین دۆستی شەیتانە، پێویستە هەست بەم شتەبکەین و لێی ئاگادار بین، چونکە شتەکە بەنێو خەڵکدا بڵاو بۆتەوەو گەورەبۆتەوە، لەبەر لاوازی ئیمان و، کەم بوونی زانست لەم زەمەنەدا، چونکە بیروباوەڕی ڕاستی ئەهلی سوونەت و جەماعەت بڵاو ناکرێتەوە، کاتێ ئەم شتانە لاواز بوو، بیرو باوەڕی پڕوپوچ لە نێو کۆمەڵگادا بڵاو بۆوە، لەو کاتەدا کەناڵی تەلایەت بۆ ئەم شتە پڕوپوچانە دادەمەزرێت، کەناڵی سەتەلایەت بۆ خاوەن باوەڕە پووچەکان و جادووگەران و ساحیرەکان دادەمەزرێت، بە ئیمان و زانست ناوزەندیان دەکەن، با موسڵمانان ئاگاداری ئەم شتانە بن.

وەکو باروو حاڵی عەبدوڵڵای کوڕی صەییاد[1] حديثه و قصته في صحيح مسلم (٢٩٢٤)، و(٢٩٢٥)، و(٢٩٢٦)، و(٢٩٢٧)، و(٢٩٣٢)، کە لە زەمەنی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەدەرکەوت و، هێندێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانیش وایان دەزانی دەجالە، وە پێغەمبەری خواش ﷺ بە گومان بوو لێی تا دواتر بۆی ڕوون بویەوە کە دەجال نییە، بەڵکو لە ڕەگەزی کاهینەکان بوو[2].

---

(١)_ ئەمیری موسڵمانان پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ باوەڕی وابوو کە ئیبن وصەییاد دەجالەو لەسەر ئەوە سوێندیشی دەخوارد، هەروەها جابیریش لەسەر ئەوە سوێندی دەخواردو، دەیفەرموو: گوێبیستی عومەر ﷺ بووم لەسەر ئەوە سوێندی دەخوارد لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ وە نکوڵیشی لێ نەدەکرد. وە ئەو باروحاڵە شەیتانیانەی کە بە عەبدوڵڵای کوڕی صەییاد پیشاندەدرا بینینی عەرشی ئیبلیس بوو لەسەر ئاو.

(٢)_ عەبدوڵڵای کوڕی صەییاد لە زەمەنی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە دەرکەوت و، هانە مەدینەی پیرۆز، شتانێکی لێوە دەبینرا وایانزانی دەجالە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە چەند شتێك تاقیکردەوەو بۆی ڕوون بویەوە کە دەجال نییە، وە کاتێك یەکێك لە هاوەڵانی بەڕێز بەپێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیکوژم؟ فەرمووی: ئەگەر دەجال بێت تۆ ناتوانی بیکوژی، ئەگەر ئەویش نەبێت ئەوە کوشتنی هیچ سوودێکی نییە، ئیتر وازیان لێهێنا، دۆستی خوای گەورە نەبوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کردەوەی نائاسایی لە سروشتبەدەر لەسەر دەستی کەسانێك بەدی دێت کە دۆستی خوای گەورە نین. دەجال گەورە گەورەترینی هەموو درۆزنان و گەورەترین نوێنەرەکانی شەیتانە لەکۆتایی زەماندا دەردەکەوێت، چەندەها کاری نا ئاسایی لە سروشت بەدەری پێیە، بەهەشت و ئاگری پێیە، فەرمان بەهەورەکان دەکات باران دەبارێنن، فەرمان بەزەوی دەکات ڕووەکەکان دەڕوێن، پیاو دەکوژێت و بەنێوان پارچەکانیدا ڕێدەکات و، پاشان هەڵدەستێت، ئەمانە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەرە بەڵام شەیتانییە، بۆیە نابێت فریویان پێ بخورێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئاً))[١]، واتە: ((شتێکم بۆ شاردویتەتەوە، چییە؟)) ئەویش گووتی: (الدُّخ الدُّخ)، پێغەمبەری خوا ﷺ سورەتی (الدخان)ی بۆ شاردبۆوە، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((اخْسَأْ فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ)) صحيح: أخرجه مسلم (٢٩٣٠)، من حديث عبدالله بن عمر رضي الله عنهما. واتە: ((بەسەر شۆڕی بێدەنگ بە، لە بڕو هێندەی خۆت زیاتر نابەیت))، مەبەستی ئەوە بوو کە لە ڕاستیدا تۆ تەنها لە برایانی کاهینانی، هەر یەکێك لە کاهینان هاوڕێیەکی لە شەیتانەکان هەبوو[٢]

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ تاقیکردەوە، پێی فەرموو: ((شتێکم بۆ شاردوویتەتیەوە، چییە؟)) وەڵامەکەی نەزانی، ئیتر پێی فەرموو: ((بێدەنگ بە، لە هێندەی خۆت زیاتر نابەیت)) واتە: لە ڕاستیدا تۆ تەنها برای کاهینەکانی.

(٢)_ چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ(٣٦)وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ(٣٧)حَتَّى إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَالَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ(٣٨) وَلَنْ يَنْفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذْ ظَلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ(٣٩)﴾ [الزخرف: ٣٦_٣٩] واتە: وە هەر کەس پشت لە یادی خوا هەڵکات شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین کە هەمیشە لەگەڵی بێ و لێی جیا نەبێتەوەوە بێگومان ئەوانە (شەیتانەکان) لە ڕێگای ڕاست بەرگری یان دەکەن واش دەزانن بە بێگومان هەر ئەوانن ڕێنوێین هەتا کاتێ کە (دەمرێ و) دێتەوە لامان دەڵێ خۆزگە نێوانی من و تۆ بە قەدەر نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا بوایە ئای چ هاوڕێیەکی خراپ بوویت (ئەم خۆزگە) هیچ سودێکتان پێناگەیەنێ چونکە ستەمتان کرد بێگومان ئێوە لە سزای سەختدا هاوبەشن.

که هەواڵی زۆرێك له غەیب و نادیارەکانی پێ ڕادەگەیاند لەوەی کە بە دزیەوە گوێی لێدەگرت[1]، ڕاستیان تێکەڵ بەدرۆ دەکرد[2]، وەکو ئەوەی لە فەرموودەی (صحیح)دا که ئیمامی بوخاریی و غەیری ئەویش دەیگێڕنەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَنْزِلُ فِي الْعَنَانِ ـ وَهُوَ السَّحَابُ ـ فَتَذْكُرُ الْأَمْرَ قُضِيَ فِي السَّمَاءِ فَتَسْتَرِقُ الشَّيَاطِينُ السَّمْعَ فَتَسْمَعُهُ فَتُوحِيهِ إِلَى الْكُهَّانِ فَيَكْذِبُونَ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ))[3] صحيح: أخرجه البخاري (٣٢١٠)، وفي غير موضع من صحيحه من حديث عائشة رضي الله عنها مرفوعاً، وقريب منه عند مسلم (٢٢٢٨).

---

(١)_ لەوەی بە دزیەوە گوێی لێدەگرن ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە شەیتانەکان بە خێرایی دەشت و دەر دەبڕن، دەفڕن، بە هەوا دا دەفڕن و، شتانێك دەبینن کە ئادەمیزاد نایبینن، ئێتر هەواڵی ئەوانە بە ئادەمیزاد دەدەن، بۆ ئەوەی نووشی فیتنەو ئاشوبیان بکەن.

(٢)_ کاتێ وشەیەك لە ئاسمانەکانەوە بەنهێنیەوە دەدزن لەگەڵ سەد درۆدا تێکەڵی دەکەن، خەڵکیش بڕوایان پێکردن لەبەر ئەو تەنها وشەیە کە لەئاسمانەوە بیستراوە، ئامادەن بڕوا بە (٩٩) درۆیان بکەن لەبەر تەنها وشەیەکی ڕاست.

(٣)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ(٢٢١)تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ (٢٢٢)يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ (٢٢٣)﴾ واتە: هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزێتە سەر هەموو (کەسێکی) زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار باش گوێ دەگرن (بۆ شەیتانەکان) وە زۆربەیان درۆزنن (لەو هەواڵاندا دەیدەن بە خەڵکی) ئەمانەن کاهینەکان و ئەوانەش ئەو کەسانەن کە فریویان پێ دەخۆن، زۆربەیان درۆزنن.

**له فەرموودەیەکی تردا کە (إبن عباس) دەیگێڕێتـەوە دەڵـێ:** بينما النبي ﷺ في نفرٍ من الأنصار، إذْ رُمِيَ بِنَجْمٍ فاسْتَنَار، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ((مَا كُنْتُمْ تَقُولُونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا رَأَيْتُمُوهُ))، قَالُوا: كُنَّا نَقُولُ: يَمُوتُ عَظِيمٌ أَوْ يُولَدُ عَظِيمٌ، قَالَ رَسُولُ ﷺ: ((فَإِنَّهُ لاَ يُرْمَى بِهَا لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنْ رَبُّنَا تَبَارَكَ اسْمُهُ إِذَا قَضَى أَمْرًا، سَبَّحَ لَهُ حَمَلَةُ الْعَرْشِ، ثُمَّ سَبَّحَ أَهْلُ السَّمَاءِ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، حَتَّى يَبْلُغَ التَّسْبِيحُ إِلَى هَذِهِ السَّمَاءِ، ثُمَّ يَسْتَخْبِرُ أَهْلُ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ حَمَلَةَ الْعَرْشِ: مَاذَا قَالَ رَبُّنَا ؟ فَيُخْبِرُونَهُمْ، ثُمَّ يَسْتَخْبِرُ أَهْلُ كُلِّ سَمَاءٍ حَتَّى يَبْلُغَ الْخَبَرُ أَهْلَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا، وَتَخْتَطِفُ الشَّيَاطِينُ السَّمْعَ، فَيَرْمُوْنَ فَيَقْذِفُونَهُ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ، فَمَا جَاؤُوا بِهِ عَلَى وَجْهِهِ فَهُوَ حَقٌّ، وَلَكِنَّهُمْ يَزِيدُونَ))، رواه مسلم **واتـە: ئیبنـو عـەبباس ﷺ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەوێك پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەگـەڵ چـەند هاوەڵێك لەپشتیواناندا دانیشتبوون، لەپڕ ئەستێرەیەك کشاو دەوروبـەری ڕووناك کردەوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: ((ئێـوە لەسـەردەمی نەفامیـدا چـیتان دەگـووت ئەگـەر بتانبینیبا؟))، فەرموویان: دەمانگووت: پیاوێکی گـەورە دەمرێـت یـان پیـاوێکی گـەورە لـە دایك دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئـەم ئەسـتێرە نـەبۆ مردنـی کـەس و نـەبۆ ژیانی کەس ناکشێت، بەڵام پەروەردگارمان _ناوی بەرزو بڵند بێت_ هەر کات فەرمانیدا بـە کارێك، هەڵگرانی عەرش تەسبیحاتی بۆ دەکـەن، پاشـان خـەڵکی ئـەو ئاسمانـەی بـە دوای ئەواندا دێن تەسبیحات دەکەن، پاشان ئـەوانی تـریش کـە بـەدوای ئەوانـدا دێـن، هـەتا ئـەو تەسبیحاتە دەگاتە ئەم ئاسمانە، پاشـان خـەڵکی ئاسمـانی حەوتـەم لـە هـەڵگرانی عـەرش دەپرسن: پەروەردگارمان چ شتێکی فەرموو؟ ئەوانیش هەواڵیان پێدەدەن، پاشان خـەڵکی هەر ئاسمانێك هێندێکیان لە هێندێکیان دەپرسن تـا وەکـو هەواڵەکـە بـە خـەڵکی ئاسمـانی دونیا دەگات، شەیتانەکان دزە دەکەن بۆ گـوێ گـرتن، ئەسـتێرەی کشـاویان تێـدەگیرێت، بەڵام هەر هەواڵ بە دۆستانی خۆیان دەگەیەنن، جـا هـەر چـی وەك خـۆی گەیانـدیان ئـەوە ڕاستە، بەڵام زیادی دەکەن))**[1].

---

**(١)_ ئەم فەرموودە ئاماژە بۆ ئەوەدەکات کە شەیتانەکان هەوڵ دەدەن بـە دزیـەوە گوێ بگرن لەوەی کە فریشتەکان لە ئاسماندا لە نێوان خۆیاندا باسی لێوە دەکەن، بەڵام**

خوای گەورە ئەستێرەی کشاوی بۆ ئامادە کردوون کە بریتییە لەو ئەستێرانەی کە خوای گەورە کردوونی بە ئەستێرەی کشاو و لە شەیتانەکانی دەگرێت و، دەیانسوتێنێت، ئیتر لەوانەیە ئەستێرە کشاوەکە بیان پێکێت پێشئەوەی ئەو وشەیەی کە بیستویانە بەدۆستە کاهینەکانیان بڵێن، وە لەوانەشە ئەو وشەیەی بیستویانە بەدۆستە کاهینەکانیان بڵێن پێش ئەوەی ئەستێرە کشاوەکە بیان پێکێت، صەد درۆشی لەلایەن خۆیانەوە تێکەڵ دەکەن و لە نێوان خەڵکیدا برەوی پێدەدەن بۆ ئەوەی فیتنەو ئاشوب لە نێوان خەڵکیدا بڵاو بکەنەوە، ئا ئەمانەن شەیتانەکان، کاهینەکانیش شوێنکەوتووی شەیتانەکانن و، دۆستی خوای گەورە نین، ناگوترێت: ئەمە کەرامەتە بەڵکو ئەوان کاهینن و نوێنەری شەیتانن جیاوازی هەیە لە نێوان دۆستی خواو دوژمنی خوادا، باکردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر لەسەر دەستی دوژمنی خوا بە دەرکەوێت هەرگیز نابێت فریوی پێ بخورێت، چونکە لەلایەن شەیتانەکانەوە ئەنجام دراوە نەك لەلایەن خوای گەورەوە، بە پێچەوانەی کەرامەتەوە کە لە لایەن خوای گەورەوەیەو رێزی ئیماندارە تەقواکارەکانی خۆی پێدەگرێت، کەوا بوو جیاوازی هەیە لە نێوان سەرچاوەی کەرامەت و سەرچاوەی کردەوەی نا ئاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانیدا، وە جیاوازی هەیە لە نێوان دۆستی خواو دۆستی شەیتاندا، جیاوازی هەیە لە نێوان ئەمەو ئەوەدا، خەڵکی ئاسایی پێویستیان بە زانینی ئەم شتانە هەیە ئەمڕۆ، چونکە هەڵخەڵەتاندن و چاو بەستکردن و جادووگەری و غەی بزانی ئەمڕۆ زۆر بووە، پێویستە زانایان ئەم شتانە باس بکەن و، خوێندکارانی زانستی شەرعیش وەری بگرن و، بیزانن و، لە نێوان خەڵکیدا بڵاوی بکەنەوە، پێویستە خەڵکی ئاسایی لەم کەناڵە سەتەلایتە کافرە هەڵخەڵەتێنەرانە ئاگادار بکرێنەوە کە خەڵکیان پێ فریو داون. هەروەها بە مۆبایل و بە ئینتەرنێت پەیوەندی بە خەڵکەوە دەکەن و، هەڕەشەی لێ دەکەن و، پێیان دەڵێن: تۆ دەمریت، تۆ ئاوەهاو ئاوەهات بەسەر دێت، بەڵام ئەوەندەو ئەوەندە پارەمان بدەرێ و، ئێمە لەو شتانە رزگارت دەکەین، چەندها شتی تری بەو هاوشێوانەش.

له ڕوایەتێکی دیکەی ئەم فەرموودەیەدا هاتووە: مەعمەر دەڵێت: بەزوهریم گوت: ئایا لەسەردەمی نەفامیدا ئەم تیرە ئەستێرانە دەهاوێژران؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نێردرا پاسەوانی کردنی ئاسمانەکان کرایەوە[1].

---

(١)_ لە سەردەمی نەفامیدا ئەستێرەی کشاو زۆر بوون، ئەستێرەی کشاوی زۆر لە سەردەمی نەفامیدا بۆ شەیتانەکان دەهاوێژرا، کاتێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ نێردرا ئاسمان پاسەوانی کرا و شتێکی کەمی مایەوە، بۆیە کاتێ جنۆکەکان گوێبیستی قورئان بوون گوتیان: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (١) يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا (٢)﴾[الجن: ١_٢] واتە: بە ڕاستی ئێمە قورئانێکی سەرسوڕهێنەرمان بیست ڕێنموونیی دەکات بۆ ڕێی ڕاست ئێمەش باوەڕمان پێکرد وە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان. تاوەکو ئەو شوێنەی کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا (٨) وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَنْ يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَصَدًا (٩) وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَنْ فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا (١٠)﴾[الجن: ٨_١٠] واتە: وە ئێمە دەگەڕاین بە شوێن دەنگوباسی ئاسماندا کەچی دیمان پڕ کراوە لە پاسەوانی بەهێزو تیری ئەستێرەکان وە بێگومان ئێمە جاران دادەنیشتین لە چەند شوێنێك لە ئاسمان بۆ گوێگرتن بەڵام هەر کەسێك ئێستا کە بەدواوە گوێبگرێ تیرێکی ئەستێرە دەبینێ لە بۆ سەیدایە وە بە ڕاستی نازانین ئایا خراپی ویستراوە بۆ ئەوانەی کە لەسەر زەوین یا پەروەردگاریان ڕێنموونیی ویستووە بۆیان. ئا ئەمە ڕوویدا لە کاتی ناردنی پێغەمبەری خوادا ﷺ، کاتێك تیری ئەستێرەکان زیاد بوون، شەیتان سیخوڕەکانی خۆی نارد بۆ زانینی هۆکارەکە، گەڕانەوە گوتیان: موحەممەد ﷺ نێردراوە، چونکە کاتێ نێردرا پاسەوانی کردنی ئاسمان چڕتر کرایەوە. شاهێد ئەوەیە پێویستە بزانین

---

---

---

ئاو نێره ئەستێرانه له شەیتانەکان دەهاوێژرێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ (٦) وَحِفْظًا مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ مَارِدٍ (٧) لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ (٨) دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ (٩) إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ (١٠)﴾ [الصافات: ٦ـ١٠.] واتە: بێگومان ئێمە ئاسمانی دونیامان بە جوانی ئەستێرەکان ڕازاندۆتەوە وە لە هەموو شەیتانێکی سەرکەش پاراستومانە ناتوانن گوێبگرن بۆ ئەو فریشتانەی لە بەرزترین پلەدان وە(ئەگەر بچن گوێ بگرن) لە هەموو لایەکی (ئاسمانەوە) ئاگر باران دەکرێن ڕاودەنرێن زۆر بە توندی و (لە قیامەتدا) سزایان بەردەوامەو سەختە (شەیتانەکان ناتوانن گوێ بگرن) مەگەر یەکێکیان بەدزیەوە هەواڵێك (لەفریشتەیەك ببیستێ و) بە پەلە بیفڕێنێ ئەویش ئەستێرەیەکی ڕووناك شوێنی دەکەوێ (و دەیسوتێنێ).

– وە ئەسوەدی عەنسی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، شەیتانی هەبوو هەواڵی هەندێ شتی نادیارو شاراوەی پێ ڕادەگەیاند[١]، کاتێکیش موسڵمانان لە دژی جەنگان لە شەیتانەکان دەترسان هەواڵی ئەو شتانەی بدەنێ کە لە بارەیەوە دەیڵێن، بەڵام کاتێ خێزانەکەی کوفری مێردەکەی بۆ دەرکەوت یارمەتی موسڵمانانیداو کوشتیان[٢].

– هەروەها موسەیلەمەی درۆزنیش، شەیتانی لەگەڵدا بوو کە هەواڵی چەند شتێکی نادیارو شاراوەی پێ دەداو، لە ڕاپەڕاندنی هەندێ کاروباریشدا یارمەتی دەدا.

– کەسانی دیکەی بە هاوشێوەی ئەوانەش زۆرن وەکو حاریـثي دیمەشقی کە لەزەمەنی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا لە وڵاتی شام دەرکەوت و، بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، شەیتانەکان پێیەکانی ئەم حاریـثەیان لە پێوەند دەردەهێنا، نەیان دەهێڵا چەك بە جەستەیدا گوزەر بکات، پارچە مەڕمەڕەکە تەسبیحاتی دەکرد ئەگەر دەستی پێدا بهێنا یبا، پیاوانێکی ئەسپ سواری پێشانی خەڵکەکە دەدا کە بە هەوادا ڕێیان دەکردو، دەیگووت: ئەمانە فریشتەن، لە ڕاستیدا تەنها جنۆکەش بوون، وە کاتێك موسڵمانان دەسگیریان کرد بۆ ئەوەی بیکوژن ڕەمهاوێژەکە بەڕەم لێیدا، بەڵام بەجەستەیدا تێپەڕ نەبوو، عەبدولمەلیك پێی گووت: تۆ ناوی خوات نەهێنا، ئیتر ڕمهاوێژەکە ناوی خوای هێناو لێیداو کوشتی.

-----------------------------------------------

(١)_ ئەسوەدی عەنسی و موختاری کوڕی ئەبی عوبێدی ئەلـثەقفی، کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد، هەر هەموویان شەیتانیان هەبوو کە فریویاندان و هەڵیان خەڵەتاندن و، وایانزانی پێغەمبەرن.

(٢)_ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدایە ئەو موسڵمانانەی لە یەمەن بوون _چونکە لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرکەوت_ بیکوژن، ئەوە بوو عەبدوڵڵای کوڕی فەیروزی دەیلەمی چوو لەگەڵ خێزانەکەی ئەسوەدی عەنسیدا کە موسڵمانێکی تەقواکاری لە خوا ترس بوو قسەی کرد ئیتر یارمەتی کوشتنی دان و کوشتیان.

ئابەو جۆرەن ئەهلی باروحاڵە شەیتانیەکان هەر کات لە لایاندا شتانێکی بەنموونەی (آية الكرسي) بخوێندرێت شەیتانەکانیان لێ دور دەکەوێتەوە، چونکە لە فەرموودەی (صحيح) دا جێگیر بووە کە جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبی هورەیرەی بە پاراستنی زەکاتی سەرفترە ڕاسپارد، شەیتانێکیش شەو لە دوای شەوە لێی دەدزی، ئەویش دەستگیری دەکرد کە تەوبەی دەکرد ئازادی دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی دەفەرموو: ((يَا أَبَا هُرِيرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ البَارِحَةَ ؟)) واتە: ئەی ئەبا هورەیرە دوێنێ دیلەکەت چی کرد؟ ئەبو هورەیرەش رضي الله عنه دەیفەرموو: وایڕاگەیاند کەچیتر ناگەڕێتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی دەفەرموو: ((كَذَبَكَ وَإِنَّهُ سَيَعُودُ)) واتە: ((درۆی لەگەڵ کردی بێگومان دواتر دەگەڕێتەوە))، لە جاری سێیەمدا شەیتانەکە بە ئەبو هورەیرەی گووت: وازم لێبێنە تا شتێکت فێرکەم سوودی بۆت هەبێت، هەر کات چویتە سەر نوێنەکەت (آية الكرسي): ﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ﴾ [البقرة: ٢٥٥] تا کۆتایەکەی بخوێنە، چونکە لەلایەن خوای گەورەوە پارێزەرێکە بۆ تۆ و شەیتان نزیکت ناکەوێتەوە تا بەیانی، وە کاتێک ئەبوهورەیرە رضي الله عنه ئەم هەواڵەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، پێی فەرموو: ((صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ)) واتە: ((ڕاستی لەگەڵ کردی لەکاتێکدا ئەو زۆر درۆزنە))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو کە ئەوە شەیتان بووە[1].

---

(1)_ صحيح: أخرجه البخاري (٢٣١١)، و(٣٢٧٥)، و(٥٠١٠) معلقاً من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

بۆیە هەر کات مرۆڤ لە کاتی باروحاڵە شەیتانیەکاندا بە ڕاستی (آیة الکرسي) خوێند ئەوا پووچی دەکاتەوە، بە نموونەی کەسێك بە بارو حاڵێکی شەیتانیەوە دەچێتە نێو ئاگرەوە، یا ئامادەی گوێگرتنی فیکەکردن و چەپڵەلێدان دەبێت و، شەیتانەکانی بەسەردا دادەبەزن و، لەسەر زمانی قسەگەلێك دەکەن کە نازانرێت و، لەوانەشە تێگەیشتنی مەحاڵ بێت و، پێدەچێ ڕازو نیازی دڵی هەندێ لە ئامادە بوانیشیان بۆ ئاشکرا کات، پێدەچێ بە چەندین زمان قسە بکات هەر وەکو ئەو جنۆکەیەی کە لەسەر زمانی ئەو مرۆڤە قسە دەکات کە دەچێتە جەستەیەوە، ئەو مرۆڤەش کە بارو حاڵەکەی تووش دەبێت هەستی پێ ناکات وەکو ئەو فێدارەی لێدێت کە شەیتان دەستی لێوەشان دەبێت، چوو بێتە نێو جەستەیەوەو لەسەر زمانی قسەی کرد بێت، جا ئەگەر کەسەکە بە ئاگا هاتەوە هەست بە هیچ شتێکی ئەوانە ناکات کە گوتویەتی، لەبەر ئەمەیە کە پێدەچێ کەسی دەست لێوەشاوی دەستی شەیتان زۆر زۆری لێبدرێت بەئاستێك ئەگەر ئەو لێدانە لەخودی مرۆڤەکە بدرایە دەیکوشت یا نەخۆشی دەخست، بەڵام ئەو لێدانە کاریگەری لەسەر مرۆڤەکە نابێت و کاتێکیش بە ئاگادێتەوە ڕا دەگەیەنێت کە هەستی بەهیچ شتێك نەکردووە، چونکە لێدانەکە لەسەر جنۆکەکە بووە کە چۆتە نێو جەستەیەوە.

هەروەها کەسانێکی دیکەی لەوانە هەن کە شەیتانەکان خۆراك و میوەو حەڵواو شتی تریان بۆ دەهێنن کە لەو جێگەیەدا بوونی نییە، هەروەها کەسانێکی تریش هەن جنۆکەکان بۆ مەککە یا بۆ بەیتول مەقدیس یا غەیری ئەو شوێنانە دەیانفڕێنن.

هەروەها کەسانێکی تریش هەن کە جنۆکەکان لە ڕۆژی عەرەفەدا بۆ ئەوێ هەڵی دەگرن و، پاشان هەر ئەو شەوە دەیگەڕێننەوەو، ئیتر حەجێکی شەرعی ئەنجام نادات[1]،

---

(١)_ کەسانێکی تریش هەن کە جنۆکەکان لە ڕۆژی عەرەفەدا بۆ عەرەفە هەڵیدەگرن و، بە بێ ئیحرام بەستن دەیبەنە ئەوێ، کاتێك بە بێ ئیحرام بەستن

دەبەنە عەرەفەو دەیگەڕێننەوە ئەوا حەجی نەکردووە، لە ڕاستیدا جنۆکەکان تەنها بارێ پێ دەکەن و هیچی تر، چۆن بەبێ ئیحرام بەستن حەج دەکات؟ لە میقاتەکە ئێپەڕ دەبێت بەبێ ئیحرام بەستن، لە قەدەغە کراوەکانی ئیحرام خۆی بە دور ناگرێت، چونکە دەیەوێ سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکات. خوای گەورە بەواجیبی داناوە ئەو کەسەی بە نیازی حەج کردنە لە میقاتەوە ئیحرام ببەستێت، فەرمانی پێداوە لە قەدەغە کراوەکانی ئیحرام خۆی بە دور بگرێت. بەڵام ئەو سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەی کرد بۆیە شەیتانەکان خزمەتیان کرد. پێویستە هەرگیز بەم جۆرە کارانە فریو نەخورێت.

بەڵکو بەجلەکانی خۆیەوە دەچێت و، ئەگەر بەلای میقاتەکەشدا تێپەڕ بوو ئیحرام نابەستێت، (لبيك اللهم لبيك) ناڵێت، لە موزدەلیفە ناوەستێت، بەدەوری ماڵی خوادا تەواف ناکات، لە نێوان صەفاو مەروەدا سەعی ناکات، ڕەجمی جەمەرات ناکات[1]، بەڵکو بە جلەکانی خۆیەوە لە عەرەفە دەوەستێت و، پاشان لە هەمان شەودا دەگەڕێتەوە، ئەمەش حەجێکی شەرعی نییە[2] بە ڕێکەوتنی موسڵمانان، بەڵکو هەر وەکو ئەو کەسەیە کە چوبێتە نوێژی هەینی و بەبێ دەست نوێژ شوشتن نوێژی کرد بێت و ڕووی لە قیبلەش نەکرد بێت.

---

(١)_ ئەمانە کردەوە گەلێکی تاعەت و گوێڕایەڵی و خواپەرستین، بە قەستەوە وازیان لێدێنێت بۆیە شەیتانەکانیش خزمەتی دەکەن، ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورەی کردو، واجیبات و مەرجەکانی کردەوەی چاکی پشتگوێ خست، ئیتر شەیتانەکان خزمەتی دەکەن و، بۆ هەر جێگەیەك حەزی لێبێت هەڵی دەگرن و، بۆ جێگەو شوێنەکەی خۆشی دەیگەڕێننەوە. کەسێکی لەم جۆرە پێی ناگوترێت دۆستی خوا، بەڵکو لە دۆستەکانی شەیتانە.

(٢)_ ئەمە حەج نییە، چونکە مەرج و پایەو واجیباتەکانی بەتەواوی بەجێنەهێنراوە، بەڵکو کارێکی شەیتانییەو، حەج نییە، ئەگەرچی بانگەشەی ئەوەش بکەن کە حەجی کردوەو، چوەو هاتۆتەوە گوایە دۆستی خوایە، نەخێر، ئەمە لەدۆستەکانی شەیتانەو حەجی شەرعی ئەنجام نەداوە.

لەو کەسە هەڵگیراوانە کەسێکی وا هەبوو جارێکیان بۆ عەرەفات هەڵگیراو گەڕابووەوە، لە خەویدا فریشتە گەلێکی بینی کە حاجیەکان دەنووسن، ئەویش پێی گوتن: ئەی من نانووسن؟ گوتیان: تۆ لە حاجیەکان نیت، واتە حەجێکی شەرعی نەکردووە[١].

---

(١)_ ئەم کەسە یەکێکە لەوانەی کە شەیتانەکان لە ڕۆژی عەرەفەدا بۆ ئەوێ هەڵیان گرتوە، فریشتەکانی بینیوە حاجیەکان دەنووسن و، ئەویان نەنوسیووە، لێی پرسیون: بۆچی ئەویان نەنوسیووە؟، پێیان گوتووە: تۆ حەجت نەکردووە، چونکە وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا ئیحرامی نەبەستوەو، (لبيك اللهم لبيك)ی نەگوتوەو، کردەوەکانی حەجی وەك خۆی بەجێ نەهێناوە.

## جیاوازیەکانی نێوان کەرامەت و باروحاڵە شەیتانیەکان

وە لە نێوان کەرامەت و ئەو باروحاڵە شەیتانیانەی کە بە کە ڕاحەت دەچن لە ڕواڵەتدا، چەند جیاوازییەك بەدی دەکرێت، لەوانە: بە ڕاستی هۆکاری کەرامەتی ئەولیاو دۆستان ئیمان و تەقوایە[(١)] هۆکاری بارو حاڵە شەیتانیەکانیش ئەنجام دانی ئەو کارانە کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ قەدەغەیان کردووە[(٢)]، وە پشت بەو باروحاڵ شەیتانیانە دەبەسترێت بۆ ئەنجام دانی ئەوانەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ قەدەغەیان کردووە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾[الأعراف: ٣٣] واتە: بڵێ بێگومان پەروەردگارم تەنها ئەو کردەوانەی حەرام کردووە کە زۆر بە دو خراپن ئەوانەی کە ئاشکران و ئەوانەش کە نهێنین وە گوناهی(حەرام کردووە) وە دەست درێژی بە ناهەق وە(حەرامی کردووە) شتێك بکەنە هاوبەش بۆ خوا کە بەڵگەی بۆ نەهاتووە وە(حەرامی کردووە) کە بەدەم خواوە شتانێك بڵێن کە نایزانن.

---

(١)_ ئا ئەمەیە جیاوازیە ڕوونەکە، ئیمان و تەقواکاری و لە خوا ترسان، جا ئەو کەسەی ئیمان و تەقواکاری هەبێت ئەو کردەوە نا ئاسایە لە سروشت بەدەرانەی لەسەر دەستی بەدی دێت کەرامەتە، ئەوەش کە نەئیمان و نەتەقوای هەبێت ئەو کردەوە نا ئاسایە لە سروشت بەدەرانەی لەسەر دەستی بەدی دێت شەیتانییەو تەنها بۆ فریودانە.

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلآ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ(٦٣)﴾[یونس: ٦٢_٦٣] ئەمە بەڵگەیە کە ئەوانەی ئیمانیان نییەو تەقواکاری ناکەن دۆستی خوای گەورە نین ئەگەر چی کردەوەی نا ئاسایی لە سروشت بە دەریان لەسەر دەست بەدی بێت.

شت گوتن بە دەم خواوە بەبێ زانین و، هاوەڵپەرستی و، ستەم و، کردەوەی بەدو ناشیرین خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ حەرامیان کردوون[1]، بۆیە ئەمانە نابن بە هۆکار بۆ بە دەست هێنانی کەرامەتی خوای گەورە، وە ئەگەر کەرامەت بە نوێژو، زیکرو، خوێندنی قورئان و، نزا بە دەست[2]، بەڵکو بەهۆی شتانێکەوە بە دەست بێت کە شەیتان حەزی لێبێت، وە بەهۆی شتانێکەوە بە دەست بێت کە شیرك و هاوەڵپەرستی تێدا بێت، وەکو پەنا بردنەبەر مەخلوقات یان ئەو شتانە لەوانە بێت کە بکرێتە هۆکارێك بۆ ستەم کردن لە خەڵك و، ئەنجام دانی کردەوەی بەدو خراپ ئەوە بێگومان لە بارو حاڵە شەیتانیەکانە، نەك لە کەرامەتی ڕەحمانی[3].

---

(١)_ کەوا بوو ئەو کەسەی واز لەکردەوە بە دو ناشیرینەکان ناهێنێت و، لە تاوان و، هاوەڵپەرستی و، شتگوتن بەدەم خواوە بەبێ زانین خۆی بە دوور ناگرێت دۆستی خوای گەورە نییە ئەگەرچی کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەریش ئەنجام بدات، ئەو کردەوانە شەیتانیەو کەرامەت نییە.

(٢)_ ئەگەر کردەوەی نائاسایی لە سروشت بە دەر بە خوێندنی قورئان و، زیکرو، نوێژ کردن بەدەست، بێگومان کردەوەی نا ئاسایی لە سروشت بەدەری شەیتا نییە.

(٣)_ ئەگەر بە پێچەوانەی ئایەتەکەی سەرەوەوە بێت، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەرامەت نییە بەڵکو کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانییە، وە ئەو کەسەش کە ئەو شتانەی لەسەر دەست بەدی دێت دۆستی خوای گەورە نییە،

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------

بەڵكو لە دۆستەكانی شەیتانە، پێویستە خەڵكی هەموو ئەم شتانە بزانن، بە تایبەت پێویستە خوێندكارانی زانستی شەرعی ئەم شتانە بزانن، خەڵكی لێ دوور خەنەوە، چونكە كەسانێكی زۆری فەوتاندووە، وە دۆستانی شەیتان بەسەر بەندەكانی خوای گەورەدا زاڵ بوونەو، فریویان داون بەهۆی ئەو كردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرانەی كە لەسەر دەستیان بەدی دێت، ئیتر گومڕایان كردن و لە ڕێگەی ڕاستی خوای گەورە دوریان خستنەوە، پێویستە گرنگی بەم كارە بدرێت، كاری وەلایەت و دۆستایەتی، ئەوە ڕوون بكرێتەوە كە كێ دۆستی خوای گەورەیەو كێ دۆستی شەیتانە، بۆ ئەوەی فریویان پێ نەخورێت، چونكە گەورەترین فیتنەیە لە ئایینی خوای گەورەدا.

وە لەوانە کەسی ولیان نجدلیە ئەگەر ئامادەی گوێبیستی فیکە کردن و چەپڵە بوار بێت، شەیتانەکەی بەسەردا دادەبەزێت تا بە هەوا دا هەڵیدەگرێ و، لەو ماڵە دەری و دەیخنکێنێت[1].

---

(1)_ هەروەها شەیتان لە کاتی فیکە کردن و چەپڵە لێداندا ئامادە دەبێت، لە سەردەمی نەفامیدا ئەمەیان لە لای ماڵی خوادا ئەنجام دەدا، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ الْبَيْتِ إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً﴾ [الأنفال: ٣٥] واتە: وە نوێژی ئەوان (بت پەرستان) لە ماڵی خوادا هیچ نییە جگە لە فیکە کردن و چەپڵە لێدان. ئەمە بوو نوێژی بت پەرستان لە سەردەمی نەفامیدا لە لای ماڵی خوا دا، کێ فەرمانی ئەم شتەی پێدا بوون؟ شەیتان فەرمانی پێدا بوون، کەوا بوو ئەگەر مەجلیسێك هەبێت و ئەم شتە پڕوپوچانەی تێدا بێت بێگومان شەیتان ئامادەی دەبێت، ئامادەی ئەو جۆرە مەجلیسانە دەبێت، ئەگەر ئەم شتانە زۆر بوو ئەوا شەیتانەکان دۆستی خۆیان لەوێ هەڵی دەگرن و، لەو شوێنە دەری دەهێنن و، وا دەزانن ئەمە کەرامەتێکەو بۆی بەدی هاتووە، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها کاری شەیتانێکی سەرکەش بووە، ویستویەتی گومڕای بکات و، گومڕای ئەو کەسانەش بکات کە فریوی پێ دەخۆن. تا ئەمەیە مەجلیسەکانی ڕابواردن، تەنها مژدە بۆ شەڕ ڕاکێش دەکات، بە پێچەوانەی مەجلیسەکانی زیکرو، مەجلیسەکانی قورئان خوێندنەوە کە فریشتەیان تێدا ئامادە دەبێت، لەو بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم إلا نزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة وحفتهم الملائكة وذكرهم الله فيمن عنده)) واتە ((هەر کۆمەڵێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوادا کۆببنەوە، قورئان بخوێننەوەو موتالای بکەن، ئەوا بێگومان دڵ ئارامیان بەسەردا دادەبەزێت، ڕەحمەت و بەزەیی دایان دەپۆشێت، فریشتەکان چوار دەوریان دەگرن، خوای گەورەش باسیان دەکات لای ئەوانەی کە لای ئەوون)).

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------

ئا ئەمەیە جیاوازی نێوان مەجلیسەکانی زیکرو مەجلیسەکانی شەڕ، مەجلیسەکانی زیکر فریشتەکان ئامادەی دەبن بەڵام مەجلیسەکانی شەڕ شەیتانەکان ئامادەی دەبن، لە نێوان ئەوەو ئەمەدا جیاوازی هەیە، مەجلیسی دۆستانی خواو مەجلیسی دوژمنانی خوا. هاوشێوەی ئەم جۆرە مەجلیسانە ئەو مەجلیسانەیە کە بە(الزار) _ئاهەنگێکە جادووگەران و فێڵبازان و چاو بەستکاران ڕێکی دەخەن گوایە بۆ چارەسەکردنی ئەو کەسانەی کە جنۆکەکان دەستیان لێ وەشاندووە_ ناو دەبرێت، لەو ئاهەنگانەدا ئەمەندە دڵخۆشی و جۆش و خرۆشی دەیانگرێت تا دەگەنە ئەو ئاستەی کە دەبورێنەوە، شەیتانەکان لایان ئامادە دەبن و، پێدەچێ هەندێ کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەریشیان بۆ ئەنجام بدەن، ئیتر خەڵکەکە وا دەزانن کەرامەتی خوای گەورەیە، ئەمە لای صۆفیەکان زیاتر ڕوو دەدات، ئەم شتانە بە لای قۆشمەچیان و بێ ئابڕوان و چەقاوەسووانەوە ڕوونادات، ئەمانە کەسانێکی سووك و ڕیسوان، بێنرخن و خەڵك بە باشی دەیان ناسن، بەڵکو ئەو شتانە بەلای صۆفیەکانەوە ڕوودەدات کە کەمێك زوهدو عیبادەتیان هەیەو، خەڵك زیاتر فریویان پێ دەخۆن.

وە ئەگەر پیاوێك لە دۆستانی خوای گەورە لەوێ ئامادە بێت شەیتانەكەی دوور دەخاتەوەو، ئەویش دەكەوێتە خوارەوە هەر وەكو ئەوە بەرامبەر چەند كەسانێك ڕوویداوە[١].

لەوانە كەسی وایان تێدایە پەنا دەباتە بەر كەسێكی زیندوو یان مردوو، گوێی ناداتی ئەو كەسە موسڵمان بێت یا گاور بێت یا هاوەڵپەرست بێت، شەیتانیش خۆی بەوێنەی كەسی پەنا بۆ براو دەگۆڕێت و هەندێ لە پێویستیەكانی ئەو كەسە پەنابەرە جێبەجێ دەكات[٢]

---

(١)_ ئەو كەسەی لەگەڵ فیكە كردن و چەپڵە لێدانەكەدا زیاتر جۆش و خرۆشی دەبگرێت شەیتانەكان بە هەوادا هەڵی دەگرن، هەر كات دۆستێكی خوای گەورە لەوێ ئامادە بێت دەست بەجێ شەیتانەكە دوور دەكەوێتەوەو، ئەو دەكەوێتە خوارەوە، چونكە ئەوەی هەڵیگرت بوو هەڵات. ئەمە بەڵگەیەكی ئاشكرایە لەسەر پووچ بوونەوەی بارو حاڵە شەیتانیەكان لە كاتی ئامادە بوونی دۆستانی خوای گەورەدا، لەكاتی ئامادە بوونی زیكرو یادی خوای گەورەدا. ئەمە یەكێكە لە جیاوازیەكانی نێوان كردەوە نا ئاساییە لە سروشت بەدەرەكانی شەیتانی و كەرامەتی دۆستانی خوای گەورەدا.

(٢)_ ئەو كەسەی پەنا بەرێتە بەر كەسێكی مردوو یان پەنا بەرێتەبەر كەسێكی نا دیار و ئامادە نەبوو، ئەوا شەیتان خۆی بە وێنەی كەسی پەنا بۆ براو دەگۆڕێت و، دێت و وەڵامی كەسی پەنابەر دەداتەوەو، پێویستیەكەی بۆ جێبەجێ دەكات، لەبەر نیتنەو ئاشوب دروست كردن و، بەرە بەرە كێشكردنی. هۆكاری ئەوەش بۆ شیرك و هاوەڵپەرستی دەگەڕێتەوە، چونكە داوای یارمەتی كردن و پەنا بەردنە بەر كەسانی مردوو و نا دیارو ئامادە نەبوو شیرك و هاوەڵپەرستییە، بێگومان هاوەڵپەرستی و شیركیش شەیتان ڕازی دەكات، بۆیە خزمەتی ئەو كەسە هاوەڵپەرستە دەكات، ئیتر بە وێنەی ئەو كەسەی كە داوای یارمەتی لێكردووەو پەنای بۆ بردووە دەچێتە لای و پێویستیەكانی بۆ جێبەجێ دەكات، ئەو بەدبەختەش وادەزانی ئەو وەلی و دۆستەیە كە پەنای بۆ بردوەو داوای یارمەتی لێكردووە، یان وا دەزانێت كە مردوكەیە یان كەسە نادیارەكەیە و لەبەر ئەو ئامادە بووە.

ئیتر وا دەزانێت کەسەکەیە یان فریشتەیەکە بە وێنەی کەسەکە خۆی گۆڕیوە[1]، لە ڕاستیشدا ئەوە تەنها شەیتانە گومڕای کرد کاتێ شیرکی بۆ خوای گەورە بڕیار دا، هەروەکو شەیتانەکان کە دەچوونە نێو بتەکانەوەو لەگەڵ هاوەڵپەرستاندا قسەیان دەکرد[2].

---

(١)_ ئەو بەد بەختە ناڵێت: شەیتانەو خۆی بەوێنەی کەسەکە گۆڕیوە بەڵکو فریوی پێ دەخوات و، دەڵێت: ئەوە فریشتەیەکە خۆی لەسەر شێوەی ئەو مرۆڤە گۆڕیوە کە پەنام بۆ بردووە، فریشتەکان لەمەجلیسەکانی خراپەکاریدا ئامادە نابن، لە مەجلیسەکانی شەڕدا ئامادە نابن، شەیتانەکانی لەو مەجلیسانەدا ئامادە دەبن، لە ڕاستیدا فریشتەکان تەنها لە مەجلیسەکانی خێرو قورئان و زیکردا ئامادە دەبن.

(٢)_ پێشتریش ئاماژەی پێدرا کە شەیتانەکان دەچنە نێو بتەکانەوە، بەردو، درەخت و، تەنانەت گۆڕیشەوە کە لە جیاتی خوای گەورە داوایان لێدەکرێت، شەیتانەکان دەچنە نێویانەوەو پاشان خۆیان لەسەر وێنەی ئەو کەسە پەرستراوانە دەگۆڕن کە دەیانپەرستن و، هێندێك پێویستیان بۆ جێبەجێ دەکەن، هێندێ شتیان بۆ ئامادە دەکەن، لە شوێنێکی دوور لە ماڵ و سامانی خەڵکی دەیدزن و، بۆیانی، ئیتر وا دەزانن ئەو کەسە دۆستێکی خوای گەورەیە، یان فریشتەیەکەو هاتۆتە لایان، وە چەندها شتی تریش کە خەڵکی پێ فریو دەدەن.

لەوانە کەسی وایان تێدایە کە شەیتان خۆی بۆ دەگۆڕێت و، پێی دەڵێت: من خەضیرم[1]، وە لەوانەیە هەواڵی هێندێ شتیشی بداتێ، یارمەتیشی بات بۆ بەجێهێنانی هێندێ لە داواکارییەکانی، وەکو ئەوەی بۆ زیاتر لە کەسێك لە موسڵمانان و جوولەکە و گاورانیش بەدی هاتووە.

---

(١)_ خەضیر، ئەو بەندە چاکە بوو کە خوای گەورە لە لایەن خۆیەوە زانستی پێبەخشی بوو، مووسا پێغەمبەر _علیه السلام _چووە لای بۆ چاوپێکەوتنی و، فێربوون لێیەوە، ئەو مردووە، بەڵام کەسانێك هەن بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە زیندووەو، بە دونیادا دەگەڕێت، دەڵێت: من خەضیرم، ئەوە شەیتانە دێت و، دەڵێت: من خەضیرم، لە کاتێکدا ئەو لە زەمەنی مووسا پێغەمبەرەوە _علیه السلام_مردووە، هەموو کەسێك دەمرێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ(٣٤) كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ(٣٥)﴾[الأنبياء: ٣٤_٣٥] واتە: بڕیارمان نەداوە بۆ هیچ کەسێك لە پێش تۆوە مانەوەی هەمیشەیی (نەمریی) ئینجا ئەگەر تۆ بمری (دوای مردنی تۆ) ئایا ئەوان ژیانیان بەردەوام دەبێ و نامرن (نەخێر) هەموو کەسێك مردن دەچێژێ(دەمرێ). خەضیرو غەیری ئەو هەمووان دەمرن، کەسانێکیان لەو باوەڕدان کە نەمردووەو، زیندووەو، بەدونیادا دەگەڕێت، کاتێ باسی کرێت ئامادە دەبێت، هەر کەس باسی کات ئامادە دەبێت، هەموو ئەم قسانە پووچن، ئەگەر شتێك ئامادە بێت و، بەشێوەیەك خۆی گۆڕی بێت بێگومان شەیتانەو، خەضیر نییە.

وە زۆرێك لە كافران لە سەر زەمینی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو غەیری ئەم دوو شوێنەشدا كە مردوویەكیان دەمرێت، پاش مردنی شەیتان لە شێوەی ئەو مردووەدا دێت و، ئەوانیش وادەزانن خودی مردووەكەیە، قەرزەكان دەداتەوەو، سپاردەكان دەگەڕێنێتەوەو، شتانێكیش ئەنجام دەدات كە پەیوەندی بە مردوكەوە هەیە[1]

---

(١)_ وا دەزانن خودی مردوكەیە، هەرگیز مردوو ناگەڕێتەوە، هەر كەسێك بمرێت هەرگیز بۆ دونیا ناگەڕێتەوە، بە كۆتایی دونیای بەجێهێشت و، لە توانادا نییە بگەڕێتەوە، بۆیە كاتێ كافران داوای گەڕانەوە دەكەن بۆ دونیا بۆ ئەوەی كردەوەكانیان چاك بكەنەوە، خوای گەورە بێ ئومێدیان دەكات لەوەی كە چیتر بۆ دونیا ناگەڕێنەوە، خوای گەورە هەرگیز كەسی مردوو بۆ دونیا ناگەڕێنێتەوە. بەلام لەوانەیە ئەم شتە وەكو موعجیزەیەك بۆ هێندێك لە پێغەمبەران بەدی بێت، لە پێناو مەبەستێك لە مەبەستەكاندا وەكو چیرۆكی كوژراوەكە لە بەنی ئیسرائیل، چیرۆكی ئەوانەی لە شارەكەیان چوونە دەرەوە، عوزەیر كە ڕابورد بە لای شاری (بیت المقدس) لە كاتێكدا ئەو شارە دیوارەكانی ڕوخا بوو بەسەر سەربانەكانیدا، عوزێر گوتی خوای گەورە چۆن ئەم شارە ئاوەدان دەكاتەوە پاش وێران بوونی، یەكسەر خوای گەورە سەد سالْ مراندی پاشان زیندووی كردەوە. لەوانەیە خوای گەورە مردوو زیندوو بكاتەوە بۆ دامەزراندنی بەلگە و موعجیزەیەك بێت، بۆ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران.

دەچێتە لای خێزانی مردوکەو دەچێت، وە لەوانەیە مردوکەی خۆیان بە ئاگر سووتاند بێت، وەکو ئەوەی کافرانی هیندستان ئەنجامی دەدەن[1]، واش دەزانن پاش مردنی زیاوە[2].

---

(۱)_ ئایا ئوممەتێك لە ئوممەتان و ڕەگەزێك لەئادەمیزاد هەیە وەکو هیندیەکان کە مردوکانی خۆیان دەسوتێنن، پاش سووتاندن بە جوانترین و چاکترین شێواز دێت و دەڵێت: من موژدەی خەیرتان دەدەمێ، من لەبەهەشتدام، ئەمە شەیتانە بۆ ئەوەی فریویان بدات، مردوکانی خۆیان بسوتێنن، کەسانێکیان تێدایە کەسانی زیندوو دەسوتێنن، لاوێکی خۆیان بە جوانترین شێواز دەڕازێننەوە وەکو ئەوەی بووکێك بگوازنەوە، پاشان ئاگرێکی گەورە دادەگیرسێنن و، ئەو لاوە فڕێ دەدەنە نێوی، پاش ماوەیەکی کەم بە جوانترین شێوازو جوانترین جلوبەرگ دێت، پێیان دەڵێت: هەموو خێرێکم تووش بوو، ئەم شتانە کاری شەیتانە چونکە دەتوانێت خۆی بگۆڕێت، خۆی بەشێوەی مردوکە دەگۆڕێت بۆ ئەوەی فریویان بدات و زیاتر لاوانی خۆیان بسوتێنن. ئا ئەمەیە کارو کردەوەی شەیتان لەگەڵ ئادەمیزادا بەردەوام و هەمیشە.

(۲)_ وا دەزانن بۆ دونیا گەڕاوەتەوە، ڕوحەکەی بۆ گەڕاوەتەوەو، دوبارە بۆ دونیا هاتۆتەوە، هەموو ئەم شتانە کاری شەیتانە، شەیتان لەسەر شێوازی مردوکە هاتوەو، ئەوانیش وا دەزانن ژیاوەتەوە.

– لەوانە شێخێك هەبوو لە وڵاتی مصر بە خزمەت کارەکەی کردو، پێی گووت: هەر کات من مردم مەهێڵە هیچ کەسێك بم شوات، خۆم دێم و خۆم دەشۆم، بۆیە کاتێك مرد خزمەتکارەکەی کەسێکی لەسەر شێوەی ئەو بەدی کرد، ئیتر لەو باوەڕە دا بوو کە خوودی خۆیەتی چووە ژوورەوەو خۆی شوشت، کاتێك ئەو کەسەی چووە ژورەوە شوشتنەکەی تەواو کرد _واتە شوشتنی مردوکەی تەواو کرد_ دیار نەما، ئەوە شەیتان بوو، مردوکەی گومڕا کرد بوو، پێی گوتبو: تۆ پاش مردن دێیت و خۆت دەشۆیت، بۆیە کاتێك مرد دیسان لەسەر شێوازی مردوکە هاتەوە بۆ ئەوەی زیندووەکانیش گومڕا کات، وەکو چۆن پێشتر مردوکەی گومڕا کرد بوو[1].

---

(١)_ شەیتان مردوکەی گومڕا کرد بوو، چونکە نەیهێڵا خەڵك بیشۆن وەکو باروحاڵی مردوانی تر، کەسی مردوو پێش ئەوەی بمرێت وەڵامی شەیتانی دایەوە، خزمەتکارەکەی ڕاسپارد کە هیچ کەسێك نەیشوات، وەکو ملکەچ بونێك بۆ شەیتان، کاتێ ئەو کەسە مرد یەکێکیان بەدیکرد هات و شوشتی، وایانزانی خودی مردوکەیە، کەسێکیان بۆ هات لەسەر شێوازی مردوکە وایانزانی خودی مردوکەیە هات و خۆی شت، کەچی لە حەقیقەتدا شەیتان بوو بۆ ئەوەی فریویان بدات، شەیتان زیندوەکان و مردوکەشی فریودا، ئا ئەمەیە شەیتان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾[فاطر: ٦] واتە: بێگومان ئەو (شەیتان)ە تاقم و کۆمەڵەکەی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی (دۆزەخ). کەواتە: وریا بن و وریا بن لە شەیتانەکانی جنۆکەو مرۆڤ کە بازاڕی ئەم بیرۆکە بۆگەنانەو ئەم شتە بێمانایانە گەرم دەکەن.

- کەسی وایان تێدایە عەرشێك لە هەوادا دەبینێت و نورو ڕووناکیەکی بەسەرەوەیە، گوێبیستیشی دەبێت لەگەڵ کەسانێکدا قسە دەکات، وە بە کەسەکە دەڵێت: من پەروەردگارتم، جا ئەو کەسە ئەگەر لەئەهلی زانست بێت، دەزانێت شەیتانە بە توندی دوری دەخاتەوەو، پەنا دەگرێت بە خوای گەورە لەو شەیتانە، ئیتر بەو جۆرە نامێنێت[1].

- کەسی واشیان تێدایە لە کاتی بە ئاگا بوون و بە خەبەر بووندا کەسانێك دەبینێت، هی وایان تێدایە بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر(نبي)ە یان صیدیقە یان شێخێکە لە پیاو چاکان، بەڵام تەنها شەیتانەو هیچی تر، ئەم شتە بۆ زیاتر لە چەند کەسێك ڕوویداوە.

- کەسی واشیان تێدایە ئەو شتانە لای ئەو گۆڕەدا دەبینێت کە دەچێتەلای، تەماشا دەکات گۆڕەکە کرایەوەو وێنەیەکی بۆ هاتە دەرەوە، وا دەزانێت مردوکەیە، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها جنۆکەیە کە لەو وێنەیەدایە.

---

(١)_ کەسی وا بوو عەرشێکی لە نێوان ئاسمان و زەویدا دەبینی و، نورو ڕووناکیەکیشی بەسەرەوە دەبینی کە لە ڕاستیدا تەنها شەیتان بوو، خۆی پیشاندەداو، فەرمانی شتانێکی پێ دەکرد، لێرەدا ئەگەر ئەم کەسە ئیماندار بێت بەدرۆی دەخاتەوە ئیتر دەفڕێت و دەچێت و نامێنێت، بەڵام کەسی بێبڕوا فریوی پێدەخوات گوێڕایەڵی دەبێت، دەگێڕنەوە کەوا شێخ عەبدولقادری گەیلانی ڕێیدەکرد لە پڕداو لەسەرەوە سێبەری شتێك دایپۆشی، کە سەری بەرز کردەوە عەرشێکی بینیی کەسێکی بەسەرەوە بوو، پێی گوت: ئەی عەبدولقادر من پەروەردگارتم، ئەوەی بۆم حەرام کرد بووی ئیستا بۆم حەڵاڵ کردووی، عەبدولقادریش پێی گوت: درۆت کرد، لە ڕاستیدا تۆ شەیتانیت، چونکە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ حەڵاڵ و حەرام کردنێك دانابەزێت، شکستی پێهێناو پیلانەکەی پووچ کردەوە، بەڵام ئیمان لاوازان بەم شتانە فریو دەخۆن.

– کەسی وایان تێدایە تەماشا دەکات ئەسپێك لە گۆڕی مردوکە هاتە دەرەوە یان چووە نێویەوە، بەڵام تەنها شەیتانەو هیچی تر.

– وە هەر کەسێك بڵێت: پێغەمبەرێکی بە چاوەکانی سەری خۆی بینیوە، با دڵنیا بێت جگە لە خەیاڵ هیچی تری نەبینیوە.

– وە کەسی واشیان تێدایە لە خەویدا کەسێکی پایە بەرزی پلە بەرزی _وەکو (الصدیق ﷺ) یان غەیری ئەو دەبینێت کە پرچەکەی بۆ کورت کردۆتەوە یان تاشیویەتی، یان کڵاوەکەی لەسەر کردووە یا پۆشاکەکەی لەبەر کردووە، بەیانیش کە خەبەری دەبێتەوە دەبینێت کڵاوێکی لەسەر کراوە، پرچەکەشی تاشراوە یا کورت کراوەتەوە، لە ڕاستیدا تەنها جنۆکەکان بوونە کە پرچەکەیان بۆ تاشیوە یا کورتیان کردۆتەوە[1].

وە ئەم باروحاڵە شەیتانیانە بۆ ئەو کەسانە بەدی دێت کە لە پێڕەوی قورئان و سوننەت لایانداوە[2]،

---

(١)_ شەیتان دەچێتە لای کەسی نووستو و پرچەکەی دەتاشێت و، کڵاوێکی لەسەر دەکات، کە خەبەری دەبێتەوە دەبینێت کڵاوێکی لەسەر کراوەو پرچەکەشی تاشراوە، ئیتر خەڵکی وا دەزانن فریشتەیەك ئەو کارەی بۆ کردووە، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها شەیتانەو فریشتە نییە.

(٢)_ ئەمە بۆ ئەو کەسانە بەدی دێت کە لە پێڕەوی قورئان و سوونەت لایانداووە، بەڵام ئەو کەسەی دەست بە قورئان و سوونەتەوە بگرێت بەم شتانە فریو ناخوات، تەماشاکەن شێخ عەبدولقادری گەیلانی چی گوت: گوتی: پاش پێغەمبەری خوا ﷺ حەڵاڵ کردن و حەرام کردن دانابەزێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾[المائدة: ٣] واتە ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو (کامل) کردووە بۆتان، بەرەکەتی زانست شێخ عەبدولقادری لەو شەیتانە پاراست.

ئەوانیش چەند پلەیەکن[1] و

(١)_ چەندین جار ئاماژەمان پێداوە کە لە نێوان کەرامەتی ئەولیاو کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانیدا جیاوازی هەیە، هۆکاری کەراماتی ئەولیا ئیمان و ئەتقواکارییە، بەڵام هۆکاری کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانی کوفرو هاوەڵپەرستی و ئیلحادن، کەراماتی ئەولیا لەکاتی زیکری خوای گەورەو، خوێندنی قورئاندا ڕوودەدەن، بەڵام کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانی لە کاتی خوێندنی قورئان و، زیکری خوای گەورەدا دەفەوتێت و نامێنێت، چونکە ئەگەر مرۆڤ کوفری بە خوای گەورە کردو هاوبەشی بۆ بڕیارداو سەرپێچی خوای گەورەی کرد، ئەوا شەیتانەکانی بەسەردا زاڵ دەبن و، بەرەو گومڕا بوونی ڕاکێش دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ(٣٦) وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ(٣٧)﴾[الزخرف: ٣٦_٣٧] واتە: وە هەر کەس پشت لە یادی خوا هەڵکات شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین کە هەمیشە لەگەڵی بێ و لێی جیانەبێتەوە وە بێگومان ئەوانە (شەیتانەکان) لە ڕێگای ڕاست بەرگری یان دەکەن واش دەزانن بە بێگومان هەر ئەوانن ڕێنوێین، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضاً بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾[الأنعام: ١٢٩] واتە: بەو شێوەیە هەندێ لە ستەم کاران دەکەین بەدۆست و پشتیوانی هەندێکی تریان بەهۆی ئەو کردەوانەوەی ئەنجامیاندەدا. ئەمە ئاشکرایەو هیچ ئاڵۆزیەکی تێدا نییە، بۆیە کردەوەی نا ئاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانی و کەرامەتی ئەولیا تێکەڵ بە یەکتر نابن، جیاوازییەکە ڕوونە. (ئەوانیش پلە گەلێکن): واتە کردەوە نا ئاسایی لە سروشت بەدەرە شەیتانیەکان چەندین پلەن هەندێکیان لە هەندێکی تریان توندترو خراپترە بەگوێرەی کوفری کەسەکەو گوێڕایەڵ بوونی بۆ شەیتان و توندی کوفرەکەی.

ئـەو جنۆكانـەش کـە دەبـن بـە هاوەڵیـان لـە ڕەگـەزيانن و لەسـەر مەزهـەب و ڕێباوەڕيـانن[١]، جنۆکـەش کـافرو، فاسـق (لـە ڕێـی ڕاسـت لادەر و) ، هەڵەکاريشـيان تێدايە[٢]، بۆيە ئەگەر مرۆڤەکە کافر يا فاسق(لەڕێی ڕاست لادەر) يا نەفام بوو، ئەوا لە بواری کوفرو فاسيقی و نەفاميەکەدا تێکەڵاويی دەکەن، لەوانەشە يارمەتی بەن ئەگـەر قايل بوو بە وەرگرتنی ئەو کوفرانەی کـە ئـەوان بـۆی هـەڵ دەبـژێرن[٣] وەکـو سـوێند خواردن بەو ناوانەی کە بە گەورەيان دادەنێن لە جنۆکەو غەيری ئەوانيش[٤]،

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضاً﴾[الأنعام: ١٢٩] واتە: بەو شێوەيە هەندێ لـە سـتەم کـاران دەکـەين بەدۆسـت و پشـتيوانی هێنـدێکی تريان. ئەوان ستەم کارن و دۆستە مرۆڤەکانيشان ستەم کـارن، زاڵ بـوون بەسـەرياندا بە هۆی ستەم کردن و کوفری خۆيانەوە بە خوای گەورە وەکو سزايەك بۆيان.

(٢)_ ئەو جنۆکانـەی کـە لەگـەڵ مرۆڤـدان، کافريـان تێدايـە کـە شـەيتانە، يـاخی بوويان تێدايە کە بە ئاستی کوفر ناگات، وە کەسانی هەڵەکاريشيان تێدايە، ئەوان يەك پلە نين، بۆيە ئەوان لە کوفرو ئيلحادو زەنديقيەتدا جياوازن.

(٣)_ ئەگـەر گوێڕايـەڵيی کـردن لـەو کوفرانـەدا کـە فـەرمانی پـێ دەکـەن، ئـەوا خزمەتی دەکەن و هاوکاری دەکەن و يارمەتی دەدەن.

(٤)_ بۆيە تەماشا دەکەيت ئـەو جادووگـەرو چـاو بەسـت کارانـە کـە فەرمانبـەری شەيتانن بە پەلە قسەدەکەن و بە وشە گەلێکەوە منگـە مـنگ دەکـەن کـە مرۆڤـ لێـی تێناگـات، وە نـاوانێکی نەناسـراو بـانگ دەکـەن، ئـا ئەوانـە دۆسـتەکانيانن لەجنۆکـە، ناوەکانيان بانگ دەکەن و قسەکانی ئەوان دەڵێنەوە، بۆيە ئێمە لێی تێناگەين.

یان وەکو ئەوەی کە ناوەکانی خوای گەورە یا هێندێ لە گوفتارەکانی بەپیسی بنوسێت[١]، یان سورەتی (الفاتحة) یان سورەتی (الإخلاص) یان (آية الكرسي) یان ئەبری ئەمانە هەلگەڕێنێتەوەو[٢]، بەپیسی بیانوسێت[٣]،

-----

(١)_ ئەگەر گوێڕایەڵی کردن و سووکایەتی بەزیکرو یادی خوای گەورەکرد، ئەوان خزمەتی دەکەن، وەکو ئەوەی هەموو قورئان بەپیسی بنووسێت، فڕێی بداتە نێو خۆڵ و خاشاکەوە، ئەو کارانە بکات کەلێی داوا دەکەن، ئەوجا ئەوان خزمەتی دەکەن، هەر چەند سەرپێچییەکانی زۆر بوون ئەوان زیاتر خزمەتی دەکەن، لەوانەیە خزمەتێکی کەمی بکەن چونکە کەمێك ملکەچیان بووە، لەوانەشە خزمەتێکی مام ناوەندی و لەوانەشە بەزۆری خزمەتی بکەن بەهۆی ئەو کوفرەوە کە لە دڵیدا هەیەو، بە هۆی ئەو گوێڕایەڵ بوون و ملکەچییەی کە بۆ ئەوان هەیەتی.

(٢)_ قورئان بشێوێنێت، وشەو پیتەکانی کەم بکاتەوە، ئەگەر ئەم کارەی کرد خزمەتی دەکەن، ئەمە گاڵتەکردن و سووکایەتی کردنە بە گوفتاری خوای گەورەو بە قورئانەکەی، کە چی کەسانێك هەن وا دەزانن ئەمە کەرامەتەو، ئەو کەسە دۆستێکە لە دۆستانی خوای گەورە، چونکە گوایە ئەو نهێنییەی زانیووە لە کاتێکدا شەیتان فەرمانی ئەو شتەی پێداوە.

(٣)_ قورئان بە ماددەیەکی پیس دەنوسنەوە، یان لە جێگەیەکی پیسدا دەینووسنەوە.

ئەوجا ناوی بۆ دەگۆڕن و، دەیگوازنەوە بەهۆی ئەو کوفرەوە کە ئەوانی پێ ڕازی دەکات[(١)].

لەوانەیە ژنێك یان منداڵێکی بۆ بەرن کە ئارەزووی دەکات، یان بە هەوا دا، یان باڵی دەنێن و بە ئارەزووی خۆی بۆلای ئەو کەسە دەچێت[(٢)].

وە چەندەها نموونەی تری ئەم شتانە کە وەسف کردنی درێژە دەکێشێت[(٣)]،

---

(١)_ ناوەکەی بۆ دەگۆڕن بۆ ئەوەی وایان پیشاندات کە توانای گۆڕینی ناوی هەیە، لەبەر ئەوە بڕوای پێ دەکەن، یا بۆ ئەو شوێنەی کە خۆی دەیەوێت هەڵی دەگرن، بە بێ ئەوەی بە پێی خۆی ڕێبکات یان بە سوار بونێکی ئاسایی بچێت، بەڵکو بە هەوادا دەیفڕێنن و، بەو شوێنەی دەگەیەنن کە خۆی دەیەوێت و، پاشان دەیگەڕێننەوە، ئیتر ئەو کەسانەی دەیبینن وا دەزانن دۆستێکە لە دۆستانی خوای گەورەو، ئەوە کەرامەتە، بەڵام بە باشی تەماشای کردەوەکانی ناکەن، تەماشای بیروباوەڕو عەقیدەی ناکەن، تا بزانن دۆستی خوایە یان شەیتانە.

(٢)_ ئەگەر ئارەزووی ژنێك بکات بۆی ئەگەر چی دووریش بێت، هەڵی دەگرن و بۆی دەبەن، ئەو ژنە یان ئەو منداڵە بە هەوا دا هەڵی دەگرن و بۆی دەبەن، یان وایلێ دەکەن بەپێیەکانی خۆی و بە ئارەزووی خۆی بۆ لای ئەو کەسە بچێت.

(٣)_ شێخول ئیسلام ئەو شتانەی ڕوون کردۆتەوە کە نەفامان فریوی پێ دەخۆن، هێندێ خەڵك فریوی پێ دەخۆن و، وا دەزانن کەرامەتێکە لە لایەن خوای گەورەوە، چونکە ئەنجامدانی ئەو شتانە لە توانای مرۆڤ بە دەرە، بۆیە وا دەزانن لە لایەن خوای گەورەوەیە، وە دۆستێکی خوای گەورەیە، کەچی نازانن ئەو شتانە بەیارمەتی شەیتان ئەنجامدراوە. درك کردن بەم شتانە پێویستی بە تێگەیشتنی ڕاستی ئایینی خوایە، پێویستە ئادەمیزاد بە هیچ باروحاڵێك فریونەخوات کە دەیانبینێت تا پاش ئەوەی بەتەواوی خاوەنی ئەو باروحاڵە دەپشکنێت، ئایا کەسێکی تەقواکارە، یان کافرێکی بەد بەختە، بۆ ئەوەی بۆی ڕوون بێتەوە کەرامەتە یان کارێکی شەیتانییە.

وە بڕواکردن بەو جۆرە شتانە بڕواکردنە بە(الجِبْتْ) و (الطاغوت)[1]، لەو بارەوە خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿أَلَمْ تَـرَ إِلَى الَّـذِينَ أُوتُـواْ نَصِيبًا مِّـنَ الْكِتَـابِ يُؤْمِنُـونَ بِالْجِبْـتِ وَالطَّاغُوتِ﴾[النساء: ٥١] واتە: ئایە ئاوڕێکت نەداوەتـەوە لەوانـەی بەشێك لـە نامـەی خواییان پێدراوە بڕوا دەهێنن بە جادوو و بە بەرنامەی غەیری خوا.

وشەی (الجِبْتِ) واتە: جادوو، (الطَّاغُوتِ) واتە شەیتانەکان و بتەکان[2]،

---

(١)_ بڕوا کردن بەو جۆرە شتانە بـڕوا کردنـە بـەجادوو و شـەیتانەکان و بتـەکان، ئیتر هەر کەس بڕوا بەم شتانە بکات ئـەوا ئـەو کـردەوە نـا ئاسـاییانەی بـۆ دێتـە دی، ئەمە کاری جوولەکەکانە کە بڕوا بە جادوو و شەیتان و بتـەکان دەکـەن، وە ئەوانـەش کە لەسەر ڕێبازی ئەوانن.

(٢)_ هەر شتێك لە جیاتی خـوای گـەورە پەرسـترا ئـەوە پەرسـتنی (الطَّاغُوتِ)ە، ئەگەر پەرستراو بەوە ڕازیبوو ئەوە (الطَّاغُوتِ)ە، ئەگینا هـیچ پەرسـتراوێك بـەوە ڕازی نابێت و ڕێگریـی لـێ دەکـات، وەکـو ئـەولیاکانی خـوای گـەورە کـە پـاش مردنیـان پەرستویانن، وەکو مەسیح _علیه السلام_، هیچ پەرستراوێك ڕازی نابێت بپەرسـترێت، بەڵکو نکۆڵیشی لێ دەکات و خۆی لەوانە بەری دەکـات کـە دەیپەرسـتن، لـە ڕاسـتیدا ئـەوان شـەیتان دەپەرسـتن کـە فریـوی داون و پـاڵی نـاون بـۆ ئـەم شـتە، ئـەگینا پەرستراوان لە جیاتی خوای گەورە بەرین لەو شتانەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا نکۆڵی لـێ دەکەن، فریشتە بن یان غەیری ئەوان بـن، نکـۆڵی دەکـەن لەوانـەی کـە پەرسـتویانن، خوای گەورە هەموو شتێکی لە قورئانی پیرۆزدا ڕوون کردۆتەوە، بـەڵام کـێن ئەوانـەی لەگەڵ قورئاندا دەوەستن و لە قورئانەوە وەردەگرن و، بیر لە ئایەتەکانی دەکەنـەوە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە مرۆڤەکان سوودو کەڵك لە جنۆکەکان وەردەگرن، بە هۆکاری ئەوەی کە مرۆڤەکان کوفر بە خوای گەورە دەکەن

و گوێڕایەڵی جنۆکەکان دەبن، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ قَدِ اسْتَكْثَرْتُمْ مِنَ الْإِنْسِ وَقَالَ أَوْلِيَاؤُهُمْ مِنَ الْإِنْسِ رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِي أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ (١٢٨) وَكَذَلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (١٢٩)﴾ واتە: وە ڕۆژێك (خوا) تێكڕا كۆیان دەكاتەوە (دەفەرموێ) ئەی دەستەو كۆمەڵی جنۆكە بێگومان ئێوە زۆر كەستان لە ئادەمیەكان گومڕا كرد وە دۆستەكانیان لە ئادەمی دەڵێن ئەی پەروەردگارمان هەندێكمان سوود و كەڵكمان لە هەندێكمان وەرگرت، وە بەو كاتەو مۆڵەتە گەیشتین كە بۆت دیاری كردبوین خوا فەرمووی ئاگر شوێنتانە بە هەمیشەیی و بێبڕانەوە دەمێننەوە تیایدا جگە لەو كاتەی كە خوا بیەوێ بە ڕاستی پەروەردگارت كار دروستی زانایە بەو شێوەیە هەندێ لە ستەمكاران دەكەین بە دۆست و پشتیوانی هێندێكی تریان بە هۆی ئەو كردەوانەوەی ئەنجامیان دەدا. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾ [الزخرف: ٣٦] واتە: وە هەر كەس پشت لە یادی خوا هەڵكات شەیتانێكی بۆ ئامادە دەكەین كە هەمیشە لەگەڵی بێ و لێی جیانەبێتەوە.

بەڵام ئەگەر پیاو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بێت لە ڕوواڵەت و پەنهان دا (باطناً و ظاهراً) هەرگیز شەیتانەکان ناتوانن لەو بوارەدا فریوی بدەن یان دۆستایەتی لەگەڵ دا ببەستن(١).

---

(١)_ هەر کەس ئیمانی بە خواو پێغەمبەرەکەی بێت و، لەڕواڵەت و پەنهان دا نەفواکاریی بکات هەرگیز شەیتانەکان نزیکی نابنەوە، وە ئەو کردەوە نا ئاساییە لە سروشت بەدەرانەی لەسەر دەستی بەدیدێت کەرامەتێکە لە لایەن خوای گەورەوە پێی بەخشراوە، کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتان و جادوو گەران و کاهینان نییە، پێویستە لە نێوان ئەوەو ئەمەدا جیاوازی بکرێت، بۆ ئەوەی ئەم شتانە بەلای زۆرێك لە خەڵکەوە ئالۆز نەبێت.

## ڕێگریکردن لەبەگەورەدانانی گۆڕەکان و وریاکردنەوە لەوەی مزگەوتی لەسەر دروست بکرێت

وە لەبەر ئەوەی پەرستنە شەرعیەکانی موسڵمانان لە مزگەوتدان کە بریتین لە ماڵەکانی خوای گەورە، بۆیە خەڵکانی ئاوەدانکارانی مزگەوتەکان لە بارو حاڵە شەیتانیەکانەوە زۆر دوورن[1].

---

(١)_ چونکە مزگەوتەکان ماڵەکانی خوای گەورەن، شوێنی دابەزینی فریشتەکان و، ڕەحمەت و بەزەیی و، دڵئارامی و هێمنین، شەیتانەکان نزیکی مزگەوتەکان نابنەوە، بەڵام دەچنە شوێنە چەپەڵ و پیسەکان، یان جێگە نهێنیەکان، یان ژێر زەمینە تاریکەکان، یان ئەشکەوتە دوورەکان، ئا ئەمانەن شوێنی مانەوەی شەیتانەکانن، جێگە نهێنیەکانە، بەڵام مزگەوتەکان بریتین لە ماڵەکانی خوای گەورەو، موسڵمانانی تێدا کۆ دەبێتەوە، زانست و، زیکری تێدا دەخوێندرێت، شەیتانەکان نزیکی نابنەوە، تۆ تەماشا دەکەیت ئەو کەسەی مزگەوت ئاوەدان دەکاتەوەو، بەردەوام دەچێتە ئەوێ لەو شەیتانانە بێوەی دەبێت، چاکی و ڕاسترەویی پێوە دیارە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلاَّ اللَّهَ فَعَسَى أُوْلَـئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾[التوبة: ١٨] واتە: بە ڕاستی مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە کەسێك کە بڕوای هێنابێت بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و نوێژەکانی بەجێهێنابێ و زەکاتی دابێ و لە کەس نەترسا بێ بێجگە لە خوا جا بەڵکو ئەوانە لەو کەسانە بن کە ڕێنموونیی کراون. ئەوانەی مزگەوتەکانی خوای گەورە ئاوەدان دەکەنەوە بریتین لەئەهلی ئیمان و باوەڕ، شەیتانەکان و دۆستە مرۆڤەکانی شەیتان نزیکی مزگەوتەکان نابنەوە، بە پێچەوانەوە حەزیان لێ نییەو لێی دوور دەکەونەوە، ئەمە شتێکی ئاشکرایە.

وه ئەهلی شیرك و هاوەڵپەرستی و بیدعە _ئەوانەی گۆڕی مردووان و پیاو چاكان بە گەورە دەزانن و، داوا لە مردوکە دەکەن، یا دەیکەن بە وەسیلەی داواکردن، یا لەو باوەڕەدان کە دوعا کردن لە لایدا گیرایە[1] _ لە باروحاڵە شەیتانیەکانەوە نزیکترن[2]، چونکە لە ((الصحيحين)) دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ ))[3] صحيح: أخرجه البخاري (٣٤٥٣)، و(٣٤٥٤)، ومسلم (٥٣١)، واتە ((نەفرینی خوا لە جوولەکەو گاوەرەکان کە گۆڕی پێغەمبەرەکان کردووە بە مزگەوت)).

---

(١)_ وەکو پێشتریش ئاماژەی پێدرا خواپەرستی لە لای گۆڕەکاندا جایز نییە، نەنوێژ کردن و، نە دوعاکردن، مەگەر دوعا بۆ مردوکە بکرێت ئەوە هیچی تێدا نییە، بەڵام ئەو کەسەی سەردانی گۆڕێك دەکات جایز نییە لە وێدا بۆ خودی خۆی دوعا بکات، داواکردن لە مردووان شیرك و هاوەڵپەرستی گەورەیە، دوعا کردنیش لە لای مردواندا بیدعەیەو، هۆکارێکە بۆ شیرك و هاوەڵپەرستی، هەروەها جایز نییە مردوو بکرێت بە وەسیلەی دوعاکردن ئەمە هۆکاریکە بۆ شیرك هەر وەکو ئاماژەی پێدرا، کەواتە داواکردن لە مردووان، دوعا کردن لە لایدا، مردووان بکرێن بە وەسیلە هەموو ئەمانە جایز نییە.

(٢)_ هەر کەس وا بزانێت دوعا کردن لە لای گۆڕەکاندا گیرایە با دڵنیا بێت بارودۆخی لە باروحاڵە شەیتانیەکانەوە نزیکترە، خوای گەورە ئەوەی بە شەرع بۆ دانە ناوین کە لای گۆڕەکاندا دوعا بکەین، بەڵکو بە شەرعی داناوە کە دوعا لە مزگەوتەکاندا بکەین کە ماڵەکانی خۆیەتی.

(٣)_ خوای گەورە نەفرینی لە جوولەکەو گاورەکان کردووە، هۆکارەکەی: گۆڕی پێغەمبەرانیان کردووە بە مزگەوت، ئا ئەمەیە هۆکاری نەفرینەکە، کردویانن بەنوێژگە، نوێژی تێدا دەکەن و دوعا دەکەن و لە خوای گەورە داوا دەکەن،

----------------------------------------------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------

بەو ئومێدەی کە دوعا کردن لەوێدا گیرایە، گوایە لە شوێنی تر چاکترە، بۆیە خوای گەورە نەفرەتی لێکردوون، واتە لە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی دوری خستنەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆ باس کردوین بۆ ئەوەی وریامان کاتەوە لەوەی کە خۆمان بەوان نەچوێنین و، چاولێکاری کردەوەکانی ئەوان نەکەین و، گۆڕی پێغەمبەران و پیاو چاکان نەکەین بە نوێژگە وەکو چۆن جوولەکەو گاورەکان کردیان بە نوێژگە. بەڵام تەماشا دەکەیت لە وڵاتانێکی زۆردا ئەو مزگەوتەی گۆڕی تێدا نەبێت کەس ڕووی تێناکات مەگەر کەسانێکی کەم، بەڵام ئەو مزگەوتانەی گۆڕێکی تێدا بێت تەماشا دەکەیت کەسانێکی زۆری تێدایە، دڵیان لە وێدا دەکرێتەوە، نوێژە فەڕزەکانی تێدا دەکەن، دەیچوێنن بە مزگەوتی حەڕام، ئێستا نوێژە فەرزەکان لە مزگەوتی حەرامەوە پەخش دەکرێت و، موسڵمانان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەویدا دەیبینن، بیدعە چیانیش نوێژە فەڕزەکان لە لای گۆڕەکاندا بە سەتەلایت پەخش دەکەن، گۆڕی فلان پیاو گۆڕ، فلان ژن، لە لای ئەمانەدا نوێژەکان بە سەتەلایت پەخش دەکەن، بە مزگەوتی حەڕام و مزگەوتی پێغەمبەری خوای ﷺ دەچوێنن، بێگومان ئەمانە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە یاری پێ کردوون. بە لایانەوە نوێژکردن لەو مزگەوتەدا کە گۆڕێکی تێدایە بەهادارە، بەڵام ئەو مزگەوتەی گۆڕێکی تێدا نەبێت ڕووی تێ ناکەن، حەزیان پێی نییە، ئەمەیە موسیبەت و کارەساتەکە، لە کاتێکدا ئەو مزگەوتەی گۆڕی تێدا نەبێت بریتیە لە یەکێك لە ماڵەکانی خوای گەورە، ئەو مزگەوتە پێویستە نوێژی تێدا بکرێت، بەڵام ئەو مزگەوتەی گۆڕی تێدا بێت ماڵی شەیتانە و، جایز نییە نوێژی تێدا بکرێت، قبوڵ نابێت و ڕاستیش نییە.

هەروەها لە فەرموودەی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لە مردنی بە پێنج شەو فەرمووی: ((إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي صُحْبَتِهِ وَ ذَاتِ يَدِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلًا مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلًا، وَلَكِنْ صَاحِبُكُمْ خَلِيلُ اللهِ، لاَ يَبْقَيَنَّ فِي الْمَسْجِدِ خَوْخَةٌ إِلاّ سُدَّتْ، إِلاّ خَوْخَةُ أَبِي بَكْرٍ، إِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ الْقُبُورَ مَسَاجِدَ، أَلا فَلا تَتَّخِذُوا الْقُبُورَ مَسَاجِدَ، فَإِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ))[1] صحيح: أخرجه مسلم (٥٣٢)، من حديث جندب بن عبدالله رضي الله عنه، عن النبي ﷺ.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێش مردنی بەپێنج شەو فەرمووی: ((لە هەموو خەڵك زیاتر فەزڵی بەسەرمەوە بێت لە هاوەڵێتی و ماڵ بەخشینیدا ئەبو بەکرە، ئەگەر کەسێکم لەخەڵکی سەر زەوی بکردایە بە خەلیلی _واتە دۆستی بە ئەمەکی گیانی بەگیانی _خۆم ئەوا ئەبو بەکرم دەکرد بە خەلیلی خۆم، بەڵام هاوەڵەکەتان _مەبەستی خودی خۆیەتی_ خەلیلی خوایە، هیچ دەروازەیەك لە مزگەوتدا نامێنێت مەگەر دادەخرێت، جگە لە دەروازەکەی ئەبی بەکر، بە ڕاستی ئەوانەی پێشی ئێوە گۆڕەکانیان دەکرد بە مزگەوت، وریا بن گۆڕەکان مەکەن بە مزگەوت، من ڕێگریتان لێ دەکەم لەو کارە)).

---

(١)_ لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەیەکی بۆ خیلافەتی ئەبوبەکر رضي الله عنه لە پاش خۆی کردوە، کاتێ هەستی بە نزیك بوونەوەی کاتی مردنی خۆی کردوە، وە فەرمانی داوە بە داخستنی هەموو دەروازەیەك چونکە هێندێك لە هاوەڵان دەروازانەوە دەهاتنە نێو مزگەوتەوە جگە لە دەروازەکەی ئەبوبەکر رضي الله عنه، لەبەر چی؟ بۆ ئەوەی پێشەوایەتی نوێژی موسڵمانان بکات، بەڵام تێکڕای خەڵکی لە دەروازەکانەوە دێنە نێو مزگەوتەوە، ئەو دەروازانە ناسراون کە نوێژ خوێنانی لێوە دێنە ژوورەوە، بەڵام ئەو دەروازانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ دەکات چەند دەروازەیەکی تایبەت بوون کە هێندێك لە هاوەڵانی لێوە دەهاتنە ژوورەوەو لە گەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژیان دەکرد، ئەوەبوو فەرمانیدا بە داخستنی هەر هەموو ئەو دەروازانە بەدەر لە

دەروازەکەی ئەبوبەکر ﷺ، ئەمە ئاماژەیەکە بۆ دانانی ئەبوبەکر ﷺ بەجێنشینی خۆی، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەی: ((إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي صُحْبَتِهِ وَ ذَاتِ يَدِهِ أَبُو بَكْرٍ)) لە هەموو خەڵك زیاتر فەزڵی بەسەرمەوە بێت لە هاوەڵێتی و ماڵ بەخشینیدا ئەبوبەکرە ﷺ، ئەمە لە چاکەکانی ئەبوبەکرە ﷺ، ئەمە ئاماژەی تێدایە کە ئەو جێنشینە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمەش بەکۆڕایی هاوەڵانی بەڕێز بوو، هاوەڵانی بەڕێز لەسەر گفت پێدان بە ئەبوبەکر ﷺ کۆڕاو یەك دەنگ بوون، ئەمە بەپەرچدانەوەییە بۆ ڕافیزەکان کە دەڵێن: پاش پێغەمبەری خوا ﷺ جێنشینی بۆ ئیمامی عەلییە ﷺ، گوایە سەرپەرشتیارو چاودێر (وصی)ە، ئەم شتە پووچەو هیچ بنەڕەتێکی ڕاستی نییە، ئیمامی عەلی ﷺ یەکێکە لە چوار جێنشینەکە، بەڵام لە ئیمامی ئەبوبەکر و عومەرو عوسمان ﷺ شایستە تر نییە بە جێنشینی، ئەمە پێچەوانەی کۆڕا بوون یەك دەنگ بوونی هاوەڵانی بەڕێزە ﷺ، پێچەوانەی ئاماژەی دەقەکانە لەسەر چۆنیەتی پێشخستن و فەزڵیان ﷺ، ئەمەیە سنورو و لێکدانەوەی ڕاستی فەرموودەکە. ((وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلًا مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلًا)) ئەگەر کەسێکم لەخەڵکی سەر زەوی بکردایە بە خەلیلی خۆم ئەوا ئەبوبەکرم دەکرد بە خەلیلی خۆم، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بەری دەکات لەوەی کە خلیلێکی لە خەڵکی سەر زەمین هەبێت، بۆچی؟ چونکە خودی خۆی خەلیلی خوای گەورەیەو، خەلیلی خواش هیچ خەلیلێکی دیکەی نییە، (خەلیلیی) هاوبەشێتی قبوڵ ناکات، بۆیە لەگەڵ ئەو پەڕی خۆشویستنیدا بۆ ئەبوبەکر ﷺ کە چی بە خلیلی خۆی نەکرد، بەڵکو کردی بەهاوەڵێك لە هاوەڵانی خۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژە دەکات کە ئەبوبەکر لە هەموو خەڵك زیاتر فەزڵی بەسەریەوە هەیە، چونکە پاراستی و بەردەوام لەگەڵیدا بوو لەو کاتەوەی کە خوای گەورە ناردی تاوەکو مردنی، ئەبوبەکر ﷺ

بانەنیشتیەوەبوو دەیپاراست و بەماڵ و سامانەکەی خۆی پشتگیری دەکرد، تا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد. کۆتایی فەرموودەکە ئەو شوێنەیە کە ئێمە مەبەستمانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ الْقُبُورَ مَسَاجِدَ)) ئەمە ڕاسپاردەی دووەمە، پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسێتی کرد یان ئاماژەی کرد بەجێنشینێتی ئەبوبەکر ﷺ، لە شتێکی تر وریایی داوە بریتیە لەوەی کە نابێت لەسەر گۆڕەکان بینا دروست بکرێت، ترسا لەوەی لەسەر گۆڕەکەی بینا دروست بکرێت وەکو چۆن لەسەر گۆڕی پێغەمبەرانی تر دروست کرا، ئەمە لە گۆی ئامۆژگاریەکانێتی بۆ ئومەتەکەی، لەوەترسا ڕوو بەڕووی گۆڕەکەی مزگەوت دروست بکرێت وەکو چۆن ڕووبە ڕووی گۆڕی پێغەمبەرانی پێشوو دروست کرا لە لایەن جوولەکەو گاورەکانەوە، لە کەماڵ و تەواوێتی ئامۆژگارییەکەیەتی کە پێش مردنی ئوممەتەکەی لەم شتانە وریا کردونەتەوە پێش مردنی بە پێنج شەو، نزیکی مردنەکەی ﷺ. ((ألا فَلا تَتَّخِذُوا القُبُورَ مَسَاجِدَ)) وریا بن لەسەر گۆڕەکان مزگەوت دروست مەکەن، ئەمە قەدەغە کردنێکی دیکەیەو، تأکیدکردنە بۆ یەکەم. ﴿فَإِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ﴾ جەختکردنەوەی زیاترە لە ڕێگری کردن لەوەی کە مزگەوت لەسەر گۆڕی پێغەمبەران دروست نەکرێت. ئەولیاو پیاو چاکان لەپێغەمبەران شایستە ترن بەوەی کە لەسەر گۆڕەکانیان مزگەوت دروست نەکرێت. ئەگەر جایز نەبێت لەسەر گۆڕی پێغەمبەران مزگەوت دروست بکرێت، ئەوەی ئەو کارە بکات نەفرەت لێکراوە، ئیتر بارو حاڵی ئەو کەسانە چۆنبێت کە لەسەر گۆڕی لەوان بە خوار تر لەئەولیاو پیاو چاکان مزگەوت دروست دەکەن، ئەم جۆرە کەسانە نەفرەت لێکراون بە توندترین نەفرەت.

هەروەها لە فەرموودەی (صحیح) داهاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی کە نەخۆشی وەفاتی بووە لە لای دا باسی جوانی و وێنەی جۆراو جۆری کەنیسەیەکیان[1] لە زەوی حەبەشەدا: ((أُولَئِكَ قَوْمٌ إِذَا مَاتَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ، بَنُوا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهَا تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ القِيَامَةِ))[2] صحيح: أخرجه البخاري (٣٨٧٣)، ومسلم (٥٢٨)، من حديث عائشة رضي الله عنها مرفوعاً. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیەکەیدا بۆیان گێڕایەوە کە کڵێسایەك لە زەوی حەبەشەدا هەیەو، باسی جوانی و وێنەکانی ناویشیانکرد، ئەویش فەرمووی: ((ئەوانە قەومێکن ئەگەر پیاوچاکێکیان تێدا بمردایە، مزگەوتێکیان لەسەر گۆڕەکەی دروستدەکردو، ئەو وێنانەشیان تێدا دەکێشا، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا خراپترینی کەسانن بەلای خوای گەورەوە)).

---

(١)_ کەنیسە، کڵێسا: شوێنی ئەنجامدانی پەرستنەکانی جوولەکەو گاورەکانە.

(٢)_ خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەی کۆچیان کرد بوو بۆ حەبەشە بۆیان باس کرد کە لەسەر زەوی حەبەشە، گاورەکانی حەبەشە کڵێسا دروست دەکەن و، وە کڵێسایەکی نەخشێنراو و ڕازاوەیان بینیوە کە وێنەی مەسیحی تێدا کێشراوە بە لە خاچ دراوی وەکو ئەوەی خۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن، بە هاوشێوەی وێنەی ئەو پیاو چاکانەی کە قەومەکەی نووح کرد بویان، شەیتان نەمردووە ئەو شەیتانەی بۆ قەومەکەی نووحی ڕازاندەوە هەتا ئێستاش هەر لە ڕازاندنەوەکەیدا بەردەوامە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئوممەتەکەی لەم جۆرە شتانە ئاگاداردەکاتەوەو، دەفەرموێ: ((أُولَئِكَ قَوْمٌ إِذَا مَاتَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ، بَنُوا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهَا تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ القِيَامَةِ)) ئەوانە ئەگەر پیاو چاکێکیان تێدا بمردایە، مزگەوتێکیان لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکردو، ئەو وێنانەشیان تێدا دەکێشا، ئەوانە لەڕۆژی قیامەتدا خراپترینی کەسانن بە لای خوای گەورەوە، ئەوانە نەفرەت لێکراون و خراپترین کەسانێکن بەلای خوای گەورەوە، لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( إِنَّ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ مَنْ تُدْرِكُهُ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ وَمَنْ يَتَّخِذُ الْقُبُورَ مَسَاجِدَ)) واتە:

((بە دڵنیایی هێندێك لە شەڕترین و خراپترین کەسانێك ئەوانەن کە قیامەت ڕوو دەدات و ئەوان زیندوون، هەروەها ئەوانەشن کە لەسەر گۆڕەکان مزگەوت دروست دەکەن)) ئەوان شەڕترین و خراپترینی خەڵکن لە کاتێکدا وا دەزانن خۆیان لە چاکانی خەڵکن و، ئەوە خۆشەویستی دەربڕینە بەرامبەر بە پیاو چاکان و، گوایە ئەوە هاندانی خەڵکە بەرەو خێرو چاکە، بەڵام با دڵنیا بن ئەوان هێندێکن لەخراپترینی خەڵك چونکە کردەوەیەکیان ئەنجامدا کە لەخوای گەورە دوری خستنەوە، وە کردەوەیەکیان ئەنجام دا حەز بۆ شیرك و هاوەڵپەرستی دەبزوێنێت، خەڵك هەڵدەخەڵەتێنێ و فریو دەدات. سەبارەت بە مزگەوتەکان پێویستە خاڵی بن لەگۆڕ، خاڵیبن لە وێنە و نیگار، مزگەوت بۆ زیکرو، نوێژو، پەرستنی خوای گەورە دروست بکرێت کە هیچ هاوبەشێکی نییە، ئا ئەمەیە ئەو مزگەوتانەی کە فەرماندراوە بە دروست کردنیان، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردووە لەوەی مزگەوت لەسەر گۆڕ دروست بکرێت، وە هەواڵی پێداوین کە ئەوە لە کردەوەی جولەکەو گاورەکانە چونکە ئەو کەسەی بیکات شایستەی نەفرین دەبێت و، کەسێکە لەشەڕترین و خراپترین کەسان، بەڵام زۆرە ئەو مزگەوتانەی کە لەسەر گۆڕەکان دروست کراون _لا حول ولا قوة إلا بالله_ وە هەر کاتێك ئێمە ڕێگریی لەوە جۆرە شتانە بکەین، پێمان دەڵێن: ئێوە پیاو چاکانتان خۆش ناوێت، ئەوان دەڵێن: ئێمە نایانپەرستین، بەڵکو دەیانکەین بەوەسیلەو هۆکارێك بۆ ئەوەی خوای گەورە دوعاکانمان گیراکات، وەکو ئەوەی موشریکەکان دەیانگوت: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّهِ﴾[يونس: ١٨] واتە: ئەوانە بێجگە لە خوا شتانێك دەپەرستن کە نەزیانیان پێ دەگەیەنن نەسوودو قازانج وە دەڵێن ئەو بتانە تکاکارمانن لای خوا. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾[الزمر: ٣] واتە: وە کەسانێ جگە لەو (خوا) چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە (دەڵێن) تەنها لەبەر ئەوە دەیانپەرستین نزیکمان بکەنەوە لە خوا.

– وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (( إِنَّ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ مَنْ تُدْرِكُهُ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ وَمَنْ يَتَّخِذُ الْقُبُورَ مَسَاجِدَ))[1] خرجه أحمد (٤٣٥/١)، وابن حبان (٣٤٠).

– لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێ: ((لا تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ ولاَ تُصَلُّوا إِلَيْهَا))[2] صحيح: أخرجه مسلم في الجنائز (٩٧٢)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لەسەر گۆڕ دامەنیشن و لە نوێژدا ڕووی تێمەکەن)).

---

(١)_ چونکە خوای گەورە ڕووحی ئیمانداران دەکێشێت پێش ڕوودانی قیامەت، بایەکی خۆش دەنێرێت ڕووحی هەموو ئیماندارێك دەکێشێت، تەنها شەڕترین و خراپترینی خەڵکان دەمێننەوە، قیامەت لەسەر ئەم جۆرە کەسانە هەڵدەستێت، قیامەت لەسەر ئیماندار هەڵناسێت، ئەمانە جۆری یەکەمن کە قیامەت هەڵدەستێت و ئەوان زیندوون، جۆری دووەم: ئەوانەن کە مەبەست قسەکانی ئێمە لێرەمایە و لەسەر گۆڕ مزگەوت دروست دەکەن، ئەم جۆرە کەسانە وادەزانن خۆیان لەچاکانی خەڵکن و، کردەوەکەیان خۆشویستنی پیاو چاکان و شوێنکەوتنیانە و...هتد. وادەزانن ئەوەی کارەکەی ئەوان نەکات ڕێزی پیاو چاکان ناگرێت و، خۆشی ناوێن.

(٢)_ فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ ((لا تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ)) لەسەر گۆڕ دامەنیشن، مەبەستی ئەوەیە نابێت سووکایەتی بەگۆڕ بکرێت، ((ولاَ تُصَلُّوا إِلَيْهَا)) لەنوێژدا ڕووی تێمەکەن، لێرەدا پێغەمەری خوا ﷺ ڕێگریی کردووە لە زیادە ڕۆیی، کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردووە لە نەرمی نواندن و ڕێگریی کردووە لەوەی سنووری گۆڕ ببەزێنرێت، بۆیە نابێت ئەوەندە نەرمی بنوێنێت و لەسەری دانیشێت، وە ناشبێت سنوری گۆڕ ببەزێنێت تا ئەو ئاستەی لە نوێژدا ڕووی تێ بکات.

- وە یەکێ لە دوعاکانی پێغەمبەر خودا ﷺ هاتووە: ((اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَنًا يُعْبَدُ، اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ عَلَى قَوْمٍ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ))[1] حسن: أخرجه أحمد (٢/٢٤٦)، من حديث أبي هُريرة رضي الله عنه مرفوعاً، ((رياض الجنة في الرد على أعداء السنّة)) للشيخ مقبل بن هادى.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((پەروەردگارا گۆڕەکەم نەکەیتە بتێک بپەرسترێت، توڕەبوونی خوای گەورە توند بووە لەسەر ئەو کەسانەی کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت)).

- هەروەها دەفەرمووێ: ((لاَ تَتَّخِذُوا قَبْرِي عِيداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ حَيْثُمَا كُنْتُمْ فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِي))[2] صحيح: أخرجه أبوداود (٢٠٤٢)، وأحمد (٢/٢٦٧)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((کۆبونەوەتان لەسەر گۆڕەکەم بە شێوازێکی تایبەت و بەردەوام دووبارە مەکەنەوە، لە هەر کوێ هەن صەڵاواتم لەسەر بەن دڵنیا بن صەڵاواتەکەتان پێم دەگات)).

---

(١)_ وشەی (الوَثَن) هەموو شتێکە کە لە جیاتی خوای گەورە بپەرسترێت درەختێک بێت، بەرد بێت، گۆڕبێت، بت بێت، هەموو شتێك کە لە جیاتی خوای گەورە پەرسترا پێی دەگوترێت (الوَثَن). بەڵام ئەوەی لە جیاتی خوای گەورە بپەرسترێت و، لەسەر شێوەی مرۆڤێك یان ئاژەڵێك بێت بتی پێ دەگوترێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَنًا يُعْبَدُ)) پەروەردگارا گۆڕەکەم نەکەیتە پەیکەرێك بپەرسترێت، وەکو چۆن گۆڕەکانی پێشتر وایان لێکرا، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زێدەڕۆیی لە گۆڕدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە جیاتی خوای گەورە بپەرسترێت، ئەمە سەبارەت بەگۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بەڕێزترین گۆڕە، ئەی سەبارەت بە گۆڕەکانی غەیری ئەو دەبێت چۆن بێت؟ بۆیە پێشەوا ئیبولقەیم فەرموویەتی: خوای گەورە داواکەی پێغەمبەری خوای ﷺ گیرا کرد و بەسێ دیوار چوار دەوریدا، بۆیە هیچ کەس نایبینێت و کەسیش ناچێتە ژورەوە بۆ لای ئەمەش لە ڕەحمەت و بەزەییەکانی خوای گەورەیە.

(٢)_ ئەمەش فەرموودەیەکی ترە ((لاَ تَتَّخِذُوا قَبْرِي عِيداً)) واتە: سەردانی گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و سلاو لێکردنی نابێت بەشێوازێکی تایبەت و

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

بەردەوام دووبارە بکرێتەوە، ئەمە دووبارە ناکرێتەوە، هەموو جارێك چووە نێو مزگەوتەوە سڵاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، ئەمە جایز نییە، بیدعەیە، لە ڕاستیدا تەنها ئەگەر لەسەفەرێك گەڕایەوە، ئەگەر خەڵکی مەدینەی پیرۆز بێت یان خەڵکی دەرەوەی مەدینە بێت دەچێت سەردانی گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات و، سڵاوی لێ دەکات، بەڵام بە شێوازێکی تایبەت و بەردەوام ئەمە دووبارە ناکرێتەوە، بە جۆرێك هەموو جارێك چووە نێو مزگەوتەوە بچێت بۆ لای گۆڕەکە، ئەگەر دووبارە بکرێتەوە ئەوا دەکەوێتە بەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چوونکە لەزمانی عەرەبیدا مانای وشەی (عید) بریتیە لەو شتەی کە بە شێوازێکی تایبەت و بەردەوام دووبارەبکرێتەوە، ئەگەر ئەو ڕەفتارەی دووبارەکردەوە ئەوا کردویەتی بە (عید) واتە: بەشێوازێکی تایبەت و بەردەوام دەچێت بۆ سەردانی، ئەم شتە مرۆڤ بەرەو شیرك و هاوەڵپەرستی دەبات، نابێت لە جیاتی خوای گەورە داوای لێ بکرێت، لە ڕاستیدا ئەمە تەنها بۆ داخستنی دەروازەی ئەو هۆکارانەیە کە مرۆڤ بۆ شیرك و هاوەڵپەرستی دەبات، تەنانەت ئەگەر کەسی سەردانیکار بیەوێت سڵاویش بکات ئەگەر بەردەوام دووبارەی کردەوە بیدعەچیە، چونکە ئەم کارە دڵی خەڵکانی ئاسایی و نەفامان بە گۆڕەکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ پێوەند دەکات.

وقال ﷺ: ((مَا مِنْ رَجُلٍ يَسَلِّمُ عَلَيَّ، إلاّ رَدَّ الله عَلَيَّ رُوحِي، حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ))[1] صحيح: أخرجه أبوداود (٢٠٤١)، من حديث أبي هُريرة رضي الله عنه مرفوعاً. واته پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر پیاوێك سڵاوم لێ بكات، مەگەر خوای گەورە ڕووحم بۆ دەگەڕێنێتەوە، تا وەڵامی سڵاوەكەی بدەمەوە))، وقال ﷺ: ((إنَّ الله وَكَلَ بِقَبْرِي مَلاَئِكَةً يُبَلِّغُونِي عَنْ أُمَّتِي السَّلاَمَ))[2] صحيح بغير هذا اللفظ: أخرجه أحمد (٣٨٧/١و٤٤١و٤٥٢)، والنسائي (٤٣/٣)، واتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بە ڕاستی خوای گەورە فریشتە گەلێكی بە گۆڕەكەم ڕاسپاردووە كە سڵاوی ئوممەتەكەمم پێ ڕادەگەیەنن)).

---

(١)_ ئەمە فەرموودەویە ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە هیچ جیاوازیەكی تێدا نییە ئەگەر لای گۆڕەكەی پێغەمبەری خوا بوویت یان لە دوورەوە بووی ئەگەر چی لەو پەڕی زەمینیشدا بیت سەلام لەپێغەمبەری خوا ﷺ بكەیت و صەلاواتی لەسەر بدەیت، چونكە صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خواو و سڵاولێكردنی بەپێغەمبەری خوا ﷺ ڕادەگەیەنرێت، پێویست ناكات بچێتە لای گۆڕەكەی بۆ ئەوەی صەلاواتی لەسەر بەیت و سەلامی لێ بكەیت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَصَلُّوا عَلَيَّ حَيْثُمَا كُنْتُمْ فإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِي)) لە هەر كوێ هەن صەڵاواتم لەسەر بەن دڵنیا بن صەلاواتەكەتان پێم دەگات، ئەگەر لە ئەدەلوس بیت یان لە چین بیت یان لەو پەڕی دونیا بیت ئەگەر صەڵاوات بدەیت و سەلام بكەیت ئەوا پێی دەگات، كەوا بوو پێویست ناكات بچیتە لای گۆڕەكە، لە ڕاستیدا ئەمەش ڕەحمەت و بەزەیی هاتنەوەیە بە ئیمانداراندا، ئاسانكارییە بۆ ئیمانداران، هەروەها داخستنی دەروازەكانی شیرك و هاوەڵ پەرستییە، ڕێگریی كردنە لە بەردەوام سەردانیكردنی گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٢)_ ((إنَّ لله ملائكةً سَيَّاحينَ في الأرضِ يُبَلِّغونى عن أمتي السلامَ)).

دووبارە بۆتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سڵاوی ئوممەتەكەی پێ ڕادەگەیەنرێت با لە دووریشەوە بێت، كەوا بوو پێویست بە چوون ناكات بۆ لای گۆڕەكەی،

---------------------------------------------
---------------------------------------------
------------------------------------------

لە ڕاستیدا ئەمە داخستنی دەروازەی ئەو هۆکارانەیە کە مرۆڤ بەرەو شیرك و هاوەڵپەرستی و زێدەڕۆیی و ڕۆچوون دەبات، ئاسانکاریە بۆ موسڵمانان ئەگینا شەڕیان دەکرد لە پێناو سڵاوکردندا، چونکە لای گۆڕەکەی خەڵکێکی بێشومار لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای سەر زەمینەوە کۆدەبوونەوەو، قەرەباڵەغیەکی زۆر ڕوویدەداو، هەولّی سڵاویان دەدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَصَلُّوا عَلَيَّ حَيْثُمَا كُنْتُمْ)) صەڵاواتم لەسەر بەن لەهەر کوێ هەن))، ئەمە ئاسانکاری کردنە بۆ خەڵك. لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا)) واتە :((هەر کەس صەڵاوتێکم لەسەربات خوای گەورە دەجار صەڵاواتی لەسەر دەدات))، ئەگەر صەڵاواتدان بە تەنها لای گۆڕەکەیدا قبولّ بووایە ئەوا هەموو خەڵك فەزلّی ئەم فەرموودەیان لە دەست دەچوو، چونکە هەموو خەڵك توانای هاتنیان بۆلای گۆڕەکەی نییەو، ئاسان نییە بۆیان، ئەمە ئاسانکاری کردنە بۆ خەڵك لە لایەکەوەو لە لایەکی تریشەوە داخستنی هۆکارەکانی شیرك و هاوەڵپەرستیەو، ئەمەش مەبەستی سەرەکییە، سوپاس بۆ خوا ئایین ڕوون و ئاشکرایەو هیچ ئاڵۆزیەکی تێدا نییە بۆ هەر کەس بیەوێت.

- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((أَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاَةِ فِي يَوْمِ الجُمُعَةِ، وَلَيْلَةَ الجُمُعَةِ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ))، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ ؟ - يَقُولُونَ: بَلِيتَ - فَقَالَ: ((إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ))[1] صحيح: أخرجه أبوداود (١٠٤٧)، و(١٥٣١)، وابن ماجة (١٠٨٥)، و(١٦٣٦)، وأحمد (٨/٤)، والنسائي (٩١/٣)، من حديث أوس بن أوس رضي الله عنه مرفوعاً.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لە ڕۆژی هەینی و، شەوی هەینیدا صەلاواتێکی زۆرم لەسەر بدەن، چونکە صەلاواتەکانتان پیشانم دەدرێت))، گوتیان: ئای پێغەمبەری خوا ﷺ، چۆن صەلاواتەکانمان پیشانت دەدرێت لە کاتێکدا پواوی؟ دەڵێن: ڕزیویت _ ئەویش فەرمووی ((بە ڕاستی خوای گەورە بە تەواوی ڕێگری کردووە لە زەوی هەموو بەشەکانی جەستەی پێغەمبەران بخوات)).

خوای گەورە لە بارەی موشریك و هاوەڵپەرستانی قەومی نووحەوە _ عليه السلام دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا لاَ تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلاَ تَذَرُنَّ وَدًّا وَلاَ سُوَاعًا وَلاَ يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا (٢٣) وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا(٢٤)﴾[2] [نوح: ٢٣_٢٤].

---

(١)_ ئەم فەرموودە دوو ڕوونکردنەوەی تێدایە، یەکەم:- ئەوەیە کە صەلاواتدان و سەلام کردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕادەگەیەنرێت، دووەمیش ئەوەیە کە زەوی جەستەی پێغەمبەری خوا ﷺ نارزێنێت، بەڵام جەستەی خەڵکی ئاسایی دەڕزێنێت، ئەمەش خاسیەت و تایبەتمەندیەکە بۆ پێغەمبەران - عليه الصلاة والسلام - بە تەنها.

(٢)_ خوای گەورە لەبارەی قەومی نووحەوە _عليه السلام_ باسمان بۆ دەکات کەوا کاتێ قەدەغەی پەرستنی پیاوچاکانی لێکردن نووح فەرمانی پێکردن خوای گەورە بە تەنها بپەرستن، ملکەچ نەبوون و یەکتریان ڕاسپاردوو و، گوتیان: ﴿لاَ تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلاَ تَذَرُنَّ وَدًّا وَلاَ سُوَاعًا وَلاَ يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ گوتیان: دەست هەڵنەگرن

---

---

---

لەبت و خواکانتان وە دەست هەڵنەگرن لەپەرستنی وود و سواع و یەغووث و یەعوق و نەسر، ئەمانە ناوی پیاوانێکی چاکی قـەومی نـووح بـوون _علیه السلام _کـاتێ مـردن وێنـەکانیان کێشـان، بـە جـێگیری چەسـپاندیان و، شـەیتانیش پـەرستنی ئـەو پیـاو چاکانەی بۆ ڕازاندنـەوە، ئـیتر پەرستنیان، ئەمـە ئـەو ڕاستیەمان پیشان دەدات کـە زێدەڕۆی کردن و ڕۆچوون لە ڕێزگرتنی گۆڕدا تـا ئاسـتی پـەرسـتن کۆنـەو، زێـدەڕۆیی کـردن و ڕۆچـوون لـە گـۆڕی پیـاو چـاکاندا کۆنـەو بـۆ زەمـەنی نـووح _علیه السلام_ دەگەڕێتەوە، شەیتان بانگەوازی بۆ دەکات، پێویستە موسڵمانان لەم شتە وریا بن.

هەروەها کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەقەومەکەی خـۆی فـەرموو: ((قُولُوا: لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ تُفْلِحُوا)) واتە: ((بڵێن: هیچ خوایەك نییـە بـە هـەق جگـە لـەخوای گـەورە سـەر فـەرزا دەبن))، ئـەوان وتیـان: ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ (٥) وَانطَلَقَ الْمَلأَ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ (٦)﴾[ص: ٥_٦] واتـە: ئایـا ئـەو (پێغەمبەرە) هەموو خواکانی کردۆتە یەك خوا بـە ڕاسـتی ئەمـە (کـە یـەك خـوا بـبێ) شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرەوە گەورەکانی (قوڕەیش لەگەڵ پێغەمبـەر قسـەیان کـردو هەڵسان) بە پەلە دەرچوون (بە خەڵکیان گوت) بڕۆن و خۆگر بن لەسـەر (پـەرستنی) خواکانتان. وازیان لێمەهێنن و خۆگر بن، با ئەم پیاوە گومڕاتان نەکات، گوتیان: واتـە دانیان بەوە دانا کە چەندەها خواوەندیان هەیە، ئایا ماقوڵە چەندین خوا هەبێت؟ خوا یەکێکە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ﴾[البقرة: ١٦٣] واتە: پەرستراوی ئێوە پەرستراوێکی تاك و تەنهایـە هـیچ پـەرسـتراوێکی ڕاست نییە تەنیا ئەو نەبێت. ئەوان دەڵێن: نەخێر، خواوەنـدانێکی زۆر هـەن. هـەروەها هـەر کـات پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی بفەرموونایـە: ((قُولُوا: لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ تُفْلِحُوا)) واتـە: ((بڵێن: هیچ خوایەك نییە بە هەق جگە لەخوای گەورە سەر فەرزا دەبن))،

دەیانگوت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ (٣٥)وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ(٣٦)﴾[الصافات: ٣٥_٣٦] واتە: بە ڕاستی هەرکاتێ بەوانە بگوترایە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە بێجگە لەخوا خۆیان بەگەورە دەزانی (و ملکەچ نەدەبوون) وە دەیانگوت: ئایا ئێمە پەرستراوەکانمان واز لێبێنین؟ لەبەر شاعیرێکی شێت. پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ﴾[الصافات: ٣٧] واتە: (نەخێر وا نییە) بەڵکو ئەو (پێغەمبەرە) هەقی هێناوەو باوەڕی بەپێغەمبەرانی پێشوو هەیە. ئا ئەمەیە بانگەوازی پێغەمبەران بەتێکڕا ئەوان بانگەوازدەکەن بۆ پەرستنی خوای گەورە بەتەنها کە هیچ هاوبەشێکی نییە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی تازە داهێنراوی نەهێناوە، بەڵکو وەکو برا پێغەمبەرەکانی پێشووی لە یەکەمیانەوە تاوەکو کۆتاهەمینیان ڕێگریی دەکەن لە دا واکردن لە غەیری خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[النحل: ٣٦] واتە: سوێند بە خوا لە ناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە(پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[الأنبياء: ٢٥] واتە: وەئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە کەواتە تەنها من بپەرستن. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾[النساء: ٣٦] واتە: بەس خوا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەن بە هاوبەشی.

پێشەوا ئیبن وعەبباس و کەسانی پێشینی چاکی غەیری ئەو دەفەرموون: ((هؤلاء قوم كانوا صالحين من قوم نوح، فلما ماتوا عكفوا على قبورهم، ثم صوروا تماثيلهم فعبدوهم، فكان هذا مبدأ عبادة الأوثان))[1] أخرجه البخاري (٤٩٢٠). واتە: ((ئەمانە پیاوانێکی چاك بوون لەقەومی نووح، لای گۆڕەکانیاندا دەمانەوەو خوویان پێوە گرت، پاشان پەیکەرەکانیان کێشان و پەرستنیان، بۆیە ئەمە سەرەتای بتپەرستی بوو)) .

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لەوەی لەسەر گۆڕەکان مزگەوت و نوێژگە دروست بکرێت[2]، بۆ داخستنی دەروازەی شیرك و هاوەڵپەرستی[3]،

---

(١)_ یەکەم جار کە شیرك و هاوەڵپەرستی لەسەر زەویدا کە ڕوویدا لە نێو قەومەکەی نووحەوە _عليه السلام_ سەری هەڵدا، ئەگینا قەومەکەی نووح سەرەتا پیاو چاك بوون و، لەسەر یەك خوا پەرستی بوون، لە کاتی ئادەمەوە _عليه السلام_ تا ئەو کاتەی کە پەیکەرەکانیان کێشاو بەجێگیری چەسپاندنیان، لەو کاتەوە شیرك و هاوەڵپەرستی ڕوویدا، بەهۆی ئەو پەیکەرانەوە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وێنە هەڵواسین و، زێدەڕۆیی کردن لە خۆشویستنی مردوواندا مرۆڤ بەرەو شیرك و هاوەڵپەرستی دەبات.

(٢)_ سەیری ریساکەی شێخ ناصرالدین الألبانی بکە بە ناوی: ((تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد)).

(٣)_ مساجد: واتە: نوێژگە، شوێنی نوێژ، وە ئەگەر مزگەوتیان لەسەر دروست بکرێت کارەکە مەترسیدارترە، بەڵام ئەگەر لەسەریشی دروست نەکرێت، کە دەچێتە سەر گۆڕو لە لایدا نوێژ دەکات ئەوە کردویەتی بە نوێژگەو شوێنی نوێژ، مزگەوتیشی لەسەر دروست نەکراوە.

هەروەها ڕێگری کردووە لە نوێژکردن لەکاتی دەرکەوتنی خۆر و لە کاتی ئاوابوونیدا، أخرجه البخاري (٥٨٢)، ومسلم (٨٢٨)، چونکە هاوەڵپەرستان لەو کاتەدا بۆ خۆر سوژدە دەبەن[1]

---

(١)_ ئەو کەسەی دەچێتە سەر گۆڕو لە لایدا دوعا و نزا دەکات بێگومان تەنها لە خوای گەورە داوا دەکات، بەڵام داوا کردن لەو شوێنەدا چواندنی تێدایە بەو کەسانەی کە لە گۆڕەکان داوا دەکەن، ئەگەر چی ئەو موسڵمانە تەنها لە خوای گەورەش داوا بکات، بەڵام کە وەکو ئەوان لەو شوێنەدا دوعا دەکات، ترسی ئەوەی تێدایە کە دواتر وەکو ئەوان داوا لە گۆڕەکەش بکات، بۆیە قەدەغەی موسڵمان کراوە لەو شوێنەدا دوعاو نزا بکات، ئەمەش بۆ داخستنی دەروازەی ئەو هۆکارانەیە کە موسڵمان بەرەو شیرك و هاوەڵپەرستی دەبات. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی موسڵمانانی کردووە لەوەی لەکاتی دەرکەوتنی خۆرو لە کاتی هەڵهاتنیدا نوێژ بکەن، هەر چەند موسڵمانان تەنها بۆ خوای گەورە نوێژ دەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی هاوەڵپەرستان خۆر دەپەرستن لە کاتی دەرکەوتنی و لە کاتی ئاوابونیدا، بۆیە داواکراوە مرۆڤی موسڵمان خۆی بەو جۆرە کەسانە نەچوێنێت، ئەگەر چی تەنها بۆ خوای گەورەش نوێژ دەکات، ئەمەش دیسان هەر بۆ داخستنی ئەو هۆکارانەیە کە مرۆڤ بەرەو هاوەڵپەرستی دەبات. تا ئێستاش تایەفە گەلێك لەهاوەڵپەرستان بۆ خۆر سوژدە دەبەن لە کاتی دەرکەوتنیداو لە کاتی ئاوابونیشیدا، دڵنیا بن شەڕو خراپە کاری هێشتا نەبڕاوەتەوە، تا ئەو ئاستەی بەم نزیکانە کەناڵێکیان هێناوە هی تایەفەیەکە کە سوژدە بۆ خۆر بن، ڕێنەیان دەگرن لە کاتێکدا ئەوان سوژدەیان بۆ خۆر بردووە لە کاتی دەرکەوتن و لە کاتی ئاوابونیدا، کەوا بوو شەڕو خراپە هەر ماوە _داواکارین خوای گەورە بمانپارێزێت_.

وە شەیتانیش سەری لەگەڵ خۆردا جووت دەکات لەکاتی دەرکەوتن و لە کاتی ئاوابوونیدا[١]، ئیتر نوێژ لەو کاتانەدا هەندێك چواندنی تێدا دەبێت بە نوێژی هاوەڵپەرستان، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دەروازەیەشی داخست[٢].

وە شەیتان بەپێی توانای خۆی ئادەمیزاد گومڕا دەکات، بۆیە هەر کەس خۆرو مانگ و هەسارەکانی پەرست و داوای لێکردن، وەکو ئەوەی خەڵکانی داواکارانی هەسارەکان دەیکەن، ئەوا شەیتانێکی بەسەردا دادەبەزێت و قسەی لەگەڵدا دەکات و هەندێ شتی بۆ باس دەکات، وە ئەوە بە ڕوحانیەتی هەسارەکان ناوزەند دەکەن، کە بریتیە لەشەیتان.

وە شەیتان، ئەگەرچی یارمەتی مرۆڤ بدات بۆ بەدی هێنانی هەندێ لە مەبەستەکانی، ئەوا زیانی پێ دەگەیەنێت بە چەندەها جار ئەوەندەی کە سوودی بۆ دەبێت[٣]،

---

(١)_ لە نێوان دوو شاخی شەیتانەوە دەردەکەوێت، ئەمە هۆکارێکی تری قەدەغە کردنەکەیە کە بریتیە لەوەی شەیتان لەگەڵیدا دەردەچێت، بۆیە قەدەغەی لێکراوە نەوەکا پەرستنەکان ببێتە هاوشێوەی پەرستنی ئەوانەی کە سوژدە بۆ شەیتان دەبەن، چونکە کەسانێك هەن شەیتان دەپەرستن.

(٢)_ تەماشاکەن پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو (شوێن) دەروازەکەی داخست کە نابێت لای گۆڕ نوێژ بکرێت، هەروەها وەکو (کات و زەمەنیش) دیسان دەروازەکەی داخست کە نابێت لە کاتی دەرکەوتنی خۆرو لە کاتی ئاوابونیدا نوێژ بکرێت، لە ترسی ئەوەی نەوەکا لە پەرستنی خۆر پەرستان بچێت.

(٣)_ پێدەچێ شەیتان سوود بە مرۆڤ بگەیەنێت بۆ بەدیهێنانی هەندێ لە مەبەستەکانی بەڵام دڵنیا بن زیانەکانی زۆرترە، کە بریتیە لەوەی مرۆڤ ئایینەکەی خۆی لە دەست دەدات و، هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار دەدات. ئەگەر شتێك بەرژەوەندیەکی کەمی تێدا بێت، خراپەکاریەکی گەورەی تێدا بێت ئەوا بێگومان حەرام دەبێت، لێرەدا تەماشای بەرژەوەندیە کەمەکەی ناکرێت.

وە ناكام و دەرەنجامی ئەو كەسەی گوێڕایەڵی ئەو دەكات تەنها بۆ شەڕە، مەگەر خوای گەورە بیبەخشێت[١].

هەروەها بتپەرستانیش لەوانەیە شەیتانەكان قسەیان لەگەڵ بكەن[٢]، هەروەها ئەو كەسەش كە پەنا بۆ مردویەك یان نادیارێك دەبات، هەروەها ئەو كەسەش كە داوا لە مردوو دەكات یان دەیكات بە هۆكارو وەسیلەیەك بۆ داواكردن، یان وابزانێت كە دوعاكردن لای گۆڕەكەیدا لە ماڵ و مزگەوتەكان چاكترە[٣]،

---

(١)_ هەر كەس گوێڕایەڵی شەیتان بێت بێگومان خەسارەتمەندە، وە ناكام و دەرەنجامیشی بۆ شەڕە مەگەر خوای گەورە بیبەخشێت، وە شەیتان لە سنوورێكدا ناوەستێت بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾[البقرة: ١٦٨] واتە: وە هەنگاوەكانی شەیتان مەكەون بە ڕاستی شەیتان دوژمنێكی ئاشكراتانە. شەیتان پلە بە پلە مرۆڤ ڕاكێش دەكات، تاوەكو لە كۆتایدا دەیگەیەنێتە كوفرو ئیلحاد، سەرەتا تەماعی شتێكی كەمی لێ دەكات تا بە تەواوی دۆستایەتی لەگەڵدا ببەستێت، پاشان كەم كەم دەیبات تا دەیگەیەنێتە كۆتایی كە كوفرە.

(٢)_ هەروەها شەیتان دەچێتە لای گۆڕ پەرستان و لە شێوەی مردوكەدا بۆیان دەردەچێت و قسەیان لەگەڵ دەكات، وە ئەو كەسانەش كە بت دەپەرستن، دیسان شەیتان دەچێتە نێو بتەكەوەو قسەیان لەگەڵ دەكات و، ئەوانیش وادەزانن بتەكەیە، كەچی لە حەقیقەتدا شەیتانە، چونكە شەیتان توانایەكی ئەوتۆی هەیە كە بە خەیاڵی مرۆڤدا نایەت، مرۆڤ ئەو توانایانەی نییە، بۆیە زیان بە ئادەمیزاد دەگەیەنێت.

(٣)_ شەیتان بەشێوەی مردوكە خۆی بۆ بەدەردەخات و، قسەی لەگەڵ دەكات وە ئەویش وادەزانێت ئەوە خودی مردوكەیە كە بۆی دەرچۆتە دەرەوە و، پێویستیەكانی بۆ جێبەجێ كردووە، كەچی لە ڕاستیدا تەنها شەیتانە، چونكە هەرگیز مردوو لە گۆڕ نایەتە دەرەوە، هەرگیز بۆ دونیا ناگەڕێتەوە، بەڵكو ئەوەی كە دەیبینێت تەنها شەیتانە دێتە بەرچاوی.

وە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە كە درۆیە بە ئیتفاقی هەموو ئەهلی زانست، بەم شێوەیەیە دەڵێ: ((إذا أعيتكم الأمور فعليكم بأصحاب القبور))[1] واتە: ((ئەگەر كارێكتان پێ ئەنجام نەدرا ئەوا لە مردووانی نێو گۆڕەكان داوای یارمەتی بكەن))، لە ڕاستیدا ئەم درۆ هەڵبەستراوە تەنها ئەو كەسانە دایاناوە كە دەروازەی شیرك و هاوەڵپەرستیان كردۆتەوە[2].

---

(١)_ ذكره العجلوني في ((كشف الخفاء))(٢١٣)، بلفظ: ((إذا تحيرتم في الأمور فاستعينوا من أصحاب القبور))، وقال: كذا في: ((الأربعين)) لأبن كمال باشا.

سبحان الله، ئایا ئەمە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ ؟ پێغەمبەرێك لە شیرك و هاوەڵپەرستی ڕێگری دەكات و، هەموو ئەو دەروازانە دادەخات كە مرۆڤ بەرەو هاوەڵپەرستی ڕاكێش دەكات، هەموو ئەمانە بەم قسەیە دەڕۆخێنێت و، دەكرێ هەموو ئەو كارانەی پووچ بكاتەوە بەو قسەیەو بڵێت: ((إذا أعيتكم الأمور)) ئەگەر توانای ئەنجام دانی كاروبارەكانتان نەبوو ((فعليكم)) ئەمە هاندانی خەڵكە ((بأصحاب القبور)) بۆ داواكردن لە گۆڕەكان، ئایا هیچ پێغەمبەرێك هەیە ئەم قسەیە بكات؟ دڵنیا بن ئەم قسەیە لە زانایەكەوە، یان لە كەسێكی ئاسایەوە نابیسترێت، ئیتر ماقوڵە پێغەمبەرێكی خوا ئەم قسەیە بڵێت؟ چۆن كۆتاهەمینی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ ئەم قسەیە دەڵێت؟ نیشانەو ئاماژەی درۆو هەڵبەستن بە دەق و سەنەدی ئەم فەرموودەیەوە دیارە، پێچەوانەی قورئان و سووننەتە، كەچی كەسانێك هەن هەر دەستی پێوە دەگرن.

(٢)_ ئەم فەرموودەیە لەدانراوی كەسانێكە كە دەروازی شیرك و هاوەڵپەرستی یان بۆ خەڵك كردۆتەوە، فەرموودەیەك نییە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدرابێتەوە، هیچ موسڵمانێكی ئاسایی نییە باوەڕی پێ بكات، ئیتر چۆن زانایان بڕوا بەوە بكەن كە فەرموودەی پێغەمبەری خوابێت ﷺ، ئەو پێغەمبەرەی كە بیست و سێ ساڵ مایەوە ڕێگریی لەشیرك و هاوەڵپەرستی دەكردو، فەرمانی بە یەكخواپەرستی دەكرد، ئایا ماقوڵە فەرموودەیەكی بەو جۆرە بڵێت كە هەموو ئەو بانگەوایەی پێ بڕوخێنێت، نەخێر زۆر لەوەوە بە دورە.

وە ئەهلی شیرك و هاوەڵپەرستی و ئەو بیدعەچیانەی خۆیان بەوان چواندووە بە نموونەی بتپەرستان و گاوران و گومڕا بوانی موسڵمانان چەندین باروحاڵیان لای گۆڕەکان هەیە وا دەزانن کەڕامەتە کەچی تەنها لە شەیتانەوەیە: وەکو ئەوەی چەند شەرواڵێك لای گۆڕدا دادەنێن دوایی تەماشا دەکەن شەرداڵەکان گرێدراون[1] یان کەسێکی دەست لێوەشاو لە لایەن شەیتانەوە لای گۆڕك دادەنێن تەماشا دەکەن شەیتانەکەی لێی دوور کەوتۆتەوە[2]، شەیتان ئەم شتە دەکات بۆ ئەوەی گومڕایان بکات، وە ئەگەر بە ڕاستی و دڵپاکیەوە (آية الكرسي) بخوێندرێت ئەو شتە پووچ دەبێتەوە[3]، چونکە یەکتاپەرستی شەیتان ڕاودەنێت، بۆیە کەسانێکیان بەهەوادا دەفرین و هەڵگیرابوون، بەڵام کە گوتویانە: (لا إله إلا الله) کەوتونتە خوارەوە[4]،

---

(١)_ شەرواڵێکی کراوە تەماشا دەکەن گرێدراوە، کێ گرێیداوە؟ خودی شەرواڵەکە خۆی گرێدا؟ نەخێر، ئەوە کاری شەیتانە، گرێیدا بۆ ئەوەی فریویان بدات.

(٢)_ یان کەسێکی دەست لێوەشاو لە لایەن شەیتانەوە دەبەنە لای گۆڕێك دواتر تەماشا دەکەن شەیتانەکەی لێی دوور کەوتۆتەوە، دەڵێن: ئەمە بەهۆی بەرەکەتی وەلیەکەوە بووە، کەچی لەحەقیقەتدا شەیتانێك لەنێو جەستەیدا بووە پاشان لێی دورکەوتەوە بۆ ئەوەی فریویان بدات.

(٣)_ ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی پوچێتی و (باطل)ی کردەوە نا ئاسایە لە سروشت بەدەرەکانی شەیتان، ئەگەر بە دڵپاکیەوە قورئان بخوێندرێت کارەکەی شەیتان پووچ دەبێتەوەو، پەکی دەکەوێت، ئەگەر (آية الكرسي) بخوێندرێت ئەو کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرە شەیتانیانە پووچ دەبێتەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو شتانە کەڕامەت نین.

(٤)_ شەیتان بە هەوادا هەڵیگرتووە، بەڵام ئەو لەسەر فیترەتی سروشتی خۆی، گوتی: (لا إله إلا الله) دەست بەجێ کەوتە سەر زەوی و شەیتانەکەی هەڵهات و بەجێی هێڵا.

هەروەها وەکو ئەوەی کە یەکێکیان تەماشا دەکات گۆڕێك کراوەتەوەو، مندالێکی لێ هاتۆتەدەر، وا دەزانێت مردوکەیە کەچی ئەوە شەیتانە، ئەم بابەتە فراوانەو لێرە هەمووی جێگای نابێتەوە[1].

وە لەبەر ئەوەی خۆتەرخان کردن بۆ مانەوە لە ئەشکەوت و بیابانەکاندا ئەو بیدعانەیە کە نەخوا نەپێغەمبەرەکەیﷺ بە شەرعیان دانەناوە، بۆیە شەیتانەکان بە زۆری پەنا دەبەنە بەر ئەشکەوتەکان و چیاکان[2]

---

(١)_ شێخولئیسلام زۆر بە جوانی شتەکانی ڕوون کردۆتەوە، بەڵام لێرەدا دوای لێبوردن دەکات لەبەر کەمی جێگە ئەگینا زۆر لەمانە زیاتری پێیە.

(٢)_ ئەوەی لە موسڵمان داواکراوە پێویستە لە باروحاڵی نهێنی و ئاشکرایی دا ڕاستگۆ بێت، لە کردەوەی دا پێچەوانەی قسەکانی بۆ خەڵکی بەدەر نەخات، وە سوپاس بۆ خوای گەورە ئیسلام ئایینێکی ئاشکرایە، نهێنی نییە، یان ڕێکخراوێکی نهێنی نییە وەکو هەر ڕێکخراوێکی نهێنی تر کە ناوی دەبەن، ئیسلام ئاشکرایە، ئاشکرایەتی ئیسلام لەوەدایە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾ [الفتح: ٢٨] واتە: خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەرەکەی ناردووە بە ڕێنموونیی و ئایینی ڕاستەوە تا بەسەر هەموو ڕێبازێکدا زاڵی بکات. ئایینێکی ئاشکرایە، ئاشکرایە لە خودی خۆیدا، زاڵ و دەرکەوتووە بەسەر هەموو ئایین و ڕێبازەکانی تردا، بەسەریاندا سەرخراوە، هیچ پەنهانی و نادیارییەکی تێدا نییە، ئاشکرایە و هەموو کەسێك دەیبینێت، بۆیە ئەوانەی خۆیان دەشارنەوەو، لە موسڵمانان جیا دەبنەوەو، لە مەجلیسی زانایان و، مزگەوتەکان و، شوێنی زانستەکان خۆیان بە دوور دەگرن، لە ئەشکەوت و شوێنی حەوانەوە دەمێننەوە، بە دڵنیایی ئەم جۆرە کەسانە شتێکی شاراوەیان هەیەو، نایانەوێ هیچ کەسێك پێی

بزانێت، ئەمە لە ئیسلام نییە، لەو بارەوە لەپێشەوا عومەری کوڕی عبدالعزیز دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ((إذا رأيت قوماً يتساررون بينهم بأمر من أمور الدين فاعلم أنهم مفتتحوا باب ضلالة)) واتە: ((ئەگەر قەومێکت بەدی کرد تەنها لە نێوان خۆیاندا بەنهێنی شتێك لەئایین دەدرکێنن ئەوە بزانە دەروازەیەکی گومڕا بوون دەکەنەوە))، لە نێوان خۆیاندا شتێکی ئایین بە نهێنی دەدرکێنن، بەلام ئەوە ئایین نییە، چونکە ئایین ڕوونەو هیچ شتێکی نهێنی تێدا نییە، لە ڕاستیدا نهێنی و شارەوە تەنها لەشتە ناڕاستەکاندا هەیە، ئەو شتانەی هەولی نەدرکاندنی دەدرێت، بەلام ئیسلام بە بەر چاوی هەموانەوەیەو ئاشکرایە، بەبەرچاوی هەموانەوە لە مزگەوتەکاندا بانگ دەدرێت، زانایان لەدەرسە زانستیەکاندا بە بەر چاوی خەلکیەوە باسی دەکەن، لە شوێنە زانستیە ناسراوەکاندا باس دەکرێت، هیچ شتێکی نهێنی تێدا نییە کە تەنها بە کەسانێکی تایبەت بدرێت و باسکرێت، وەك کۆمەلە گومڕاکانی وەکو (دروز) و غەیری ئەوان، ئەوان نهێنی ئایینەکەی خۆیان تەنانەت لە مندالەکانی خۆیان و خوێندکارانی خۆشیان دەشارنەوە، بەلام ئایینی ئیسلام ئاشکرایە ڕوونە، کەچی تەماشای کەسانێك دەکەیت لە مەجلیسی زانست و ئامادە بوونی مزگەوتەکان، تەنانەت لە نوێژەکانی هەینی و نوێژە بەکۆمەلەکانیش دوور دەکەونەوەو، لەگەل موسلمانانندا نوێژ ناکەن، بۆیە هەرکەسێك ئەو بیرۆکانە بۆ خۆی دروست بکات بێگومان لە موسلمانان دوور دەکەوێتەوە، نوێژی هەینی و نوێژە بە کۆمەلەکان ناکات، ئەمە ڕوونە، لەگەل شەیتانەکەیدا دەبێت یان لە ژێر زەمینەکان و خەلوەتگاکان خۆیان دەشارنەوە، ئەمە ئایینی ئیسلام نییە، ئایینی ئیسلام بۆ هەموانەو، بۆ هەموان ئاشکرا دەکرێت. بۆیە کاتێ واصیلی کوڕی عەطائولغەزال و شوێنکەوتوانی لەمەجلیسی حەسەنی بەصری جیا بوونەوە، ئەنجامەکەی چ بوو؟ بیرو باوەڕی موعتەزیلەی گومڕاو لەڕێی ڕاست

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

لادەر هاتە کایەوە کە هەتا وەکو ئێستاش موسڵمانان بە دەستیەوە دەناڵێنن، ئایینی ئیسلام ئایینی کۆمەڵە، ئایینی خۆشەویستیە لە دڵاندا، ئایینی هاوکاریی یەکەی کردنە لەسەر خێرو چاکەکاری و تەقواکاریی. لە سیفاتی کەسانی لەرێی ڕاست لادەر ئەوەیە کە خۆیان بە دوور دەگرن و، خۆیان نادیار دەکەن، شتانێك لە دڵی خۆیاندا بەرامبەر بە موسڵمان هەڵدەگرن، ئەگەر پیاوانێکی ڕاستگۆ و ئاشکرا کار بوونایە لەگەڵ خەڵکیدا دیار دەبوون، بۆیە خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ﴾[البقرة: ٩] واتە: (بە لای خۆیانەوە) خواو ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن کە بڕوایان هێناوە ! کەس ناخەڵەتێنن تەنیا خۆیان نەبێت بەڵام هەستی پێناکەن. ئایینی صۆفیەکان لەو جۆرەیە، کە خەڵوەتگاو، شوێنی تایبەتیان هەیە خۆیانی تێدا دەشارنەوەو، ئایینی تەصەوف فێری یەکتر دەکەن، کەسانێکیان چل ڕۆژ خۆی لە خەڵك بە دور دەگرێت و، پاشان خۆی پیشانی خەڵکی دەدات و، گوایە دەروازەی زانستی بۆ کراوەتەوە، بەڵام ئەمە تەنها لە شەیتانەوەیە، چونکە شەیتان لەو شوێنە تاریکا دا ئامادە دەبێت، شەیتان لە مزگەوتەکان و دەرسە زانستیەکاندا ئامادە نابێت، بەڵام لە ئەشکەوتەکان و، شوێنە نادیارەکاندا ئامادە دەبێت بۆ ئەوەی ئەو نهێنیە خراپ و پیسانە بەو کەسە هەڵخەڵەتێنراوانە فێر بکات، کەوا بوو هەر کات کەسانێکت بەدی کرد خۆیان بە دور دەگرت و، لە شار دەچنە دەرەوەو، لە شوێنێکدا کۆ دەبنەوە، ئەوە بزانە شتانێکی پەنهانی پیسیان هەیە، دڵنیابە ئەگەر خێریان پێبوایە نەیاندەشاردەوە، کە خۆیان دەشارنەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شەڕێکیان پێیەو نایانەوێت کەس پێی بزانێت، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لاَ يَرْضَىٰ مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا﴾[النساء: ١٠٨]

---------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------

واته: (تاوانەکانی) خۆیان دەشارنەوە لە خەڵکی (لەترساندا) و نایشارنەوە لە خوا (شەرم ناکەن لەخوا) لە کاتێکدا خوا لەگەڵیاندایە کاتێ (کە بەنهێنی) لەشەودا تەگبیر دەکەن و قسەیەك دەکەن خوا پێی ڕازی نییە وە خوا هەمیشە زاناو ئاگادارە بە هەر کردەوەیەك کە ئەوان دەیکەن. ئەمە شتێکە کەسانی تر پێشی ئەمان پێی گەیشتوون، لەترساندا تاوانەکانی خۆیان لە خەڵکی دەشارنەوە کەچی لە خوا شەرم ناکەن و لەوی نایشارنەوە ئەگەر لە ئەشکەوتێکدا یان لەشوێنێکی حەوانەوەدا یان لە شوێنێکی خاڵیدا مانەوە، ئەگەرچی خەڵکی پێیان نەزانن بەڵام خوای گەورە هەر پێیان دەزانێت، خوای گەورە دەزانێت کە بە نهێنی و لە شەودا تەگبیر دەکەن و قسە گەلێك دەکەن کە پێی ڕازی نییە، بۆیە خوای گەورە ئاسانکاری بۆ موسڵمانان دەکات بۆ ئەوەی لە ناویان بەرن، وەکو ئەوەی لە مێژوودا زانراوە کە موسڵمانان بە چ شێوازێك کۆمەڵە گومڕاکانیان لە ناو بردووە.

به بۆ وێنه ئەشکەوتی ئەلدەم لە چیای قاسیۆن، وە چیای لوبنان لە ڕۆخی شام، وە چیای ئەلفەتح لە ئەسوان لە مصر، وە چەند چیایەك لە ڕۆم و خۆراسان، وە چەند چیایەك لە جەزیرەو، غەیری ئەوانیش[(١)]، وە چیای ئەلوکام، وە چیای ئەلئەحیەش، وە چیای سەولانی نزیك ئەردەبیل، وە چیای شەهەنکی نزیك تەبریز، وە چیای ماشکوی نزیك ئەتشوان، وە چیای نەهاوەند، وە چەندەها چیای دیکەش کە هەندێ کەس وا دەزانن پیاو چاکانێکی ئادەمیان تێدایە[(٢)] وە بە پیاوانی غەیب و نادیاریان ناو دەبەن، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها پیاوانێکی جنۆکەن کە لە وێن.

---

(١)_ بە دوای ئەشکەوت و چیادا دەگەڕێن بۆ ئەوەی تیایدا بمێننەوە، بۆ ئەوەی پیلان دژی موسڵمانان بگێڕن و، ئەو ژەهرەی لە سنگیاندایە بە موسڵمانانندا بیڕێژن بە یارمەتی شەیتانی شێخیان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ﴾[محمد: ٢٥] واتە: شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کرد بوون وە بەهیوا و ئومێد فریوی دابوون.

(٢)_ ئا ئەمەیە کێشەکە، وا دەزانن پیاو چاکانێك هەن لە پیاوانی غەیب و نهێنی، کە بە پیاوانی غەیبیان ناو دەبن، کە لە ڕاستیدا تەنها شەیتانەکانن، وە لەوانەیە خۆیان بەشێوازی مرۆڤی بگۆڕن و، بێنەلایان و لەگەڵیاندا دابنیشن و، ئەم بیرۆکە خراپ و پیسانەیان فێرکەن، چونکە ئەگەر مرۆڤ لەبرا موسڵمانەکانی دابڕا، شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێت، لەبەر ئەم هۆیە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ هانی موسڵمانانی بۆ مانەوە لەنێو کۆمەڵی موسڵماناندا، وە ڕێگریی کردووە لە بەتەنها مانەوە، وە فەرموویەتی لە ڕاستیدا گورگ ئەو مەڕە دەخوات کە لە مێگەل جیا دەبێتەوە، چونکە شەیتان گورگی مرۆڤە، بۆیە پێویستە موسڵمان لەگەڵ موسڵماناندا بێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾[التوبة: ١١٩]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە (تۆڵەی) خوا وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن و لە ڕیزی ئەواندابن. لەبەر ئەمەیە خوای گەورە فەرمانی پێداوین لە پەرستنەکاندا کۆ ببینەوە، پێنج نوێژە فەرزەکە، نوێژی هەینی، وە لە جەژنەکاندا، لە ڕۆژی عەرەفەدا، ئەمانە چەندین کۆبونەوەن کە موسڵمانانی تێدا کۆدەبێتەوە. نەك هەموو کەسێك بچێتە نێو ئەشکەوتێکەوە یان بچێتە چیایەك و، بڵێت: من خواپەرستی دەکەم، بەپێشەوا ئیبن و عەبباسیان ﷺ گوت: پیاوێك بە شەو شەو نوێژ دەکات و بە ڕۆژیش هەمیشە بە ڕۆژوو دەبێت، بەڵام نوێژەکانی هەینی و نوێژە بە کۆمەڵەکان ڕاکات، فەرمووی: لەئاگردایە. ئێوە لەهەموو وتارێکدا دەبیستن: لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمانان دا بن، ئەمە فەرموودەیە، دەقی فەرموودەیەکە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((عليكم بالجماعة، فإن يد الله مع الجماعة، ومن شذَّ شذَّ في النارِ)) واتە: ((لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمانان دا بن، چونکە دەستی خوای گەورە لەگەڵ کۆمەڵدایە، هەر کەس جیا بێتەوە بەرەو ئاگر جیا دەبێتەوە)).

چونکه جنۆکەکان پیاوانن وەکو چۆن ئادەمیزاد پیاوانن، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾(١) [الجن: ٦] واتە: بە ڕاستی پیاوانێك لە ئادەمیی پەنایان دەبردە بەر پیاوانێك لە جنۆکە (کە بیان پارێزن) کەچی زۆرتر ماندوویان دەکردن.

وە هی وایان تێدایە بەوێنەی پیاوێکی تووکن کە پێستی لە پێستی بزن دەچێت دەتوانێت خۆی بە دیار بکات، جا کەسانێك کە نەیناسن وا دەزانن ئادەمییە، لە ڕاستیشدا تەنها جنۆکەیە(٢).

---

(١)_ شەیتانی مرۆڤی لەشەیتانی جنۆکەکان مەترسیدارترە بۆ سەر موسڵمانان، چونکە شەیتانی مرۆڤیش هەیە، کەوابوو جنۆکەو مرۆڤیش شەیتانیان هەیە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا﴾[الأنعام: ١١٢] واتە: لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە کە بەنهێنی بە یەکتری ڕادەگەیەنن ووتەی ڕازاوەو بریقەدار بۆ فریودانیان. لێرەدا خوای گەورە هەواڵیداوە کە لە مرۆڤیشدا شەیتان هەیە کە زۆر لە شەیتانەکانی جنۆکە بۆ سەر ئادەمیزاد مەترسیدار ترن، چونکە شەیتانەکانی جنۆکە ئەگەر زیکری خوای گەورە بکرێت هەڵدێن، بەڵام شەیتانەکانی مرۆڤی نەك جارێك بەڵکو ئەگەر صەد جار زیکری خوای گەورەش بکرێت هەڵنەین و هەر لەسەر گومڕا بوونی خۆیان بەردەوام دەبن، بۆیە لە شەیتانەکانی جنۆکە مەترسیدار ترن، گومڕا بوونی ئادەمیزاد لە شەیتانەکانی جنۆکە مەترسیدار ترن.

(٢)_ ئایا ئادەمی هەیە ڕەنگی بزنی هەبێت؟ یا لە سەر شێوەی بزن بێت، بێگومان ئەوە شەیتانە.

وە دەگوترێ: لە هەر چیایەکی ئەم چل چیایەدا (الأبدال)[1] هەیە، وە ئەوانەی
...ئەمرۆ (الأبدال)ن لە حەقیقەتدا تەنها جنۆکەن و لەو چیایانەدان، وەکو ئەوەی
بە چەند ڕێگەیەك ئەو شتە زانراوە.

ئەم بابەتە لەم شوێنەدا ئەوەندە فراوان نییە بە درێژی باس بکرێت، هەموو
ئەوەی کە دەیزانین بیخەینەڕوو، چونکە ئێمە ئەوەندەمان لەو شتانە بینیوە کە
...مەنکردنی درێژە دەکێشێت[2] کە نووسراوە بۆ ئەو کەسەی داوای کردووە هەندێك
...شتی بۆ باس بکەین لەسەر ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە بۆ ئەوەی هەندێك لەو
بارەوە بزانێت[3].

---

(١)_ (الأبدال)ەکان ئەوانە نین کە ئەوان باسی دەکەن. بە پێی ئەو ئەثەرەی کە
لە بارەیانەوە هاتووە، بە(الأبدال) ناونراون چونکە کە یەکێکیان ئەمما یەکێکی دیکە
شوێنی دەگرێتەوە، ئەوان پیاوانێکی چاکن و، لەهەموو سەدەیەکدا ژمارەیەکی کەمن،
ئەمە ئەگەر ئەو ئەثەرەیان کە لە بارەوە هاتووە ڕاست و دروست بێت، ئەوانە نین کە
ئەوان باسی دەکەن، بەڵکو پیاوانێکی چاکن، زانان.

(٢)_ بواری زانینی شێخولئیسلام و فراوانی ئەو هەواڵ و شتانەی کە دەیزانێت بە
ڕاستی سەرسوڕمێنە، خوای گەورە دەروازەیەکی گەورەی هەموو ئەو زانستانەی بۆ
کردۆتەوە، بە حەقیقەت هۆکاری ئەمەش بۆ بەرەکەتی زانست و کردە دەگەڕێتەوە،
زانستی بە سوودو، کردەوەی چاك و، بانگەوازی بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گەورە.

(٣)_ شێخولئیسلام هەموو کتێبەی نووسیوە سەبارەت بە وەڵامدانەوەی
مەسەلەیەك، لێیان پرسی سەبارەت بە جیاکارییەکانی نێوان دۆستانی خواو دۆستانی
شەیتان، ئەویش ئەم پەرتووکەی لە وەڵامدانەوەیدا نووسی کە وەڵامدانەوەی تەنها
پرسیارێك نووسی.

## کردەوە نائاساییە لەسروشتبەدەرەکان لەدیدی خەڵکدا

خەڵکی لە بارەی کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرەکانەوە سێ بەشن[١]:

بەشێك لە خەڵکی کردەوە لە سرووشت بەدەرەکان بۆ کەسانی تری غەیری پێغەمبەران بەدرۆ دەخەنەوە[٢]، وە پێدەچێت بە شێوەیەکی گشتی باوەڕی پێ بکات، وە ئەوانە بە درۆ بخاتەوە کە لە زۆرێك لە خەڵکەوە بۆی باس دەکرێت، چونکە بەلایەوە ئەو کەسانە لە ئەولیاو دۆستان نین.

---

(١)_ وەکو پێشتر باسمان بۆکردن خەڵکانێك لە بەدرۆ خستنەوەی کردەوە نائاساییەکان زێدەڕیان کردو، نکۆڵیان لێکرد وەکو موعتەزیلەکان، کە نکۆڵی لە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر دەکەن، ئێستا بە عەقلانیەکانیان ناو دەبەن، هەروەها نکوولی لە موعجیزەکانیش دەکەن، وە لە کەرامەت نکۆڵی دەکەن، وە خەڵکانێکیش لە باوەڕیی بوون و جێگیرکردنی ئەو کردەوە لە سروشت بەدەرانە زێدەڕۆییان کرد تا ئەو ئاستەی کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرە شەیتانیەکانیشیان بە کەرامەت داناوە، ئەمانە لە جێگیرکردنیدا زێدەڕۆییان کرد، وە نێوەندی ئەو دوو چینە خەڵکە تایەفەیەکی ترن کە کەرامەت و موعجیزات جێگیر دەکەن لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سووننەتدا، وە نکۆڵیان لە غەیری ئەوانەکرد، ئەم تایەفە بریتین لە ئەهلی سووننەت و جەماعەت.

(٢)_ عەقلانیەکان نکۆڵی لە کەرامەت دەکەن بۆ کەسانی تری غەیری پێغەمبەران، عەقلانیە هاوچەرخەکان تەنانەت لە موعجیزاتی پێغەمبەرانیش نکۆڵی دەکەن، بەڵام موعتەزیلەکان کە پێشینی ئەوانن موعجیزاتی پێغەمبەرانیان جێگیر دەکرد بەڵام لە کەرامەتی ئەولیا نکۆڵیان دەکرد، دەڵێن: گوایە بۆ ئەوەی کەرامەتی ئەولیا تێکەڵ بە موعجیزاتی پێغەمبەران نەبێت و لە یەك نەچن.

وه كەسانێكيشيان تێدايە وادەزانێت هەركەسێك جۆرێك لەكردەوەی ناناسايی هەبێت دۆستی خوايە[1]، وە هەر دوو بۆچوونەكان هەڵەن[2]، بۆيە ئەوانەی زێدەڕۆيی دەكەن لە بڕوا بوونيان بە كردەوە لە سروشت بەدەرەكان تەماشا دەكەيت دەڵێن: ماوەڵپەرستان و ئەهلی كيتابيش پشتگيرانێكيان ناديارييان هەيە و لە جەنگی دژ بە موسڵماناندا يارمەتيان دەدەن و[3]، وا گومان دەبەن لە ئەولياو دۆستانی خوان، بەڵام نكۆڵيكاران بە درۆی دەخەنەوە كەسانێكيان لەگەڵ دابێت جۆرێك لە كردەوەی ناناساييان هەبێت .

---

(١)_ ئەمانە بريتين لەو بەشەی كە لە جێگيركردندا زێدەڕۆيی دەكەن، لەنێوان كەرامەت و كردەوەی ناناسايی لە سروشت بەدەری شەيتانيدا جياوازی ناكەن.

(٢)_ واتە: ئەوانەی لە نەفی كردندا زێدەڕۆی دەكەن و، ئەوانەش كە لە جێگركردندا زێدەڕۆيی دەكەن هەردوو لايان هەڵەن.

(٣)_ تەنانەت كەرامەتيان بۆ كافرانی وەكو جوولەكەو گاورانيش جێگير كرد، چونكە كردەوەی ناناسايی لە سروشت بەدەريان هەيە، بەديدی ئەوان كەرامەتێكی ڕەهايە، لە نێوان كەرامەت و كردەوەی نا ئاسايی لە سروشت بەدەری شەيتانيدا جياوازی ناكەن.

ڕاستیش بۆچوونی سێیەمە[١]: کە پێیان وایە کافرەکان ئەوانەیان لەگەڵدایە کە لە ڕەگەزی خۆیانن نەك لە ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە[٢]، وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾[٣] [المائدة: ٥١]واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ﴿لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ﴾ جوولەکەو گاور مەکەن بەپشتیوان و خۆشەویستی خۆتان ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆست ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە.

---

(١)_ لە جەنگی بەدردا شەیتان لەگەڵ کافراندا ئامادە بوو، وەکو ئەوەی خوای گەورە باسی دەکات، لە جەنگی بەدردا هانی کافرانیدەدا بۆ جەنگ کردن دژ بە موسڵمانان، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ فَلَمَّا تَرَاءتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكُمْ إِنِّي أَرَى مَا لاَ تَرَوْنَ إِنِّيَ أَخَافُ اللّهَ وَاللّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ [الأنفال: ٤٨] واتە: (بیربکەرەوە) کاتێك کەشەیتان کردەوەکانیانی بۆ ڕازاندەوە وە گوتی ئەمڕۆ هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ و بێگومان من پەنادەر (و پارێزەر)ی ئێوەم ئینجا کاتێ هەر دوو دەستەکە ڕوو بە ڕووی یەکتر بوونەوە (شەیتان) پاشەو پاش بە دوای خۆیدا گەڕایەوە و گوتی بە ڕاستی من بەریم لە ئێوە چونکە بەڕاستی ئەوەی من دەبینم ئێوە نایبینن بە ڕاستی من لە خوا دەترسم و خوا زۆر تۆڵەی بەتین و سەختە. شەیتان لەگەڵیاندا ئامادە دەبێت بەڵام ئەگەر هێزی موسڵمانان و، زیکرو یادی خوای گەورەو، دابەزینی فریشتەکانی بەدی کرد هەڵدێت.

(٢)_ ئەوانەیان لەگەڵدایە کە یارمەتیان دەدەن و، لەڕەگەزی خۆیانن وەکو کافران و شەیتانەکان وەکو ئەوەی لە جەنگی بەدردا ئامادە بوو.

(٣)_ شاهێدی قسەکانمان فەرمایشتی خوایە کە دەفەرمووێ: ﴿بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن، کەوا بوو ئەوەی لەگەڵیاندا ئامادە دەبێت لە ڕەگەزی خۆیانە، لە کافرەکانە، لە موسڵمانان نییە.

ئەو خواپەرست و زاهیدانەی کە لە ئەولیاو دۆستانی تەقواکاری خوای گەورە نین و، شوێنکەوتووی قورئان و سووننەت نین(١) شەیتان دەبێ بە هاوەڵیان، هەر یەکێکیان هێندێ لە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری هەیە کە گونجاوی ڕێکی ئەو بارو حاڵەکە خۆی تیایەتی، بەڵام کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرەکانی ئەوان جیاوازن و هێندێکیان دژ بەیەکترن(٢)،

---

(١)_ ئەگەر پەرستن و عیبادەت بەگوێرەی شەریعەت ئەنجام نەدرا باتڵ و پووچە، با کەسێکی زۆر عابیدیش بێت، گاورەکان عابیدن، قەشەکان دەگرین و، واز لە دونیا دێنن و، لەکەڵێسایەکدا بە تەنیا دەمێننەوەو، بەکوڵ دەگرین بەڵام لە ئاگریشدان، چونکە لەسەر شەریعەتی پاکی خوای گەورە نین، ئەگەر پەرستن و عیبادەت بە ڕێگەیەکی ڕاست و دروست ئەنجام نەدرا پووچەو باتڵە، ماندوو بونێکی بێ سوودە. لە بارەی زوهدیشەوە ئەوان زوهد دەکەن، واز لە دونیا دێنن، وەکو زاهیدەکانی هیندو شوێنانی تریش کە لە دونیادا زوهد دەکەن، چونکە زوهد تەنها بەموسڵمانانەوە سنووردار نەکراوە، کافران زاهیدانیان تێدایە، بەڵام لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست نین، بۆ نموونە غاندی کە سەرۆکی هیند بوو، هێندی لە دەستی ئینگلیزەکان ڕزگار کرد، پیاوێکی زاهید بوو، وازی لە دونیا هێنا بوو، شیری بزنێکی دەخوارد کە بەردەوام لەگەڵیدا بوو، تەنانەت بۆ کۆنفرانسە جیهانیەکانیش دەیبرد، بەڵام زەندیق و کافر بوو. ئەگەر زوهد ڕاست و شەرعی نەبوو، ئەوا زوهدێکی چووچە لای خوا.

(٢)_ کەرامەتی ئەولیا جیاوازنین و دژبە یەکترنین چونکە لە لایەن خوای گەورەوەیە، بەڵام کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرە شەیتانیەکان جیاوازن و دژبە یەکترن، چونکە پووچ و باتڵن، باتڵ و پووچیش ڕێك ناکەوێت، بەڵکو جیاواز دەبێت.

وە ئەگەر ڕوویداو یەکێك لەوەلی و دۆستانی خوای گەورە بە توانا بێ دەتوانێ کردەوە نائاساییەکانیان پووچ بکاتەوە[1]. وە پێویستە هەر یەکێکیان ئەمەندە درۆی تێدا بێت بە نەفامی یان بە قەستیبێت وە ئەمەندە تاوانیشی تێدا بێت کە گونجاوی باروحاڵی ئەو شەیتانانە بن کە بوونە کەهاوەڵیان، بۆ ئەوەی خوای گەورە بیکا بە سنووری جیاکاری لە نێوان دۆستە تەقواکارەکانی خۆی و ئەوانەی خۆیان بەوان چوواندووە لەدۆستانی شەیتان .

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ (٢٢١) تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ (٢٢٢)﴾[2] [الشعراء: ٢٢١_٢٢٢].

---

(١)_ لە کاتی زیکرو یادی خوای گەورەدا پووچ دەبێتەوە، کردەوە نائاساییە شەیتانیەکان لە کاتی زیکرو یادی خوای گەورەدا پووچ دەبنەوە، بەلاّم کەرامەتی ئەولیا لەگەڵ زیکرو یادی خوای گەورەدا زیاد دەکات، بەهێزتر دەبێت، کاتێ شێخولئیسلام لەگەڵ ریفاعیەکاندا موناقەشەی کرد، ئەوان گوتیان: ئێمە دەچینە نێو ئاگرەوەو هیچ زیانێکمان پێنا گەیەنێت، شێخولئیسلامیش پێی گوتن: باشە منیش لەگەڵتاندا دەچمە نێو ئاگرەکەوە بەلاّم بەمەرجێك پێکانمان بشۆین و پاشان بچینە نێو ئاگرەکەوە، چونکە ئەوان شتانێکی دژبە ئاگریان بەژێر پێی خۆیانەوە دەلکاندو، ئینجا دەچوونە نێو ئاگرەکەوە ئیتر زیانی پێنەدەگەیاندن، پاشان دەیانگوت: ئێمە دەچینە نێو ئاگرەوە، کە شێخولئیسلام ئەوەی پێ گوتن ئەوان ڕازی نەبوون، بەم جۆرە کارەکەی پووچ کردنەوە.

(٢)_ چونکە بێباوەڕان گوتیان: قورئان جادووەو شەیتانەکان بۆ موحەممەدیان دابەزاندووە، بۆیە خوای گەورە وەلاّمیان دەداتەوەو، دەفەرموێ: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ (٢٢١) تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ (٢٢٢)﴾ هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنە سەر هەموو کەسێکی زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار. شەیتانەکان بەسەر دۆستانی خوای گەورەدا دانابەزن، لە ڕاستیدا تەنها بەسەر دۆستانی شەیتاندا دادەبەزن.

## گۆرانی گوتن بار و حاڵه شەیتانیەکان بەهێز دەکات

## قورئانیش ئیمان بەهێز دەکات

گەورەترینی ئەو شتانەی کە باروحاڵە شەیتانیەکان بەهێزدەکات: گۆرانی بیستن و مۆسیقاکانی ڕابواردنە، ئەو شێوە بیستنە بیستنی هاوەڵپەرستانیش بوو[1]، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ صَلاَتُهُمْ عِندَ الْبَيْتِ إِلاَّ مُكَاء وَتَصْدِيَةً﴾[الأنفال: ٣٥] واتە: وە نوێژی ئەوان (بتپەرستان) لە ماڵی خوادا هیچ نییە جگە لە فیکە کردن و چەپڵە لێدان.

پێشەوایان ئیبنو عەبباس و ئیبن وعومەر ﷺ وە کەسانی تری پێشینی چاکیش فەرموویانە: ((التصدية)) چەپڵە لێدانە، ((المكاء))یش: وەکو فیکە کردنە، هاوەڵپەرستان ئەمەیان کردبووە عیبادەت و پەرستن[2].

---

(١)_ ئەمە جیاوازیەکی ترە لەنێوان کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرە شەیتانیەکان و کەرامەتی ڕەحماندا، چونکە کەرامەتی ڕەحمانی لەگەڵ زیکرو یادی خوای گەورەدا بەهێز دەبێت، بەڵام کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرە شەیتانیەکانیەکان لەگەڵ مەعصیەت و سەرپێچی و گۆرانی و سەماکردندا بەهێزتر دەبێت، لەگەڵ سەرپێچیەکاندا بەهێز دەبێت بۆیە ئامادەی سەماکردن دەبن و، دەڵێن: ئێمە لەدۆستانین، ئامادەی شوێنی سەماکردن و گۆرانی بێژان دەبن، گۆرانی دەڵێن و دەف لێدەدەن و دەڵێن: ئەمە دەفی خوایە لەکاتێکدا ئەوە زیکری شەیتانە، بۆیە کردەوە نائاساییەکانیان لەگەڵ سەرپێچی و دەف و شمشاڵ لێدان و گۆرانیدا بەهێز دەبێت، بەڵام کەرامەتی ڕەحمان لەگەڵ زیکرو یادی خوای گەورەدا بەهێز دەبێت، ئەمەش جیاوازییە.

(٢)_ هاوەڵپەرستان چەپڵە لێدان و فیکە کردنیان کرد بووە عیبادەت و پەرستن لە کاتێدا ئەمانە مەعصیەت و سەرپێچی کردنن.

بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی، پەرستنەکانیان بریتی بوو لەوانەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکرد بوون، وەکو نوێـژ، خوێنـدنی قورئـان و، زیکرو بەو هاوشێوانە، وە کۆبونەوە شەرعیەکانیش، هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بۆ بیستنی گۆرانی کۆنەدەبونەوە، نە بە دەست نـە بـەدەف، نەخۆشەویستی و نەسۆز نیشاندا، نە(بُرْدَة)کەی[1] کەوتەخوارەوە[2]،

---

(١)_ (بُرْدَة): پۆشاکێکی خەت خەت بوو وەکو عەبا لەبەر دەکرا یان وەکو جاجم بەخۆدا دەدرا، بڕوانە: مەلا مەحمودی گەلاڵەیی، قامووسی ڕستە، (وەرگێڕ).

(٢)_ هـەرگیز پێغەمبـەری خـوا ﷺ و هـاوەڵانی بـەڕێزی بـۆ گـۆرانی بیسـتن و، سەماکردن کۆ نەدەبونەوە، بەڵکو تەنها بۆ قورئان خوێندن و، زیکری خوای گەورەو، دەرسی زانستی کۆدەبوونەوە، ئا ئەمانە بوون لەسەری کۆدەبونەوە، بەلام ئەوان بۆ چـەپڵە لێـدان و، فیکـەکردن و، تـەپڵ لێـدان و، شمشـاڵ لێـدان و، گـۆرانی گـوتن کۆدەبنـەوە، ئـەو شـتانە دڵـەکان ڕەت دەکـات، مرۆڤـ لـە زیکـری خـوای گـەورە دور دەخاتەوە. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ (بُرْدَة)کەی نەکەوتە خوارەوە وەکو ئەوەی ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن و، بۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ درۆ هەڵدەبەسـتن، گوایـە لـە مەجلیسێکی صۆفیدا ئامادە بوو، کە گوێبیستی ئەم گۆرانییە بوو:

لسعت حية الهوى كبدى     ليس لها من واق ولا راقِ.

دەڵـێن: کـاتێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوێبیسـتی ئـەم گۆرانییـە بـوو خـۆی لـە راندەوەو، خۆی بادا تاوەکو (بُرْدَة)کەی کەوتە خوارەوە، ئەمە درۆکردنێکی ئاشکرایە کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵبەستراوە.

بەلکو هەر هەموو ئەوانە درۆن بەڕێککەوتنی ئەو زانایانەی فەرموودەکانی دەناسن[١].

هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کات کۆبونایانەتەوە فەرمانیان دەدایە، بەکێکیان قورئانی بخوێندایەو، ئەوانیتریش گوێیان دەگرت[٢]، پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه بە ئەبی مووسای ئەشعەری رضي الله عنه دەفەرموو: ((ذكرنا ربنا، فيقرأ وهم يستمعون)) واتە: ((پەروەردگارمان یادخەرەوە، ئیتر قورئانی دەخوێندو ئەوانیش گوێیان لێ دەگرت))[٣]،

---

(١)_ خوای گەورە چەند زانایەکی کاملی تەواوی ڕێکو پێکی بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ تەرخان کردووە کە (صحيح) ڕاست و، (ضعيف) لاوازو، (موضوع) هەڵبەستراوەکانیان لێك جیا کردۆتەوە، بۆیە نەفس نزمان هەرگیز ناتوانن درۆ بەدەم پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵبەستن، ئەمەش ڕاستێتی گوفتاری خوای گەورەیە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ [الحجر: ٩] واتە: بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە و بەڕاستی هەر ئێمەش دەیپارێزین. کەوا بوو هیچ مولحیدو دوو ڕوویەك ناتوانێت درۆ بە دەم پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵبەستێت، لەبەر بوونی ئەو کەڵە زانایانە.

(٢)_ بۆ بیستنی قورئانی پیرۆز کۆ دەبوونەوە، بۆ بیستنی گۆرانی و، دەف لێدان کۆنەدبونەوەو، بڵێن: ئەمە زیکرو یادی خوایە.

(٣)_ ئەبو مووسای ئەشعەری رضي الله عنه لە قورئان خوێندندا دەنگێکی خۆشی هەبوو، کە شەونوێژی دەکردو، قورئانی دەخوێند پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ دەگرت، لە قورئان خوێندنەکەی چێژی وەردەگرت، جارێکیش کۆبونەوە ئیمامی عومەر رضي الله عنه فەرمانی پێکرد قورئان بخوێنێت و، ئەوانیش گوێبیستی خوێندنەکەی دەبوون و، چێژیان لێوەردەگرت. چێژیان لە چەپڵە لێدان و فیکە کردن وگۆرانی و دەف لێدان وەرنەدەگرت.

وَمَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِأَبِي مُوسَى وَهُوَ يَقْرَأُ.فَجَعَلَ يَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِهِ. وَقَالَ: ((مَرَرْتُ بِكَ الْبَارِحَةَ وَأَنْتَ تَقْرَأُ. فَجَعَلْتُ أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ)) فَقَالَ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَسْمَعُ لَحَبَّرْتُه لَكَ تَحْبِيرًا[1]، أَيْ: لَحَسَّنْتُه تَحْسِينًا)). **واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای ئەبو مووسای ئەشعەریدا تێپەڕ بوو کە قورئانی دەخوێند. وەستا بۆ گوێگرتن لە خوێندنەکەی. وە پێی فەرموو: ((دوێنێ بەلاتدا تێپەڕ بووم و تۆ قورئانت دەخوێند، منیش وەستام بۆ گوێگرتن لە خوێندنەکەت)) ئەبو مووساش پێی فەرموو: ئەگەر بمزانیبا تۆ گوێم لێدەگریت بۆم دەڕازندیتەوە بە ڕازاندنەوە)) واتە دەنگی بۆ خۆشتر دەکردەوە.**

**هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:** ((زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ))[2] أخرجه البخاري معلقا، وأحمد (٢٨٣/٤)، وأبو داود (١٤٦٨)، وابن ماجة (١٣٤٢)، والنسائي (١٧٩/٢)، **واتە ((بە دەنگەکانتان قورئان بڕازێننەوە)).**

---

(١)_ أصله في الصحيحين من حديث أبي موسى أن النبي ﷺ قال: ((يا أبا موسى لقد أُوتيت مزمارا من مزامير آل داود))، أخرجه البخاري (٥٠٤٨)، ومسلم (٧٩٣).

وسياق الحديث بأكمله (بما فيه زيادة لحبرته لك تحبيرا)، عزاه الحافظ في ((الفتح)) (٩٣/٩)، إلى أبي يعلى والروياني، ونحوه عند ابن سعد بإسناد على شرط مسلم.

**(٢)_ بۆیە خۆشخوازی خوێنەری قورئان بە دەنگی بیڕازێنێتەوە، وەکو شیعر بە خێرایی نەخوێنێتەوە و، وەکو خورمای خراپیش بەبێ تێدا ورد بوونەوە و، تێگەیشتن وشەکانی فڕێنەدا، بەڵکو بە دەنگی بترازێنێتەوە، بە شێوازێکی زۆر جوان دەیخوێنێتەوە بۆ ئەوەی کار لە خودی خۆی و، کار لە گوێگرانیش بکات، بەڵام با زێدەڕۆیی نەکات وەکو چۆن ئێستا بە تەجویدی ناو دەبەن، لە غوننەو، مەخاریجی حوروفدا پێداگریی دەکەن تا ئەو ئاستەی پیت گەلێکی تر دروست دەکەن، گوێگر بێزار دەکەن، بەم خوێندنە قورسکراویە لەسەر نوێژ خوێنانی قورس دەکەنەوە، ئەگەر قورئان بە مامناوەندی بخوێندرێت کاریگەریی دەبێت بەڵام ئەگەر قورس بکرێتەوە کاریگەریی نابێت.**

وقال ﷺ: ((لَلَّهُ أَشَدُّ أَذَنًا ـ أي استماعاً ـ إِلَى الرَّجُلِ الْحَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ مِنْ صَاحِبِ الْقَيْنَةِ إِلَى قَيْنَتِهِ))[1] أخرجه أحمد (٦/١٩و٢٠)، وابن ماجة (١٣٤٠)، من حديث فضالة بن عبيد ﷺ مرفوعاً، وفي إسناده ميسرة مولى فضالة وهو مجهول، واتـه: ((دلنيا بن خواى گەورە زۆر زۆر بە جۆشترو گوێبیسترە بۆ پیاوەی کە بە دەنگی بەرزی خۆش قورئان دەخوێنێت لەخاوەن کەنیزەکێکی گۆرانی بێژ بۆ گوێبست بوونی لە گۆرانی کەنیزەکەکەی)).

---

(١)_ من حديث أبي هُريرة ﷺ قال: ((ما أَذِنَ الله لشيء ما أَذِنَ لنبي حسن الصوت، يتغنى بالقرآن يجهر به)).

وشەی (أُذُن) لە زمانی عەرەبیدا بۆ (السماع) واتە: بیستن بەکار دێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ﴾[التوبة: ٦١] واتە: وە لەو ناپاکانە کەسانێك هەیە کە ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدەن و دەڵێن ئەو خۆش باوەڕو گوێگرە بۆ هەموو شت. خوای گەورە حەز بەوە دەکات بەندەکەی قورئان بەدەنگی خۆشی بەرز بخوێنێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ليسَ منا مَن لم يتغنّ بالقرآنِ)) رواه البخاري، واتە: ((هەر کەس بە دەنگی خۆش قورئان نەخوێنێت لە ئێمە نییە))، مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بە وشەی (يتغنى) قورئان خوێندنە بە دەنگی خۆش، مەبەستی ئەوە نییە وەکو گۆرانی قورئان بخوێنێت، نەخێر، وشەی (يتغنى) واتە: بە دەنگی خۆش قورئان بخوێنێت، فەرمایشت خوای گەورە دەخوێنێت، قسەی مرۆڤێك ناخوێنێتەوە، بۆیە پێویستە بە چاکترین شێوە خۆی بۆ خوێندنی ئامادە بکات.

له فەرمایشتێکی تردا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیبن و مەسعوود: ((اقْرَأْ عليَّ القرآن))، فقال: أأقرأ عليك وعليك أُنزل ؟ قال: ((إنِّي أُحِبُّ أنْ أسْمَعَهُ مِنْ غيْرِي)) قال: فقرأت عليه سورة النساء حتى انتهيت إلى هذه الآية: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾[النساء: ٤١]، قال: ((حَسْبُكَ))، فإذا عيناه تذرفان من البكاء[1] صحيح: أخرجه البخاري (٥٠٥٠)، ومسلم (٨٠٠) من حديث ابن مسعود ﷺ مرفوعاً.

واتە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیبن ومەسعودی فەرموو: ((قورئانم بۆ بخوێنە))، ئیبن و مەسعودیش پێی گووت: ئایا بۆ تۆی بخوێنمەوە لە کاتێکدا بۆ تۆ دابەزیووە؟ فەرمووی: ((بە ڕاستی من حەزدەکەم لە غەیری خۆمەوە بیبیستم))، ئیبن ومەسعود دەڵێت: منیش سورەتی (النساء)م بۆ خوێندەوە تا گەشتمە ئەم ئایەتە: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾ واتە: ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك هێنامان لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێك (کە پێغەمبەرەکەیانە) تۆشمان هێنا (ئەی موحەممەد ﷺ) بەشایەت بەسەر ئا ئەوانەوە. فەرمووی: ((بوەستە)). تەماشام کرد لە گریاندا چاوەکانی فرمێسك دەڕێژن.

---

(١)_ لەو هاوەڵانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێگرتن و، بە گوێ گرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزیان لێنرا، ئیبنومەسعود بوو ﷺ، زۆر بە تەواوی و ڕێکوپێکی و جوانی قورئانی دەخوێند، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکرد قورئانی بۆ بخوێنێت، ئەویش گوتی: ئایا بۆ تۆی بخوێنم لە کاتێکدا بۆ تۆ دابەزێنراوە، ئەویش فەرمووی: ((حەزم دەکەم لە کەسانی غەیری خۆمەوە بیبیستم))، ئەمە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و خێری بیستنی قورئان، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا﴾ [الاعراف: ٢٠٤] واتە: وە کاتێك کە قورئان خوێندرا دەبێ گوێی لێبگرن و بێدەنگیش بن. ئەمە بەڵگەیە بۆ فەزڵ و خێری گوێگرتن لە قورئان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵانی لە قورئان چێژیان وەردەگرت، نەك لە گۆرانی و دەف لێدان و شمشاڵ لێدان، بەڵکو لە قورئان و زیکری خوای گەورە چێژیان وەردەگرت.

هاوشێوەی ئەو گوێگرتنانەش گوێگرتنی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان بوو، وەکو خوای گەورە لە قورئاندا باسی دەکات و، دەفەرموێت: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ مِن ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْرَائِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَنِ خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾[1] [مريم: ٥٨] واتە: ئەوانە(ی کە باسکران) کەسانێکن کە خوا نیعمەت و چاکی خۆی ڕشت بەسەریاندا لەو پێغەمبەرانەی کە لە نەوەی ئادەمن (وەك ئیدریس) وە لە (نەوەی) ئەوانەش (کە لە کەشتیەکەیدا) لەگەڵ نوح دا هەڵمانگرتن (وەك ئیبراهیم) وە لە نەوەی ئیبراهیم و یەعقوب (وەك ئیسماعیل و یوسف) وە ئەوانەی هیدایەتمان داون و هەڵمانبژاردن ئا ئەوانە هەر کاتێ ئایەتەکانی خوای بە بەزەییان بۆ بخوێنرێتەوە دەستبەجێ دەکەون بە ڕوودا بەسووژدەو گریانەوە.

---

(١)_ خوای گەورە لە سورەتی مەریەمدا باسی پێغەمبەران دەکات و، دەفەرموێت: ﴿إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَنِ﴾ ئا ئەوانە هەر کاتێ ئایەتەکانی خوای بەبەزەییان بۆ بخوێنرێتەوە، وەك تەورات و ئینجیل و قورئان و زەبور ﴿خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ دەست بەجێ دەکەون بە ڕوودا بە سووژدەو گریانەوە، لە کاتی بیستنیدا هەستیان دەجولێت و بۆ خوای گەورە سوژدە دەبەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ آمِنُواْ بِهِ أَوْ لاَ تُؤْمِنُواْ إِنَّ الَّذِينَ أُوتُواْ الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّداً (١٠٧) وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولاً (١٠٨) وَيَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعاً (١٠٩)﴾ [الإسراء: ١٠٧_١٠٩] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) پێیان بڵێ باوەڕبێنن بەم (قورئانە) یان باوەڕی پێ نەهێنن بە ڕاستی ئەوانەی کە زانیارییان پێبەخشراوە لە پێش ئەم (قورئانە)دا کاتێ (قورئان) بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بەچەسپانی دەکەون بە ڕودا بە سوژدە بردن وە دەڵێن پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارمان بە ڕاستی هەمیشە بەڵێنی پەروەردگارمان بە دێت وە دەکەون بەسەر ڕووداو دەگرین و(قورئان) هەمیشە ملکەچییان بۆ زیاد دەکات. ئەهلی کیتاب ئەگەر گوێبیستی قورئان بن سوژدە دەبەن. مەبەست بە ئەهلی کیتاب: باوەڕدارەکانیانە وەکو نەجاشی و غەیری ئەو.

وه له بارەی ئەهلی زانست و مەعریفەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَمِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾[المائدة: ٨٣] واتە: هەر کاتێ گوێیان لێبووایە ئەو قورئانەی کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەبینی چاوەکانیان لە فرمێسك (پڕ دەبێ و) دەڕژێت لەبەر ئەو ڕاستییەی کە زانیویانە (و بۆیان دەرکەوتووە) دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا دەتۆش لەگەڵ شایەت دەران ناومان بنووسە.

وه خوای گەورە ستایشی ئەهلی ئەم بیستن و گوێگرتنانەی کردووە _ کە ئیمان زیادی و، تەزووی پێست و، فرمێسکی چاویان بۆ دروست دەکات _ و دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ﴾[1] [الزمر: ٢٣] واتە: خوا جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە قورئانێکە (کە ئایەتەکانی) لە یەکچووی دووپات کراوەن ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پیادێ (بەبیستنی قورئان) پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بە یادی (قورئانی) خودا.

---

(١)_ ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا﴾ خوا جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە کە قورئانێکە ئایەتەکانی لە یەکچوون، بە هەر هەموو قورئان دەگوترێت (مُتشابه): واتە لەچاکیدا هێندێکی لەهێندێکی تری دەچێت، هەروەها بەهەر هەمووشی دەگوترێت (مُحْكَم): واتە بەباشی و پووختی و بتەوی دارێژراوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ﴾[هود: ١] واتە: ئەمە کتێبێکە ئایەتەکانی بتەو دارێژراوە. هەروەها دەگوترێت: هێندێکی (مُحْكَم)ە و هێندێکی تریشی (مُتشابه)ە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ﴾[آل عمران: ٧] واتە: هێندێکی ئایاتی

---------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------

(كە مەبەستەكانيان) ڕۆشنن ئەو ئايەتانە بنـەڕەتى قورئـانن وە ئـەوانيتر (ئايـەتانێكن كە مەبەستەكانيان) ڕۆشن نين. واتە: تەزوو بە پێستى مـرۆڤ دادەهێنـێ، ئايەتـەكانى دووپاتكراوەتەوە، هەواڵەكانى و چيرۆكەكانى، بۆ ئـەوەى كاريگـەرى لەسـەر خوێنـەرو بيسـەر دروست بكـات، تەماشـا دەكـەن ئامۆژگـارى و، هەواڵـەكانى قورئـان دووبـارە بۆتەوە، ئەمە بە (مَّثَانِيَ) ناو دەبرێت، كە دڵەكان نەرم دەكات، بۆ زيكرو يـادى خـواى گـەورە كـە دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاته زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾[الأنفـال: ٢] واتــە: كاتێكيش ئايەتەكانى خوا بخوێنرێتەوە بەسەرياندا بڕوايان زياد دەبێت.

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٢) الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (٣) أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ (٤)﴾[1] [الأنفال: ٢_٤] **واتە: بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کە کاتێك کە باسی خوا کراو ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و ترسی لێدەنشێت کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەبێت وە هەر پشت بەپەروەردگاری خۆیان دەبەستن ئەوانەن کە بە ڕاستی نوێژەکانیان بەجێدەهێنن وە لەو رسق و ڕۆزیەی پێمان داوون (لە پێناوی خوادا) دەیبەخشن هەر ئەوانەن بڕوادارانی ڕاستەقینە پلەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و لێخۆشبوونی (تاوانەکانیان) و ڕۆزی پەسەندو چاك (یان بۆ هەیە).**

---

(١)_ شاهێد لەهەموو ئەم ئایەتانە ئەوەیە کە گوێگرتنی ئیمانداران بۆ قورئانە نەك گۆرانی و مۆسیقای صۆفیەکان و کافران و هاوەڵپەرستان، ئەمانە گوێبیستی گۆرانی و دەف و شمشاڵ دەبن، بەڵام ئیمانداران ئەو گوێگرتنەی کە چێژی لێوەردەگرن، تەزوو بەپێستیاندا دێنێت بریتیە لە قورئانی پیرۆز، لە نێوان ئەوەو ئەمەدا جیاوازی هەیە، بۆیە دەبینیت کەسی گیرۆدە ئەگەر قورئانی بیست ڕادیۆکە دەکوژێنێتەوە، بەڵام ئەگەر گۆرانی بیست دڵخۆش دەبێت، کەچی خولەکێك یان دوو خولەك لەسەر بیستنی قورئان ئارام ناگرێت، بەڵام هەموو شەو و ڕۆژەکەی لەگەڵ گۆرانی و شمشاڵدایە، تەنانەت کەسانێك ئیشوکارەکەی بەجێدێڵێت تەنها بۆ بیستنی گۆرانی فلان ئافرەت کە لە فلان بەرنامەدا پێشکەش دەکرێت، دەچێت و ئامادەی بیستنی دەبێت بۆ ئەوەی لە دەستی نەچێت، چونکە دڵی پێوە پێوەندبووە.

ئالەتی بیستنە داهێنراوەکان: وەکو بیستنی (الکف و الدف والقضیب)، هاوەڵانی باڕێزو، شوێنکەوتوانیان بەچاکەو، پێشەوا گەورەکانی ئایین ئەمانەیان نەدەکردە ڕێگەیەك بۆ نزیك بوونەوەیان لە خوای گەورە[١]، بە هۆکارێکی نزیك بونەوەو تاعەت و گوێڕایەڵیشیان دانە دەنا[٢]، بەڵکو بەبیدعەیەکی زەم کراویان دادەنا، تا ئەو ئاستەی ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: ((لە بەغدا شتێك هەبوو زەندیق و ڕواڵەتی موسڵمانەکان دایان هێنابوو بە (التغبیر) یان ناو دەبرد، کردبویانە هۆکارێك بۆ دورخستنەوەی خەڵك لە قورئان))[٣].

وە دۆستە زاناکانی خوای گەورە ئەوە دەزانن و[٤]، تێگەیشتوون کە شەیتان بەشێکی باشی لەو ئالەتانەدا هەیە[٥]، هەندێ لەو کەسە چاکانەی کە بەشدار دەبوون تۆبەیان لێکرد.

---

(١)_ گۆرانی و، شمشاڵ لێدان ناکەن بەڕێگەیەك بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورە، گۆرانی و شمشاڵ لێدان دوو ڕووی و، ئارەزو و، عیشق لە دڵدا دەڕوێنێت، بە پێچەوانەی قورئان کە ترس و بیم دەخاتە دڵانەوە، ئومێد بۆ مرۆڤ دروست دەکات بۆ گەیشتن بەوەی لای خوای گەورەیە.

(٢)_ بەڵام صۆفیەکان گۆرانی و دەف بە تاعەت و گوێڕایەڵی دادەنێن، بۆیە دەیهێنن بۆ مزگەوتەکان، لە مزگەوتەکاندا ئەنجامی دەدەن لە جیاتی قورئان خوێندن.

(٣)_ (التغبیر): بریتیە لە گۆرانی و شمشاڵ لێدان، ئیمامی شافیعی دەڵێت: لە بەغداد دایان هێنا بوو، بەلای پێشینی چاك و ئەهلی زانستەوە نەناسراو بوو.

(٤)_ جیاوازی نێوان گوێ گرتنی ئیمانداران و گوێ گرتنی دوو ڕووان و کافرانیان چاك دەزانی.

(٥)_ بیستنی دوو ڕووان و کافران و فاسیقان لە شەیتانەوەیە، شەیتان بۆیانی دەڕازێنێتەوە، شەیتان ئامادەی دەبێت، شەیتان هانیان دەدات.

وە هەر کەس لە زانست و لە کەماڵ و تەواوێتی دۆستایەتی خوای گەورەوە دوور تر بێت، ئەوا بەشی شەیتان لەودا زۆرتر دەبێت، گۆرانی لە ئاستی مەی و ئارەقدایە، کاریگەریەك لە دەروون دروست لە نەفسەکان دەکات کە زۆر لە کاریگەری مەی و ئارەق گەورەترە، بۆیە هەر کات مەست بوونی ئەهلەکەی بەهێز بوو شەیتانەکانیان بەسەردا دادەبەزێت، لەسەر زمانی هێندێکیان قسە دەکات، هێندێکیان بە هەوا دا هەڵدەگرێت[1]، لەوانەشە لە نێوانیاندا دوژمنایەتی ڕوو بدات، وەکو ئەوەی لە نێوان کەسانی مەی و ئارەق خۆردا ڕوودات[2]، شەیتانی یەکێکیشیان لەشەیتانی ئەویتر بەهێزتر دەبێت ئیتر دەیکوژێت .

---

(١)_ پێشتر ئامازەمان پێدا کە ئەگەر جۆش و خرۆشیان زۆر بوو بە هەوادا دەفڕن، ئەگەر لە گۆرانی و دەف لێداندا جۆش و خرۆشیان زیاد بوو بە هەوادا دەفڕن، چونکە شەیتان بە هەوادا هەڵیان دەگرێت، لە نێوان خەڵکی ئامادە بووی ئاهەنگەکەوە دەفڕن، ئەوانیش دەڵێن: ئەمە کەرامەتە، لە کاتێکدا ئەوە کاری شەیتانە.

(٢)_ لە نێوان عاشقاندا دوژمنایەتی و حەسوودی و ڕەشکێتی ڕوو دەدات، هەر وەکو ئەوەی لە نێوان مەی خۆراندا ڕوو دەدات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾[المائدة: ٩٠] واتە: بێگومان شەیتان هەر ئەوەی ئەوێ کە دوژمنایەتی و کینەو ڕق بخاتە ناوتانەوە بە هۆی ئارەق و قومارەوە وە بەرگریتان بکات لە یاد و باسی خواو لە نوێژکردن دەی ئایا ئێوە وازدەهێنن (لەو خراپانە).

ئەوامانیش وا دەزانن بەڕاستی ئەمە لە كەرامەتی دۆستانی تەقواكاری خوای گەورەیە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە تەنها خاوەنەكەی لە خوای گەورە دوردەخاتەوەو، دەیخاتە لە باروحاڵێكی شەیتانی، چونكە كوشتنی موسڵمان حەڵاڵ نییە مەگەر بەوەی كە خوای گەورە حەڵاڵی كردووە، باشە چۆن كوشتنی نەفسێكی پارێزراو لەو كاتەدا دەبێت كە خوای گەورە بەهۆیەوە ڕێزو كەرامەت بە ئەولیاو دۆستانی خۆی دەبەخشێت ؟!(١).

---

(١)_ خوای گەورە كوشتنی موسڵمانی حەرام كردووە بەتوندی، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُّتَعَمِّداً فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً﴾[النساء: ٩٣] واتە: وە هەر كەسێك ئیماندارێك بە دەستی ئەنقەس بكوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو كەسە دۆزەخە بە هەمیشەیی تیایدا دەبێت و خوا خەشمی لێگرتووە و نەفرینی لێكردووەو سزایەكی گەورەی بۆ ئامادە كردووە.
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا يَحِلُّ دَمُ امْرِىءٍ مُسْلِمٍ إلاَّ بِإحْدَى ثَلاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ المُفَارِقُ للجماعة)) واتە: (( ڕشتنی خوێنی هیچ كەسێكی موسڵمان حەڵاڵ نییە مەگەر بە یەكێك لەم سیانە: پیاوی خاوەن هاوسەر و ژنی مێردكردوو كە زینا بكەن، گیان بەگیان واتە: كەسێ كەسێكی تر بە ناهەق بكوژێت لە تۆڵەیدا دەكوژرێتەوە، كەسێك لە ئایینی خۆی پاشگەز بێتەوەو لە كۆمەڵی موسڵمانان جیا بێتەوە)). ئەم سیانە ڕێ دەدات بە موسڵمان بكوژرێت، پیاوی خاوەن هاوسەر ژنی مێرد كردوو ئەگەر زینا بكەن دەكوژرێن، ئەگەر كەسێك بە ناهەق كەسێكی تر بكوژێت ئەوا لە جیاتیدا دەكوژرێتەوە، هەر كەسێكیش لە ئایینەكەی خۆی پاشگەز بێتەوە دەكوژرێت، لەگەڵ مانەوەی بنەڕەتەكەدا كە موسڵمان پارێزراوە، مانای پارێزراو چییە؟ واتە: ڕشتنی خوێنی حەرامە، بۆیە نابێ دەست

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

درێژی بکرێته سەر، کەچی کەسانێك بە هۆی شەیتانەکانەوە کەسانێکی تر دەکوژن، هێندێ کەسی نەفامیش وا دەزانن ئەمە کەرامەتی ئەولیای خوای گەورەیە لە کاتێکدا ئەوە یەکێکە لەو شتانەی کە بە توندی حەرام کراوە، ئایا شیاوە کەرامەت لە کارە حەرام کراوەکان و سەرپێچیەکاندا بێت، لە ڕاستیدا کەرامەت تەنها بە هۆی تاعەت و گوێڕایەڵی خوای گەورەو، ڕاستڕەوی و، خۆ دورخستنەوە لە حەرام کراوەکان بەدی دێت. شیاو نییە خوێنی کەسێك بڕێژرێت کە خوای گەورە کوشتنی حەرام کردووە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾[الإسراء: ٣٣] واتە: وە کەسێك مەکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی حەرام کردووە مەگەر بە(هۆیەکی) ڕاست و ڕەوا. ئەو هۆیانەش کە ڕاست و ڕەوایەتی بە کوشتنی موسڵمان دەدەن ئەوانەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەکەی سەرەوەدا باسی کردووە، ئەوانەن کە ڕاست و ڕەوایەتی بە کوشتنی موسڵمان دەدات، بەڵام جگە لەوانە بنەڕەت ئەوەیە کە خوێنی موسڵمان پارێزراوە.

...راستیدا ئیستیقامەو راستڕەوی بەرزترین کەرامەتە[1]، خوای گەورە ڕێزو کەرامەت ...بەندەیەک نابەخشێت بەهاوشێوەی ئەوەی کە یارمەتی بدات بۆ بەجێهێنانی ...کردەوانەی کە خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە، ڕێنوونی زیاتریشی دەکات بۆ ...کردن بەوانەی کە لە خوای گەورە نزیکی دەکەنەوە، پلەکانی پێ بەرز ...دەکاتەوە[2].

---

(۱)_ لە ڕاستیدا بەرزترین کەرامەت بریتیە لەوەی کە خوای گەورە ئیستیقامەو ...ڕاستڕەوی لەسەر هەق و ئاین بەدۆستانی خۆی ببەخشێت، چونکە کەرامات ...بەدەرچوون لەئاین و کوفر و سەرپێچیکردن و ئەنجامدانی حەرام کراوەکان بەدی ...نایەت، کەرامەت بەوانە بەدی نایەت، وە ئەگەر بەهۆی ئەو شتانەوە کردەوە گەلێکی ...نامابی ڕوو بدات ئەوە شەیتا نییە و کەرامەت نییە.

(۲)_ نیشانەی ڕێزگرتنی خوای گەورە لە بەندەکەی بریتیە لەوەی یارمەتی بدات بۆ ئەنجامدانی ئەو کردەوانەی کە خۆشی دەوێت و، پێی ڕازییە، وەکو گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی، ئیستیقامەو ڕاستڕەوی لەسەر ئاین و هەق، بە حەقیقەت ئەمە گەورەترینی ئەو شتانەیە کە خوای گەورە بە هۆیەوە ڕێز لەبەندەکەی دەنێت، بە ڕاستی ئەمانە لەسەرەوەت و سامان و بەرێزی و شەرافەت و هەموو خۆشیەکانی دونیا گەورەترن، دڵنیا بن ئەگەر خوای گەورە نیعمەتی ئاین و ئیمان بەبەندەیەکی خۆی ببەخشێت ئەوە بە ڕاستی و بە دڵنیاییەوە ئەوپەڕی ڕێزو کەرامەتی پێبەخشیوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[الحجرات: ۱۳] واتە: ...بەڕێزترینتان لای خوا پارێزگار ترینتانە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَاللَّهُ ...الدُّنیا مَنْ یُحِبُّ وَمَنْ لا یُحِبُّ، وَلا یُؤْتِي الدِّینَ إِلا مَنْ یُحِبُّ)) واتە: ((خوای گەورە دونیا ...بەهەموو کەسێک دەبەخشێت ئەوانەی خۆشی دەوێن و ئەوانەش کە خۆشی ناوێن،

---

---

---

بەلام ئایین بە هیچ کەس نابەخشێت مەگەر ئەوانەی کە خۆشی دەوێن))، بە ڕاستی ئەمەیە بەرزترین ڕێزو کەرامەت، ڕێزی خوای گەورە لە بەندەکەی بریتی نییە لەوەی ماڵ و سامان و کوڕو ڕێز و شەرافەتی دونیایی پێبەخشێت، بەڵکو ئەگەر ئایینی پێبەخشی ئەو پەڕی ڕێزی لێناوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ(١٥) وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ(١٦)﴾ [الفجر: ١٥ـ١٦] واتە: جا کاتێك کە خوا ئادەمی تاقیکردەوە و ڕێزی گرت و نازو نیعمەتی بە سەردا ڕشت ئەوە دەڵێ پەروەردگارم ڕێزی گرتووم وە ئەگەر تاقی کردەوەو ڕۆزی کەم پێدا ئەوسا دەڵێ پەروەردگارم ریسوای کردووم. نەخێر، ڕێزگرتن و کەرامەت و ریسواکردن بەشتە دونیاییەکان نییە، بەڵکو ڕێزو کەرامەت و ریسوا کردن بەشتەکانی ڕۆژی دوایی و کردەوەی چاك و تەقوای خوای گەورەیە.

چونکه کردەوە نا ئاساییە لە سروشت بەدەرەکان هێندێکیان لە ڕەگەزی زانستن وەکو موکاشەفات[1]، هەشیانە لە ڕەگەزی هێزو دەسەلات (القدرة والملك)ە، وەکو تەصەڕوفاتە نائاساییە لە سروشت بەدەرەکان،

---

(١)_ هێندێك لە کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرەکان لە ڕەگەزی زانستن وەکو موکاشەفات و فیڕاسە _ پێشبینی و لێزانی لە ناواخنی کارەکاندا _ کە خوای گەورە بە هێندێك لە بەندەکانی خۆی دەبەخشێت، ئەمە جۆرێکە لە زانست کە خوای گەورە بە بەندەی دەدات، ئیتر هێزی پێشبینی و هەڵهێنجان و بۆدەرکەوتن و بۆساخ بونەوەی دەبێت، ئەمەش ڕێزو کەرامەتی خوای گەورەیە کە بە هێندێك لە بەندەکانی خۆی دەبەخشێت، جۆرێکە لە زانست، بەڵام ئەم زانستە بە فێر بوون دەستگیر نابێت، بەڵکو شتێکە خوای گەورە بە هێندێك لە بەندەکانی خۆی دەدات، لەبەر ئەو گوێڕایەڵیەی کە بۆ خواو پێغەمبەری خوا و، ناسینی خوای گەورە هەیەتی، ئیتر خوای گەورەش هێزی جیاکەرەوەیان پێدەبەخشێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إَن تَتَّقُواْ اللّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَاناً﴾ [الأنفال: ٢٩] واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە خواناس بن و خۆتان بپارێزن هۆی جیاکەرەوە(ی ڕاست و ناڕاست)تان بۆ فەراهام دێنێت. هێزی جیا کەرەوەیان پێ دەبەخشێت، کە ئیتر توانای جیاکردنەوەی هەق و باتڵ، زیانبەخش و سوود بەخش، ڕێنموونی و گومڕایی، کوفرو ئیمانیان دەبێت، بە ڕاستی ئەمە گەورەترین جۆرەکانی زانستە، ئەو هێزە جیاکەرەوەیەی کە خوای گەورە دەیخاتە دڵی ئیماندارەوە بەهۆی تەقواکارییەکەی خۆیەوە لە گەورەترین بەخششەکانی خوای گەورەیە.

وە هەشیانە لە ڕەگەزی دەوڵەمەندێتییە، لەڕەگەزی ئەوەی بە ڕواڵەت بە خەڵك دەدرێت وەکو زانست و دەسەلات و سامان و دەوڵەمەندی[1].

وە تێکڕایی ئەم شتانەو غەیری ئەمانەش کە خوای گەورە بە بەندەکەی خۆی دەبەخشێت، ئەگەر بەندە لەو بوارانەدا بەکاری بێنێت کە خوای گەورە خۆشی دەوێت و پێی ڕازییەو، لێی نزیکی دەکاتەوەو، پلەکانی بەرزدەکاتەوەو، خواو پێغەمبەرەکەی فەرمانی ئەنجام دانی پێ دەدەن، ئەوا شکۆ و، پایە بەرزی و، نزیك بونەوەی لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە زیاتر دەبێت و[2]، پلەکەشی بەرز دەبێتەوە.

---

(١)_ لە کردەوە نائاساییەکان دەوڵەمەند کردنە، خوای گەورە ئەمەندە زانست و بار و حاڵ و توانا بە بەندەکەی خۆی دەبەخشێت، کە ئیتر پێویستی بە هیچ کەسێك نابێت، ئەمەش جۆرێکە لە کردەوە نائاساییەکان.

(٢)_ ئەمەش دیسان لە جیاوازییەکانی نێوان کەرامەت و کردەوە نائاساییە شەیتانیەکانە، چونکە ئەو کەرامەتەی کە خوای گەورە لەسەر دەستی بەندە ئیماندارەکەی خۆی بەدیدێنێت، بەندە بەکاری دێنێت بۆ تاعەت و گوێڕایەڵییەکی زیاتری خوای گەورە، ئیتر ئیمان و باوەڕی بەخوای گەورە زیاتر دەبێت. بەڵام کردەوە نائاساییە شەیتانیەکان مرۆڤ زیاتر پاڵ دەنێت بەرەو کوفرو هاوەڵپەرستی و سەرپێچی کردن. کەرامەت یارمەتی بەندەی خوای گەورە دەدات بۆ تاعەت و گوێڕایەڵی و ئەنجام دانی کردەوە گەلێکی چاکی زیاتر، بەڵام کردەوە نائاساییە شەیتانیەکان مرۆڤ زیاتر پاڵ دەنێت بۆ کوفرو هاوەڵپەرستی و ئەنجام دانی کردەوەی خراپ و سەرپێچی. هەروەها کەرامەت بەندە والێ دەکات زیاتر ملکەچی خوای گەورە بێت، بەرامبەر بە خەڵك زیاتر خاکی بێت، ئەو کەسەی خوای گەورە کەرامەتی پێ دەبەخشێت لووت بەزی بەسەر خەڵکیدا نانوێنێت، لە خۆی بایی نابێت، بەڵکو زیاتر ملکەچی خوای گەورە دەبێت، لەگەڵ خەڵکیشدا زیاتر خاکی دەبێت، بە پێچەوانەی کردەوە نائاساییە شەیتانیەکانەوە کە مرۆڤ والێ دەکات زیاتر لووت بەرزی و زێدەڕۆیی و لە خۆ بایی بێت.

وە ئەگەر لەو بوارانەدا بەکاریهێنا ئەوە خوای گەورە [illegible]

کردووە، وەکو هاوەڵپەرستی و ستەم کردن و دەستدرێژی، خوای [illegible]

کردن و سزادان دەبێت، بۆیە ئەگەر خوای گەورە بە تۆبە [illegible]

کردەوە کەڵێکی تاوان لابەر لەبریان نەکەوێت، ئەوا وەکو [illegible]

دەبێت[1]، بۆیە بە ئاینی سزای ئەنجام دەرانی کردەوە نائاساییە لە سەرپێچی بەدەرەکان دەدات جار بە جار بەلێسەندنەوەی، وەکو ئەوەی پادشایەک لە موڵکەکەی لا دەبا، زانست لە زانا دەسێنێتەوە، جار بە جاریش کردەوە سەرپێچییەکان لە سەرپێچی دەسێنێتەوە، ئیتر لە وەلایەت و دۆستایەتی تایبەتەوە دەگوازرێتەوە بۆ وەلایەت و دۆستایەتی گشتی[1]،

---

(١)_ ئەگەر بەم کردەوە نائاساییە لە سەرپێچی بەدەرانە هەڵبخەڵەتێت و کردەوانێکی پێ ئەنجام بدات کە خوای گەورە تووڕە بکات، ئەوا تیا دەچێت، دەبێتە هۆکارێك بۆ تیاچوونی مەگەر خوای گەورە لێی خۆشبێت، ئەگەر تەوبە بکات و لەو خۆ بایبوون و هەڵەشەیی و بێ ئەقڵێتییە پەشیمان بێتەوە ئەوا خوای گەورە لێی دەبورێت و، ئەوەش دەبێتە نیعمەتێك بۆی، یاخود پێدەچێت کردەوانێکی چاکی هەبێت و خوای گەورە بیکاتە هۆکاری سڕینەوەی تاوان و سەرپێچییەکانی، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾[هود: ١١٤] واتە: چونکە بە ڕاستی (کردەوە) چاکەکان (کردەوە) خراپەکان لا دەبەن. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وأتبع السيئة الحسنة تمحها)) رواه الترمذي واتە: ((ئەگەر خراپەیەکت ئەنجام دا کردەوەیەکی چاکی بە دوا دا ئەنجام بدە دەیسڕێتەوە)).

(٢)_ تەماشای ئەمە بکە (لەدۆستایەتی تایبەتەوە دەگوازرێتەوە بۆ دۆستایەتی گشتی)، پێغەمبەری خوا ﷺ بەعەبدوڵلای کوڕی عومەری فەرموو: ((ئەی عەبدوڵلا وەکو فلان کەس مەبە کە شەو نوێژی دەکرد پاشان وازی لە شەو نوێژ کردن هێنا))

---

---

---

لەبەر ئەوەی وازی لە شەو نوێژ کردن هێنا لـە دۆستـایەتی تایبەتـەوە گوازرایـەوە بۆ دۆستایەتی گشتی، بەداخەوە هەست بـەم شـتە ناکـەین، لەوانەیـە مرۆڤـ سـزا بـدرێت بەوەی ئاسانکاری بۆ ناکرێت بۆ ئەوەی تاعەت و گوێڕایەڵیی ئەنجام بات، مـەرج نییـە سزادان بەوە بێت کە مرۆڤـ موسـیبەت و کارەسـاتێکی بـۆ دابـەزێت، یـان هێنـدێ لـە خۆشیەکانی ژیان لە دەست بات، لەوانەیە سزاداناکە بە لە دەستدانی کردەوەیـەك لـە کردەوەکانی شەرع بێت، وەکو ئەوەی چێژی ئیمان و ئـارام بـوونی دڵ و زیـاد بـوونی یەقین و ئەنجام دانی کـردەوە چـاکەکان لەدەسـت دەدات، ئەمـە شـتانێکە زۆر کـەس هەسـتی پـێ ناکـات، بڕوانـە: الشيخ الدكتور خالد المصلح، شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان. وەرگێڕ.

جار بە جاریش بۆ پلەی فاسیق و خراپە کار دادەبەزێت[1]، جار بەجاریش لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە[2].

ئەمەش لەو نێو ئەو کەسانەدا زۆرە کە کردەوەی نائاسایی شەیتانیان هەیە[3]، زۆرێك لەمانە لە ئایینی ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە.

---

(١)_ واتە بە گوێرەی ئەو حیکمەت و دانایییەی کە خوای گەورە دەویێ بۆ سزادانی ئەم مرۆڤە، لەوانەیە کەرامەتی لێسێنێتەوە، یان کەرامەتەکەی کەم دەکرێتەوە، یان لە کەسێکی گوێڕایەڵەوە دەگۆڕدێت بۆ کەسێکی فاسیق و لەڕێی ڕاست لادەر، ئیتر هەموو نیعمەتێك کە خوای گەورە بەمرۆڤی دەبەخشێت، ئەگەر لەتاعەت و گوێڕایەڵبوونی خوادا بەکارهێنراو، سوپاس گوزاری خوای گەورەی لەسەر کرا، خوای گەورە زیادی دەکات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾[إبراهيم: ٧] واتە: (بیریان بخەرەوە) کاتێ کە پەروەردگارتان ڕایگەیاند سوێند بێ بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی (چاکەی) من بکەن بۆتان زیاد دەکەم بەڵام بێگومان ئەگەر نا سوپاسی بکەن ئەوە بە ڕاستی سزای من زۆر بەتینە. بە ڕاستی کەرامەت نیعمەتێکە لە چاکترینی نیعمەتەکان و پێویستی بە سوپاس گوزارییە، ئەگەر سوپاسی خوای لەسەر نەکرێت تووشی نەمان و لابردن دەبێت.

(٢)_ ئەمە سەختترە جار بە جار لە ئایینی ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، دەبێ بە کافر، ئەمە مەترسیەکی گەورەیە، پێویستە موسڵمان لە خوا بترسێت و، سوپاس گوزاری خوای گەورە بکات لەو نیعمەتانەدا کە پێی بەخشیووە، پارێزگاری لێ بکات، بۆ ئەوەی نەبێ بەهۆی تیاچوونی.

(٣)_ واتە: لە مرۆڤێکی خاوەن کەرامەتەوە دەگۆڕدرێت بۆ مرۆڤێکی خاوەن کردەوەی نائاسایی شەیتانی و بەوەش لەئایینی ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، لە دۆستی خوای گەورەوە دەگۆڕدرێت بۆ دۆستی شەیتان، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو ئەوانەی کەرامەتێکیان پێدراوە ئاگاداری خۆیان بن و، هەڵنەخەڵەتێن و فریو نەخۆن، بەڵکو پێویستە وای دانێن کە ئەمە تاقیکردنەوەیەکە لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئەوان.

زۆرێکیش لەوانە نازانن ئەمە لە لایەن شەیتانەوەیە، بەڵکو وادەزانن لەکەراماتی ئەولیای خوای گەورەیە(١)، کەسانێکیشیان تێدایە وادەزانن ئەگەر خوای گەورە کردەوەیەکی نائاسایی دایە بەندەیەك لەسەر ئەوە هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەڵدا ناکات، نموونەی ئەم کەسە وەکو ئەو کەسەیە کە وا دەزانێت ئەگەر خوای گەورە موڵك و دەسەڵات و ماڵ و سامان و جۆرە تەصەڕوفێکی بە بەندەیەك بەخشی، لەسەر ئەوانە لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکات(٢).

---

(١)_ هێندێکیان وا دەزانن کردەوە نائاساییە شەیتانیەکان کەڕامەتێکی ئیلاهییە، چونکە نەفامن بە کەڕامەت، نازانن لەنێوان کەراماتی ئیلاهی و لەنێوان کردەوە نائاساییە شەیتانیەکاندا جیاوازی بکەن. هۆکاری کەڕامەت گوێڕایەڵی و تەقواکارییە، هۆکاری کردەوەی نائاسایی شەیتانیش کوفرو سەرپێچی و تاوانە، پێویستە موسڵمان بەو جۆرە لەنێوان هەردوکیاندا جیاوازی بکات.

(٢)_ ئەمە بە خۆوە نازین و خۆپەسەندێتیە، ئەو کەسەی وا دەزانێت خوای گەورە لەسەر نیعمەتەکان لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکات، لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر نیعمەتەکان موناقەشەی ناکات، وا دەزانیت ئەم نێعمەتانەی پێدراوە چونکە شایستەیەتی، وە دان بەوەدا نانێت کە ئەوانە نیعمەت و بەهرەگەلێکن و خوای گەورە پێی بەخشیون، دان بەوەدا نانێت کە لەسەر ئەوانە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت، با بزانێت لە بێ ئاگابونێکی گەورەدا دەژی، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾[ص: ٢٦] واتە: سزای سەختیان بۆ هەیە چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیرکرد. لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوە گشتییە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە بەبەندە دراوە.

كەسانێکیشیان تێدایە کردەوە نائاساییەکان لە کاروبارێکی موباح و ڕێ پێدراودا بەکار دێنێت کە نەفەرمانی پێکراوەو نەڕێگریشی لێکراوە، ئیتر ئەم کەسە یەکێك دەبێت لە ئەولیاو دۆستانی گشتی[1] کە بریتین لە (الأبرار المقتصدون)، بەڵام (السابقون المقربون) لەمانە پلە بەرزترن، وەکو چۆن بەندەو پێغەمبەر (العبد الرسول) لە پێغەمبەری پادشا (النبي الملك) پلە بەرزترە.

---

(١)_ لە ئەولیاو دۆستە تایبەتەکان نییە، کەسانێك کەرامەت لە کاروبارێکی ڕێ پێدراو و موباحدا بەکار دەهێنێت، موباح و ڕێ پێدراو نەپاداشتی لەسەرەو نەسزاشی لەسەرە، ئەم جۆرە کەسانە لە دۆستانی گشتییە، نەك تایبەت، پلەکەی دابەزێنراوە، ئەمە ئەگەر لە کاروباری ڕێ پێدراودا بەکاری هێنا پلەکەی دادەبەزێت، ئەی ئەگەر لە بواری حەرام دا بەکاری هێنا، یان لەشیرك و هاوەڵپەرستیدا، یان لە سەرپێچی دا بەکاری هێنا دەبێت چۆن بێت؟!!.

## لە گومان و دودڵیەکانی (وسوس)ی شەیتان

لەبەر ئەوەی کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرەکان بە ئەڵدی پلە و پایەی پیاوی پیّ کەم دەبێتەوە، بۆیە زۆرێك لە پیاو چاکان لە شتانێکی وەکو ئەوانە تەوبەیان دەکرد، وە ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوونیان لەخوای گەورە دەکرد[1]، وەکو چۆن لەتاوانێکی وەکو داوێن پیسی و دزین تەوبەیان دەکرد[2]، هەندێ جار کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر بەهێندێکیان دەدرا، لە خوای گەورەی داوا دەکرد کە لایبەرێت و نەمێنێت[3]،

---

(١)_ گومانی تێدا نییە کەرامەت پاداشتدانەوەیەکە لەسەر ئەو کردەوە چاکانەی کە مرۆڤێك ئەنجامی دەدات، پێدەچێت بەو هۆیەوە پاداشتەکەی لای خوای گەورە کەمبێتەوە، بۆیە کەسانی خاوەن ئیمان و باوەڕیی ڕاستگۆ لەو شتانە دەسڵمینەوەو ئاگاداری خۆیان دەبوون، نەوەکا ئەو شتانەیان لەسەر حیساب کرا بێت، بەو هۆیەوە لە پاداشتی کردەوەکانیان کەم بێتەوە، چونکە زۆر لە خوا ترس بوون، کەماڵ و تەواوی پاداشتیان دەویست، نەیاندەویست لە دونیادا شتێك لە پاداشتی خۆیان وەرگرن، کەماڵ و تەواوی پاداشتی خۆیان لە ڕۆژی دواییدا لای خوای گەورە دەویست، نەیاندەویست هیچ شتێك لە دونیادا بەرن.

(٢)_ ئەو پیاوانە لە کەرامەت تەوبەیان دەکردو، لێی دەترسان زیاتر لەوەی کە لە تاوان و سەپێچیەکان دەترسان، لە ڕاستیدا ئەمە لەفیقهزانی خۆیانەوە بوو، زانا بوون بەخوای گەورە.

(٣)_ نەیدەویست، چونکە دەیزانی لە پاداشتەکەی دادەبەزێنێت، ئیتر نەیدەویست، چونکە دەیەویست پاداشتەکەی بە تەواوی و کاملی لای خوای گەورە بمێنێت.

هەموو ئەو زاناو دۆستانەی خوا فەرمانیان دەدایە خوێندکارەکانیان هەبەلستیان ئەوەند بێ کردەوە لە سروشت بەدەرەکان بە دەست بێنن، نەیکەن بەویست و خواستی سەرەکی خۆیان، خۆیانی پێوە هەڵنەکێشن[1] با واش بزانن کەرامەتە، ئەی ئەگەر بە حەقیقەت لە لایەن شەیتانەکانەوە بێت و بیەوێت بەو هۆیەوە هەڵیانخەڵەتێنێت دەبێت چۆن بێت؟![2].

من (شێخولئیسلام) کەسی وا دەناسم ڕووەکەکان دەیەوێت سوودەکانی خۆیانیان پێدەڵێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە تەنها شەیتانە کە چۆتە نێو ئەو ڕووەکانەوە قسەی لەگەڵ دەکات[3]،

---

(١)_ زاناکان ڕێگریان لە خوێندکارو، شوێنکەوتوانیان دەکرد کە بە هیواوە سەیری کردەوە لە سروشت نەکەن، بۆ کەرامەت بە دەرەکان خۆزگە نەخوازن، لەبەر ئەو مەترسیانەی کە تیایدایە.

(٢)_ کەرامەت لە لایەن خوای گەورەوەیە لەگەڵ ئەوەشدا حەزیان لێ نەبوو، ئاگاداری خوێندکاران و شوێنکەوتوانی خۆیان دەکرد کە بە ئارەزووەوە تەماشای نەکەن، نەیکەن بەویست و خواستی سەرەکی خۆیان، زۆرێك لە ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە هەن هیچ کەرامەتێکیان لەسەر دەست نەهاتۆتە دی، وەکو هاوەڵان و تابعین، مەرج نییە دۆستی خوای گەورە کەرامەتی هەبێت وەکو ئەوەی لە خەیاڵی هەندێ نەفام دایە.

(٣)_ شەیتان بۆ ئەوەی فێڵ لە ئادەمیزاد بکات و، فریویان بدات لە نێو چەند دارو درەخت و ڕووەکێکەوە قسە بۆ مرۆڤ دەکات، ئیتر مرۆڤەکە وا دەزانێت خودی ڕووەکەکە یان درەختەکە قسەی لەگەڵدا کردووە، لە کاتێکدا ئەوە شەیتانە لە نێو ئەو درەختانەوە قسەی لەگەڵ دەکات.

کەسانێکی تریش دەناسم کە بەردو درەخت قسەی لەگەڵ دەکەن و، دەڵێن: نۆشی گیانت بێت ئەی دۆستی خوا، بەڵام کە (آیة الکرسي) دەخوێنێت ئەوە لا دەچێت و نامێنێت[١].

کەسی وایان تێدایە بەنیازە ڕاوی باڵندە بکات، چۆلەکەو باڵندەی تریش قسەی لەگەڵ دەکەن و، دەڵێن: بمبە بۆ ئەوەی هەژاران بم خۆن، بەڵام ئەوە شەیتانە کە چۆتە نێویانەوە وەکو چۆن دەچێتە نێو ئادەمیزادیشەوە، ئیتر بەو شێوە قسەی لەگەڵ دەکات، کەسی وایان تێدایە لەماڵەوە دەبێت لەو کاتە کە دەرگاکە داخراوە، پاش کەمێك خودی خۆی لە دەرەوە دەبینێت لە کاتێکدا دەرگای ماڵەکە هەر داخراوە، بە پێچەوانەشەوە[٢]،

---

(١)_ ئەگەر هەستی بەوە کرد، ئەو دەنگانەی بیست، پەنا دەباتە بەر خوای گەورە، (آیة الکرسي) دەخوێنێت کە شەیتانەکان ڕاودەنێت، لەو کەسە نزیك نابنەوە کە دەیخوێنێت، ئەگەر کەرامەت بوایە لانەدەچوو، بەڵام ئەوە داهێنانی شەیتانە، بۆیە ئەگەر (آیة الکرسي) بخوێنێت شەیتان هەڵدێت و شکست دێنێت، بۆیە (آیة الکرسي) قەڵای موسڵمانە، ئایەتەکانی قورئان قەڵای موسڵمانن، بەڵام (آیة الکرسي) بە تایبەت قەڵایەکە بۆ موسڵمان، خۆی پێ قەڵا بەند دەکات لە شەیتان.

(٢)_ شەیتان هەڵیدەگرێت وا دەزانرێت کەرامەتە، چۆتە دەرەوە بەبێ ئەوەی دەرگاکە کرا بێتەوە، ئیتر وادەزانرێت ئەم کەسە وەلیەو کارەکەشی کەرامەتە، لە کاتێکدا ئەوە لەشەیتانەوەیە، شەیتان هەڵیگرتوە، شەیتان توانای هەیەو دەچێتە نێو ماڵانەوە، پاشان دەچێتە دەرەوە لەکاتێکدا دەرگاکە داخراوە، ئەو سەرلێشێواوەش لەگەڵ خۆیدا دەباتە دەرەوە، ئیتر وا دەزانرێت کەرامەتی هەیە.

هەروەها لە دەروازەکانی شاریشدا کە هەر جنۆکە بووە بەخێرایی بردویانەتە ژوورەوەو دەریانهێناوە، وە نورو ڕوناکی گەلێکی پیشان دەدەن، یان کەسێکی بۆ دێنن کە داوای دەکات، بەڵام ئەوە لەشەیتانەکانەوەیە کە خۆیان بە وێنە و شێوەی کەسەکە دەگۆڕن[١]، بۆیە ئەگەر (آية الكرسي) جار لە دوای جار بخوێنێت هەر هەموو ئەوانە نامێنن[٢].

کەسی وا دەناسم (ئیبن و تەیمییە) یەکێك قسەی لەگەڵ دەکات و، پێی دەڵێت: بەفەرمانی خوا هاتووم، بەڵێنی دەداتێ کە ئەو (المهدي)یە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی دەرکەوتنی بە ئوممەتەکەی داوە[٣]،

---

(١)_ یان خۆیان بەشێوەی ڕووناکی پێکدێنن، ئیتر وا دەزانرێت ئەمە فریشتەیە، لە کاتێکدا ئەوە شەیتانەو خۆی بەو شێوازە گۆڕیوە بۆ فریودانی ئادەمیزاد، یان شەیتان کەسێکی وەکو کوڕ یا خزمێکی بۆ ئامادە دەکات کە لە شوێنێکی زۆر دوورەو ئەمیش تامەزرۆی بینینی دەکات، ئەو کەسەی بۆ هەڵدەگرێت و بۆی دەهێنێت، یان خۆی بە شێوەی ئەو کەسە دەگۆڕێت و لە بەردەمی دا ئامادە دەبێت، چونکە شەیتان توانای خۆ گۆڕینی هەیە بەشێوەی مرۆڤ یان ئاژەڵ یان باڵندە یان هەر شتێکی تر.

(٢)_ چونکە قەڵایەکە بەرامبەر بەشەیتان، بۆیە ئەگەر خوای گەورە یارمەتی داو هەستی بەو شتانە کرد، باوەڕی پێ نەکات، بەڵام دەترسێت لە لایەن شەیتانەکانەوە بێت، بۆیە یەکسەر بە(آية الكرسي) قەڵا بەندی خۆی دەکات، ئیتر شەیتانی لێ دوور دەکەوێتەوە.

(٣)_ ئەو (المهدي)ەی کە لە کۆتایی زەماندا دەردەکەوێت لەبنەماڵەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لەنەوەی حوسەینی کوڕی عەلییە رضي الله عنه، ئایین دەچەسپێنێت، لە پێناوی

---

---

---

خوادا تێدەکۆشێت، دادپەروەری لەسەر زەوی بڵاو دەکاتەوە، لە ئاییندەدا ئەمە ڕوو دەدات، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دەرکەوتنی پێداوین، بۆیە بە دڵنیایی دەردەکەوێت، دەرکەوتنی (المهدي) یەکێکە لەنیشانەکانی قیامەت، پێش دەرکەوتنی (الدّجال) ئەو (المهدي)ە دەردەکەوێت، یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی قیامەت. ئیتر شەیتان ئەوە دەقۆزێتەوە و، پێی دەڵێت: ئەو (المهدي)ەم کە پێغەمبەر مژدەی دەرکەوتنی بە خەڵك داوە، کەچی ئەوە شەیتانی سەرکەشی یاخی بووە. لەوانەیە بەخودی مرۆڤەکە بڵێت: تۆ (المهدي) ت، ئەم شتە بۆ کەسانێکی زۆر ڕووی داوە کە بانگەشەی (المهدي)ە تیان دەکرد، پاشتر ڕوون بویەوە کە درۆزنن و هیچی تر، ئەو شتانەش کە بۆیان بەدی دەهات تەنها لەلایەن شەیتانەوە بوو کە هەڵیخەڵەتاند بوون و فریوی دابوون.

وە چەندەها کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدریشی بۆ ئەنجام دەدات، وەکو ئەوەی بە دڵی ختورە دەکات کە باڵندە یان کوللە لە هەوادا، یان مەڕو ماڵات جۆرە تەصەڕوفێکی تایبەت بکەن، ئەگەر بە دڵی ختورەی کرد باڵندەکە یان کوولەکە بەلای ڕاست یان چەپدا بڕۆن، بەپێی خواستەکەی ئەو دەچن، ئەگەر بەدڵی ختورە بکات هەندێ مەڕ و ماڵات هەستن یان بخەون یان بچن، خواستەکەی بۆ بەدی دێت، بەبێ ئەوەی خۆی بەئاشکرا هیچ جووڵانەوەیەك بکات، وە هەڵیدەگرێت و دەیباتە مەککەو دەشیهێنێتەوە[1]، یان کەسانێکی شێوە جوانی بۆ دێنێت و، پێی دەڵێت: ئەمانە فریشتە کەڕوبیەکانن[2] دەیانەوێ دیدەنیت بکەن،

---

(١)_ شەیتانەکان بۆ مەککە هەڵی دەگرن، وا دەزانێت ئەوە کەرامەتێکی ئیلاهییەو بۆی هاتووە، لە کاتێکدا ئەوە کردەوەی شەیتانە، بە هەوادا هەڵی دەگرن نەپێویستی بە فڕۆکەیە نە بە ئۆتۆمبێلە نە بە هیچ شتێك، وا دەزانێت ئەوە کەرامەتێکی ئیلاهییە، لە حەقیقەتیشدا تەنها کاری شەیتانە، شەیتان فریوی دەدات، بۆیە پێویستە بەو جۆرە شتانە مرۆڤ هەڵ نەخەڵەتێت، فریوی پێ نەخوات، پێویستە هەوڵی ئەوە بدات کە لە شتەکان دڵنیا بێت، هەوڵی جیاکردنەوەی هەق و باتڵ بدات، چ ڕاستەو چ درۆیە لە ڕوانگەی قورئان و سووننەتەوە، لە ڕوانگەی بار وحاڵی خودی کەسەکەوە کە ئەو کردەوە نائاساییانەی لەسەر دەست بەدی دێت، لە ڕوانگەی هەڵسوکەوتیەوە، نابێ هەر کەسێك شتێك لەو کردەوە نائاساییانە ئەنجام بدات وا بزانیت مەهدییە یان عیسایە، چەندین کەسانی درۆزن و فێلباز بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە عیسای کوڕی مەریەمە.

(٢)_ فریشتە کەڕوبیەکان: بەرزترین و نزیکترین چینی فریشتەکانن لە خوای گەورەوە، لەو فریشتە کەڕوبیانە هەڵگرانی عەرشی خوای گەورەن، شەیتان ئادەمیزاد

-----------------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------

هەڵدەخەڵەتێنێت و، بەشێوازێکی جوانەوە دەچێتە لای و، پێی دەڵێت: من لە کەڕوبیەکانم، واتە: گوایە لە فریشتە نزیکەکانە، شەیتان کەمتەرخەمی ناکات لە گومڕا کردنی ئادەمیزاددا، هەموو فێڵ و هەموو ڕێگەکان بۆ ئەو مەبەستە بەکاردێنێت، شەیتان گوتویەتی: ﴿ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَائِلِهِمْ﴾[الأعراف: ١٧] واتە: ئینجا سوێندبێ بێگومان بۆیان دەچم لەپێشیانەوە و لە دوایانەوە وە لەلای ڕاستیان و لە لای چەپیانەوە. شەیتان لە هەموو لایەکەوە دەچێت بۆ فەوتاندنی ئادەمیزاد مەگەر خوای گەورە بەڕەحمەتی خۆی مرۆڤێکی پاراستبێتی، بە توندی دەستی بە سرووش و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواوە ﷺ گرتبێت.

پاشان لە دڵی خۆیەوە دەڵێت: چۆن بەشێوەی لاوانێکی لووسکەی بێتووك خۆیان گۆڕیوە؟! کە سەری بەرز دەکاتەوە بە ڕیشەوە دەیانبینێت[1]، وە پێی دەڵێت: نیشانەی ئەوەی کە تۆ خودی (المهدي) یت خاڵێکی ڕەش لە جەستەت دەڕوێت، ئیتر دەڕوێت و دەیبینێت و چەندەها شتی تریش، کەچی هەموو ئەوانە تەنها فێڵی شەیتانەو هیچی تر.

بە ڕاستی ئەمە بەشێکی گەورەیە، ئەگەر ئەو شتانەی دەیزانم باسی بکەم پێویستی بەکتێبێکی گەورە دەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا الإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ(١٥) وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ(١٦)﴾[2] [الفجر: ١٥_١٦]

---

(١)_ شەیتان بە چاو ترکاندنێك خۆی بەشێوەی لاوێکی لووسکەی بێتووك خۆی دەگۆڕێت، پاشان بە چاو ترکاندنێك خۆی بەشێوەیەکی دیکە دەگۆڕێت، هەموو ئەو شتانە بۆ هەڵخەڵەتاندن و فریودانی خەڵکە.

(٢)_ مرۆڤ دەوڵەمەندی و هەژاری دەکاتە پێوەرێك بۆ کەرامەت و ڕێز، ئەگەر خوای گەورە دەوڵەمەندی کرد وا دەزانێت ئەوەی پێبەخشراوە چونکە بە لای خوای گەورەوە ڕێزدارە، چونکە خوای گەورە ئەم ماڵ و سامانەی پێبەخشیوە، کەچی نازانێت ماڵ و سامان تەنها بۆ تاقی کردنەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾[التغابن: ١٥] واتە: بێگومان دارایی ومنداڵتان هەر هۆی تاقیکردنەوەتانن. بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە کە خوای گەورە ماڵ و دارایی و سامان بەهەموان دەبەخشێت ئەوانەی کە خۆشی دەوێن و ئەوانەش خۆشی ناوێن و، کافرن، ئەمەش دادپەروەرییە لەلایەن خوای گەورەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ))

----------------------------------------

----------------------------------------

----------------------------------------

واته: ((ئەگەر دونیا بەلای خوای گەورەوە بەئەندازەی باڵە مێشوولەیەك سەنگین بوایە هەرگیز قومێك ئاوی بەكافر نەدەدا))، كەچی ئەم مرۆڤە ماڵ و دارایی و سامانی كردۆتە پێوەرێك بۆ رێزو كەرامەت، هەژاریشی كردۆتە پێوەرێك بۆ سووكایەتی. تەماشاكەن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا مَا ابْتَلاهُ﴾ واتە ئەگەر خوای گەورە ئادەمیزادی تاقی كردەوە، ﴿فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ﴾ رێزی گرت و نازو نیعمەتی بەسەردا رشت ئەوە دەڵێ پەروەردگارم رێزی گرتووم، ﴿وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ﴾ وە ئەگەر تاقی كردەوەو رۆزی كەم پێدا، خوای گەورە ئادەمیزاد تاقیدەكاتەوە بەوەی ماڵ و سامانی كەم پێدەبەخشێت، ﴿فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ﴾ ئەوسا دەڵێ پەروەردگارم ریسوای كردووم، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَلاَّ﴾ [الفجر: ١٧] واتە نەخێر، ماڵ و دارایی و سامان پێوەر نییە بۆ رێزو كەرامەت، هەژارییش پێوەر نییە بۆ سووكایەتی، بەڵكو پێوەری راستەقینە تەقواكاری و لە خوا ترسانە، ئەنجام دانی كردەوەی چاكە، دڵنیا بن ئەو كەسەی تەقواكاری و كردەوەی چاكی پێدرابێت ئەو بەرزترین رێزو كەرامەتی بۆ دانراوە، وە هەر كەسێكیش تەقواكاری و كردەوەی چاكی نەبێت ئەوە بە تەواوی ریسواكراوە، ئا ئەمەیە پێوەری تەواوی راستەقینە، ماڵ و دارایی و سامان دێن و دەچن، پێوەرێكی تەواو نییە، ئەولیاو دۆستانی تایبەت هەژاربوون، پێغەمبەری خوا ﷺ بەردی لەسەر سكی دەبەست، چەندین رۆژی بەسەردا تێدەپەری و هیچ شتێكی نەبوو بیخوات، لەكاتێكدا سەروەری هەموو ئادەمیزاد بوو، بەڵام كافران و زۆرداران لەنازو نیعمەتدا دەژیان، خواردن و خواردنەوەی زۆریان هەبوو، ئەوە پێوەرێكی دروست نییە.

بێژەی ﴿كَلَّا﴾ش[1] بۆ قەدەغەکردن و ئاگادارکردنەوەیە، قەدغەی ئادەمیزاد دەکات لە قسەگەلێکی وەکو ئەمە، ئاگاداریش دەدا بۆ ئەو شتانەی دوای ئەوە رایدەگەیەنێت و فەرمانی پێدەکات، چونکە مەرجن نییە هەر کەسێك نیعمەت و بەهرەیەکی دونیایی پێبەخشرابێت بە کەرامەت و رێزێك دانرێت کە خوای گەورە بەو هۆیەوە رێزی لێنا بێت، مەرجیش نییە هەرکەسێك رۆزیەکی کەمی پێدرابێت بەو هۆیەوە ریسوا کرا بێت، بەڵکو خوای گەورە بەندەی خۆی بەخۆشی و ناخۆشی تاقی دەکاتەوە، لەوانەیە نیعمەت و بەهرە دونیاییەکان بە کەسێك بدات کە خۆشی ناوێت و بەرێزیش نییە بەلایەوە بۆ ئەوەی پلە بە پلە نزیکی بکاتەوە لە تیا چوون، پێدەچێت خوای گەورە هێندێ لەو بەندانەی خۆی کە خۆشی دەوێن و پشتگیرییان دەکات لەو نیعمەت و بەهرانە بپارێزت، نەوەکا پلەو رێزی بەلایەوە کەم بێتەوە، یان بەهۆی ئەو نیعمەت و بەهرانەوە بکەوێتە نێو شتانێکەوە کە حەز ناکات ئەنجامی بدات[2].

هەروەها کەرامەتی ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە هۆکارەکەی بۆ ئیمان و تەقواکاری دەگەڕێتەوە .

بۆیە ئەوەی هۆکارەکەی بۆ کوفرو، لەرێی راست لادان و، یاخی بوون دەگەڕێتەوە، بێگومان لەکردەوە نائاساییە لەسروشتبەدەرەکانی دوژمنانی خوایە نەك لە کەرامەتی ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە[3]،

---

(١)_ ﴿كَلَّا﴾ پیتی رێگەنەدان و قەدەغەکردنە، رێگەنەدانە بەم جۆرە قسانە، ئاگادارییش دەدات کە غەیری ئەم قسەیە راستە.

(٢)_ وەکو ئەوەی پزیشك نەخۆشەکەی لە هێندێ خواردن و خواردنەوە دەپارێزێت، نەوەکا زیانی پێگەیەنێت و بیکوژێت، بەو جۆرە خوای گەورەش بەندەکەی خۆی لەنیعمەت و بەهرەکانی دونیا دەپارێزێت، چونکە زیانی پێدەگەیەنن.

(٣)_ بەڵام کێن ئەوانەی بیر لەمە دەکەنەوەو لەمە وردەبنەوە، ئەوانەی بیر لەمە دەکاتەوە کەسانێکی کەمن.

کەوابوو هەرکەسێك کردەوە نائاسایییە لە سروشت بەدەرەکانی بە هۆی نوێژو، خوێندنی قورئان و، زیکرو، شەو نوێژو، نزاکردنەوە بۆی بەدیبەیەت، بەڵام لە کاتی شیرك و هاوەڵبەرستیدا بۆی بەدی بێت: وەکو داوا کردن لە مردووان یان نادیاران یان لە ڕێی ڕاست لادان و سەرپێچی کردن و خواردنی حەرام کراوەکانی بە نموونەی مارو زەردەواڵەو قالۆنچەو خوێن و شتە پیسەکانی دیکەی جگە لەمانە، بە هۆی گۆرانی و سەماکردنەوە بە تایبەت لەگەڵ ژنانی نامەحرەم و لاوانی لووسکەی بێتووکدا، وە باری کردەوە نائاسایییە لە سروشت بەدەرەکانی لە کاتی بیستنی قورئاندا کەم بکات و، بەهێز بێت لە کاتی بیستنی شمشاڵی شەیتاندا[1]،

---

(١)_ ئەمەش دیسان یەکێکە لە جیاکاریەکانی نێوان کەرامەت و کردەوەی نائاسایی شەیتانی، کەرامەت بە بیستنی قورئان زیاد دەبێت، کردەوەی نائاسایی شەیتانی بەبیستنی قورئان لا دەچێت، لەوانەیە کردەوەی نائاسایی شەیتانی بۆ کەسانی خراپەکارانیش لە مەجلیسەکانی ڕابواردن و گۆرانی و جۆش و خرۆشیدا بەدی بێت، پێدەچێ بە هەوادا بفڕن، ئەمە لە شەیتانەوەیە چونکە هاوتای کوفرو سەرپێچییە، لە حەقیقەتدا لە لایەن شەیتانەوە ئەنجام دەدرێت بۆ فریودانی ئەم جۆرە کەسانە، بەڵام ئەگەر کردەوە نائاساییەکان لەگەڵ تەقواکاری و ئیستیقامەو ڕاسترەویدا بەدی هات ئەوا کەرامەتەو، خوای گەورە دەیەوێت بەم جۆرە پشتگیری بەندەکەی بدات بۆ تاعەتی زیاتر.

دوور و شەوێکی درێژ سەما بکات و، ئەگەر کاتی نوێژ هات بەدانیشتنەوە نوێژەکەی بخوێنێت، نوێژەکەی بە خێرایی ئەنجام بدات وەکو چۆن کەڵەشێر بە دەنووکی دان هەڵدەچنێت[1]، حەزی بەبیستنی قورئان نییە خۆی لێ دور دەخاتەوە[2]،

---

(١)_ ئەمە باروحاڵی خراپەکارانە، سەما دەکات، هەموو شەو سەما دەکات، ئەگەر کاتی نوێژیش هات توانای هەڵسانی نابێت، بەدانیشتنەوە نوێژ دەکات، توانای ئەنجامدانی تاعەت و پەرستنەکانی نابێت، لە کاتێکدا هەموو شەوەکە سەمادەکات و نوێژەکان پشتگوێ دەخات، ئەمە نیشانەکانی کردەوە نائاساییە شەیتانییەکانە، چێژ لە نوێژ وەرناگرێت، حەزی بە ئەنجام دانی نییە، بەخێرایی ئەنجامی دەدات، لەکوڵ خۆی دەکاتەوە، چونکە هەس تدەکات بەند دەکات، نوێژ بۆ خراپەکاران بەندیخانەیە، دەیەوێت هەر چۆنێك بێت لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، بەڵام بۆ تەقواکاران نوێژ بەهەشتە، چونکە چێژی لێوەردەگرێت، تەقواکار ئەگەر بۆ کارێکی بچوك هەستێت ماندوو دەبێت بەڵام ئەگەر هەموو شەو شەو نوێژ بکات ماندوو نابێت، چونکە چێژی لێوەردەگرێت.

(٢)_ ئەمەش دیسان لە نیشانەکانە، حەزی بە بیستنی قورئان نییە، حەزی بە بیستنی شەیتانە، گۆرانی و شمشاڵ، بۆیە بە بەردەوامی ڕادیۆکە لەسەر گۆرانی دەکاتەوە، تەنانەت ئەگەر بەڕێگەیەکیشدا ڕێ بکات، ئەگەر ڕادیۆکە قورئان لێدات دەیکوژێنێتەوە، چێژی لێوەر ناگرێت، خۆشی ناوێت، بۆیە دەیکوژێنێتەوە، چونکە خۆشویستنی قورئان و خۆشویستنی موسیقاو گۆرانی لەیەك دڵدا کۆنابنەوە، وەکو پێشەوا ئیبنولقەییم باسی دەکات.

یان هەر چۆن بێت ئەنجامی دەدات و هیچ خۆشی و حەزو و ئارەزو و چێژێکی بۆی تێدا نەبێت لە کاتی وەجدو سۆزیدا، وە حەزی بەچەپڵەلێدان و فیکەکردن بێت و سۆزی لێوەرگرێت. ئەمانە باروحاڵگەلێکی شەیتانین، ئەو ئایەتەی خوای گەورە دەیانگرێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾[1]، [الزخرف: ٣٦].

---

(١)_ هەر کەسێك لە قورئان واز بێنێت تووشی گۆرانی و ئاواز دەبێت، تووشی بیستنی گۆرانی و ئاوازی دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾ وە هەر کەس پشت لە یادی خوا هەڵکات شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین کە هەمیشە لە گەڵی بێ و لێی جیا نەبێتەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ (٣٧) حَتَّىٰ إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ (٣٨)﴾[الزخرف: ٣٧_٣٨] واتە: وە بێگومان ئەوانە (شەیتانەکان) لە ڕێگەی ڕاست بەرگری یان دەکەن واش دەزانن بە بێگومان هەر ئەوانن ڕێنووین هەتا کاتێ کە (دەمرێ و) دێتەوە لامان، لە ڕۆژی قیامەتدا دێتەوە لامان بە شەیتان دەڵێ: خۆزگە نێوانی من و تۆ بە قەدەر نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوا بوایە، کاتێ تۆڵە دەبینێت پەشیمان دەبێتەوە، لەسەر کردەوەکانی پێشتری پەشیمان دەبێتەوە ئای چ هاوڕێ یەکی خراپ بوویت.

قورئان زیکرو یادی خوای گەورەیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى (١٢٤) قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا (١٢٥) قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى (١٢٦)﴾[1] [طه: ١٢٤_١٢٦] واتە: وە هەر کەسێ ڕوو وەرگێڕێ لە ڕێبازو یادی من ئەوە بێگومان ئەو کەسە گوزەرانێکی سەخت و تەنگی دەبێت (لە گۆڕدا) وە لەڕۆژی دواییشدا حەشری دەکەین بە کوێری دەڵێ ئەی پەروەردگارم بۆچی بەکوێری حەشرتکردم خۆ من (لە دونیادا) ساغ و بینابووم (خوا) دەفەرموێ هەر بەو شێوەی ئایەتەکانی ئێمەت بۆ هات و لەبیری خۆت بردەوە (و کوێر بوویت لە ئاستیدا) بەهەمان شێوە تۆش ئەمڕۆ گوێت پێنادرێ و لە بیر دەکرێی.

واتە: وازت لە کار پێکردنی هێنا، پێشەوا ئیبن وعەبباس ﵁ دەڵێت: (هەرکەسێك قورئان بخوێنێت و کار بە هەموو ئەوانە بکات کە تیایدایە ئەوا خوای گەورە زامنی ئەوەی بۆ دەکات کە نە لە دونیا گومڕا دەبێت و نە لە ڕۆژی دوایشدا تووشی نارەحەتی و زەحمەت دەبێت)). پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلا يَضِلُّ وَلا يَشْقَى﴾[طه: ١٢٣] واتە: ئەوسا ئەوەی شوێنی ڕێنموونی من بکەوێ ئەوە (لە قیامەتیشی دا) گومڕا نابێ و (لە ڕۆژی دوایشدا) تووشی ناخۆشی و زەحمەت نابێ.

---

(١)_ ﴿فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾ ئەوە بێگومان ئەو کەسە گوزەرانێکی سەخت و تەنگی دەبێت، ئەمە سزای گۆڕە، چونکە لەوانەیە لەدونیادا لەنازو نیعمەتدا بێت، تەنگانەی نەبێت، بەڵام ئەمە لەگۆڕدایە _ والله أعلم _ لە گۆڕدا لەسزادا دەبێت، ﴿وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى﴾ بەهەمان شێوە تۆش ئەمڕۆ گوێت پێنادرێ و لە بیر دەکرێی، پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە، کاتێ قورئانی پشتگوێ خست و وازی لێهێنا، خوای گەورەش وازی لێهێناو لە سزادا هێشتیەوە.

## بەشێك

## سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ تێکڕای ئادەمیزادو جنۆکە نێردراوە

پێویستە بزانرێت کە خوای گەورە موحەممەدی ﷺ وەکو پێغەمبەرێك بۆ تێکڕای ئادەمیزادو جنۆکە ناردووە، کەواتە: پێویستە لەسەر هەر مرۆڤ و جنۆکەیەك ئیمان بە موحەممەد ﷺ بێنێت و، شوێنی بکەوێت(1)، پێویستە بە ڕاستگۆی دابنێن و باوەڕی بێنن لەوانەدا کە هەواڵی پێداوەو، گوێڕایەڵیشی بن لەوانەدا کە فەرمانی پێداوە(2)،

---

(١)_ وەکو چۆن پەیامی پێغەمبەری خوا ﷺ گشتتیە بۆ هەر هەموو مرۆڤایەتی، هەر بەو جۆرە گشتیشە بۆ هەر هەموو جنۆکە، ئەو بۆ هەردوو جیهانی ئادامیزادو جنۆکە نێردراوە، پێویستە هەر هەموو جنۆکە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بن و، هیچ دانەیەکیان دوانەکەوێت، وەکو چۆن لەسەر هەموو مرۆڤایەتیشە گوێڕایەڵی بن، بۆیە کاتێ چەند دانەیەك لە جنۆکەکان گوێ بیستی قورئان بوون، پێیان خۆش بوو، گەڕانەوە بۆ لای قەومەکانی خۆیان و بۆ ئیسلام بانگیان کردن، ئەو قورئانەی کە بیستبویان بە قەومەکانی خۆیان ڕاگەیاند، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ﴾ [الأحقاف: ٣١] واتە: ئەی قەومەکەمان وەڵامی بانگخوازی خوا بدەنەوە و باوەڕی پێ بێنن. ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە قورئان بۆ جیهانی جنۆکەش هاتووە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوانیش نێردراوە.

(٢)_ پێویستە باوەڕ بەپێغەمبەری خوا ﷺ بکات لە هەر هەموو ئەو شتانەدا کە هەواڵی پێداوە، لەهەواڵی ڕابردوو وە هەواڵی ئاییندەش، ئەو غەیب و نهێنییە ڕابردوو و داهاتووانەی کە خوای گەورە بۆی ئاشکرا کردووە، موسڵمان لەم شتانەدا باوەڕ بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، مرۆڤ و جنۆکە، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبێت.

وه هەر كەسێك بەپەيامی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵگەی لەسەر دامەزرابێت و، ئیمانی پێنەهێنێت، ئەوە كافرە(١)، ئادەمیزاد بێت یاخود جنۆكە(٢).

وه موحەممەد ﷺ بۆ هەر دوو جیهانی ئادەمیزاد و جنۆكە نێردراوە بە ڕێككەوتنی هەموو موسڵمانان(٣)،

---

(١)_ هەر كەسێك لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە عەرەب و عەجەم، لە ئادەمیزادو جنۆكە ئەگەر بە ناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵگەی خوای گەورەی پێگەیشتبێت و، ئیمانی پێنەهێنێت، ئەوە كافرە، جوولەكەو گاور، ئەهلی كیتاب ئەگەر ئیمان بەم پێغەمبەرە ﷺ نەهێنن ئەوا كافرن، گومان لە كوفر بونیان ناكرێت، بەڵكو كوفری ئەوان لە كوفری خەڵكانی تر زۆر توند ترە چونكە هەقیان زانی بەڵام بەرهەڵستیان كردو سەرپێچیان كرد لە دوای زانینیی.

(٢)_ وە ئەگەر لە ئەهلی كیتاب بێت یان لە ئەهلی كیتاب نەبێت.

(٣)_ ئەمە بیرو باوەڕە، پێویستە باوەڕت بەوە بێت كە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەر دوو جیهانی ئادەمیزادو جنۆكە نێردراوە. دەڵێین: نەخێر، بۆ تێكڕای خەڵكی نەنێردراوە، تەنها بۆ عەرەب نێردراوە، موحەممەد پێغەمبەرە، بەڵام پێغەمبەرە بۆ عەرەبەكان، ئەوەی ئەم جۆرە قسانە بڵێت كافرە، چونكە باوەڕی بەخوای گەورە نەكردووە كە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾ [الأعراف: ١٥٨] واتە: ﴿قُلْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەی خەڵكینە بەڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان. كەوا بوو ئەو كەسەی دەڵێت: موحەممەد پێغەمبەر نییە بۆ هەر هەموو مرۆڤایەتی، كافرە، هەر كەسیش بڵێت: پێغەمبەری خوایە بۆ ئادەمیزاد نەك جنۆكە، ئەمیش دیسان كافرە، پێویستە باوەڕ بە گشتێتی پەیامەكەی بهێنرێت، پێویستە باوەڕ بەوە بهێنرێت كە گوێڕایەڵی و باوەڕ پێهێنانی موحەممەد ﷺ واجیبە لەسەر هەر دوو جیهانی ئادەمیزادو جنۆكە، ئەمە لەبنچینەكانی بیرو باوەڕە.

به ڕاستی چەند جنۆکەیەك قورئانیان بیست، هەموو بۆ لای قەومەکانیان گەڕانەوە بە ترسێنەر[(١)]، ئەو کاتە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە تائیف گەڕایەوەو[(٢)] البخاري (٤٩٢١)، ومسلم (٤٤٩)، لە دۆڵی (بطن نخلة)[(٣)] نوێژی بە هاوەڵانی دەکرد، خوای گەورە لە قورئاندا ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاند، لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ (٢٩) قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ (٣٠) يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ (٣١) وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءُ أُولَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ (٣٢)﴾[(٤)] [الأحقاف: ٢٩_٣٢]

---

(١)_ ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تائیف گەڕایەوە، کاتێ بانگی خەڵکی تائیفی بۆ ئیسلام کردو، ئەوانیش بەخراپە ڕوو بە ڕووی بونەوە، بەردە بارانیان کردو، لای ئەوان گەڕایەوە، خوای گەورە چەند جنۆکەیەکی بۆ ئامادە کرد بۆ ئەوەی گوێ لە قورئان بگرن و، بە قەومەکانی خۆیانی ڕاگەیەنن.

(٢)_ صحيح: وله طرق عن النبي ﷺ منها.

(٣)_ بطن نخلة: دۆڵێکە لە نێوان مەککەو تائیفدایە، ئێستا ناسراوە، بە (النخلة اليمانية) و (النخلة الشامية) ناسراوە.

(٤)_ ﴿قَالُوا أَنصِتُوا﴾ گوتیان بە یەکتری بێدەنگ بن و گوێبگرن، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەرکەسێك گوێبیستی قورئان بێت پێویستە بێدەنگ بێت، خۆی لە سەرقاڵییەکانی دونیا بە دور بگرێت، بۆ ئەوەی سوودی لێوەر بگرێت، وە بۆ ئەوەی بەرامبەر بە قورئان ڕەوشت بەرزی بنوێنێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ﴾[الأعراف: ٢٠٤] واتە: وە کاتێك کە قورئان خوێندرا دەبێ گوێی لێ بگرن و بێدەنگیش بن، نابێ خۆتان سەرقاڵ کەن، چونکە لەگەڵ ئێوەدا

...تەوە (بیرمان بخەرەوە) کاتێ چەند جنۆکەیەکمان نارد بۆ لات تا گوێ لە قورئان بگرن، جا کاتێ ئامادەی گوێگرتن لە قورئان بوون گوتیان (بە یەکتری) بێدەنگ بن و گوێبگرن، جا کە (قورئان خوێندنەکە) تەواو بوو هەموو گەڕانەوە بۆ لای قەوم و هۆزەکەیان بە ترسێنەر گوتیان ئەی هۆزو قەومەکەمان بە ڕاستی ئێمە گوێبیستی کتێبێک بووین کە لەپاش مووسا نێردراوەتە خوارەوە پەڕاوەکانی پێش خۆی بە ڕاست دادەنێ (خەڵک) ڕێنموونیی دەکات بۆ هەق بۆ ڕێبازی ڕاست ئەی قەومەکەمان وەڵامی بانگخوازی خوا بدەنەوە و باوەڕی پێ بێنن (خوا) لە تاوانەکانتان خۆش دەبێ و دەتانپارێزێتەوە وە لە سزای سەخت دەتان پارێزێ هەر کەسیش وەڵامی بانگخوازی خوا (کە موحەممەدە ﷺ) نەداتەوە ئەوە بە هیچ جۆرێ ناتوانێ لە زەویدا لەدەست خوا دەرچێ و خۆی قوتار کات وە جگە لە خوا یارمەتی دەرو پشتیوانێکی نییە ئا ئەوانە لە گومڕێیەکی ئاشکرادان.

---

دەدوێت. باشە چۆن خوای گەورە لەگەڵ تۆدا دەدوێت و تۆ گوێی پێنادەیت، ڕووت تێوەرگێڕاوە. ﴿وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ﴾ هەموو گەڕانەوە بۆ لای قەوم و هۆزەکەیان بەترسێنەر: ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەر کەسێک زانستێک فێر بوو لەوانەی کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ ناردوویەتیە خوارەوە پێویستە بەخەڵکی ڕاگەیەنێت. ﴿يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بە ڕاستی ئێمە گوێبیستی کتێبێک بووین کە لە پاش مووسا نێردراوەتە خوارەوە پەڕاوەکانی پێش خۆی بە ڕاست دادەنێت: ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەوان ئیمانیان بە مووسا پێغەمبەرو کتێبەکەی هەیە. ئەمڕۆ کەسانێک هەن دەڵێن: من ئازادم، ئەو ئایین و مەزهەبە هەڵدەبژێرم کە حەزم لێیەتی، نەخێر، ئەو ئازاد نییە، بەڵکو ئەو بەندەی خوای گەورەیە پێویستە ملکەچی خواو پێغەمبەرەکەی بێت ﷺ. ئەو کەسەی دەیەوێت ڕزگار بوون بۆ خودی خۆی بە دەستبێنێت و، ئیمان بەخواو پێغەمبەرەکەی بێنێت، با دڵنیا بێت ئەو پەڕی ئازادی ڕاستەقینەی بۆ خودی خۆی بەدەست هێناوە،

ئـازادی ڕاسـت و دروسـت. بـەڵام ئیمـان نـەهێنان بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی، وە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوات و شەیتان و بانگەوازکارانی گومڕاییی، ئەوە با دڵنیا بێت بە بەندەی شتانێکی تری غەیری خوای گەورە. کەوابوو ئادەمیزاد هـەر چۆنێك بێت بەندەیەو، هەر گیز لە چوار چێوەی بەندایەتی ناچێتە دەرەوە، یا بەندەی خوای گەورە وە یان بەندەی شتانێکی ترە، بۆیە پێشەوا ئیبنولقەییم فەرموویەتی:

هَرَبوا مِنَ الرِّقِ الذي خُلِقوا لَهُ فبلوا بِرِقِ النَّفسِ والشيطانِ

واتە: لەو بەندایەتیەی بۆی خولقێنرا بوون هەڵهاتن بەڵام توشی بەندایەتی نەفس و شەیتان هاتن.

بوون بە کوێلەی شەیتان و هەواو ئارەزاتی نەفسی خۆیان، دڵنیابن ئازادی ڕاستەقینە تەنها و تەنها بریتیە لە ئیمان هێنان بە خوای گەورە، بەندایەتی کردن و ملکەچ کردن بۆ شتی تری غەیری خوای گەورە کوفرو هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خوای گەورە.

پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (١) يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا (٢) وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا (٣) وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا (٤)﴾[1] [الجن: ١_٤] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: نیگام بۆ کرا کە بێگومان چەند کەسێك لە جنۆکە گوێیانگرت (لە قورئان خوێندنەوەم) ئینجا گوتیان: بە ڕاستی ئێمە قورئانێکی سەرسوڕهێنەرمان بیست ڕێنموونیی دەکات بۆ ڕێی ڕاست ئێمەش باوەڕمان پێکرد وە هەرگیز کەس ناکەین بەهاوبەشی پەروەردگارمان وە بە ڕاستی بڵندە گەورەیی پەروەردگارمان لەشتی ناشایستە هیچ هاوسەرو منداڵێکی بۆخۆی دانەناوە بێگومان بێ ئاوەزەکەمان درۆی نالەباری هەڵدەبەست دەربارەی خوا.

﴿سَفِيهُنَا﴾[2] واتە نادان و بێ ئاوەزو هەرزەکان لە ئێمە، بەپێی دیارترین بۆچوون لە دوو بۆچونەکەی زانایان.

زیاتر لە زانایەك لەپێشینی چاك گوتوویانە: ((هەر کات پیاوێك لە ئادەمیزاد لە دۆڵێکدا بمایاتەوە، دەیگووت: پەنا دەگرم بە گەورەی ئەم دۆڵە لە شەڕ و خراپەکاریی هەرزەی قەومەکەی، کاتێك ئادەمیزاد پەنایان بە جنۆکەکان گرت ئیتر جنۆکەکان کوفرو سەرکەشیان زیاتر بوو))[3]،

---

(١)_ هەموو ئەم ئایەتانە سەبارەت بە ئیمان هێنانی جنۆکەیە بەپێغەمبەری خوا ﷺ، وە سەرزەنشت کردنیانی تێدایە بۆ ئەوانەیان کە باوەڕیان پێنەهێناوە.

(٢)_ واتە: نادان و بێ ئاوەزو هەرزەی جنۆکەکان.

(٣)_ پێغەمبەری خوا ﷺ بە یادی هێناوەتەوە کە خەڵکانی سەردەمی نەفامی ئەگەر لە شوێنێکی چۆڵەوانیدا دابەزینایە، پەنایان بەگەورەی ئەو شوێنە دەگرت لەشەڕو خراپەی نادان و بێ ئاوەزو هەرزەی قەومەکەی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دایە موسڵمانان، لە جیاتی ئەوە بڵێن: ((أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)) واتە: ((پەنا دەگرم بەوشە تەواوەکانی خوای گەورە لە شەڕو خراپەی دروستکراوەکانی)).

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا (٦) وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا (٧) وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا (٨)﴾[1] [الجن: ٦ـ٨].

---

**(١)_ پەناگرتن جۆرێکە لە جۆرەکانی پەرستن، جگە لە خوای گەورە پەنا بە هیچ یەکێکی دیکە ناگیرێت، هەر کەسێك پەنای بەشتێکی دیکەی غەیری خوای گەورە گرت بە دڵنیایی هاوەڵی بۆ خوای گەورە بڕیار داوە، لەسەردەمی نەفامیدا پەنایان بە جنۆکەکان دەگرت، لە جیاتی ئەوەی پەنا بەخوای گەورە بگرن پەنایان بە جنۆکە دەگرت، چونکە نەفام بوون، هەر کات یەکێکیان لە جێگەیەك دابەزیایە، لە دۆڵێك لە دۆڵەکان دابەزیایە، دەیگوت: پەنا دەگرم بە گەورەی ئەم دۆڵە لە شەڕو خراپەکاری نادان و بێ ئاوەزو هەرزەی قەومەکەی، بێگومان ئەمە شیرك و هاوەڵپەرستییە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی فێر دەکرد، موسڵمانانی فێر دەکرد کە واز لەو شیرك و هاوەڵپەرستییە بێنن و، هەر کات لە شوێنێك دابەزین بڵێن: ((أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)) واتە: ((پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە لە شەڕو خراپەی دروستکراوەکانی))، ئەگەر ئەو دوعایە بڵێتەوە ئەوا هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێت چەند لەو شوێنەدا بمێنێتەوە، چونکە هەر کەسێك پەنا بە خوای گەورە بگرێت ئەوا پەنای دەدات، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی پەنا گرتن بە هیچ شتێکی تر شیاو نییە جگە لە خوای گەورە، یان بە سیفەتێك لە سیفاتەکانی خوای گەورە کە کەلام و گوفتارەکەیەتی، چونکە کەلام و گوفتار لە سیفەتەکانی خوای گەورەیە، بۆیە ئەگەر پەنای بە گوفتار یان بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە گرت ئەوە پەنای بەخوای گەورە گرتووە، چونکە پەناگرتن بە سیفەت پەناگرتنە بە وەسف کراو، ئابەم جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ ئوممەتەکەی فێری پەنا گرتن کردووە. ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ بە ڕاستی پیاوانێك لە ئادەمی پەنایان**

-----------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------

دەبردە بەر پیاوانێك لە جنۆكە، كە بیان پارێزن، كەچی زۆرتر ماندویان كردن، هەروەها بە مانایەكی تریش تەفسیر كراوە: پیاوانێك لە ئادەمیزاد پەنایان دەبر دەبەر پیاوانێك لە جنۆكە، ئیتر جنۆكەكانیش لووت بەرز بوون و، لە خۆیان بایی بوون چونكە ئادەمیزاد ملكەچیان بوون، داوایی یارمەتیان لێكردن. هەر كەس پەنا بە خوای گەورە بگرێت، دەیپارێزێت، شكۆمەندی دەكات، بەلاّم هەر كەس پەنا بەشتانێكی دیكەی غەیری خوای گەورە بگرێت، ئەوا خوای گەورە سەرشۆڕی دەكات، شاهێد قسەكانمان ئەوەیە كە پەناگرتن پەرستنەو، بۆ غەیری خوای گەورە ناشێت، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی كە كەلاّم و وشەكانی خوای گەورە مەخلوق و دروستكراو نییە، چونكە پەناگرتن بەشتی دروستكراو جایز نییە، كەوا بوو كەلام و وشەكانی خوای گەورە سیفەتێكن لە سیفاتەكانی و مەخلوق و دروستكراو نییە. ﴿حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾ پاسەوانی بەهێز لە فریشتەكان و، تیری ئەستێرە، پارچەیەكی سووتێنەر لە ئەستێرەكە جیادەبێتەوەو، ئەو شەیتانە دەپێكێت كە بەدزیەوە گوێدەگرن و، دەیانسوتێنێت.

شەیتانەکان بەتیرە ئەستێرە لێیان دەدرا پێش ئەوەی قورئان دابەزێت، بەڵام جار بەجار بەدزییەوە گوێیان دەگرت پێش ئەوەی تیرە ئەستێرەکە بە یەکێکیان بکات، کە پێغەمبەر ﷺ نێردرا ئاسمان لەپاسەوانی بەهێزو تیرە ئەستێرە پڕ کرا، ئیتر تیرە ئەستێرەکان لە بۆسەدا بوون بۆیان پێش ئەوەی گوێ بگرن(١)،

---

(١)_ خـوای گـەورە ئەسـتێرەکانی دروسـت کـردوەو، سوودەکانیشـیانی ڕوون کردۆتەوە کە بۆ ڕازاندنەوەی ئاسمان و، بۆ ڕەجمی شەیتانەکانن، لـەم بـارەوە خـوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ﴾[الملك: ٥] واتە: سوێندبێ بێگومان ئاسمانی دونیامان ڕازاندۆتەوە بەچرای زۆر (ی ئەستێرە) ﴿وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ﴾ وە گێڕاومانن بەڕەجمی شەیتانەکان. هەروەها لەسەفەردا شەوان سوود لەئەستێرەکان وەردەگیرێت بۆ ڕێدەرکردن، لـەم بـارەوە خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَلامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾[النحل: ١٦] واتـە: هـەروەها نیشـانەی زۆری داناوەو بە ئەستێرەش خەڵکی ڕێ دەردەکەن (لە شەودا). کەوابوو ئەستێرەکان لەبـەر سـێ شـت دروسـت کـراون: ڕازاندنـەوەی ئاسمـان، ڕەجمـی شـەیتانەکان، ڕێ دەرکردن، خوای گەورە ئەستێرەکانی کردووە بە نیشانە گەلێك کە گەشتیاران بەشەو سوودیان لێوەردەگرن بۆ ڕێ دەرکردن، لەم بارەوە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾[الأنعام: ٩٧] واتـە: وە هـەر خوایـە کـە ئەسـتێرەی دانـاوە بۆتـان بـۆ ئـەوەی ڕێیـان پێدەرکـەن لـە تاریکیـەکانی وشکانی و دەریادا. موسافیر بە گوێرەی شوێنی ئەستێرەکە ڕێدەکات و، بەئاڕاسـتەی دروستی خوازراوی خۆیدا دەڕوات، بە ڕاستی فەزڵ و بەخششی خوای گەورەیە. بـەڵام ئەو کەسەی وا تێدەگات کە ئەستێرەکان سوودو زیان دەگەیەنن و، لە جیاتی خوای

---------------------------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------------

گەورە دەیپەرستێت، وەکو بار و حاڵی قەومەکەی ئیبراهیم پێغەمبەر ـ علیه السلام ـ، ماوەلانی نەمروود کە هەسارەکانیان دەپەرست، بە دڵنیایی خەسارەتمەندن، چونکە ئەستێرەکان بۆ شتێکی ئاوەها دروست نەکراون، بەڵکو بۆ ئەو سێ سوودەی پێشەوە دروستکراون، شتی دروستکراویش ناپەرسترێت، ئەستێرە لە لایەن خوای گەورەوە بەڕێوە دەبرێت، هیچ شتێکی بە دەست نییە، بۆیە پێغەمبەر ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ ویستی بەڵگەو بەهانەی قەومەکەی تێکشکێنێت و، فەرمووی: ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لا أُحِبُّ الآفِلِينَ (٧٦) فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ (٧٧) فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَذَا رَبِّي هَذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ (٧٨) إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (٧٩)﴾[الأنعام: ٧٦_٧٩] واتە: کاتێ شەوی بەسەر داهات ئەستێرەیەکی بینی گوتی ئەمە پەروەردگاری منە بەڵام کاتێ ئاوا بوو گوتی من هەرچی ئاوابێ خۆشم ناوێ، ئینجا کاتێ مانگی بینی هەڵهات گوتی ئەمە پەروەردگاری منە، بەڵام کاتێ کە ئاوا بوو گوتی سوێند بەخوا ئەگەر پەروەردگارم ڕێنموونیم نەکات بێگومان لەکۆمەڵی گومڕایان دەبم ئینجا کاتێ خۆری بینی هەڵهات گوتی ئەمە پەروەردگاری منە ئەمە گەورەترە (لەوان) جا کاتێ خۆریش ئاوا بوو گوتی ئەی گەلەکەم بە ڕاستی من بەریم لەهەرشتێ کە ئێوە دەیکەن بەهاوبەش بۆخوا بە ڕاستی من ڕووی خۆم وەردەگێرم بۆ لای زاتێک کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە جگە لەخوا ڕووم لە هیچی تر ناکەم وە بێگومان من لە هاوبەش پەیدا کەران نیم. ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەستێرەکان بەڕێوە براون و، هیچیان بە دەست نییە، ئەم ڕەفتارەی پێغەمبەر ئیبراهیمیش بۆ ئەوەبوو کە دەیەویست پێچەوانەی قەومەکەی کردار بکات، بەم گفتوگۆ و موناقەشانە بەڵگەی

--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------

لەسەر دامەزراندن، چونکە ئەستێرەکانیان دەپەرست لە جیاتی خوای گەورە. ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ﴾ وە بێگومان ئێمە جاران دادەنیشتین لە چەند شوێنێك لە ئاسمان بۆ گوێگرتن، وشەیەکیان لە فریشتەکان دەبیست و، دەستبەجێ بەکاهینەکانیان ڕادەگەیاند، ئەوانیش صەد درۆیان تێکەڵ دەکردو، بۆ خەڵکیان باس دەکرد، ئەمە لەسەردەمی نەفامیدابوو، کاتێکیش موحەممەد ﷺ نێردرا ئاسمان بەتیری ئەستێرە پاسەوانی توند کرا، ئیتر توانای ئەوەیان نەبوو کە پێشتر دەیانکرد، توانای بیستنیان نەما، هەر کامێکیشیان هەوڵی بیستنی بدایە تیرە ئەستێرەی تێدەگیراو، دەیسوتاند، ئەوەش بۆ پاراستنی وەحی بوو، بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەتوانێت یاری بەوەحیەکەی خوای گەورە بکات، ئەمەش فەزڵی خوای گەورەیە.

وەكو ئەوەی گوتویانە: ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا﴾[الجن: ٩] واتە وە بێگومان ئێمە جاران دادەنیشتین لە چەند شوێنێك لە ئاسمان بۆ گوێ گرتن بەلاّم هەر كەسێك ئێستا كە بە دواوە گوێبگرێ تیرێكی ئەستێرە دەبینێ لە بۆسەیدایە.

خوای گەورە لە ئایەتێكی دیكەدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّيَاطِينُ (٢١٠) وَمَا يَنبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ (٢١١) إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ (٢١٢)﴾[1] [الشعراء: ٢١٠_٢١٢].

---

(١)_ واتە: شەیتانەكان ئەو قورئانەیان نەهێناوەتە خوارەوە، بەڵكو فریشتەیەك لە فریشتەكان كە جبریلە _ علیه السلام _ هێنایە خوارەوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ (١٩٤)﴾[الشعراء: ١٩٣_١٩٤] واتە: جوبرەئیلی ئەمین هینایە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی. نەشیاوی ئەوەن و نەدەشتوانن، شەیتان شیاوی ئەوە نییە قورئان دابەزێنێت، وەحی دابەزێنێت و ناشتوانێت، چونكە قورئان دەیسوتێنێت، دەیكوژێت، ناتوانێت توخنی قورئان بكەوێتەوە، ئیتر چۆن توانای دابەزینی قورئانی دەبێت وەكو ئەوەی موشریك و هاوەڵپەرستان بانگەشەی بۆدەكەن، ئیتر چۆن دەتوانێت بۆ پێغەمبەری ﷺ دابەزێنێت، ﴿إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ بە ڕاستی شەیتانەكان لە گوێ گرتنی هەواڵی ئاسمان بەرگری كراون، شەیتانەكان لە گوێ گرتنی وەحی و سرووش بەتیرە ئەستێرە بەرگری كراون. قورئان و سرووش لەنێوان خوای گەورەو پێغەمبەری خوادا ﷺ پارێزراوە، بۆیە شەیتانەكان هیچ پەیوەندیەكیان پێوە نییە، لە ڕاستیدا شەیتان تەنها لەگەڵ كاهینانداً كاردەكەن نەك پێغەمبەران، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ (٢٢١) تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ (٢٢٢)﴾[الشعراء: ٢٢١_٢٢٢] واتە: هەواڵتان بدەمێ شەیتانەكان دادەبەزنە سەر كێ؟! دادەبەزنە سەر هەموو (كەسێكی) زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار.

جنۆکـەکان دەیـانگووت: ﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا (١٠) وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا (١١)﴾[1] [الجن: ١٠_١١].

---

(١)_ دەڵێن: نازانین هۆکاری ئەمە چییە؟ ئەم نیشانانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە شتێك ڕوو دەدات و، نازانین چییە، شتێك بۆ خەڵکی سەرزەمین دێت، خەیرە یان...، ئەوان گوتیان خەیر، ئەوە بوو قورئان و، سوننەت و، زانستی بەسوودو، هۆشیاریی لەسەر دەستی ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەدیهات. تەماشای ئەدەب و ڕەوشتی جنۆکەکان بکەن بەرامبەر بەخوای گەورە، کاتێ باسی شەڕ دەکەن، دەڵێن: ﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ﴾ واتە وە بەڕاستی نازانین ئایا شەڕو خراپی ویستراوە بۆ ئەوانەی لەسەر زەوین، دەڵێن: شەڕو خراپی ویستراوە، ناڵێن: خوای گەورە شەڕو خراپەی ویستووە، شەڕو خراپە نادەنە پاڵ خوای گەورە. بەڵام کاتێ باسی ڕێنموونییان کردووە داویانەتە پاڵ خوای گەورەو، گوتوویانە: ﴿أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا﴾ یا پەروەردگاریان ڕێنموونیی ویستووە بۆیان، ﴿كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا﴾ ئێمە جاران خاوەنی ڕێبازی زۆربووین، جنۆکەکانیش جیاوازن، بەشێکیان ئیماندارن، بەشێکیان کافرن، بەشێکیان پیاوچاکن، بەشێکیان خراپەکارن، بەشێکیان تەقواکارن، بەشێکیان خواپەرستن، بەشێکیان فاسیق و لەڕێی ڕاست لادەرن، ئەوانیش وەکو ئادەمیزاد دابەشبوونە.

﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعجِزَ اللَّهَ فِي الأَرْضِ وَلَن نُّعجِزَهُ هَرَبًا﴾[الجن: ١٢] واتـه: وه ئێمـه دڵنیا بووین كه هەرگیز ناتوانین له دەستی خوا دەرچین له زەویدا وه بەهەڵهاتنیش له دەستی خوا ڕزگار نابین. جنۆكـەكان ڕایانگەیانـدووه كـه نـاتوانن لـه دەسـتی خـوای گەوره دەرچن و ڕزگاریان بێت، ئەگەر له زەویدا بمێننەوە، یان لێـی هـەڵبێن[1]: ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا (١٣) وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ(١٤)﴾[2] [الجن: ١٣_١٤].

---

(١)_ جنۆكەكان دانیان پێدانا كـه هـەرگیز توانـای دەرچـونیان لەدەسـتی خـوای گەوره نابێـت، هـەرگیز لەچوارچـێوەی قـودرەت و توانـاو دەسـەڵاتی خـوای گـەوره دەرچونیان نابێـت، هەرچـەنده خـوای گـەوره كـێش سـووكی و فـڕین و تایبەتمەنـدی دیكەی داونەتێ، ئەوان هەر لەژێر دەسەڵاتی ئەودان، ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا﴾ وه ئێمه دڵنیابووین، چونكه لەزمانی عەرەبیدا وشەی (الظَّنُّ) هەندێ جار به مانای یەقین و دڵنیـا بـوونیش دێت، وەك دەبنیین له شـوێنێكی تـردا خـوای گـەوره دەفـەرموێت: ﴿قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُوا اللَّهِ﴾[البقرة: ٢٤٩] واته: گوتیـان: ئەوانـەی كـه دڵنیـابوون بەخزمـەت خـوا دەگەن له ڕۆژی دواییدا، لێرەدا وشەی (الظَّنُّ) مانای گومان نابەخشێت، بەڵكو وشـەی (الظَّنُّ) بـەمانای یـەقین و دڵنیـابوون دێـت، ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعجِزَ اللَّهَ فِي الأَرْضِ﴾ وه ئێمه دڵنیا بووین كه هـەرگیز نـاتوانین لـه دەسـتی خـوا دەرچـین، بەیەكسـانی ئەگـەر لەزەویـدا بمێنینـەوه یـان لـه زەوی هـەڵبێین، ئێمـه هـەر لـه ژێـر دەسـەڵاتی خـوای گەورەداین.

(٢)_ جنۆكـەكان موسـڵمان بـوونی خۆیـان ئاشـكرا كـرد، ئـەم چـەند كەسـەی جنۆكەكان موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند، ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ﴾ به ڕاستی

----------------------------------------------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------------------------------------------------

ئێمە کاتێ ڕێنموونیی قورئانمان بیست ئیمانمان پێ هێنا، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە جنۆکەکانیش موسڵمان و، ئیماندارو، تەقواکاریان تێدایە، هەروەها خراپەکاریشیان تێدایە، بۆیە گوتوویانە: ﴿كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا﴾[الجن: ١١] ئێمە جاران خاوەنی ڕێبازی زۆر بوین، ﴿وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ﴾ وە بێگومان ئێمە هێندێکمان موسڵمانین و هێندێکمان ستەم کار، واتە کافر. لە زمانی عەرەبیدا وشەی (قَسَطَ) کە سێ پیتە مانای ستەم کردن دەبەخشێت، بەڵام وشەی (أَقْسَطَ) کە چوار پیتە مانای دادپەروەری دەبەخشێت، (إسمُ الفاعِلْ) ناوی بکەری وشەی (أَقْسَطَ) (القاسِط)ە، بۆیە گوتوویانە: ﴿وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ﴾ واتە کافران و خراپەکاران.

أسلم فأولئك تحروا رشدا(١٤) وأما القاسطون فكانوا لجهنم حطبا (١٥) وأن لو استقاموا على الطريقة لأسقيناهم ماء غدقا (١٦) لنفتنهم فيه ومن يعرض عن ذكر ربه يسلكه عذابا صعدا (١٧) وأن المساجد لله فلا تدعوا مع الله أحدا (١٨) وأنه لما قام عبد الله يدعوه كادوا يكونون عليه لبدا (١٩) قل إنما أدعو ربي ولا أشرك به أحدا (٢٠) قل إني لا أملك لكم ضرا ولا رشدا (٢١) قل إني لن يجيرني من الله أحد ولن أجد من دونه ملتحدا (٢٢) إلا بلاغا من الله ورسالاته ومن يعص الله ورسوله فإن له نار جهنم خالدين فيها أبدا(٢٣) حتى إذا رأوا ما يوعدون فسيعلمون من أضعف ناصرا وأقل عددا(٢٤) قل إن أدري أقريب ما توعدون أم يجعل له ربي أمدا (٢٥) عالم الغيب فلا يظهر على غيبه أحدا (٢٦) إلا من ارتضى من رسول فإنه يسلك من بين يديه ومن خلفه رصدا (٢٧) ليعلم أن قد أبلغوا رسالات ربهم وأحاط بما لديهم وأحصى كل شيء عددا(٢٨) ﴾[1] [الجن: ١٦_٢٨].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا﴾ وە ئەگەر ئەوان مرۆڤ و جنۆکە، واتە بەدیهێنراوان ﴿عَلَى الطَّرِيقَةِ﴾ بەردەوام بوونایە لەسەر ڕێی ڕاست، لەسەر ئایینی ڕاست و دروست ﴿لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاءً غَدَقًا﴾ ئاوی زۆرمان پێ دەنۆشین، بارانی زۆرمان پێ دەنۆشین بە خۆشی و حەلاڵی، لە ڕاستیدا خوای گەورە بارانیان لێ دەگرێتەوە بە هۆی کوفرو تاوانەکانیانەوە ﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ تا تاقیتان کەینەوە تیایدا. بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوە: ﴿وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ﴾ ئەگەر ئەوان مرۆڤ و جنۆکە بەردەوام بوونایە لەسەر ڕێگەی کوفر ﴿لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاءً غَدَقًا﴾ ئاوی زۆرمان پێ دەنۆشین، بۆ ئەوەی پلە بەپلە لە تیاچوون نزیکیان بکاتەوە، خوای گەورە نیعمەت بە کافر دەبەخشێت بۆ ئەوەی پلە بە پلە بەرەوە تیاچوون ڕاکێشیان بکات، ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ﴾ بێگومان مزگەوتەکان تایبەت خوان، مزگەوت بۆ پەرستنی خوای گەورە دروست دەکرێت، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ (٣٦) رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ

وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ(٣٧)﴾[النور: ٣٦_٣٧] واتە: لە مزگەوتانێكدا خوا مۆڵەتی داوە كە بە گەورەو پاك ڕاگیرێ (بەرزو بڵند دروست كرێت) زیكرو یادی خوای تێدا بكرێ لەو (مزگەوتانەدا) تەسبیحاتی خوا دەكەن بە بەیانیان و ئێواراندا پیاوانێك كە بازرگانی و كڕین و فرۆشتن بێ ئاگایان ناكات لە یادی خوا. ئا ئەمە ئەو شتەیە كە مزگەوتی لە پێناودا دروست دەكرێت، بۆ پەرستنی خوای گەورە، بۆ نوێژ كردن، بۆ زیكرو یادی خوای گەورە، بەڵام كە مزگەوت بۆ شیرك و هاوەڵپەرستی دروست بكرێت، لەسەر گۆڕ دروست بكرێت ئەمە مزگەوت نییە، چونكە لەسەر شیرك و هاوەڵپەرستی و پەرستنی غەیری خوای گەورە دروستكراوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾ كەواتە لەگەڵ خوادا هاوار لە كەسی تر مەكەن، هاوار و هانا بۆ غەیری خوای گەورە مەبەن، لەو بوارانەدا كە غەیری خوای گەورە كەسی توانای بەسەریدا نییە، هانا بردن و داوای یارمەتی كردن جۆرێكە لە جۆرەكانی پەرستن، هانا بردن و داوای یارمەتی كردن تەنها لە خوای گەورە دەكرێت، بە تایبەت لەو بوارانەدا كە تەنها خوای گەورە توانای بەسەریدا هەیە، بەڵام لە هەندێ بواری تردا كە مرۆڤ توانای بەسەریدا هەیە جایزە داوای یارمەتی لە براكەت بكەیت بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات، چونكە خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ﴾[القصص: ١٥] واتە: ئینجا ئەوەیان كە لە تایەفەی خۆی بوو داوای یارمەتی لێكرد لە دژی ئەوەی كە لە (تاقمی) دوژمنەكەی بوو. ئەوانەی مزگەوتەكان لەشیرك و هاوەڵپەرستی و بیدعە پاك ناكەنەوە با بزانن پێچەوانەی شەرعی خوای گەورە ڕەفتاریان كردووە، خوای گەورە فەرمانی داوە بە مزگەوت دروست كردن بۆ یەك خواپەرستی و، زیكرو یادی خواو، نوێژ كردن، ئەوانەی مزگەوتەكان بەشیرك و بیدعەی وەكو داوای یارمەتی كردن لە خەڵك و شتی تر پڕدەكەن مزگەوتەكان پیس

دەكان، ڕێڕەوی مزگەوتەكانیان گۆڕیوە لەوەی كە لە بنەڕەتەوە بۆی دروست كراوە، پێویستە مزگەوتەكان بپارێزرێت، لە جۆرەكانی شیرك و هاوەڵپەرستی و بیدعە بپارێزرێت، بۆ نوێژو، فێركردنی زانستی بە سوودو، زیكری خوای گەورەو، خوێندنی قورئان تایبەت بكرێت، پێویستە مزگەوتەكان بەم جۆرەبن بەلای موسڵمانانەوە، كەچی گۆڕپەرستان قایل نەبوون بەوە نەبێت كە بیكەن بەشوێنی بتەپەرستی و ناوی مزگەوتیشیان لێناوە، ﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾ وە بەندەی خوا موحەممەد ﷺ كە هەستا لەخوا بپاڕێتەوەو بیپەرستێ بێبڕواكانی مەككە نزیك بوو داباڕن بەسەریدا، وە كەسی تر نەپەرستێت. بێباوەڕان داوایان لەغەیری خوای گەورە دەكرد، بۆیە كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو تەنها داوای لەخوای گەورە كردو، تەنها خوای گەورەی پەرست، سەریان سوڕماو، لەدەوری كۆبونەوە، ﴿قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا﴾ بلێ:- دڵنیابن من هەر خوای خۆم دەپەرستم، وە كەس ناكەم بە هاوبەشی، ئەمە بەڵگەیە كە داواكردن لە غەیری خوای گەورە هاوەڵپەرستییە، ﴿قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا﴾ بلێ: بەڕاستی من نەزیان نەڕێنموونیی ئێوەم بەدەست نییە، ئەمە زێدەڕۆیی كردن لە پێغەمبەری خوادا ڕەتدەكاتەوە، چونكە كەسانێك لەو باوەڕەدان كە پێغەمبەری خوا ﷺ سوود و زیانی بەدەستە لە جیاتی خوای گەورە، پێغەمبەری خوا ﷺ سوودو زیانی بە دەست نییە، ئەوەی سوودو زیانی بەدەستە تەنها خوای گەورەیە، تەنها خوای گەورەیە كە داوای سوودی لێدەكرێت و، پەنای پێدەگیرێت لە شەڕ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بەندەیەكەو پەیامەكەی خوای گەورە ڕادەگەیەنێت، بۆیە زێدەڕۆی كردن لە پێغەمبەری خواداو باوەڕ بوون بەوەی كە سوودو زیان گەیاندنی بەدەستە شیرك و هاوەڵپەرستییە، ئەوانەی داوای یارمەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەن و، هانای بۆ

------------------------------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------------------

دەبەن بە تایبەت لەم زەمەندا کە ناوی ڕۆژانی مەولودیان لێناوە، لەم ڕۆژانەدا جۆرەها شیرك و داواکردن و کڕوزانەوە بەپێغەمبەری خواوە ﷺ تایبەت دەکەن، دەستیان بۆ خوای گەورە بەرز ناکەنەوەو، داواکارییەکانیان تایبەت ناکەن بەخوای گەورەوە ، کەچی داوا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن و، دەڵێن: گوایە ئامادەی حەفلەو ئاهەنگەکانیان دەبێت، گوێبیستی دوعاکانیان دەبێت و...و...هتد، دڵنیا بن هەموو ئەمانە لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکەوەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ پەیامەکەی پەروەردگاری خۆی ڕاگەیاند، دوو شتی بۆ بەجێهێشتووین کە ئەگەر دەستی پێوە بگرین هەرگیز گومڕا نابین، قورئان و سووننەت، پێغەمبەری خوا ﷺ پەیامەکەی خوای گەورە زۆر بە جوانی و بە ئاشکراو ڕوونی گەیاندووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەر لە گەیاندن هیچ شتێکی تری بە دەست نییە. ئیتر ئەم کردەوە ناشیرینە چییە کە لەم زەمەنەدا داهێنراوەو بە بۆنەی مەولیدو لە دایکبوونی ناودەبەن، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها لەم ڕۆژانەدا دەناسنەوە، هەموو ڕۆژێك پێنج جار لەسەر منارەکانەوە ناوی پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێنرێت و، دەناسرێت، (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله) هەموو ڕۆژێك پێنج جار لەسەر منارەکانەوە بە بەرزترین دەنگ دەگوترێتەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾[الشرح: ٤] وە ناو و ناو بانگتمان بۆ بەرزکردیتەوە. بۆیە کە ناوی خوای گەورە دەهێنرێت پاشان ناوی پێغەمبەریش ﷺ دەبرێت، لە کاتەکانی بانگدان و، ئیقامەکردن و، وتارەکاندا، ئەمە بەرزکردنەوەی ناو و ناو بانگێتی ﷺ، بەڵام کە یادی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها لەم ڕۆژاندا بکرێتەوە، بە ڕاستی بیدعەیەکی ئاشکرایە، کەسانێکیان دەڵێن: ئەنجامدانی یادی لە دایکبوونی پێغەمبەری خوامان ﷺ بەس بۆ ئەوەی بچینە بەهەشتەوە ئەگەر هیچ کردەوەیەکی تریشمان ئەنجام نەدابێت، ﴿قُلْ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ

--------------------------------------------

--------------------------------------------

--------------------------------------------

ضَرًّا وَلَا رَشَدًا﴾ بلّیّ: بەڕاستی من نەزیان و نەڕێنموونیی ئێوەم بە دەست نییە، خوای گەورە فەرمانی پێداوە ئەوەیان پێ ڕاگەیەنێت کە توانای زیان و ڕێنوێنی هیچ کەسێکی بە دەست نییە، بەڵکو تەنها ڕوون کردنەوەی ئایینەکەی خوای گەورەو گەیاندنەکەی لە ئەستۆدایە، بە ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ بە چاکترین شێوە ئایینەکەی خوای گەورەی ڕوون کردۆتەوەو گەیاندوویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ زیان و سوود گەیاندنی بەخودی خۆشی نییە مەگەر ئەوەی خوای گەورە بیەوێ، ﴿قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِ مُلْتَحَدًا﴾ بلّیّ: بێگومان کەسێك نییە کە من بپارێزێ لە سزای خوا وە بێجگە لەو پەناگەیەك شك نابەم، ئەگەر خوای گەورە ویستی سزای بەندەکەی خۆی هەبێت ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێگری لەخوای گەورە بکات، بۆ ئەوەی سزای بەندەکەی خۆی نەدات، نەپێغەمبەرێك و نەغەیری پێغەمبەرێك توانای ئەوەی نییە، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت تۆڵە لەبەندەکەی خۆی بکاتەوە ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێت بیپارێزێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ(٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ(٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ(٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ(٤٧)﴾ [الحاقة: ٤٤_٤٧] واتە: ئەگەر (موحەممەد ﷺ) بەدەم ئێمەوە هێندێ (ووتەی) هەڵبیەستایە بێگومان ئێمە بە دەستی خۆمان تۆڵەمان لێدەسەند لەپاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی، واتە بە خراپترین شێوە دەمان کوشت وە کەس لە ئێوە نەیدەتوانی بەرگری لێ بکات، هیچ کەسێك نەیدەتوانی ڕێگری لە خوای گەورە بکات، ئەگەر بیەوێت سزای بەندەیەك بدات هیچ کەسێك ناتوانێت ئەو سزایە لەو بەندیە دووربخاتەوە. ﴿إِلَّا بَلَاغًا مِّنَ اللَّهِ وَرِسَالَاتِهِ﴾ وە هیچم بە دەست نییە ڕاگەیاندن نەبێ لە خواوە و گەیاندنی پەیامی ئەو نەبێ، ئەمەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستێتی، ڕاگەیاندنی پەیامی خوای گەورە، کە بە شێوازێکی ئاشکراو ڕوون

گەیاندویەتی، ﴿وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ وە هەر کەسێ بێ فەرمانی خواو پێغەمبەری بکات ئەوە بێگومان ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوە تیادەمێنێتەوە بەهەمیشەیی، هاوەڵپەرست و کافر ئاگری دۆزەخ جێگەیانەو بەهەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، بەڵام کەسانی یاخی بوو، ئەوانەی سەرپێچیەکانیان لە کوفر بە خوار ترە لە ژێر ویستی خوای گەورەدان، ئەگەر ویستی لێبێت بە ئاگر سزایان دەدات و، ئەگەر ویستیشی لێبێت دەیانبەخشێت، ئەگەر بەئاگریش سزایان بدات ئەوا بە هەمیشەیی تیایدا نامێننەوە بەڵکو دێنەدەرەوەو، دەرەنجامیشیان بۆ بەهەشتە، ئەمە لە ئایەتەکانی هەڕەشەیە (الوَعيد) و بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە هەر مەعصیەت و سەرپێچیەك کوفر بێت و ئادەمیزاد لە چوار چێوەی ئاییني ئیسلام بکاتە دەرەوە، وەکو ئەوەی خەواریجەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەم ئایەتە لە موجمەلاتی قورئانە، لە موتەشابیهەکانی قورئانە کە پێویستە بۆ بەوردی و چاك تێگەیشتنی بۆ ئایەتە موحکەمەکانی تری قورئان بیگەڕێنێتەوە، ئایەتانێکی تری قورئان تەفسیری دەکات، ﴿حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا﴾ تا بەچاوی خۆیان دەبینن ئەو سزایانەی کە بەڵێنیان پێدراوە ئینجا ئەو کاتە دەزانن کەکێ یارمەتی دەری کەمترەو ژمارەی کەمە، کە کافرو هاوەڵپەرستان ئەو سزایانەیان بینی کە پەیمانیان پێدرا بوو، ئەو کاتە بۆیان ڕوون دەبێتەوە کێ پشتیوانی کەمە، ئایا ئەوان یان پێغەمبەری خوا ﷺ ژمارەیان کەمترە، پێغەمبەری خوا ﷺ خواو، فریشتەکان و، ئیماندارانی لەگەڵدایە، بەڵام ئەوان هیچ کەسێکیان لەگەڵدا نییە تەنها شەیتانەکانی خۆیان نەبێت، هیچ کەسێکیان لەگەڵ دانییە پشتگیریان بکەن و، یارمەتیان بدەن.

پاشان كه جنۆكه‌كان گوێبیستی قورئان بوون چوونه خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ و ئیمانیان پێ هێنا، ئه‌مانه جنۆكه‌كانی نصیبین بوون[١]، ئه‌مه‌ش به فه‌مووده‌ی (صحیح) بۆیان جێگیر بووه هاوه‌ڵی به‌ڕێز ئیبن و مه‌سعود[٢].

وه ده‌گێڕنه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ سوره‌تی (الرَّحمن)ی بۆ خوێندنه‌وه، ئیتر كه ئه‌م ئایه‌ته‌ی ده‌خوێنده‌وه: ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ واته: جا به‌كام نیعمه‌تانی په‌روه‌ردگارتان باوه‌ڕ ناكه‌ن؟ ده‌یانگووت: به‌هه‌ر هه‌موو نیعمه‌ته‌كانی تۆ باوه‌ڕ ده‌كه‌ین په‌روه‌ردگارمان، سوپاس و ستایش بۆ تۆیه[٣] أخرجه الترمذي (٣٢٩١)، قال الترمذي: هذا حديث غريب، لا نعرفه إلا من حديث الوليد بن مسلم عن زهير بن محمد.

---

(١)_ واته: جنۆكه‌كانی سه‌ر زه‌مینی عێراق بوون، چوون و گوێیان له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ گرت، كاتێ پێش نوێژی بۆ هاوه‌ڵانی ده‌كرد له دۆڵی (وادي النخلة) له‌نێوان مه‌ككه‌و تائیفدا، ئه‌و كاته بوو كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له تائیف گه‌ڕایه‌وه‌و، سوكایه‌تیان پێكردو، گاڵته‌یان پێكرد، بۆ مه‌ككه گه‌ڕایه‌وه، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ نوێژی به‌یانی به هاوه‌ڵانی ده‌كرد، قورئانی خوێند، جنۆكه‌كان قورئان خوێندنه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوایان ﷺ بیست، كه پێشتر نه‌یان بیستبوو، هاوشێوه‌ی ئه‌و قورئانه پێشتر ته‌نها بۆ مووسا پێغه‌مبه‌ر _ عليه السلام _ دابه‌زیبوو، ئیتر گه‌ڕانه‌وه‌و به قه‌ومه‌كانی خۆیانیان ڕاگه‌یاند، ئیتر موسڵمان بوون و، هاتنه خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌سه‌ر ئیسلام به‌یعه‌تیان دایه، چونكه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بۆ هه‌ردوو جیهانی ئاده‌میزادو جنۆكه‌كانیش نێردراوه.

(٢)_ تقدم الكلام عليه و ذكر طرقه قريباً.

(٣)_ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((وه‌ڵامی جنۆكه‌كان له ئێوه باشتر بوو)) مه‌به‌ستی ئێوه‌ی ئاده‌میزاده. كاتی گوێبیستی ئه‌م فه‌رمایشته‌ی خوای گه‌وره ده‌بوون: ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ده‌یانگوت: به هه‌ر هه‌موو نیعمه‌ته‌كانی باوه‌ڕمان هێناوه ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان، سوپاس و ستایش بۆ تۆیه.

كاتێك جنۆكەكان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ كۆبوونەوە، داوای خواردەمەنیان لێكرد بۆ خۆیان و چوارپێكانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ((لَكُمْ كُلُّ عَظْمٍ ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ تَجِدُهُ أَوْفَرَ مَا يَكُونُ لَحْمًا، وَكُلُّ بَعْرَةٍ عَلَفٌ لِدَوَابِكُمْ))، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ((فَلا تَسْتَنْجُوا بِهِمَا، فَإِنَّهُمَا زَادُ إِخْوَانِكُمْ مِنْ الجِنِّ))[1] معناه صحيح: وهذا النهي ثابت من وجوه متعددة منها: حديث أبي هريرة عند البخاري (٣٨٦٠)، واتە: ((هەموو ئێسكێك ناوی خوای گەورەی لەسەر هێنرابێت بۆ ئێوەیە دەبینن زۆرترین گۆشتی بەسەرەوەیە، هەر پشقلێكێش عەلەفی چوار پێكانی ئێوەیە))، پێغەمبەری خوا ﷺ بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: ((بەو دووانە خۆتان پاك مەكەنەوە، چونكە خواردەمەنی برا جنۆكەكانتانن)).

ئەم قەدەغەو ڕێگری كردنەش لە چەندین ڕووەوە جێگیربووە، بۆیە زانایان قەدەغەی خۆ پاككردنەوەیان كردووە بەو دووانە، زانایان گووتوشیانە: ئەگەر قەدەغەی خۆ پاك كردنەوە كرا بێت بەو شتانەی كە بۆ خواردنی جنۆكەو چوار پێكانیان دانراوە، كەوا بوو بەوانەی كە بۆ خواردەمەنی ئادەمیزاد و چوارپێكانیان دانراوە پێشتر شایستەترە[2].

---

(١)_ بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی كردووە لەوەی مرۆڤ خۆی بەئێسك و پشقل پاك بكاتەوە، چونكە ئێسك خواردنی جنۆكە موسڵمانەكانە و خوای گەورە بە گۆشت بۆیانی دادەپۆشێت، پشقل و پاشەڕۆی ئاژەڵانیش خوای گەورە دەیكات بە عەلەفی چوار پێكانیان.

(٢)_ كەواتە ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی بەخواردەمەنی ئادەمیزادو، عەلەفی چوار پێكانیان خۆ پاك ناكرێتەوە، ئەو عەلەفەی بۆ ئاژەڵان دانراوە بۆ هیچ كەسێك نییە میزی بەسەردا بكات و، خۆی پێ پاك بكاتەوە، هەروەها خواردەمەنی ئادەمیزادیش بۆ هیچ كەس نییە خۆی پێ پاك بكاتەوە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەر هەموو ئادەمیزاد و جنۆکە نێردراوە، لە لای خوای گەورەوە ئەمە پلە و پایەیەکی گەورەترە لە چاو ئەوەی کە جنۆکەکان بۆ سولەیمان پێغەمبەر ـ علیه السلام ـ ڕام کرابوو[1]، جنۆکەکانی بۆ ڕام کرا بوو ئەسەرۆف پێوە دەکردن بە سیفەتی ئەوەی کە پاشا بوو، بەڵام پێغەمبەری ﷺ بە سیفەتی پێغەمبەرایەتی نێراوە بۆیان، فەرمانی بەو شتانە پێدەدات کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان،

---

(١)_ سولەیمان پێغەمبەر _ علیه السلام _ جنۆکەی بۆ ڕام کرا بوو، کاریان بۆ دەکرد، خواستی هەر شتێکی بوایە دەست بەجێ بۆیان جێبەجێ دەکرد، چونکە خوای گەورە موڵك و دەسەڵاتێکی پێدابوو کە هەرگیز بە هیچ کەسێکی دیکەی غەیری ئەوی نابەخشێت، لەوەی کە عفریت و جنۆکەکانی بۆ ڕام کرد بوو، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَاتٍ﴾[سبأ: ١٣] واتە: (سولەیمان) هەرچی بویستایە بۆیان دروست دەکرد لە پەرستگاو پەیکەرو چەندین قاپی (نان خواردن) وەك حەوزی گەورەو چەند قازان و مەنجەڵی دامەزراو (نەدەجوڵان لەبەر گەورەیان). خوای گەورە جنۆکەکانی بۆ سولەیمان پێغەمبەر _ علیه السلام _ ڕام کرد بوو کە هەڵدەستان بەشت دروستکردن و ئاوەدانکردنەوە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاءٍ وَغَوَّاصٍ﴾[ص: ٣٧] واتە: وە هەموو (پەری و) شەیتانەکانمان بۆ ڕام هێنا بوو کە بیناسازو مەلەوانی ژێر دەریابوون. بیناسازیان دەکرد، لە ژێر دەریادا مەلەوانیان دەکردو، هەموو شتێکیان بۆ سولەیمان پێغەمبەر _ علیه السلام _ دەهێنا کە داوای دەکرد. بەڵام پێغەمبەرمان ﷺ لەو پایەدارترە چونکە لە سولەیمان پێغەمبەر زیاتری پێ درا بوو، خوای گەورە وەکو پێغەمبەرێك بۆ تێکڕای ئادەمیزادو جنۆکەکان ناردی، بەمژدەدرو ترسێنەر، پەیامەکەی گشتییە.

چـونكه پێغەمبـەر ﷺ بەنـدەی خـواو پێغەمبەركەیـەتی، پایـەی بەنـدەی پێغەمبەریش(العبد الرسول) لەپایەی پێغەمبەری پادشا(النبي الملك) گەورەترە[١].

وە كافرانی جنۆكە دەچنە دۆزەخەوە بە بەڵگە و دەقە شەرعیەكان و بە یەك دەنگی زانایان[٢]، بەڵام سەبارەت بەئیماندارانیان جەماوەری زانایان یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوەی كە دەچنە بەهەشتەوە.

وە جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن كە پێغەمبەران هەموویان لە ئادەمیزادن[٣]، هیچ پێغەمبەرێك لە جنۆكە نەنێردراوە، بەڵام ترسێنەر (النُّذُر) یان تێدا دەبێت[٤]، وە ئەم مەسەلانە بەوردی لەشوێنی تردا باس كراوە.

---

(١)_ سولەیمان پێغەمبەر _ علیه السلام _ پێغەمبەر و پادشایە (النبي الملك)، وەكو بابی داود پێغەمبەر _ علیه السلام _ كە پێغەمبەر بوو وە پادشاش بوو لەهەمان كاتدا، وەكو یوسف پێغەمبەر _ علیه السلام _ كە پێغەمبەرو پادشاش بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ پێغەمبەرە پادشا نییە. پێغەمبەرمان ﷺ فەرمانی پێدرا یان پێغەمبەرو پادشا بێت، وە یان بەندەو پێغەمبەر بێت، ئیتر ئەوەی هەڵبژارد كە پێغەمبەر بێت و پادشا نەبێت.

(٢)_ لە رووی سزاوە جنۆكەكان وەكو ئادەمیزادن، جنۆكەكان دەچنە دۆزەخەوە، زانایان جیاواز بوون سەبارەت بەوەی كە ئایا پیاو چاكانیان دەچنە بەهەشتەوە؟ وا دیارە پیاو چاكانیان دەچنە بەهەشتەوە وەكو ئادەمیزاد.

(٣)_ پێغەمبەران لە ئادەمیزاد دەبن، لەجنۆكە نابن، وە لە پیاوانیش دەبن نەك لە ژنان.

(٤)_ پێ ڕاگەیەن و ترسێنەریان تێدایە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ﴾[الأحقاف: ٢٩] هەموو گەڕانەوە بۆ لای قەوم و هۆزەكەیان بەترسێنەر بۆ ئەوەی لەسەر كوفرو شیرك و هاوەڵپەرستی نەمێننەوە، كەواتە ترسێنەریان تێدایە.

ئەو ئادەمیزاددەی کە فەرمان بەجنۆکەکان دەکات بەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێداوە، وەکو پەرستنی خوای گەورە بەتەنهاو[1]، گوێڕایەڵ بوون بۆ پێغەمبەرەکەی، وە هەمان ئەو فەرمانانە بە مرۆڤیش دەدات، ئەو ئادەمیزادە یەکێکە لەچاکترین ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە، وە لەو ڕووەوە جێنشین وە نوێنەری پێغەمبەری خوایە ﷺ[2].

---

(١)_ وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو فەرمانەی داوە بە جنۆکەکان کە خوای گەورە فەرمانی پێداون، وەکو پەرستنی خوای گەورە بە تەنها کە هیچ هاوبەشێکی نییە، وە وازهێنان لە پەرستنی شتانی دیکەی جگە لەخوای گەورە.

(٢)_ مەبەستی شێخولئیسلام ئەوەیە کە دەیەوێت بەرپەچی ئەو کەسانە بداتەوە کە جنۆکە خزمەتیان دەکەن، دەشڵێن: ئەمە کەرامەتێکە لە لایەن خوای گەورەوە، پێشتر ئاماژە بەوەدرا کە ئەمە کەرامەتی خوای گەورە نییە، ئەمە تەنها گومڕا بوون و لە خۆ باییبوونە لە ڕاستیدا ئەوەی فەرمانیان دەداتی بە گوێڕایەڵی و ملکەچ بوون بۆ خوای گەورەو، بۆ پەرستنی خوای گەورە بانگیان دەکات بێگومان کەسێکە لە پیاو چاکان، بەڵام ئەو کەسەی لە کارە حەرامەکان و، جادوو، شتی تردا بەکاریان دێنێت و، لەو شتانەدا بەکاریان دێنێت کە خوای گەورە حەرامی کردووە، بێگومان ئەوە بەکارهێنانێکی حەرامە.

وە ئەو کەسەی جنۆکە لە کاروبارێکی موباح و ڕێپێدراوی خۆیدا بەکاربێنێت، وەکو ئەو کەسەیە کە مرۆڤێك لەکاروباری موباح و ڕێپێدراوی خۆیدا بەکاردێنێت، ئەوەی فەرمانی ئەنجام دانی ئەو شتانەیان بداتێ کە لەسەریان واجبە، قەدەغەی ئەو شتانەیان لێبکات کە لەسەریان حەڕام کراوە، وە لە کاروبارێکی موباح و ڕێپێدراوی خۆیدا بەکاریان بێنێت، ئیتر ئەم کەسە لە پلەو پایەی پادشایانێکدایە کە شتانێکی وەکو ئەوە ئەنجام دەدەن[1]، ئەم کەسە ئەگەر بەیەکێك لە ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە دانرا ئەوە تەنها یەکێکە لە ئەولیاو دۆستانی گشتی[2] خوای گەورە، وەکو پێغەمبەری پادشا (النبي الملك) لەگەڵ بەندەی پێغەمبەردا (العبد الرسول)، وەکو سولەیمان و یوسف لەگەڵ ئیبراهیم و مووساو عیساو موحەممەد دا _صلوات الله وسلامه عليهم أجمعين_[3].

---

(١)_ ئەمە، نازانم، واتە ڕێدان بەمرۆڤەکان بۆ بەکارهێنانی جنۆکە لە کاروبارێکی موباح و ڕێپێدراودا، پێویستە ئەم دەروازەیە بۆ خەڵك نەکرێتەوە، چونکە بەو بەهانەیەوە کەسانێکی زۆر بانگەشەی شتانێکی وەکو ئەوە دەکەن، چاکتر بۆ مرۆڤ ئەوەیە لە هیچ شتێکدا جنۆکە بەکارنەهێنێت، بەڵکو داوای یارمەتی لەخوای گەورە بکات، داوای یارمەتی لە برا ئادەمییەکانی خۆی بکات بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارانەی کە خوای گەورە ڕێی پێداوە.

(٢)_ وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە بۆ بەندە ئیماندارەکانی دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: وەلایەت و دۆستایەتیەکی گشتی کە بۆ سەرجەم ئیماندارانە.

جۆری دووەم: وەلایەت و دۆستایەتیەکی تایبەت: کە بۆ کەسانێکی هەڵبژێردراو و چاکانی ئەو ئیماندارانەیە.

(٣)_ شێخولئیسلام لێرەدا بەرپەرچی ئەو کەسانە دەداتەوە کە جنۆکە لە بوارەکانی جادوو و کیهانەو غەیبزانیدا بەکاردێنن، بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە ئەوە کەڕامەتەو، گوایە ئەوان لە ئەولیاو دۆستانی خوای گەورەن، بەڵام ئەوان لەحەقیقەتدا تەنها دۆستی شەیتانن و، دۆستی خوای گەورە نین.

وە هەرکەس جنۆکە لەو بوارانەدا بەکاربێنێت کە خواو پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردووە، یا لەشیرك و هاوەڵپەرستیدا، یا لەکوشتنی کەسێکی خوێن پارێزراودا، یا بۆ ئەوەی دەست درێژییان بکاتە سەر بەبێ کوشتنیان وەکو ئەوەی نەخۆشیان بخات و، زانست و زیکرو یادی خوای گەورەیان بیرباتەوەو، یا لە خراپەو بە دڕەوشتیدا، وەکو هێنانی کەسانێك کە داوای داوێن پیسی لێ بکات، ئەم کەسانە جنۆکەی لەبواری تاوان و دەستدرێژیدا بەکارهێناوە، پاشان ئەگەر لەبواری کوفردا بەکاریان بێنێت ئەوە کافرە، ئەگەر بۆ تاوان و سەرپێچی بەکاریان بێنێت ئەوە کەسێکی سەرپێچی کارو یاخییە، یان خراپەکارەو لە هەق و ڕێی ڕاست لایداوە (فاسق)، یان تاوانبارەو لەهەق و ڕێی ڕاست لاینەداوە(مذنب غير فاسق).

وە ئەگەر بەتەواوی بەشەریعەت زانا نەبێت و[1]، لەو بوارنەدا بەکاری هێنان کە وا دەزانێت لە کەرامەتن، وەکو ئەوەی بەکاری هێنان بۆ حەج کردن، یان لە کاتی گوێ بیست بوونی بیدعە شەیتانەکان بیفڕێنن[2]،

---

(١)_ تەماشاکە، ئەم مەرجە، بە تەواوی بەشەریعەت زانابێت، ئەگەر زانستێکی تەواوی بەشەریعەت هەبێت ئەوە لەکاروباری موباح و ڕێپێدراودا با بەکاریان بێنێت، بەڵام کەسی نەفام باهەرگیز ئەم دەروازەیە نەکاتەوە.

(٢)_ بیستنی بیدعی، واتە گۆرانی، گۆرانی بە لای صۆفیەکانەوە، کۆ دەبنەوەو، گۆرانی دەڵێن و، دەف لێدەدەن، پاشان باروحاڵێکیان بەسەردا دێت دەفڕن و، دەڵێن: ئەمە کەرامەتە کەچی لە حەقیقەتدا تەنها کردەوە گەلێکی شەیتانییە، ئەوەی فڕاندنی تەنها شەیتان بوو، خودی خۆیان نەفڕین، بەڵکو لە ڕاستیدا تەنها شەیتان بوو هەڵیگرتن و فڕینی پێکردن.

یان بۆ عەرەفات هەڵیگرن، ئەو حەجە شەرعییە بەجێنەهێنێت کە خواو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێداوە، یان لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر هەڵیگرن و، شتیتری بەو هاوشێوانە، ئەمە گومڕاییەو، بە ڕاستی فریویانداوە[1].

وە زۆرێك لەو کەسانە پێدەچێت هەر نەزانێت ئەوە لە لایەن جنۆکەوەیە، بەڵکو بیستویەتی کەوا ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە کەرامەت و کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەریان هەیە، ئەوەندەش حەقیقەتەکانی ئیمان و زانینی قورئانی[2] پێنییە بەهۆیەوە لە نێوان کەرامەتی ڕەحمانی و لە نێوان سەرلێشێواندنەکانی شەیتانیدا جیاکاریی بکات، ئیتر بە گوێرەی بیروباوەڕی خۆی فریوی دەدەن.

---

(١)_ جایز نییە لەپەرستنەکاندا بەکاریان بێنن، بۆ مەککەو مەدینەو بەیتولمەقدیس بیانبەن، ئەمە جایز نییە، نابێت لە پەرستندا بەکاریان بێنن، بەڵکو لە ڕاستیدا تەنها لە موباحات و ڕێپێدراوەکاندا بەکاریان دێنن بەمەرجێك ئەو مرۆڤە تەواو زانابێت بەشەریعەت.

(٢)_ ئەو کەسەی زانستێکی تەواوی بەشەریعەت نەبێت دەکەوێتە نێو ئەم شتانەوە.

بۆیە ئەگەر هاوەڵپەرست بێت و هەسارە و بتەکان بپەرستێت، وای بەخەیاڵدا دێنێ کە لەو پەرستنە سوود وەردەگرێت، بە نیازە ئەوەی بتەکەیان لەسەر شێوەی کێشراوە تکاکاری بۆ بکات و بیکات بەهۆکاری نزیکبوونەوە، کە پادشایەکە یان پێغەمبەرێکە یان شێخێکی چاکە، وادەزانێت ئەو پێغەمبەرە یان ئەو شێخە چاکە دەپەرستێت، کەچی پەرستنەکەی لەحەقیقەتدا بۆ شەیتانە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ (٤٠) قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ (٤١)﴾[1] [سبأ: ٤٠_٤١] واته: وە بیری (خوا) هەموویان کۆ دەکاتەوە پاشان بە فریشتەکان دەفەرموێت ئایا ئەوانە (لە دونیا) ئێوەیان دەپەرست (فریشتەکان) دەڵێن پاك و بێگەردی بۆ تۆ تەنیا تۆ گەورەی ئێمەی نەك ئەوان بەڵکو ئەوان جنۆکەیان دەپەرست زۆربەیان باوەڕیان بەوان (جنۆکە) هەبوو.

---

(١)_ هەر موشریك و هاوەڵپەرستێك ئەگەر بەرد یان دەرخت یان بتێکی پەرستبێت، بادڵنیابێت لەڕاستیدا تەنها شەیتانی پەرستووە، چونکە شەیتان فەرمانی ئەوەی پێکردوون، ﴿بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ﴾ بەڵکو ئەوان جنۆکەیان دەپەرست، واتە شەیتانیان دەپەرست، ﴿أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ﴾ زۆربەیان باوەڕیان بەوان (جنۆکە) هەبوو.

بۆیە ئەوانەی که سوژدەیان بۆ خۆرو، مانگ و، هەسارەکان دەبرد، مەبەستیان سوژود بردن بوو بۆ خودی ئەوانە، کەچی شەیتانیش خۆی لەگەڵ ئەو خۆرو، مانگ و، هەسارانەدا جووت دەکرد لە کاتی سوژدە بردنەکەی ئەواندا، بۆ ئەوەی سوژدەکەیان بۆ ئەو بێت، شەیتان خۆی بەشێوەی ئەوانە دەگۆڕێت کە موشریك و هاوەڵپەرستان هانایان بۆ دەبەن و داوای فریاکەوتنیان لێدەکەن، ئەگەر ئەو هاوەڵپەرستە گاور بێت و هانای بۆ جرجس یان غەیری ئەو بردو داوای فریاکەوتنی لێکرد، ئەوا شەیتان لەسەر شێوەی جرجس و غەیری ئەویش کە هاوەڵپەرستان هانایان بۆ دەبەن و داوای فریاکەوتنیان لێدەکەن دێتە لایان، یان ئەگەر خۆی دابێتە پاڵ ئیسلام و، هانای بۆ شێخێك لەشێخانی موسڵمانان برد کە گومانی چاکێتی لێدەکات، ئەوا شەیتان لەسەر شێوە ئەو شێخە دێتە لای، وە ئەگەر لەموشریك و هاوەڵپەرستانی هیندیش بوو، ئەوا شەیتان لەسەر شێوەی ئەوە دێتە لای کە هیندیەکە بەگەورەی دادەنێت.

پاشان ئەگەر ئەو شێخەی هانای بۆ براوەو داوای فریاکەوتنی لێکراوە لەوانە بێت کە پسپۆڕو زانان لە شەریعەتدا، ئەوا شەیتان پێی ڕاناگەیەنێت کە لەسەر شێوەی ئەو خۆی پێشانی ئەو هاوەڵانەی داوە، کە هانایان بۆ بردوەو، داوای فریاکەوتنیان لێکردووە، وە ئەگەر شێخەکە لەوانە بێت کە هیچ زانینێکی ئەوتۆی بە گوفتاری هاوەڵانی نەبێت، ئەوا شەیتان گوفتاری هاوەڵانی پێدەگەیەنێت، هاوەڵانیشی وادەزانن کەوا شێخ لەدورەوە دەنگەکانی بیستوون و، وەڵامی داونەتەوە، کەچی لەڕاستیدا تەنها بەواسیتەو نێوەندکاری شەیتانەوە بووە.

شێخێك کە شتانێکی وەکو ئەمەی بۆ بە دیهات بوو بەشێوەی موکاشەفەو موخاتەبە، گووتی: جنۆکەکان شتێکی درەوشاوەم پێشان دەدەن وەکو ئاو و شوشە، خۆیانی تێدا دەنوێنن لەسەر شێوەی ئەو شتانەی کە لێی داواکراوە هەواڵمان لە بارەوە بداتێ[1]،

---

(١)_ وەکو ئەو کەسانەی کە بانگەشەی زانینی شتی شوێنی دزراو دەکەن، ڕووحە شەیتانیەکان ئامادە دەکەن، وە ژنان و منداڵانیش جاربەجار لەشتانێکی وەکو

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

ئەوەدا بەکاردێنن، کوپێکی بۆ دێنن ئاوی تێدایە، منداڵەکە تەماشای ئاوی نێو کوپەکە دەکات هاوکات جنۆکەکە خۆی دەگۆڕێت و خۆی پیشان دەدات کە چەند شتێك ئەنجام دەدات، کوتومت وەکو دزەکە، منداڵەکە لەنێو ئاوی کوپەکەدا وێنەی پیاوێك دەبینێت لەسەر شێوەی ئەو پیاوەی کە دایەکەی کردووە، ڕێدەکات و دەچێتە ماڵی فلان کەسەوە، ئیتر هەڵدەستێت و پێی دەڵێت: من بینیم فلانی کوڕی فلان دزیەکەی کرد، پێی دەڵێت: ئەو فلان کەسە شتەکەی دزیووە، بچۆ لە ماڵی ئەو فلان کەسە بە دوایدا بگەڕێ، ئیتر پیاوەکە دەچێت و لەماڵی ئەو فلان کەسەدا شتەکەی دەدۆزێتەوە، شتانێکی وەکو ئەمە لە بارو حاڵی جنۆکەکانە، کە جنۆکەکە لە وێنەی ئەو پیاوەدا کە مانگەکەی دزیوە خۆی دەنوێنێت، جنۆکەکە خۆی لە شێوەی پیاوەکەو لەشێوەی شتە دزراوەکەش لە نێو ئاوەکە یان شوشەکەدا خۆیانی بۆ دەنوێنێت. بڕوانە: الشيخ ياسر برهامي، شرح الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان، وەرگێڕ.

گووتی: منیش هەواڵی شتەکە بە خەڵکەکە دەڵێم. جنۆکەکان گوفتاری ئەو کەسانەم پێدەگەیەنن کە هانام بۆ دەبەن و داوای فریاکەوتنم لێدەکەن، وەڵامی منیش بەوان دەگەیەنێت[١].

شێخانێکی زۆریش کە شتانێکی زۆری وەکو ئەو کردەوە نائاساییانەیان بۆ بەدی هاتووە، ئەگەر کەسانێك کە لەو بارەوە شتێك نەزانن و بڕوایان پێنەکەن و بە درۆیان بخەنەوەو، بڵێن: ئێوە بە ڕێگەی فێڵ ئەو شتانە ئەنجام دەدەن، ئێوە بە (حجر الطلق)و[٢] توێکڵی نارنج و، ڕۆنی بۆق و، چەندین فێڵی سروشتی تر دەچنە نێو ئاگرەوە، ئەو شێخانە سەریان سوڕدەمێنێت و، دەڵێن: سوێند بە خوا ئێمە هیچ شتێك لەو فێڵانە نازانین، بەڵام ئەگەر کەسانێکی شارەزا پێیان بڵێن: ئێوە لەوەدا ڕاست دەڵێن، بەڵام ئێوە لەڕێگەوی باروحاڵی شەیتانیەوە ئەو شتانە ئەنجام دەدەن، دان بەوەدا دەنێن، کەسانێکیشان تەوبەیان کردو پەشیمان بوونەوەو، خوای گەورە لێیان ببورێ و لێتان خۆش بێ ، کاتێ هەقیان بۆ ڕوون بویەوە، کاتێ لەچەندەها ڕووی جۆر بە جۆرەوە بۆیان ئاشکرا بوو کە کاری شەیتانە، تەماشایان کرد لە لایەن شەیتانەوە ئەنجام دەدرێت، چونکە بۆیان دەرکەوت لە کاتی ئەنجام دانی بیدعە زەم کراوەکانی شەرعدا، لە کاتی مەعصیەت و سەرپێچی کردنی خواو پێغەمبەرەکەیدا ڕوو دەدەن.

---

(١)_ دەبن بە پۆستەچی!

(٢)_ حجر الطلق: بەردێکی بریسکەدارو ڕوونە، چینەچینە، ئەگەر پیاکێشیت پریشکی لێدەبێتەوە، دەهاڕدرێ و وەکو بۆدرە بەجەستەوە دەکرێت، پێستی مرۆڤ نەرم دەکات. بڕوانە: مەلا مەحمودی گەلالەیی، قامووسی ڕستە، وەرگێڕ.

وە لە کاتی ئەنجام دانی ئەو کردەوەو پەرستنە شەرعیانەدا ڕوونادەن کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت[1]، ئەو کاتە زانیان کە لە کردەوە ناناساییاکانی ئەبینانە کە بۆ دۆستانی خۆی ئەنجامی دەدات، نەك لە کەرامەتی ڕەحمانییی کە بۆ دۆستانی خۆی بەدی دێنێت.

والله أعلم بالصواب وإليه المرجع والمآب، وصلى الله وسلم على محمداً سيد رسله وأنبيائه، وعلى آله وصحبه وأنصاره وأشياعه وخلفائه صلاة وسلاما نستوجب بهما شفاعته . . . آمين.

---

(١)_ لە ڕاستیدا کەرامەت ڕوو دەدات لە کاتی بەجێهێنانی گوێڕایەڵ بوون و ئەنجام دانی ئەو پەرستنانەدا کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت، بەلام کردەوەی ناناسایی لە سروشت بەدەری شەیتانی لە کاتی ئەنجامدانی ئەو کردەوانەدا خواو پێغەمبەرەکەی ڕقیان لێیەتی ڕوودەدەن، وەکو مەعصیەت و تاوان و شیرك و هاوەڵپەرستی، ئەمەیە جیاوازی نێوان کەرامەت و کردەوەی ناناسایی شەیتانیدا.

# ناوەڕۆك


**بەشێك سەبارەت بەوەی كە پێغەمبەران( عليهم الصلاة والسلام ) لەو ئەولیاو دۆستان چاكترن كە پێغەمبەر نین**.........٥١٧

فەزڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەكەی..........٥٢٢

گومڕایی ئەوانەی وەلایەت و دۆستایەتی لە پێغەمبەرایەتی بەچاكتر دادەنێن......٥٥٤

بیروباوەڕە پووچەكانی ئیبنوسیناو فەیلەسوفان..........٥٦٢

(ضعیف) بوونی ئەو فەرموودانەی كە لە بارەی چاكێتی ئەقڵەوە هاتوون..........٥٧١

حەقیقەتی عەقڵ..........٥٧٥

وەسفی فریشتەكان لە قورئاندا..........٥٨٥

ئیلحادیی ئەوانەی باوەڕیان(وحدة الوجود)ە..........٦٠٢

**بەشێك سەبارەت بەئاڵۆز بوون و تێكەڵبوونی مانای حەقیقەتە ئەمریە شەرعیەكان بەحەقیقەتە خەلقیە قەدەریە كەونیەكان**..........٧٠٢

هاندان بۆ تەوبەكردن و داوای لێخۆشبوون..........٧١٨

بەرپەرچدانەوەی ئەو كەسانەی كە قەدەری خوا دەكەنە بەهانەی تاوانەكانیان..٧٥١

هاندان بۆ ئارام گرتن و، داوای لێخۆشبوون و، ڕازیبوون بەقەزا..........٧٧٣

حەقیقەتی قەدەری (كۆن)ی حەقیقەتی شەرعی..........٧٨٩

**بەشێك سەبارەت بەوەی خوای گەورە لەقورئانە پیرۆزەكەیدا باسی جیاوازی نێوان ئیرادەی كەونی ئیرادەی شەرعی كردووە غەیری ئەوانەشی كردووە**..........٨١٦

ئیرادەی كەونی و ئیرادەی شەرعی..........٨٢٠

ئەمری كەونی و ئەمری شەرعی..........٨٣٠

ئیزنی كەونی و ئیزنی شەرعی..........٨٣٥

قەزای كەونی و قەزای شەرعی..........٨٣٩

ناردنی (بەعثی) کەونی و بەعثی شەرعی........................................ ٨٤٦
(الإرسال)ی کەونی و (الإرسال)ی شەرعی........................................ ٨٥١
پیّ سپاردنی(الجَعْل)ی کەونی و شەرعی........................................ ٨٥٤
(التحریم)ی کەونی و (التحریم)ی دینی........................................ ٨٥٦
(الکلمات)ی کەونی و (الکلمات)ی دینی........................................ ٨٥٩
**باسێك سەبارەت بەوەی کەوا (ڕێزی) کەرامەتی ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە لەڕاستیدا تەنها بەهۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە ﷺ بەدی دێت**........................................ ٨٩٦
**باسێك سەبارەت بەیاد هێنانەوە و باسکردنی چەمکێك لە کەرامەتی هاوەڵانی بەڕێز و تابعین**........................................ ٩٠٧
ئەهلی باروحاڵە شەیتانیەکان........................................ ٩٣٦
جیاوازیەکانی نێوان کەرامەت و باروحاڵە شەیتانیەکان........................................ ٩٥٢
ڕێگریکردن لەبەگەورەدانانی گۆڕەکان و ورياکردنەوە لەوەی مزگەوتی لەسەر دروست بکرێت........................................ ٩٧٢
کردەوە نائاساییە لەسروشتبەدەرەکان لەدیدی خەڵکدا........................................ ١٠٠٢
گۆرانی گوتن بار و حاڵە شەیتانیەکان بەهێز دەکات قورئانیش ئیمان بەهێز دەکات........................................ ١٠٠٧
لە گومان و دودڵیەکانی (وسوس)ی شەیتان........................................ ١٠٣٠
**بەشێك سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ تێکڕای ئادەمیزادو جنۆکە نێردراوە**........................................ ١٠٤٤
باروحاڵەکانی جنۆکە لەگەڵ ئادەمیزاددا........................................ ١٠٦٩